178 2004







گۆڤارێکی مانگانەی ڕۆشنبیری گشتییە
وەزارەتی ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەریدەکات



## خودو بابەت لە پرۆسەی رەخنەدا

## کۆمەڵگای ئەوروپاو خوێنی نوێی موسڵمانەکان

## رۆژئاوا لە دیدی رۆژهەڵاتەوە

## تیوری هەڵوەشاندنەوە لە لایەن جاک دریداوە

هەڤپەیڤین:

دڵشاد عەبدوڵڵا ، ناز ناز محەمەد ، بۆرخیس ، لوان ستارۆڤا



پۆرتریت

لە ساڵی ١٧٨٢ لە لایەن هونەرمەندی شێوەکار

(گی لێبرون)ەوە بە قەوارەی ٩٧,٨ × ٧٠,٥سم دروست کراوە

هەڵبژاردەی: جەببار جەمال غەریب

178
کانوونی دووەم
2004

# کاروان

گۆڤارێکی مانگانەی رۆشنبیریی گشتییە
وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان دەریدەکات


زنجیرە درامای گەمەی خەونە ئازادەکان


خاوەنی ئیمتیاز

مەحمود محەمەد
وەزیری رۆشنبیری

سەرنووسەر

کاروان عەبدوڵلا

بەڕێوەبەری نووسین

سەلاح عومەر

کاری هونەری

کاوە فاروق علی

سەرپەرشتی چاپ

نەوزاد سلێمان



ناونیشان: هەولێر- ڕێگای شەست مەتری -بەرامبەر نەخۆشخانەی کوردستانی تایبەت

Tel: 2232436
Mo 6700861 بۆ ناوەوە
0032484450861 بۆ دەرەوە

WWW.karwan.150m.com
Email: govarikarwan@maktoob.com

گۆڤاری کاروان لەسەر ئەم
سایتەی خوارەوە بخوێنەوە

# لەم ژمارەیەدا

### لێکۆڵینەوە



### وتار



### هزر



### هەڤپەیڤین



### شیعر



### چیرۆک



### شانۆ



### مێژوو



### فۆلکلۆر



### زانست



### سەرگوزشتە



### روانگە




پیتچنین و کاری هونەری و فەرزی بەرگ و چاپکردن لە چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری - هەولێر

# خود و بابەت لە پرۆسیسەکردنی ڕەخنەدا



## ١-٢

عەبدولموتەلیب عەبدوڵلا

خوێندنەوە بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێک لایەنی بنەڕەتی لەخۆدا هەڵگرتووە، بۆ بەرقەرارکردنی ڕێگای گونجاو و لەبار تاکو لەوێوە مامەڵە لەگەڵ خودی دەقدا بکات. ئەو مامەڵەکردنەش مەرج نییە خۆی بەیەک لایەن یاخود یەک ڕەگەز و یەک دەلالەتی چەسپاو خەریک بکات. بەمانایەکی دیکە دەشێ لە دووتوێی کۆمەڵێک خوێندنەوەی جۆراوجۆرەوە بتوانین پەنجە بخەینە سەر ڕونیاو میتۆدی دیاریکراو، بەر لەوەی تەسەوریکی پێشینە بۆ لە یەکنزیکردنەوەی خوێندنەوەکان لە ئارادا هەبێت، واتە دەشێ گشتی بەرهەم هاتوو لە دووتوێی هەڵوەشانەوەو پارچە پارچەکردنیدا بخوێنینەوە، هەروەک چۆن بەهەمان شێوەش دەشێ لە توێی خوێندنەوەی پارچەکانەوە دواجار گشتی بەرهەم هاتوو خۆی بدۆزێتەوە. بەمانایەکی دیکە خوێندنەوە دەبێتە ڕێبازێک، یان ئامانجێک کە بەهۆیەوە واقیعیەت دەخرێتە بەر هەڵسەنگاندن و بەدواداچوون، بەدیوەکەی دیکەش چەمکێکە بەردەوام قابیلی دراسەکردن و فرەڕەهەندی و جێگیرنەبوون.

ئەگەر لە دەرەوەی هەژموونی دەقەوە لە پارچەکانەوە بەرەو گشت هەنگاو بنێین، لەلایەک خوێنەر لە تەمومژ ڕزگار دەکەین، لەلایەکی دیکەش ڕێگا دروستەکانی خودی دەق لە شێوان دەپارێزین. بێگومان خوێندنەوە هەر تەنها توێژینەوەو لێکۆڵینەوە ناگرێتەوە، بەڵکو دەشێ لەم بوارەش گوزەرێکاو لەتوێی ئاگایی خودی خوێنەرەوە فەزاو پێشنیاری گونجاو بخاتەوە کە لە هەمان کاتدا لەگەڵ ئاستی فیکری خوێندراوە لە خاڵێک لە خاڵەکاندا یەک بگرێتەوەو لە چەندان خاڵیشدا دژ بوەستێ، یاخود بەمانایەکی دیکە ڕەنگە لە دووتوێی تاکە میتۆدێک و تاکە ڕوئیایەکدا بتوانین کۆمەڵێک خوێندنەوەی جیاجیا بۆ دەقێک بە ئەنجام بگەیەنن، وەک چۆن شیاویشە تاکە دەقێک بەچەندان میتۆد و ڕونیای جیاجیا بخوێنینەوە، ئەگەر خوێندنەوەی یەکەم بکەوێتە میانی ئیشکالیەتی مەعریفی و ئایدیۆلۆژی میتۆدی دیاریکراو، بێگومان لە دووەمدا خودی دەق هەمان ئیشکالیەت بەرهەم دێنێ. بەواتایەکی دیکە ئەگەر لە خوێندنەوەی یەکەمدا بتوانین هاوچەرخێتی بۆ میتۆدی دیاریکراو فەراهەم بکەین، ئەوا لە دووەمدا دەق ئەو بایەخە بۆ خۆی دەبات. بەڵام لە دەرەوەی خوێندنەوەی هاوچەرخانە و دەقی هاوچەرخدا، ئەگەر خوێندنەوە تاکە پێناسەیەک بۆ خۆی بەرەوا بزانێ ئەوەیە کە خوێندنەوە: گواستنەوەی دەق و میتۆدە بۆ بواری گرینگیدانی خوێنەر، ئەوەش وا دەکات خوێنەر لای خۆی شتەکان تەوزیف بکات، هەر لەتوێی ئەو تەوزیف کردنەشەوە تەماهی خوێندنەوە دەبێت، یاخود واز لەخودی خۆی دەهێنێ و دووبارە لەئاستێکی دیکەدا خۆی بونیاد دەنێتەوە. هەروەک بەهەمان شێوەش دەق بونیاد دەنێتەوە. کەواتە کاتێ خوێندنەوەی یەکەم بەهۆی بەهاوچەرخی کردنی میتۆدەوە دەق لەئێمە دادەبڕێ، ئەوا خوێندنەوەی دووەم میتۆد دەخاتە دواوەو دەق لەگەڵ ئێمەدا بەرێ دەخات. کەواتە کاتێ لەسەرەوە گوتمان خوێندنەوە هەر تەنها توێژینەوەو دیراسەکردن نییە، ویستمان بڵێین بەهۆی ئاگایی و ڕۆشنبیریی فرە مەودای خوێنەرەوە دەتوانین لەکۆی میتۆدەکانەوە پەنجە بۆ هیرمۆنتیکا درێژ بکەین، لەدووتوێی هیرمۆنتیکاشەوە پەیوەندییەکانی«دابڕان و گەیشتن» هەروەک دوو هەنگاوی سەرەکی خوێندنەوە لە خوێندراوەدا نمایش بکەین . بەڵام کەس بۆی نییە لە بەکارهێنانی دەستەواژەیەک، یان مانایەکی دیاریکراو ڕێگر بێ لەو شێوەیەی کە دەقنوس دەیەوێ بەکاری بهێنێ، ئەوە

**ڕەنگە لە دووتوێی تاکە میتۆدێک و تاکە ڕوئیایەکدا بتوانین کۆمەڵێک خوێندنەوەی جیاجیا بۆ دەقێک بە ئەنجام بگەیەنن، وەک چۆن شیاویشە تاکە دەقێک بەچەندان میتۆد و ڕوئیای جیاجیا بخوێنینەوە. ئەگەر خوێندنەوەی یەکەم بکەوێتە میانی ئیشکالیەتی مەعریفی و ئایدیۆلۆژی میتۆدی دیاریکراو، بێگومان لە دووەمدا خودی دەق هەمان ئیشکالیەت بەرهەم دێنێ**

لەکاتێکدا کە بەکارهێنەر دەستەواژەکە ڕوون بکاتەوە، کە چ مەبەستێک لەو شێوە بەکارهێنانە هەیە«بڕوانە ئانتۆنی ئاربلاستەر- دیموکراسی-و: ڕێباز مستەفا-ل٣٠ چاپی ٢٠٠٢ سلێمانی».دەشێ پێکەوەلکانی هەندێ لەدیاردەکان لەڕێگای بەرهەمهێنانی کۆمەڵێ چەمک و پرەنسیپی جیاوازەوە خودێک لەخۆ بگرێت، پرسیاری ئەو خودەش هەرگیز ناکرێ وەک پرسیارێکی هەمەکی سەیر بکرێت. بەڵکو پرسیارێکە ئەگەر لەلایەک کۆی بەشەکان(ئەو پرسیارەیان) بەرز کردبێتەوە، ئەوا لەلایەکی دیکە ئەویدی بەرامبەر، یان خودەکانی دیکە دەستیان لە دروستکردنیدا هەیە، بەو مانایەش دەتوانین بڵێین هەموو ئەوانە بەرئەنجامی، ئەویش بەرئەنجامی کەلەپورو کلتورو ئەو ئایدیاو جیهانبینییەیە کە سەردەم پشتی پێدەبەستێ. بەڵام بەدیوەکەی دیکەش هەر خوێندنەوەیەک دەبێ، وەک چاخ و نەوەکانی بەر خۆی، یان بە مانایەکی گشتی خوێندنەوەکانی بەر لە خۆی ئازادبێ، تاکو بڕیاری خۆی بدات.

ئەگەر وەک(جابری) ئەو بەر ئەنجامە بەعەقڵی عەرەبییەوە پەیوەست بکەین، دەشێ بڵێین کێشەی عەقڵی عەرەبی کێشەی مردنی خودێکە کە تەواوی شتەکانی بۆ دەرەوە بەیان کردووە، لەمیانی ئەو مردنە یان لە ئەکتیڤ نەبوونی خودی عەرەبییەوە، دەشێ ئەو گوتەزایەی (هیگل) بهێنینەوە کە دەڵێ: ئەو بوونانەی کە لەکۆدا تواونەتەوە بوونێکی درۆزنانەن. ئەگەر لەلایەک کوشتنی ئەو خودە تەعبیر لە بەرجەستەکردنی کلتوری عەرەبی و بە دیوەکەی دیکە «ئایینی ئیسلامی» بکات، کەواتە شاردنەوەی ئەو خودە، میتافیزیکای عەقڵی عەرەبی لەخۆ دەگرێت، تاوەکو لەم خاڵەوە خزمەت پێشکەش بەسیستەمی مەعریفی بکات. ئەو سیستەمە مەعریفییەش کەمالی تاک لایەن لەپێناو کەمالی هەمەلایەندا دەخاتە ڕوو، بەم واتایەش دەشێ ئەزمەی عەقڵی عەرەبی لە ماهیەتی ئەو سیستەمەوە بێ کەکردەی عەقڵی لەتوێی خۆیدا کوشتووە، یاخود ئەزمەی ئەو سیستەمە مەعریفییە بێ کە تەواوی کێشەو ململانێکانی لەخۆدا خنکاندووە، بۆ ئەوەی وەک حەقیقەتێکی ڕەها خۆی بەرجەستە بکا.

بێگومان خودی ئەو مەسەلەیە ئەگەرچی بەشێوەی جیاجیا خراوەتە بەر چاوی خوێنەران



جابری

بەڵام لەهەمان کاتیشدا لێردا پێویستی بە بەدواداچوونی زێتر هەبوو، هیوادارم لەمیانی ئەو خوێندنەوەیدا و لەمیانی ڕەخنەکانی (جابری) بۆ عەقڵی عەرەبی بتوانین ڕوونتر قسە لەم مەسەلەیە بکەین ڕەنگە پرسیاری عەرەبی وەک(جابری) پۆلێنی دەکات لەم سێ تەوەرەیەدا خۆی بنوێنێ:

**چۆن سەربەرزی ژیاری دەگەڕێنینەوە.. چۆن کەلەپورمان زیندوو دەکەینەوە؟**

ئەو دوو پرسیارە یەکێک لەگفتوگۆ سەرەکییەکانی فیکری عەرەبی و ئیشکالیەتی فیکری عەرەبی نوێ لەخۆدەگرێت، دواجار سیستەمی پەیوەندییەکانیشیان دەکەوێتە نێوان(ڕابردوو- داهاتوو) لێردا ئێستا دەگۆڕێ، نەک بەو مانایەی کەرەفزە، بەڵکو بەومانایەی کە ئامادەباشی ڕابردوو لەئێستا بەهێزترە، تا ئەو پلەیەی کە وەک ئەڵتەرناتیڤێ پەل بۆ داهاتووش دەکوتێ، داگیری دەکات، تەواوی ئەو مەسەلەیەش ڕاستەوخۆ جەختکردنە لە(خود)و ڕەتکردنەوەی پێودانگەکای ئەویدییە، ئەو جەخت کردنەش دەشێ دژبوونەوەی ژیاری خۆرئاوا«چ لەئاستی تاک، یان کۆ بەهەموو شێوەکانییەوە»بێ.

هەموو ئەو خۆ بینانەی کە «ئەویدی» بەشداری تیا ناکات، بەرەو نەرگیزیەتمان دەبات، نەرگیزیەتیش هەر تەنها دەلالەت لە سڕینەوەی ئەویدی دەکات و گەڕانەوەیە بۆ خود، بە دیوەکەی دیکەش وەک دەزانین پرۆسەی تەئکیدکردن لەخود هەمیشە شێوەی سەرهەڵدانەوە(نکوص) لە

خۆدەگرێت، یاخود بەمانایەکی دیکە گەڕانەوە بۆ دواوەو هێرش بردن هەر لەوێوە، لەفیکری عەرەبی نوێی هاوچەرخدا بەشێوەیەک لەشێوەکان بەندە بەشەپۆلی سەلەفیەتەوە، واتە گەڕانەوەو زیندووکردنەوە بەم شێوەیەو لە توێی خوێندنەوەیەکی ئایدیۆلۆژیانەدا، تەواوی وێنەی داهاتوو دەخاتە مەترسی و هەرەسهێنانەوە، هەر لە میانی ئەم پرۆسەیەوە داهاتووی ئایدیۆلۆژی عەرەبی بەهۆی پشتبەستن بە پرۆسەی سەرهەڵدانەوە، وانیشان دەدات کە ئەوەی لە (رابردوو) تەواوکراوە، دەشێ لەداهاتووشدا بەجێ بهێنرێت.

**چۆن هاوچەرخانە دەژین.. چۆن مامەڵە لەگەڵ کەلەپور دەکەین؟**

ئەو دوو پرسیارە دەچنە ناو یەکترو دەبنە تەوەرەی گفتوگۆکردنی ئیشکالیەتی فیکری عەرەبی، سیستەمی پەیوەندیەکانیشیان دەکەوێتە نێوان(ئێستا- رابردوو) بەڵام نەک ئێستای ئێمە، بەڵکو ئێستای ئەورووپی، چونکە ئەوروپا وەک خودێک کۆنترۆڵی تەواوی دنیای کردووە، هەر لەسەر هەمان بنچینەش خۆی بەشیاوی داهاتووش دەداتە قەڵەم . بۆیە لیبراڵە عەرەبەکان هەمیشە پێیان وایە دەبێ لەرابردوو گوزەر بکەین و هەوڵبدەین لە ئێستای ئەورووپیدا خۆمان بدۆزینەوە، یاخود بەچاوی ئەوان سەیری ژیان بکەین، بۆیە خوێندنەوەیان دەکەوێتە دووتوێی خوێندنەوەیەکی خۆرئاوایی، یاخود مەیلێکی خۆرئاواییانە لە خۆدەگرێت، واتە لەمیانی مەرجعیەتی سیستەمی خۆرئاواییەوە تەماشای ئێستای عەرەبی دەکەن، بۆیە هیچ شتێ نابینن تەنها ئەوە نەبێ کە خۆرئاوا دەیبینێ. لێرەشدا خودی ئەو خوێندنەوەیە راستەوخۆ پەیوەندی بەفیکری ئۆرینتالیستەکانەوە هەیە، ئۆرینتالیستەکانیش(١) هەمیشە خۆیان بەبێ لایەن وەسف دەکەن، واتە هەر تەنها دەیانەوێت سوود بەخشبن واتە لیبرالیەکان پێیانوایە لەدەرەوەی ئایدیۆلۆژیاو ئیلتزامەوە دەتوانن هەوڵی گرتنی مەعریفەو چەمکەکانی بدەن، دەتوانن بەشێوەیەکی زانستی میتۆد وەربگرن و ئایدیۆلۆژیاکەیان پاش گوێ بخەن، بەڵام لەبیریان چووە کە جیهانبینی و روئیاش لەگەڵ میتۆد خۆی دەخاتە ناوەوە، ئایا دەکرێ ئەو دووانە لێکجیا بکەینەوە؟ وەک دەزانین روئیای ئۆرینتالیستەکان لەتوێی میتۆدی فیلۆلۆژیدا(٢) هەوڵدەدا خوێندنەوەی کەلەپوور بەئەنجام بگەیەنێت، بەواتایەکی دیکە هەوڵدەدات کەلەپوری عەرەبی ئەرشیف بکات، بۆ ئەوەی لەمیانی ئەو ئەرشیف کردنەدا خودی عەرەبی بخاتە دواوە، لەلایەکی دیکە ئۆرینتالیستەکان دەیانەوێ تێبگەن، بەڵام چ تێبگەن، بێگومان دەیانەوێ مەودای تێگەیشتنی عەرەبی بۆ کەلەپور بزانن، چونکە وەک دەزانین عەرەب پێگەی نێوان ژیاری یۆنان وژیاری ئێستا لەخۆ دەگرێ.

**چۆن شۆڕش پراکتیزە دەکەین.. چۆن بونیادی کەلەپور دەنێیینەوە؟.**

ئەو دوو پرسیارەش بەیەکدا دەچن و دەبنە تەوەرەی سێیەم لەگفتوگۆی ئیشکالیەتی فیکری عەرەبی، سیستەمی پەیوەندیەکانی دەگەڕێتەوە بۆ (داهاتوو- رابردوو( واتە چۆن دەتوانین پرۆژەی ئەو شۆڕشەی کە تاکو ئێستا پراکتیزە نەکراوە، لەگەڵ پرۆژەی بونیاد نانەوەی کەلەپور یەکانگیر بکەین بەشێوەیەک هەریەک لەئاستی خۆی یارمەتی ئەویدی بدات واتە لێرەدا داوا لە شۆڕش دەکرێ کەبونیادنانی کەلەپوور بخاتە ئەستۆی خۆی، هەروەک داواش لەکەلەپور دەکرێ کەیاریدەی بەخشەکانی شۆڕش بدات.

جەدەلیەتی ئەو پەیوەندییە پەیوەستە بەفیکری هاوچەرخی عەرەبی، واتە هەمیشە فیکری چەپی عەرەبی لەو بازنە بۆشەدا دەخولێتەوە... بۆ؟ چونکە فیکری چەپ بەبڕوای (جابری) میتۆدی جەدەلی بونیاد نانێ بۆ جێبەجێکردن، بەڵکو وەک میتۆدێکی جێبەجێ دەیگوازێتەوە، بەمەش دەبێ کەلەپوری ئیسلامی رەنگدانەوەی کێشەی چینایەتیەکانی لەخۆدا هەڵگرتبێ، هەروەک دەبێ گۆڕەپانێکیش بێ بۆ کێشەی مادییەت و میثالیەت.

بەم جۆرە کاتێ کێشەی چینایەتی فریای فیکری چەپی عەرەبی ناکەوێت، دەبێ بە (دابەزینی مێژوو) ناونووسی بکەین. هەروەک کاتێ (مادییەت)یش فریای نەکەوت بە هێرتێک (هرطقە) بەندی بکەین، بۆیە خوێندنەوەی چەپەکان بۆ کەلەپور هەمیشە دەکەوێتە توێی سەلەفیەتی مارکسییەوە هەموو ئەو خوێندنەوانەی سەرەوەش، تەنها بۆ خستنەرووی دەرئەنجامەکانی عەقڵی عەرەبی بوو، بەمانایەکی دیکە کردەی عەقڵی دەخاتەروو، هەر کاتێکیش رەخنە بنەما مەعریفییەکانی خۆی

**لیبراڵە عەرەبەکان هەمیشە پێیان وایە دەبێ لەرابردوو گوزەر بکەین و هەوڵبدەین لە ئێستای ئەورووپیدا خۆمان بدۆزینەوە، یاخود بەچاوی ئەوان سەیری ژیان بکەین**

> **کاتێکیش ڕەخنە بنەما مەعریفییەکانی خۆی ون کرد، ئیتر ڕاستەوخۆ دەبێتە ڕەخنەیەکی ئایدیۆلۆژی بۆ ئایدیۆلۆژیەت، بەو مانایەش جگە لە ئایدیۆلۆژیا ناشێ شتێکی دیکە بەرهەم بهێنێ.**

ون کرد، ئیتر راستەوخۆ دەبێتە رەخنەیەکی ئایدیۆلۆژی بۆ ئایدیۆلۆژیەت، بەو مانایەش جگە لە ئایدیۆلۆژیا ناشێ شتێکی دیکە بەرهەم بهێنێ. بەڵام رەخنەی تیۆری بەرهەمهێن، یاخود کردەی عەقڵی دەشێ رێگا خۆشکەربێ بۆ هێنانەدی خوێندنەوەی زانستی و هوشیارانە، جا ئەگەر لەم گوشەنیگایەی (جابری)ییەوە سەیری ئەو سێ خوێندنەوانەی سەرەوە بکەین، بەکورتی دەکەوینە دەرەوەی بابەت و لەبارەی روئیاشەوە هەر هەموویان دوورن لە بۆچوونی مێژووییەوە.

بەم جۆرە نەبوونی بابەتیەت و روئیای مێژووی، فیکر دەخەنە ژێر بارێکی قورسەوە، هەر فیکرێکیش بکەوێتە ژێر ئەو بارەوە هەرگیز ناتوانێ سەربەخۆیی خۆی بپارێزێ، بۆیە بۆ ئەوەی ئەلتەرناتیڤێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە، یاخود بۆ ئەوەی کەم و کورییەکانی خۆی داپۆشێ، هەوڵی گرتنی بابەتەکان دەدات تا لە شوێنی (ئەو) کار بکەن، واتە لە شوێنی (خود)(بابەت) دێتە قسە کردن، لەبری ئەوەی فیکر بڕیار بدات بابەتەکان یەک لەسەر ئەویدی بڕیاری خۆیان دەردەکەن. لێرەدایە خود لەنێو بابەتدا دەتوێتەوەو بابەتیش لە شوێنی خودی ونبوودا خۆی دادەمەزرێنێ، جا بۆ ئەوەی بابەتیش پشت بەشتێ بدات لە سەلەف دەگەڕێ تاکو پشتی خۆی پێ قایم بکات یاخود تاکو لەوێوە پێودانگەکان بۆ خۆی بگەڕێنینەوە، لێرەدا دەبینین سەلەف هەمووی هەر مەیل و حەزە، واتە لە عەقڵی عەرەبیدا جیاوازی نێوان رێبازو شەپۆلەکان هەر تەنها جۆرێکە لە سەلەف و سەلەف بەرگرییان لێدەکات. بەڵام ئایا بۆچی ئەو مەیلە سەلەفییە تەواو دوای فیکری عەرەبی هاوچەرخ دەکەوێت بێگومان (جابری) دەیەوێ: لەمیانی ئەو خوێندنەوەیەدا سەرنجمان بۆ چەند دیاردەو هۆیەک راکێشێ، وەک دەشزانین خوێندنەوەی خوێندراوەکان بەشێوەیەکی میتۆدی سەختە، لەبەر ئەوەی خوێنەر بەرەو میکانیزمەکانی ئەو خوێندنەوەیە پەلکێش دەکات، ئەگەر تەماشای ئەو سێ خوێندنەوەیەی پێشوو بکەین، دەبینین هەر سێ خوێندنەوە، خوێندنەوەی سەلەفین و بەهیچ جۆرێک جیاوازیان لەنێوان بەدی ناکرێت چونکە یەک رێبازی فیکری بەرهەمی هێناون، خودی ئەو رێبازەش لێتوێژەران بە پێوانەکردنی (نادیار لەسەر دیار) ناوزەدیان کردووە. بەو مانایە هەمیشە (دیارێک) هەیە کە (نادیاری) پێ پێوانە دەکرێت، بەڵام ئایا دیار

ئەرستۆ

کامانەیە؟ بێگومان لە فیکری عەرەبیدا دیار هەمیشە سەربەرزییەکانی ژیانمانی لە خۆگرتووە، واتە هەمیشە لەسەر رابردوو داهاتوومان هەڵدەسەنگێنێ.

کەواتە هەرچەندە ئەو پێوانەیە بکەوێتە توێی ئایین- ناسیۆنالیەت- لیبرالیەت- چەپگەرێتی.. هەمیشە دیارێک هەیە، کە تەواوی بنەماکانی لەخۆدا هەڵگرتووە، ئەوەش هەرگیز مەرج نییە بکەوێتە میانی رێبازەکانەوە بەمجۆرە دیار وەک یەکەم شەقی پرسیاری (سەربەرزی ژیاری) خۆی دەنوێنێ، بەڵام ئاخۆ میکانیزمەتی ئەو پێوانەیە چییە؟(جابری) دەڵێت: ئەوەی راستی بێ پێوانەکردنی نادیار لەسەر دیار بەرێبازێکی زانستی دەژمێردرێت و زاناکانی زمانەوانی و فیۆلۆژی ئەو رێبازە بۆ کارە زانستییەکانی خۆیان بەکاردەهێنن بەڵام خودی ئەو پێوانەیە لە زانستی ئاخاوتن بەمەحاڵ دەکەوێتەوە، واتە ئەو دەلالەتانەی لەسەر دیار دەکەونەوە هەرگیز دروست نابن، بەڵام بڕیارەکانی ئەو پێوانەیە بە کۆمەڵێک بڕیاری شەرعی لە قەڵەم دەدات، کەواتە دەق لێرەدا (هێنانە ناوەوەی سوودو دوورکەوتنەوەیە لە زیان) هەر شتێکیش کاتێ لە توێی ئەو پێوانەیە دەچێتە دەرەوە بەجۆرێکی دیکە پاساو بۆ دیار دەهێنێتەوە، بۆ ئەوەی رێگەی نادیاری بۆ خۆش بکرێ، ئەگەر لەمیانی ئەو لادانەش خودی ناوەڕۆک گۆڕانی بەسەردا بێت، راستەوخۆ بەبارودۆخەکەیەوە بەندی دەکەن. بەمجۆرە ئەو

پێوانەیە لە میانی نائاگایی عەرەبی کاری پێدەکرێ، وەک گوتمان ئەگەر دووچاری تەگەرەیەکیش بێ، کۆمەڵێک پاساوی بۆ دەهێنێتەوە، کەواتە هەموو ونبوویێک بەنادیار دەژمێرێت، بەو مانایەش لەبەر ئەوەی داهاتوو ونبوویێکی گەورەیەو (رابردوو) تەنها زانراوێکە بۆیە هەموو ئەو گیروگرفتانەی لە داهاتوودا بەرەو روومان دەبێتەوە، دەشێ لە رابردووی زانراو چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە، یاخود پێوانەکانیان لەوێوە وەدەست دەهێنین. لێرەدا خودی ئەو پێوانەیە وەک بنەمایەکی (لۆژیکی/میتۆدی) زانستی عەرەبی ئیسلامی بەرێوە دەبات و شتە نوێیەکانی پێ پێوانە دەکرێت، دۆزینەوەی نوێش لەسەر ئەو بنەمایە دەکەوێتە سەر دۆزینەوەی کۆنەکان. بەمجۆرە تاکو ئێستا خودی ئەو پێوانەیە کردەیەکی بەرهەمهێنە لە عەقڵی عەرەبیدا و کاری پێدەکرێ، بەدیوەکەی تریشەوە کۆمەڵێک سلبیاتی لەخۆدا هەڵگرتووە لەوانەش رەتکردنەوەی زەمەن و پێشکەوتن، چونکە کاتێ دەڵێین ئێستا- لەسەر ئێستاکانی رابردوو دەپێورێ، هەروەک ئەوە وایە کە (رابردوو- ئێستا- داهاتوو) رایەخێکی درێژکراوەو بێ جوڵە بێ، وەک ئەوە وایە زەمەن راوەستابێ، هەر لە خودی ئەوەشەوە نامێژوویەتی فیکری عەرەبی بەدیار دەکەوێت. هەروەک هەندێ لە روناکبیرانی عەرەب لە رێگەی رابردوو ئێستای خۆرئاواوە بیر لە ئێستاو دوارۆژی نەتەوەی عەرەبی دەکەنەوە، بەوەرگرتنی زانست و تەکنۆلۆژیا بانگەشەی لیبرالیزمی هاوچەرخ دەکەن وەک بڵێی زانست و تەکنۆلۆژیا لە دەرەوەی مێژوودا هەبن. (4)

هەر چۆنێ بێ ئەوەی کە (جابری) تەئکیدی لێدەکاتە یەکلاکردنەوەی بابەتە لە خود، واتە هەرگیز ناتوانین بەهۆی (رابردوو)ی عەرەبی ئیسلامی بیر لە ئێستاو دوارۆژ بکەینەوە، یاخود بەمانایەکی دیکە هەرگیز ناتوانین لەناو کەلەپوردا لە ئایندەدا بژین بەمجۆرە پێویستە خودی ئەو پێوانەیە بخرێتە بەر رەخنەو بەدواداچوون و شیکردنەوە. کەواتە فیکری عەرەبی نوێ، فیکرێکە لە دەرەوەی مێژوو- لە دەرەوەی بابەت، بۆیە لێرەدا خوێندنەوەی کەلەپور خوێندنەوەیەکە لە دووتوێی سەلەفیەتەوەو هەمیشە بەچاوی رێزو ستایشەوە سەیری کەلەپور دەکرێت. ئەوەش هەر تەنها شەپۆڵەکانی ئایینی ناگرێتەوە، بەڵکو تەواوی شەپۆڵەکانی دیکەش دەخاتە خۆیەوە، بەمجۆرە عەرەب پرۆژەی رێنیسانس ئیسلامی بێ، لە رابردووەوە وەردەگرێ، جاچ رابردووی عەرەبی یاخود رابردوو- ئێستای خۆرئاوا، چ ئەزموونی روسی بێ، یان چینی. واتە چالاکی فیکری لای عەرەب، هەمیشە بۆ (ئێستا و داهاتوو)ی خۆی لەچارەی ئامادە دەگەرێت. واتە هەمیشە هەوڵ دەدات گونجانێ لە نێوان (رابردوو- ئاینده) دروست بکات، جاچ رابردووی عەرەبی ئیسلامی بێ، کە وێنە هەرە دیاردەکەی لە کەلەپوردایە، ئایندەی عەرەبیش کە وێنە هەرە دیاردەکەی لە زانست و تەکنیکی دەزگاکانی خۆرئاوادا خۆی دەنوێنێ، لێرەدا هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە کە خاڵی گونجان، مێژوو رادەگرێ و پەرەسەندن دەسڕێتەوە، خاڵی گونجان خودو بابەت تێکەڵ یەک دەکات.

پرسیاری مەعریفی لە کەلەپور، پرسیاری نەوەستانە، داگرتنی کەلەپورە لە مەیدانی (عەقڵ) ەوە بۆ مەیدانی واقیع لە وێناکردنی نموونەییەوە بۆ پەرەسەندنی مێژوویی، یەکەم هەنگاوی ئەو رێگەیەش بریتییە لەسەر لە نوێ خوێندنەوەی ئەو کەلەپورەو هەڵسەنگاندنی لەبەر تیشکی واقیعی بەرهەم هاتوو، مەسەلەکە ئەوە نییە کام هەوڵ بۆ خوێندنەوە دەگونجێ تاکو هەڵیبژێرین، یاخود کام میتۆدی ئامادە بەکاربهێنین، بەڵکو وەک گوتمان پشکنینی ئەو عەقڵەیە کە دەیەوێت خوێندنەوە ئەنجام بدات، مەسەلەی سەرەکی رەخنە گرتنە لەو عەقڵە نەک بەکارهێنانی بەو رێگەیە یان رێگەیەکی دیکە. عەقڵی عەرەبی لە پێکهاتەکانیدا کۆمەڵێک رەگەز بەشداری تیا دەکەن لەسەرووشیانەوە پروسیسەکردنی تیۆری- پرۆسیسەکردنی میتۆدی کە سینتاکسی- فیۆلۆژی- ئاخاوتنی لەخۆ دەگرێت.

ئەوانەش لە (سەدەی دارماندا) شێوازێک بوون بۆ پێوانەکردنی (نادیار لەسەر دیار) بێ ئەوەی مەرجەکانی پێوانەی زانستی پەیرەو بکەن. بەمجۆرە خودی ئەو پێوانەیە بەشێوەیەکی میکانیکی وەک پێوانەیەکی نەگۆڕ بۆ عەقڵی عەرەبی خۆی خستەروو- بێ ئەوەی بڕوای بەپەرەسەندنی زەمەن هەبێت. لێرەدا (جابری) پێی وایە بانگەشەکردنی نوێکردنەوە لە فیکری عەرەبیدا قسەیەکی بۆشە هیچ دەرەنجامێک لەخۆ ناگرێت، بۆیە پێش هەموو شتێ پێویستە بونیادی

پرسیاری مەعریفی لە کەلەپور، پرسیاری نەوەستانە، داگرتنی کەلەپورە لە مەیدانی (عەقڵ) ەوە بۆ مەیدانی واقیع لە وێناکردنی نموونەییەوە بۆ پەرەسەندنی مێژوویی، یەکەم هەنگاوی ئەو رێگەیەش بریتییە لەسەر لە نوێ خوێندنەوەی ئەو کەلەپورەو هەڵسەنگاندنی لەبەر تیشکی واقیعی بەرهەم هاتوو

ئەو عەقڵە لادەرەی کە لە سەدەی (دارمان )هاتە نێو عەقڵی عەرەبی، هەڵبوەشێنینەوە بیپشکنین و بەشێوەیەکی زۆر ورد بیخەنە بەر لێکۆڵینەوەو رەخنەوە، دەشێ ئەو بەدواداچوونەش لە رێگەی پێــوانەی ناوبراوەوە بە ئەنجـام بگەیەنین، بەڵام بەشێوەیەکی تێروتەسەل، (جابری) هەوڵدەدات بلێ کـۆمـەڵگا پێـویسـتی بە پەرەسـەندن و پێـشکەوتنەوە هەیە، بەڵام تەنهـا بەناوەوەو لە هەناوی خـۆیدا پەرەدەسـێنێ و پێـشـدەکـەوێ، پێویسـتی بەکەلتوری نوێ هەیە، بەڵام نەک بەو مـانایەی کەوەک شتومەک لە دەرەوە بیهێنین لە ئامێری رۆشنبیریی کۆن بەموتوربەکردنی بکەین، بەڵکو دەبێ لەگەڵ رۆشنبیری هاوچەرخ گەشەی پێبـدەین و مـامـەڵەی لەتەکدا بکەین، رەخنەی لێبگرین و بیخوێنینەوە.

کەواتە (تازەکردنەوەی عـەقڵی عـەرەبی) لەو بۆچوونەوە واتە تازەکاری، دابڕینی مەعریفیانەی تەواوە لەگەڵ بونیادی عەقڵی عەرەبی لە سەدەی دارماندا، بەڵام ئایا دابڕینی مەعریفیانە مانای چییە؟ لێرەدا دابڕینی مەعریفیانە بەهیچ جۆرێ بابەتی مەعـریفی ناگرێتەوە، واتە پەیوەندی بەو دیدە داشۆراوەوە نییە کە پێیوایە دەبێ کەلەپور بخـرێتـە مـۆزەخانەوە، یاخـود لە شـوێنێ لەنێـو مێژوودا جێبهێڵرێ، رەتکردنەوەی کەلەپور بەم شێوە میکانیکییە، نەهەڵوێستێکی زانستییە، نەمـێـژوویی، دەشێ خـودی ئەو هەڵوێسـتـە لە رەواسبی- فیکری کەلەپور لە سەدەی دارماندا بگرێتەوە، بەڵام نەک تەواوی کەلەپور.

بەو مـانایەش لێرەدا دابڕینی مەعریفی کردەی عەقڵی لەخۆ ناگرێت کردەیەکی باشلاریانە نییە واتە ئێـمـە دابڕین بەو مـانا زمـانەوانیـیـەوە وەرناگرین بەڵکو دەمانەوێت بڵێین واز هێنانە لە تێگەیشـتنی کـەلەپور بەهۆی کـەلەپورەوە، واتە رزگـاربوونە لە رەواسـبەکـانی کـەلەپور تاکـو لە دەرەوەی ئەو رەواسـبـانەوە چەمکێکی دیکە بۆ کــــەلەپور بســــازێنین. لەســــەرووی ئەو رەواسبانەشەوە چەمکی پێوانەی سینتاکسی و فــیــۆلۆژی و ئاخــاوتن، لە مــیکانیــزمــە ناکــردەییــەکــانی خــۆیاندا هەڵدەستێ بە بەسـتنەوەیەکی مـیکانیکیـانەی بەشـێک بە بەشـــــێکی دیکەوە، یاخـــــود هەڵدەستێ بەهەڵوەشانەوەی گشت و دابڕینی بەشەکانی لە چوارچێوەی زەمەن- مـەعـریفە- ئایدیۆلۆژیا-دا دابڕینی بەشەکـان لە گشت و گـواستنەوەیان بۆ

گشـتـێکی دیکە بێ ئەوەی بابەت و خـود بێنە ناوەوە، راستەوخۆ دەلالەت لە شێوانی بابەت و تێـوەگـلانێکی نائاگـاییـانەی خـود دەکـات، لە زۆربەی کـاتیـشـدا هەردووکـیـان پێکەوە روو دەدەن، لێرەدا کـاتێ (بابەت) خودی کـەلەپورە، لەم حاڵەتەدا دەرەنجام دەبێتـە تێکەڵبوونی خود لەگـەڵ کـەلەپوردا. تێکەڵ بوونی خـود لەگـەڵ کەلەپور شتێکەو تێکەڵبـوونی کەلەپور لەگەڵ خود شتێکی ترە، کە کەلەپور لە خۆمان دەگرێ شـتـێکەو کـە ئێـمـە کـەلەپور لە خـۆ دەگـرین شتێکی ترە، لێرەدا ئەو دابڕانەی باسمـان کرد دابڕان نییە لەگەڵ کەلەپور، بەڵکو دابڕانە لەگەڵ جۆرێک لە پەیوەندییەکان لەگەڵ کەلەپوردا، ئەو دابڕانەیە کـە لە بوونەوەرێکی کـەلەپوری بەرەو بوونەوەرێکمـان دەبات کـە خـاوەن کـەلەپورە، یاخود بەرەو کەسێتییەکمان دەبات کە کەلەپور یەکێک لە بنەرەتیەکانی دروست دەکـات، ئەو بنەرەتیـەی نێـوانیـان لە تەواوی کـەسـێـتـیـدا، دەلالەت لە کەسێتی گەل دەکات، ئەو گەلەی کە خاوەن کەلەپورە، بەو مانایە کەلەپور بریتییە لە ویژدانی نەتـەوە- ئەو ئاوێنەیە کـــە نەتەوە بەدیهێنانی مومکینەکانی تیا دەبینێ.

لێرەدا گـیروگرفـتی مـیـتـۆد ئەوە نییە کە ئەو مـیـتـۆدی هەڵـمـانبـژاردووە مـێـژووییـە، یان بونیادگەرییە.. رەنگە لە مەیدانێک ئەو میتۆدە بگات، بەڵام لە مەیدانێکی دیکە هەمان میتۆد نەگـات. کـەواتە کـاتێـک رووبەرووی بابەتێک دەبینەوە کـە خـۆی وەک بەشـێک لە خـودو خـود وەک بەشـێک لەو دەنوێنێ بۆ نموونە: کـەلەپور، لێرەدا گـیـروگرفـتێکە بەمـیـتۆدەوە بەند نابێ، بەڵـکو بە ئامــرازەوە بەندە، ئەو ئامــرازەی کــە خـۆی لە دابڕینی خـود لە بابەت و بابەت لە خــوددا دەبینێـتــەوە، بۆ ئەوەی لەم دابڕانە شێوەیەکی دیکەی پەیوەندی دابمەزرێنێ. کەواتە گیروگرفتی میتۆد لێرەدا راستەوخۆ گیروگرفتی بابەتگەرییە. واتە ئایا چۆن بۆ خۆمان دەتوانین تێگەیشـتـنێکی بابەتیـیــانە بۆ کــەلەپور بسـازێنین؟ (جابری) پێـیـوایە مـەسـەلەکە هەر تەنهـا بەبابەتەوە پەیوەست نیـیـە، واتە هەر تەنهـا ئەوە نییە کە خود نەچێتـە ناو بابەت (چەمکی خود لێرەدا ئارەزوو مەیل دەگەیەنێت) بەڵکو دەشێ ئەو مـەسـەلەیە لە دوو ئاسـتـدا بخرێتە روو:-

**- ئەو ئاسـتـەی کـە خـود بۆ بابەت دەچێ،**

**کەواتە هەموو ونبوونێک بەئاگادیار دەژمێرێت، بەو مانایەش لەبەر ئەوەی داهاتوو ونبوونێکی گەورەیەو (رابردوو) تەنها زانراوێکە بۆیە هەموو ئەو گیروگرفتانەی لە داهاتوودا بەرەو روومان دەبێتەوە، دەشێ لە رابردووی زانراو چارەسەریان بۆ بدۆزینەوە**

**بابەتیگەری لێرەدا واتە دابڕینی بابەت لەخود.**

**- ئەو ئاستەی کە بابەت بۆ خود دەچێ، واتە دابڕینی خود لە بابەت، هەروەها جێ بەجێ کردنی بە ئاستی دووەمەوە بەندە.**

پرسیار (جابری) لێرەدا ئەوەیە کە ئایا لە خوێندنەوەی کەلەپوردا، بۆ خود لە بابەت دادەبڕین؟ دەشێ بڵێین چونکە خوێنەر لە توێی کەلەپوردا چوارچێوەی بۆ دارێژراوە، واتە کەلەپور ئەوی لەخۆ گرتووەو تەواوی سەربەستی و ئازادی لێ سەندۆتەوە، یاخود بەمانایەکی دیکە ئەو لە ناو کەلەپوردا سەربەستی و ئازادی خۆی لەدەست داوە. لێرەدا بەیەکگەیشتنی خوێنەری عەرەبی لەگەڵ کەلەپوردا لەساتەوەختی لە دایکبوونەوە دەست پێدەکات و هەر لەوێشەوە دەکەوێتە نێو وشەو چەمکەوە، وەک زمان و بیرکردنەوە، وەک چیرۆک و ئەفسانەو خەیاڵ، بێ ئەوەی تۆزقاڵێ روحی رەخنەی تیا چەکەرە بکات، بێ ئەوەی هەرگیز رۆحی رەخنەی تیا دروست بێت، ئالێرەدایە کە نیشانەی بنەڕەتی لە هەموو ئەو شتانەدا بریتییە لە بونیادنانی ئێستاو داهاتوو لەسەر بنچینەی ئەو شتانەی کە لەرابردوودا بەدی هاتوون.

کەواتە کاتێ خوێنەری عەرەبی بیردەکاتەوە، ئەوا راستەوخۆ بەهۆی کەلەپورەوە بیردەکاتەوە، واتە روئیا لەو وەردەگرێ و ئەو سەرپەرشتی بیرکردنەوەی دەکات، بەمجۆرە هەرگیز بیرکردنەوە ناچێتە دووتوێی کردەی چالاکانەی عەقڵ، بەڵکو راستەوخۆ دەلالەت لە بیرهێنانەوەی دەکات، واتە کاتێ خوێنەری عەرەبی دەقێک لە دەقەکانی کەلەپور دەخوێنێتەوە، بە وەبیرهێنانەوە دەیخوێنێتەوە، نەک بەوەی کە کەشفی شتێکی تر بکات، یاخود کەشفی چەمکێکی دیکە بکات، راستە هەموو گەلێک بیر لە کەلەپوری خۆی دەکاتەوە، بەڵام جیاوازی گەورە لەوەدایە کە گەلێ بیر لە کەلەپور دەکاتەوەو درێژی دەکاتەوە بۆ ئێستای خۆی و یاخود ئێستای بەشێک دەبێ لەو کەلەپورە تازەیەو بەردەوام پێیدا دەچێتەوەو لە مەیدانی واقیعدا رەخنەی لێ دەگرێ. لەگەڵ ئەو گەلەی کە لە مەیدانی عەقڵی کەلەپوردا یاخود بەکەلەپورێ بیر دەکاتەوە کە لەگەشەسەندن وەستاوە، کەلەپورێ کە لەئێستا دابڕاوە، واتە کەلەپور داناگیرێتە نێو واقیع،بەڵکو هەر لە وێناکردنە نموونەییەکەی خۆیدا سەیری دەکات، بێ ئەوەی پیرۆزییەکەی بشێوێنێ و دەستی بۆ بەرێت. بەڵام کاتێ خوێنەر دەیەوێت لە دووتوێی کەلەپوردا هیواو ئاواتەکانی خۆی ببینێ، کاتێ دەیەوێت زانست و عەقلانیەت و پێشکەوتن و هەموو ئەو شتانەی کە لە ئیستای ئەو ونە چ لە ئاستی واقیع، چ لە ئاستی خەون بەرجەستەی بکات، راستەوخۆ لەکاتی خوێندنەوەدا پێش وشەکان دەکەوێت، تاکو ئەو مانایانە بدۆزیتەوە کە پێویستی پێ هەیە، بۆیە شتێ دەخوێنێتەوەو چەندان پشت گوێ دەخات.

یەکێتی دەق تێکدەشکێنێ و دەلالەتەکانی خواردەکاتەوەو لەبوارە مەعریفیە مێژووییەکەی دەردەچێ. مەبەستمان ئەوەیە بڵێین خوێنەری عەرەبی لەژێر پاڵەپەستۆو بێداویستیەکانی سەردەمدا دەژی و سەردەمیش بەردەوام لەو رادەکات. واتە تا زێتر بەرەو تەئکیدکردنی خود بچێ، زێتر بەرەو چارەسەرکردنی سیحری گیروگرفتەکان دەچێ. بۆیە هەرچەندە کەلەپور لە خۆی بگرێ، ئەو هەوڵدەدات خۆی لەگەڵیدا بگونجێنێ تا بەشێوەیەک بتوانێ ئەو بەخششانە بخوێنێتەوە، کە نەیتوانیوە بیانخوێنێتەوە، واتە ئەو بەر لەوەی دەق وەک خۆی بخوێنێتەوە، گیروگرفتەکانی دەخوێنێتەوە لەم ئاستەدا دەبینین خوێنەری عەردبی هەمیشە بە ئێستا بارگرانە و لەژێر ئێستادا دەناڵێ. کەواتە لێرەدا دابڕینی خود لە کەلەپور وەک پرۆسەیەکی پێویست خۆی دەنوێنێ، یەکەم رێگایەکە بەرەو بابەتێتیمان دەبات، میتۆدی زانستی زمانەوانی نوێ پێمان دەڵێ کە مامەڵەیەکی بابەتیانە لەگەڵ دەقدا بکەین، کورتکردنەوەی رێسا زێڕینەکەی ئەو مامەڵەیەش ئەوەیە کە: بەر لەوەی خوێندنەوە بۆ مانا بسازێنین، زاراوە بخوێنینەوە، زاراوە وەک رەگەزو تۆڕی پەیوەندییەکان، نەک وەک دەستەواژەیەکی سەربەخۆ، پێویستە لەو چەمکانە رزگار بین کە کاتی خۆی بۆ کەلەپور دامەزراوە، یان لەو ئارەزوانە رزگار بین کە ئێستا خەریکە دامەزرێ، پێویستە هەموو پێشینەو ئارەزووەکان بخەینە دووتوێی کەوانەوە، بۆ ئەوەی مانای دەق لە خودی دەق و و پەیوەندی بەشەکانەوە بخەینەروو، بەمانایەکی دیکە ئازادکردنی خود لە هەژموونی دەقی کەلەپور، داوا دەکات کە. دەقی کەلەپور کردارێکی توێکارانەی بۆ ئەنجام بدرێ.. کە بەراستی ببێتە بابەتی خودو مادەی خوێندنەوە، بەو مانایەش خود دەتوانێ سەربەخۆیی و کەسێتی خۆی بپارێزی.

(جابری) لە سێ پرۆسەدا قسە لەم مەسەلەیەدا دەکات:

**1- چارسەری بونیادگەریانە:** بەکورتی مەسەلەکە لە بنەڕەتدا بە تەوەری فیکری خاوەن دەق و ئیشکالیەتەکانەوە بەندە، ئەو فیکرەی کە دەتوانێ هەموو ئاڵوگۆڕییەکان وەرگرێ و لە توێی دەقدا بۆ هەموو بزاڤ و گواستنەوەکانی گشتی دەق پاساو بهێنێتەوە.

**2- شیکردنەوەی مێژوویی:** ئەو مەسەلەیان بەدووبارە دارشتنەوەی فیکری خاوەن دەقەوە بەندە، بەهەموو رەهەندە رۆشنبیری و ئایدیۆلۆژی و سیاسی و کۆمەلایەتیەکانیەوە، خودی ئەو پەیوەست بوونە پێویستە، نەک لەبەر ئەوەی دەتوانین لەمیانی ئەوەوە لە چەمکی مێژووی فیکری دراسەکراو دەگەین، بەڵکو بۆ هەڵبژاردنی دروستی نموونە

(بونیادەگەری) یە. مەبەستمان لە دروستی زاستگۆیی لۆژێکی نییە یان دژبوونەوە، چونکە هەموو ئەوانە دەشێ لە چارەسەرکردنی بونیادگەرییانە کارێ پێ بکەین، بەڵکو مەبەستمان ئیمکانیەتی مێژوویە ئەو ئیمکانیەتە کە لەنێواندایەو دەکرێ دەق لەخۆبگرێ ئەگەر نەتوانێ لەخۆی بگرێ، لێرەدا دەچینە سەر ئەو ئیمکانیەتەی کە دەگوترێ، بەڵام هەمیشەوسبەی لێدەکرێ.

**3- دەربڕینی ئایدیۆلۆژی:** بێگومان شیکردنەوەی مێژوویی بە شێوەیەکی رووت تەواو نییە تاکو تەرحی ئایدیۆلۆژی بەفریای نەگات، یاخود تاکو کەشف کردنی وەزیفەی ئایدیۆلۆژی (کۆمەڵایەتی- سیاسی) ماناکانی خۆی نەخاتە روو، کەواتە لێرەدا کەوانەکانی بونیادگەری دەکەینەوە بۆ ئەوەی بۆ ماناکان بگەڕێنینەوە.

لێرەدا دابڕینی کەلەپور لە خۆمان، بۆ ئەوە نییە کە وەک فەیلەسوف لێی ورد ببینەوە، بەڵکو بەو مانایە لە خۆمانی دادەبڕین تاکو بەشێوەیەکی نوێ و لە توێی وێنەیەکی نوێدا پەیوەندی پێوە بکەینەوە، بەڵام پرسیاری سەرەکی ردنگە ئەوەبێ ئاخۆ چۆن ئەو پەیوەندییە دەسازێنین.. واتە چۆن خوێنەر بە خوێندراوە دەگات، چۆن بەردەوام دەبێت؟

بێگومان کەلەپور هەر تەنها بەرهەمێکی مێژوویی نییە، هەر تەنها بەرهەمێک نییە مێژوو- کۆمەڵگا دروستی کردبێت، بەڵکو بەخششێکی خودی مرۆڤایەتیشە، بەڵام بێگومان ئەو بەخششە راستەوخۆ نەهاتۆتە ناوەوە، چونکە زۆرجار ئەو بەخششە فەردییانە، ئەو بەخششە ئازادو یاخییانە رێگای هاتنە ناوەوەیان لێدەگیرێ و دەکەونە پشت چوارچێوەکانی فیکرو رێگاکانی تەعبیرکردنەوە، یاخود لە پشت زمانەوە دەمێننەوە، جا بۆ ئەوەی بەو بەخششانە بگەن، دەبێ سنورەکانی فیکرو زمان ببڕین، ئەو سنور بڕینەش هەر تەنها بەروونبینی (حدس) دەبێ، هەر ئەو پێشبینی کردنەیە وادەکات خودی خوێنەر بەخوێندراوە بگات و لەگەڵ ئیشکالیەتەکانیدا بژی و درەوشانەوەیان بگرێ. بەمجۆرە خودی خوێنەر لەنێو خوێندنەوەدا دەتوانێ خۆی بخوێنێتەوە، بێ ئەوەی گیانی خۆی لەدەست بدات. هەروەها مەبەستمان لە (حدس) نزیکە لە مانا سۆفییەکەی و راستەوخۆ بەکەشف کردنەوە بەندەو رێگاکان دەخاتەروو، پێش دەرەنجامەکانی خودی خوێنەرو خودی خوێنراوە دەکەوێت، واتە کەشفی نەگوتراوەکان دەکات، نەک بەو مانایەی کە ردفزی لۆژیکە، بەڵکو کورتکردنەوەی دەرەنجامەکانی لۆژیکییەت دەنوێنێ. لەسەرتادا گوتمان هەموو میتۆدێ بە روئیاوە بەندە جا چ ئاشکرا بێ، چ بکەوێتە توێی ناوەڕۆکەوە، دەشێ بڵێین هەمیشە روئیا میتۆد دەکاتە ناوەڕۆکی خۆی و سنوری بۆ دادەڕێژێ، میتۆدش بەروئیاوە دەوڵەمەندە. بۆ ئەوەی باشتر لە روئیا بگەین هەوڵ دەدەین بەکورتی رەگەزەکانی روئیا بخەینەروو:-

**یەکێتی بیر.. یەکێتی ئیشکالیەتەکان**

کاتێ لە فیکری تیۆری کۆمەڵێکی دیاریکراو و سەدەیەکی دیاریکراو دەدوێین، یەکێتییەکی نموونەیی و تایبەت دروست دەکەین، کە هەموو رێبازەکانی تیادا دەتوێتەوە بەومانایەش حەقیقەت وەک گشت سەیر دەکرێ، نەک وەک بەش- بەشەکانیش جگە لە تەعبیرکردنی لایەنێکی ئەو گشتە شتێکی دیکە نیین. بەمجۆرە لە هەموو جۆرەکانی فیکر دەدوێین وەک گشتێک بەتەنها، تەنها بۆ خۆی کە دەشێ بەشێوەی (گشت) دراسەی بکەین، بەڵام ئایا کێ ئەو گشتە دادەمەزرێنێ؟ کاتێک لە یەکێتی بیر دەدوێین، مەبەستمان یەکێتی بیریاران نییە، یان یەکێتی ناسیۆنالیزمی و ئایینی و زمانەوانی، یەکێتی بابەتیانە، یان یەکێتی شوێنکات نییە، بەڵکو یەکێتی ئیشکالیەتەکانە. رەنگە ئەو بابەتانەی کە بیریاران پێیەوە پابەندن، یەک بابەت بێ، یان جیاوازبێ، رەنگە دەرەنجامەکانیان یەک بێ، یان لێکنزیک بێ جیاواز بێ... هەموو ئەوانە لەگەڵ جیاوازی و تەباییان گرنگ نییە، چونکە ئەوانە یەکێتی فیکر دانامەزرێنن، بەڵکو ئەوەی یەکێتی فیکر دادەمەزرێنێ، یەکێتی ئیشکالیەتەکانی ئەو فیکرەیە. ئیشکالیەتیش سیستەمێکە لە پەیوەندی لە ناوەوەی فیکرێکی دیاریکراودا، کۆمەڵێک گیروگرفتی جۆراوجۆری هاوبەندن، کە هەریەک بەتەنها ئیمکانیەتی حەل بوونیان هەیەو لەگەڵ یەک دەگونجێن، بەڵام لە بەشە تیۆریەکەدا حەل کردنیان گونجاو نییە، تەنها لە چوارچێوەی حەلی گشتیدا نەبێت کە هەموویان دەگرێتەوە.

واتە وەرگرتنی تەنها گیروگرفتێک، دەبێتە هۆی شێوانی ئەوانیتریش بەمجۆرە گرینگی گیروگرفتێک لەنێو ئیشکالیەتەکاندا تەنها هەر خۆی نییە، بەڵکو هەریەکەیان بەشداره لە چارەسەرکردن، بۆ نموونە چارەسەرکردنی گیروگرفتی (ژن )لەنێو ئیشکالیەتی رێنیسانسی عەرەبیدا، هەر تەنها ژن وەک کیانێکی دابڕاو ناگرێتەوە، بەڵکو ژن وەک رەگەزێک لەنێو رینیسانسدا ئازادکردنی گیروگرفتێکە لەنێو گیروگرفتەکاندا، لێرەدا کاتێ گیروگرفتی ژن وەردەگرین بەناچاری دەکەوینە نێو گیروگرفتی پەروەردەکردن و دیموکراسیەت و گیروگرفتی داب و نەریت و زمان.. یان بەجۆرێکی دیکە تەواوی ئیمکانیەتەکانی رینیسانس لێرەدا کۆ دەبێتەوە، هەر بەو مانایە یەکێتی بیر واتە یەکێتی ئیشکالیەتەکان، لەلایەکی دیکەش بیرو باوەڕی جۆراوجۆر مەرج نییە ئیشکالیەتەکان، جۆراوجۆر بخاتەوە، دەشێ لەیەک ئیشکالیەتدا کۆمەڵێک بیروڕای جیاواز هەبێت، لەلایەکی دیکەش ئیشکالیەت بەشوێنکاتەوە بەند نییە، بەڵکو بەکراوەیی دەمێنێتەوە.



# دەمامکەکانی نوسین

٢-٢

نیهاد جامی

**خۆکوشتن و یادەوەریی شوێن**

یادەوەریی چیە!؟ پەیوەندیی ئێمە بە یادەوەریەوە چیە!؟ ئایا زەمەنی خۆکوشتن بەسە بۆ ئەوەی گومان لەزەمەنی یادەوەریی بکەیت بەوەی ئێمە خاوەن مێژوویەکین کە گوتاریی شکست بەرهەم دێنێت!؟ بۆ وەڵامێ ئەو پرسیارانە پێویستە قسە لەو شوێنە بکەین کە هەڵگری یادەوەرییە کە بە خۆکوشتن کۆتایی دێنێ بۆیە شوێن و ناونیشانی دەق دەبێت بە رووبەرێک بۆ خۆ کوشتن، بەواتای نووسین لەناو چیرۆکی (ئە وژوورەی هاورێکەم خۆی تیاکوشت)ی سیامەند هادی، پەیوەندیی دەقە بەیادەوەرییەوە، یادەوەریەک خۆکوشتن چڕ دەکاتەوە لەناو ژووردا، ئێمە لەناو دەقێکداین کە لەدوای سێ ڕۆژ لە پرۆسەیەکی خۆ کوشتن و زمان لە ڕێگەی نووسەرەوە دەچێتە ئەو ژوورەوە تاوەکو کەلوپەلەکانی کۆ بکاتەوە، ئەوەش کۆکردنەوەی یادەوەرییە لە ڕێی دەرکردنی لە شوێن و زیندووکردنەوەی لەناو رووبەرێکی تر کە رووبەرووی نووسراوە، رووبەرێک نووسین دەیباتە گۆرستان، بەوەش دەق لەفەزای شوێن دەیگوازێتەوە نێو فەزای نووسین، نووسین لەو فەزا نوێیەدا رووبەرووی چەمکێکی خوێندنەوەمان دەکاتەوە و بۆ تێگەیشتن لە یادەوەریی، ئەویش چەمکی شوێنە لەناو نووسین، بۆیە هەوڵ دەدەین لە ڕێگەی (ئەنترۆپۆلۆژیای شوێن)ەوە چیرۆکەکە بخوێنینەوە، دیارە کاتێ خۆ کوشتن دەبەستینەوە بەو یادەوەرییەی کە ئەنترۆپۆلۆژیای شوێن توانای هەیە دەلالەتە شاراوەکانی نووسینمان بۆ کەشف بکات، مانای وایە خۆکوشتن پەیوەندیی بە ژیارەوە هەیە، چونکە لە رووی ئەنترۆپۆلۆژییەوە شوێن، پەیوەستە بەژیارەوە، بەواتای پەیوەندیی هەیە بەو ژیارەی کۆمەڵگا کە شار یەکێکە لەو خەسڵەتە ژیاریەی مرۆڤ نائومێددەکات، هەر ئەویشە ئەو بڕیارەی پێ دەدات لەناو جوگرافیای یادەوەریی کە شوێنە، ئەو شوێنەی رووبەرووی ژیاردەبێتەوە، شوێنێکە یادەوەریی دەیگوازێتەوە شوێنێکی فراوانتر کە (شار)ە، شاریش دەیگوازێتەوە (ژوور)، بەوەی لەو شوێنە فەزایەش بۆ خۆ کوشتن تەرخان بکات، کە مردن بگەیەنێتە چلەپۆپە، مردنێک تەنیا بەوەستانی جولەی فیسیۆلۆژیی دانی پیادا دەنرێت، ئەویش ساتەوەختێکە جەستە لەنا شوێن دەردەکرێت، و ڕێگەی مانەوەی نادەن لەو شوێنەدا، بەڵکو جەستە دەبێ بەرەو شوێنێکی تر ببرێت کە فەزایەکی تاریکە، ئەو شوێنەی دوای مردنی دەبێ بەگۆڕی جەستە، شوێنێکە سرووتە کۆمەڵایەتیەکان دەلالەتی جیاوازی پێدەبەخشن «هەندێ جار مردوو بەشێوەیەکی فراوانتر دەنێژرێت و، بەدانانی لەسەر شاخێک، یان فرێدانی بۆ نێو دەریا، یان سووتاندنی تەرمەکە هەستێکی فراوان و بڵاو لە هەموو جارێکیا دەوەریدا بە دووی تەرمەکەدا دەڕوات، بەڵام لێرە بەشێوەیەکی جێگیر یادەوەریی بۆ مردوو لە چاڵێکی تەسکدا هەڵدەگیرێت» ئەوەش گواستنەوەی یادەوەرییە لە (شوێنی یەکەم- ژوور) بۆ (شوێنی دووەم- گۆڕستان). بەواتای ژوور شوێنێکە ئارام... هەستکردنی مرۆڤە تیایدا بۆ دڵنەوایی، بەڵام ئەو ژوورە دەبێتە ئەو شوێنەی کە (پۆل ئیلوار) بە (جوگرافیای خەمناکی سنوری مرۆڤایەتی) ناویدەبات، چونکە ئەو شوێنە جوگرافیای یادەوەرییەکە کلتورێکە لەشکست، هەر ئەو شکست و تاریکییە شەوا وادەکات ئارامی شوێن بگۆڕدرێت بە

جوگرافیایەکی خەمناک، ئەوەش خۆ کوشتنە بە یادەوەریی، بەوەی هەموو ئەوانەی لە شوێندا ئامادەگیان هەیە، بۆ خۆیان دەبنە بەشێک لەناو پرۆسەی خۆکوشتن، بۆیە (چەقۆ) چەندە هەڵدەستێ بە پرۆسەی خۆکوشتن، بەڵام ماتریالێکی نێو یادەوەرییە، ئەویش بەشێکە لەو کلتورەی یادەوەریی کە توانای دواندنی ئەو کلتورەی هەیە بۆ گۆڕان، بۆیە ئەو پرۆسەیە ساتەوەختی نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو مەترسیەی نووسەر لەتیژی چەقۆ، بەڵام دەنگی هاوڕێکەی لەناو یادەوەریی بەوە وەڵامی دەداتەوە «چەقۆیەک بە باشی گۆشت نەبڕێت چەقۆ نییە» چەقۆ ئەو ئاماژەیەی کە دایک فڕێی دەداتە ناو کەلوپەلەکانی کوڕەکەی، بێئاگا لەوەی کە نووسەر مەبەستیەتی ئەو چەقۆیە بکاتە میکانیزمی ئیشکردنی بۆ خۆکوشتنی هاوڕێکەی، بۆیە چەقۆ خزاندنە ناو کەلوپەلەکان بۆ ئەوەیە پێمان بڵێ کە ئەویش بەشێکە لە کلتور، زەمان کاتێ لە ڕێگەی دایکەوە چەقۆیەکی بۆ ئامادە دەکات، دەیەوێ ئامرازێک بدۆزێتەوە، تا سەر لەبەری نووسینی بۆ نێو فەزایەک ببات کە توانای دروستکردنی هەبێت، هەر ئەو (چەقۆ)یەشە دەبێتە هۆی ئاونانی دەق، کە دەق دەیەوێ خۆ کوشتن بکاتە گۆڕانێک لە ئاستی شوێن بەوەی بتوانێ شوێنی یەکەم ئەو شوێنەی جوگرافیایەکی گەردوونی هەیە بیگۆڕێت بۆ شوێنێک کە ئارامیی تیانییە، بەڵکو پێکهاتەیەکە لە تەنیایی و تاریکی، چونکە ئەو لەناخدا ئەو کەسەیە کە پێویستی بە شوێنێکی لەم چەشنە هەیە، ئەوێک کە هەست بە ئارامیی ناکات، ئیدیی چی لە شوێنی ئارام داوە.

مردن ئەو پێشبینییە بۆ تەنیایی و دڵەڕاوکەیەک دروست دەکات بۆ ئەوەی خۆمانی بۆ ئامادە بکەین، بۆیە جۆرێک لە بێهودەیی دەخولقێنێ، کە دەبێتە کو شتنی ژیان، کوشتنێک شایەنی ئەوەیە مرۆڤ خۆی دەست پێشخەریی تیا بکات، «دەبوایە مرۆڤ ئەیزانییایە کە دەمرێت، چونکە تۆ کاتێک بزانیت کە هەر دەمرێت، ئیدیی تاکو زووتر بمرێت پەتی خەیاڵی ئەو ترس و نائومێدییە کورتتر دەبێتەوە» ، خوێندنەوەمان بۆ شوێن تێگەیشتنە لە دەلالەتەکانی مردن، بۆیە ئێمە شوێن بەدوو جۆر دەبینین، واتە ژوور لە (پێش خۆ کوشتن) و (دوای خۆکوشتن)، پێش خۆکوشتن شوێن بریتییە لەو «ژووردی کە چوارچێوەیەکی سیخناخ بوو لە بیرەوەریی و، بوخچەیەکی شەتەک دراو بوو لە پەیڤ و ڕوانین» بەواتای شوێنێکە هەڵگریی ئاخاوتنەکانمانە بە (زەوی، پەنجە، دەرگا، دیواری شووشەیی» ئەوەش چیرۆکی هەستکردنمانە بەتەنیایی، کە ئەگەر شوێن زەمەنی یادەوەریی بخولقێنێ، ئەوا خولقاندنی هەموو یادەوەرییەک لە دەرەوەی شوێن و لەناو شوێنێکی تر کە ئێمە تیایدا ئامادەنیین، بەشێکە لە بێمانایییەک کە دەیپارێزین، داکۆکی کردن لەو کلتورەی بەبێ بەشداریی کردنمان هەوڵی گەڕانەوەی دەدەین بۆ نێو ئەو زەمەنەی ئێستامان فاکتەرێکی ترە بۆ خۆکوشتن «ئێمە یادی ڕووداو کارێکی گەورە دەکەینەوە لە ڕابردوودا کە ئێمە نەمانکردووە، هەر بۆیە خۆ هەڵکێشان بەشێکەوە کە تۆ نەتکردبێت هیچ مانایەکی نابێت» قسەکردن لەو یادەوەرییە، هەوڵدانە بۆ وەدەست کەوتنی بێمانایی ژیان، کە بەخۆ کوشتن کۆتایی دێت، ئەوەش پرۆسەیەکە بەدوای تێگەیشتن لە بێهودەیی ئەنجام دەدرێت، بەواتای خۆ کوشتن ڕەتکردنەوەی ئەو سیستمە ئەخلاقیەی بوونە، ڕازینەبوونە بە هەموو ئەو تاپۆیانەی لەبەردەم گۆڕانە فیسیۆلۆژیەکانی جەستە قووت کراوەتەوە، بۆیە کاتێ چەقۆ لە جەستە دەدرێت، واتە دەیەوێ جەستە بکوژێت، چونکە ئەو لەبنەماوە خاوەن جەستەیەکی کوژراوە، کەوابێ ئیدی بۆ خۆی بخەڵەتێنێ کە زیندووە، بۆیە خۆ کوشتن وەڵامدانەوەیە بە پرسیاریی عەقڵ، پرۆسەیەکی ئەخلاقییە بۆ قبوڵ نەکردنی بوون، دەیەوێ لە ڕێی خۆ کوشتنەوە ئەخلاقیەتی مرۆڤبوونی خۆی ڕابگەیەنێتەوە، هەموو ئەمانەش ڕاڤەکردنی ئاماژەکانی شوێنە بەر لەخۆ کوشتن، کەچی ڕاڤەکردنی ئاماژەکان بەدوای خۆکوشتن، دەبینین زەمان لەناو شوێنێکدایە کە پەیوەندییەکانی پێش خۆ کوشتن بە شوێنەوە سڕاونەتەوە «ساپێتەی ژوورەکە یەکپارچە ڕەشایی دەینواند، کە هەموو نهێنیەکانی بۆشای لێ وون دەکردم، دیوارەکانی وردە وردە دەهاتنەوەیەک و، لە هەموو چوار دەوری دوور دەخستمەوە، زەمینی ژوورەکە خم خۆرک بوو، ئەوەندەی ئەما بوو بەرەو قولاییم هەڵلوشێ» خوێندنمان بۆ شوێن بەدوای خۆکوشتن، سەیرکردنێکە پرسیاری ئەخلاقی دێنێتە بوون، چونکە ئەو هەستە ئەما کە پەیوەندیەکی مرۆیی کۆی دەکردنەوە، بۆیە ژوور ڕەش دادەگەڕێ، ئەوەش کۆتایی هێنانە بە شوێن و جوگرافیای جەستە لەناو شوێنێکی تردا سنوری خۆی دەست نیشان دەکات، چونکە ژوور لە توانایدا نەماوە پەیوەندیی دروست بکاتەوە، بۆیە ئەگەر پەنجەرە پەیوەندیی کەسەکانی شوێن بێت بەدەرەوە، ئەوە ئەو

ئاماژەیە بەدوای خۆ کوشتن هیچ وەزیفەو دەلالەتێکی نامێنێ، ئەو تاریکی دێنێتە نێو شوێن، بەڵام توانای بینینی بۆ دەرەوە وەرگرتنی ڕۆشنایی لەدەست داوە و تەنیا دەتوانێ بەتاریکی شوێن وێرانتر بکات «پەنجەرەکان لاکێشەیەک بوون لە تەم و مژو بەردەوام تاریکیان لەدەرەوە هەڵدەمژی و ڕۆیان دەکردە نێو ژوورەکە»، شوێن کاتێ هەموو شتەکای ترمان لێ دەسەنێتەوە، لە ڕێگەی سڕینەوەی پەیوەندی کردن پێمانەوە، بۆیە ئەوکاتە هەوڵی کۆکردنەوەی شتەکان دەدەین، ئەوەش بەمەبەستی ڕزگارکردنی شتەکانە لەو دڵۆپە خوێنانەی کە لەناو شوێن پەرش بوونە، ئەو دڵۆپە خوێنە دەیەوێت مێژوویەک بەشوێن ببەخشێت کە بیکات بەکلتوری خۆ کوشتن، بەوەی کە هەموو ئەوانەی پەیوەندییان بەکەسی خۆ کوژەوە هەیە دەبنە موفرەدەی نێو ئەو کلتورە، بۆیە (چەتر) کە وەزیفەیەکی تری پێ دەدات، ئەویش چوونە ژێر پرۆسەی خۆ کوشتنە، بەمانای مانەوە لەشوێن بڕیاردانە بۆ خۆکوشتن، چونکە دەچینە ژێر ئەو چەترەی خوێنی لێ دەچۆڕێ، بۆیە ژوور دەبێ بە (شوێنی خۆ کوشتن) بەوەی هەموو ئەوانەی لە شوێندان پەیوەندییان بەخوێن هەیە، دەرکردنی کەل و پەلەکان لە شوێن چەندە پەیوەندیی بەو ڕزگارکردنە هەیە، دواجار ئەو ڕزگارکردنە ناتوانێ لە یادەوەریی خوێن خۆی بەتاڵ بکاتەوە، هەر ئەوەش بووەتە هۆی، ئەوەی کاتێ پاڵەوانی چیرۆکەکە لەماڵی مامۆستاکەی هاوڕێیەتی، ناتوانێ لە یادەوەریی هاوڕێکەی ڕزگاریی بێت.

بۆیە ئەگەر لایەکی ژوورەکە پەیوەندیی نووسەر بێت بەشوێنەوە، ئەوا لایەکەی تری ژوورەکە پەیوەندیی بەجەستەی خۆ کوژەوە هەیە، پارچەکردنی جەستە لەناو ژوورو تێکەڵ بوونەوە بەشتەکانی ماڵ، بەوەی خوێن شتەکان لەگەڵ جەستەی پارچەکراو تێکەڵ دەکات، ئەوەش پەیوەندیی جەستەیە بە هەموو ئەوانەی کە ناتوانێ دەسبەرداریان بێت و زمان لەناو شوێن جارێکی تر پێکیان شاد دەکاتەوە، بۆیە زیندوویەتی ئەو شوێنە لە ڕێگەی دڵی جەستەی خۆ کوژەکە «لەناوەڕاست ژوورەکەدا کەوتووەو لە هەر لێدانێکدا چەند دڵۆپێک خوێن دەر دەداتە دەرەوە»

بوونی دڵ لەناوەڕاستی ژوور ئاماژەیە بۆ نەزیفبوونی شوێن بەوەی شوێن هەموو بەشەکانی ئەو ژوورە هاوتەریب دەکاتەوە بەخوێن، بۆیە هەموو ئەو شتانەی لەناو ژووردان پڕ دەبن لە خوێن، تەنانەت ئەو جەستەیەی دەیەوێ بێتە ناو شوێن، بەواتا دێتە ناو زەمەنی خۆ کوشتن، بۆیە ڕاکردن لەشوێن گەڕانە بەدوای شوێنێکی تر کە نادیارە، شوێنێک کە یادەوەریی لێی نابێتەوە، بەڵکو جارێکی تر لەگەڵیدا دەژییتەوە بەوەی هەموو ڕووداوەکانی تر دەبنەوە گریمانەیەک بۆگەڕانەوەی یادەوەریی «سەربڕینی مریشکێکی نێو حەوشەی ماڵی مامۆستاکەی هاوڕێمان لەدواهەمین شەوی مانەوە) لەو شارەدا، ڕۆژی مردنی هاوڕێکی من وەک فلمێکی کورت هێنایە بەرچاوم».

وەک چۆن دەق لە ساتەوەخت کۆتایی هێنان بە ڕابردوو دەیگەڕێنێتەوە، مانەوەشی نوسەر نییە کە باس لەو ڕۆژە دەکات هەواڵی خۆ سوتاندنی ژنێک بە هاوڕێکەی بڵێت، بەڵکو ئەوە دەنگێکی نێو یادەوەرییە، وەک هەر ماتریالێکی شوێن دەبێتە قسەو پێمان دەڵێ ئەو بەرلەوەی خۆی بکوژێت، جگە لەدوو دێر هیچی تری ڕانەسپارد، دوودێر کە بەرجەستەکردنی وێنەی خوێنە، بەوەی زەمەنی جەستە زەمەنێکە خوێن وێنای دەکات، ئەو زەمەنەش دەبێتە زەمەنی یادەوەریی کە توانای ئەوەمان نابێت بە دەرچوون لەشوێن بیرمان بچێت، تەنیا وازهێنانە لە هەموو پەیوەندیەکانی بە ڕابردووەوە، ئەوەش تەنیا دەرچوون نییە لە ژوور، چونکە پێشتر ئاماژەمان بەوەدا، کە شوێن ئەو پانتاییەی هەڵگریی یادەوەرییە (شار)ە خۆی لەناو (ژوور) چڕ کردۆتەوە، بۆیە گەر بمانەوێ خۆمان لە یادەوەریی خاڵی کەینەوە هەر هێندە بەس نییە کە دەسبەرداری (ژوور) بین، بەڵکو دەبێ (شار)یش بەجێ بێڵین «چیدی نەمدەتوانی دوای مردنی هاوڕێکەم لەو شارەدا بمێنمەوەو، لەو ژوورەدا بگوزەرێنم، هەر بۆیە کاتێک جانتاکەم بەشانمدا شۆڕکردبۆوە، بێ ئاوڕ دانەوە لەو ژوورە بڕیارمدا بە یەکجاری ئەو شارە بەجێ بێڵم».

ئەوەش وازهێنانە لە یادەوەریی و دەست پێکردنەوەی ژیانە لە شارێک کە هیچ پەیوەندیەکی بەڕابردووی ئێمەوە نییە، بەڵکو پەیوەندیەکی تازەی ئێمە بە شوێنەوە، گواستنەوە بۆ شوێنێکی تر دەلالەت لە دەست پێکردنەوەی ژیانێکی نوێ دەکات، کە یادەوەریی نەخۆش نەخات، یادەوەریی وەک (فرۆید) دەڵێ: (هۆکارێکە بۆ نەخۆش بوونی مرۆڤ) هەر بۆیە کاتێ پاڵەوانی چیرۆکەکە شارەکە بەجێدێڵێ، ڕەفزی قەدەرێک دەکاتەوە کە قەدەری خۆکوشتنە لە ڕێگەی یادەوەرییەوە، ئەوەش تێگەیشتنی زەمەنی خوێندنەوەی وەرگرە لە خوێندنەوەی ئەنترۆپۆلۆژی

بۆ شـوێن، بەوەی لە ڕێگەی ئەنتـرۆپۆلۆژیای شـوێنەوە پەیوەندیی پاڵەوان بە شوێن دەخوێنرێتەوە.

**ئامادەبوونی زەمەن... زەمەنی نا ئامادەیی**

ئەگـەر خـوێندنەوەی هەر دەقـێک بەرهەم هێنانەوەی سیستمێکی دەلالی سەربەخۆبێت، ئەوا بەبێ گومان کردن لە سیـستمی پێشـووی نێو دەق توانای خولقاندنەوەمان نابێت، خولقاندنەوەش بەدوای ئەو گومانکردنە دێت کە خوێنەر لە سـێنتـەریی دەقی دەکـات، گـومـانێـک دەبێ بەستراتیژیی خوێنەر لە دەقێکی تردا کە خولقاندنەوەی ئاماژەیە بۆ کرانەوەی دەق، ئەوەش پرۆسەی ئامادەبوونی خـوێنەرە لەناو دەق، کـە خـوێنەر لەناو ئەو پرۆسـەیەدا فـاکـتـەرێکی کـارای بەرهەم هێنەرە، ئەو چەمکەشـە لە خوێندنەوە وامان لێ دەکات، لە خوێندنەوەمان بۆ چیرۆکی (خـانوو)ی - شـیـرین-ک- هەوڵی تەئویل کـردنی ئامـاژەکـانی نێـو نووسین نەدەین، بەڵکو بە پرۆژەی گومانەوە سەیری دەق بکەین، (خانوو) ئەو سێنتەرەی گەشەی بە نووسین داوە دەکەوێتە بەر گومانی خوێندنەوە، ئەوەش دەبێ بەستراتیژیی خوێنەر، لە ڕێگەی گومان کردن لە خانوو، کە گـومـان لەزەمـەنی ئەو پرسـیـارەی بەردەوام لێمان دەپرسێ: ناونیشانی دەق چ دەلالەتێکی هەیە؟

بۆیە پەیوەندیی خوێنەرو دەق بریتـیـیە لەو بۆشـاییـەی خـوێندنەوە بەمـانا هەوڵی نووسـینەوەی دەدات، لەوەسێ پرسـیـاریی خوێندنەوە دەبێ بە ئاستێکی تر، کە دەبێ بە پرسیار لە گەڕانی نووسەر لەنێو فەزاکانی زمان، لەوەشدا ئامادەبوونی خۆمان دەسەپێنیە نێو زمان، کاتێ نووسەر بۆ پێگەیشتن بە پیـاوی بەردەم خـانووەکـەو ناسین و گـەڕان بەدوای (ئەویتـر)ەوەیە و دەیەوێ ئامـادەگی خـۆی لەنێـو خـانووەکە و ناسینی پیـاوەکە بکاتە پەیوەندیی (ئەو)ی نووسەر بە (ئەویتر)ی کارەکتەریی نێو دەق، ئەو هەوڵەی نووسـەر لەنێـو دەق نایلـێت، نەک ڕاڤـەکـردنی ئەو نەووتراوانەی ئەودیو وتراوە، ئەگەر ئاماژەکانی نێو دەق پارێزگـاریی لەو سـیـسـتـمـە دەلالیـە بکەن، ئەوا لە گـرێمانەکـردنی ئامـاژەکـان لەنێـو پرۆسـەی نووسـینەوەدا سیـستـمێکی تر بەرهەم دێنن، نا ئامادەگیی (من) لەنێو دەق کەلێنێکە لەنێـو نووسین بەوەی (من) لە دەقـەکـەدا تەنیـا بەدوای کـەشـفکردنی (ئەویتـر)ە، ئەو گـەڕانەش هەوڵدانە بۆ دۆزینەوە، بێ ئەوەی توانای ئامادەگیی خۆی هەبێت، بۆیە (من) چەندە لەناو زمـانـدا دەگـەڕێت بۆ ئەوەی ئامـاژە بە (ئەویتـر) ببەخـشـێت، هێندە لەو ئامـاژە زمانەوانیەش ئاماژەکانی خۆی وون دەکات، چونکە (من) کـاتێ لەنێـو دەقـدا دەیەوێ کـەسی بەرامـبـەر بناسـێت، پەیوەندیی بە هەمـوو بونیـادەکـانی تر پچـڕاوەو تاکـە پەیوەندیەک بوونی هەبێت پەیوەندی کردنیەتی بە نووسین، ئەوەش وادەکـات پرسـیـاری دەق، ئەو پرسـیـارەی دەڵێت (خانوو چییـە؟) خۆی دەگـۆڕێت بە پرسـیـاری (من کێم؟ پەیوەندیی من بەشوێنەوە چییە؟) بەواتای بەدوای ناسینی خود، دەبێ ئەو پەیوەندیە بناسین کە ئەوەی خود بەشوێن دەبەسـتـێـتـەوە، نەک بەدوای ئەوەوە بین کـە (خـانوو) چ دەلالەتێکی هەیە، چونکە ئەو دەلالەتەی نێـــو دەقی نووسەر ئاماژەی پێدراوە، بۆیە ئەوکاتەی ئێمە هەموو ئەو دەلالەتانەی نووسـەر بە خانووی داوە فەرامـۆش دەکەین و تەنانەت دەیخـەینە نێـو گـومـانەوە، بەوەی پەیوەندیان پێـیەوە نابێت، هێندەی بەدوای ئەو کەلێنە زمانەوانییـە خەریک دەبین کە بەنەنوسراوەیی جێ هێلدراوە. خود لەنێو فـەزایەکی نادیاردا دەیەوێ گۆشەگـیـربوونی کۆتایی پێ بێنێت لە ڕێگەی شکاندنی ئەو تەنیـــا بوونەی نەک لە ئاسـتی ونبـوونی ڕەگـەزی بەرامـبـەر، بەڵکو شکاندنی گەمارۆکانی ناوەوەی خود، بەوەی تەنیاییەکانی ناوەوەی خـود بشکێنێت، بۆ ئەوەش بەدوای کـەسـێکی تەنیـاتر دەگـەڕێت، کـە توانای بەشـداری کـردنی هەبێت، بەوەی ئەویش لەناو تەنیـاییـەکی قـووڵدا بژێت کـە دەرگـاکـانی بەشداریکردنی لەگەڵ کۆمەڵگای لەسەرخۆی داخستبێت، بەوەی خەمێکی قووڵ و تاریک گەمارۆی داوە، بۆیە گەر دەق ویستـبێـتی کـەشـفی ئەو پیـاوە بکات «پیـاوێک لەبەردەم دەرگـاکـەدایە، لاوازو درێژو کـەمێ چەمـاوەیە، لە هەموو وەرزەکاندا بەرگێکی خاکی، لەبەردایە، نازانم پیبە یان لاو، چونکە هەر چەندە بەوێدانێدەپەڕم لە شەقامەکە نیـیـە سـەری شـۆڕکـردۆتەوە جگەرە پێـدەکـا.. پێناچێت بەڕێکەوت لەوێدا بێت، بەڵکو ڕەنگە پاسـەوانی ئەو خـــانووە بێت»، بەلام (من) لەنێـــو دەق بە نادیاری مـاوەتەوە، خـود کـێـیـە؟ بۆ ناسـینیش دەبێ لەپرۆسـەی خوێندنەوە ئامادەگیی (من)ی نووسەر بگۆڕین بە (من)ی خـوێنەر، بۆ ئەوەی لە شـوێنی ئەوداو لەناو دەق توانای بەرهەم هێـنانەوەی ئامـــاژەمـــان هەبێت، بۆیە دەق لەو ساتەوەختـەی من تیـایدا دەنووسم دەمـەوێ مـومـارەسـەی دەسەلاتی خوێنەری خۆم بکەم، کە توانای دەست نیـشـان کردنی شوێنگەی خۆم هەبێت لەو ڕووبەرەدا، دیارە ئەوەی

لەو ناسینە گرنگی نابێت و بایەخی پێ نادەین جۆری (جلەو بەرگ، تەمەن، ڕەگەز)ە، بەڵکو ئەوەی بەلامانەوە مەبەستە پەیوەندیی جەستەیە بە نووسینەوە، جەستەی من کە توانای گومان کردنی هەیە لەخانوو، ئەو جەستەیە (خانوو) کە ناونیشانی دەقەوە هەڵگریی سیستمی دەلالی نووسینە دەیسڕێتەوە بۆ وێناکردنی سیستمێکی دەلالی تر کە ئاماژەکانی خانوو دەگۆڕین بە ئاماژەی جەستەیی، ئەو جەستەیەی پێویست بە چوونە نێو خانوو نییە، بەڵکو پێویست بە چوونە پرۆسەیەکە بۆ بەشداریکردن لە گۆشەگیرییەک کە لە (جەستەی ئەویتر)ەوە دەتوانێ زەمەنی بێدەنگی بشکێنێت، زەمەنێک بەتێگەیشتن لەو حەقیقەتەی کە خانوو تەنیا چوونە نێو فەزایەکە بۆ نووسین، کە خوێندنەوە دەتوانێ فەرامۆشی بکات، ئەوسا ڕووی (هاودژی مانا)مان بۆ کەشف دەبێت، چونکە قەشەنگی دیوارو گوڵەکانی باخچەی خانووەکە ڕووبەکە بۆ دەسخەڕۆدانی خوێنەر تاپەی بەنهێنی جەستەی بەر دەرگا نەبات، ئەودەیەوێ لە ڕێگەی جوانی باخچەو ڕەنگی خشتی دیوار فریومان بدات، بۆیە هەر بەشێک لەو شوێنە پەنجەرەیەک بۆ کرانەوە بەسەر جوانی، بەڵکو دەرگایەکە بۆ مردن، دەرگایەک کە بە گۆڕینی زەمەن دەسەپێت (دواتر دەگەڕێمەوە سەر زەمەن لە دەقەکەدا). بۆ ناسینی من لە ڕێگەی ئەویتر کە ئەوکاتەی «یەکەمجار چاوەکانیم بە چاکی بینی و هەستم کرد ئەویش سەیرم دەکاو بزەیەکم لەسەرلێوی بەدی کرد، بەڵکو لەگەڵ بزەکەشدا دەستی سڵاوی بەرزکردەوە، ئیتر لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆکە نازانم چەند ساڵ دەکا تەنیا نێواران کە بەوێدا دەگەڕێمەوە ئەو دەبینم لە هەمان شوێندا وەستاوە».

ئەوەش ئاشکراکردنی جەستەی منە بەوەی هەڵگریی هەمان بێدەنگی بەرامبەرە، کە جەستەیەکە لەناو شکستدا دەیەوێ شکستە خودیەکان نزیک بکەنەوە، بۆیە بە تێپەڕینی زەمەن جەستەی ئەویتر دەبێ بە وەهمێک کە ئامادەگی خۆی دەسەپێنێ، چونکە ئەوە زەمەنی ڕابردووە جەستە دەگەڕێنێتەوە، ڕابردوویەک بۆ ئەوەی لەنێو زەمەنی هەنووکەیی بیسڕینەوە دەبێ وێران بکرێت، ئەوەش وێرانکردنی ئەو خانووەیە کە «زۆر کۆن و غەمگین بوو دیمەنی ئەو ڕیزە خانووە نوێیانەی تێدابوو کە بەتەنیشتیەوە بوون».

چونکە پەیوەندیی من بە شوێنەوە، پەیوەندیەکە لەسەر بنەمای پارێزگاری کردن لە ڕابردوو وەستاوەو دەیەوێ بەردەوام ئەو زەمەنە بگەڕێنێتەوە، کە زەمەنێکە تەنیا لەنێو شوێندا هەست پێدەکاتەوە، بەڵام زەمەنێکی پیر بوو کە سیمای زەمەنی هەنووکەیی شێواندووە، بەواتای خانوو لە پرۆژەی گومانکردندا دەلالەتی زەمەنی پێ دەبەخشێت، بە ڕابردووکردنی خانوو بەواتای سڕینەوەی مانای یەکەم و نووسینەوەی مانا لەنێو بۆشییەکانی پەیوەندیان بەدەقەوە، چونکە لەنێو دەقەکەدا دوو زەمەن هەیە، کە هەریەک لەو دوو زەمەنە فەزاو خەون و کارەکتەریی خۆی هەیە، بۆشاییەک هەیە لەنێو ئەو دوو زەمەنە کە خاڵییە لە نووسینەوە ئەوانیش (زەمەنی نا ئامادە( ئامادەبوونی زەمەن)ە.

زەمەنی دەق بەو دوو ئاراستەیە هاتووە کە لەنێو بۆشایی نێوان هەردوو زەمەنەکە زەمەنی دەقی بەرهەم هێناوە، زەمەنێک کە مردن کەلێنێک دروست دەکات بۆ هاتنی زەمەنی دووەم، بەواتای مردنی پیاوی بەردەرگاکە کۆتایی هاتنە بە (ئامادەوونی زەمەن) و لە شوێنیدا (زەمەنی نا ئامادە) دەردەکەوێت، ئامادەبوونی زەمەن قبوڵ کردنی یەکترییە لە چرکە باڵای زەمەنی لەلایان ئەو پیاوەی بەردەرگاکە «هەستم کرد ئەویش سەیرم دەکاو بزەیەکم لەسەرلێوی بەدی کرد، بەڵکو لەگەڵ بزەکەشدا دەستی سڵاوی بەرز کردەوە» ئەو چرکە زەمەنییە، چرکەی باڵابوونی زەمەنە، بەوەی زەمەن دەوەستێنێت، لە ڕێگەی وەستانی خۆی لەبەردەرگا، وەستانێک کۆتایی زەمەنە، بە کۆتایی هاتنی (من) لەناو هەمان زەمەندا نامێنێتەوە، هێندەی لەنێو (زەمەنی نا ئامادە)دا ئامادەیەگی دەبێت، کە زەمەنێکە جولەی سروشتی تیا گۆڕدراوە، کە زەمەنی گریمانەیی (هاوین... بەهار... بەیانی.. ئێوارە) لە دەرەوەی زەمەن نییە، بۆیە لە (ئامادە نەبوونی زەمەنی ئامادەیە، بەڵام (من) دەمەوێ بیگەڕێنمەوە.

«ئەمڕۆش بۆ جاری چەند هەزارهەم بەو شەقامەدا دەڕۆم، بەڵام بەسەیارەنا بەڵکو بەپێ، کاتیش نە ئێوارەیە، نە بەیانی، بەڵکو عەسرێکی زووە» بۆیە کاتێ «من بڕیار دەدات بچێتە خانوو، ئەوەیان ئینتیماکردنەوەیە بۆ زەمەنی ڕابردوو، نەوەک ئامادەگیی من بێت لە زەمەن، بەڵکو هەوڵێکی خۆسەپێنەرانەی منە لە زەمەنی نا ئامادە زەمەنێک ڕەنگی (دیوار.. دەرگا.. چیمەن.. درەخت.. گوڵ) هەموویان کاڵبونەتەوەو لەگەڵ زەمەنی ڕابردوو کۆتاییان هاتووە، بۆیە ئەو زەمەنە هەرگیز یەک زەمەن

لەنێو دەق بەرهەم ناهێنێت و، پەیوەندیی هارمۆنی زەمەن توانای ئەوەی نییە خۆی بەدرێژکراوەی زەمەنی پێشوو بزانێت، هەربەک لە ئاماژەکانی نێو نووسین بۆ خۆی گومانکردنە لەو زەمەنەی کە هەر زەمەنی ڕابردووبێت (کاغەزی و زینەی کۆن) (دای جالجالۆکە) (مۆدیلی کۆنی گلۆپەکان) (خوڵی سەرکارتۆنی کتێبەکان، تەنانەت کارەکتەری نێو زەمەنەکان هەرگیز کارەکتەرەکانی پێشوونین، هەربەک لە کارەکتەرەکان وەزیفەی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوە (من)ە واتێدەگا هەموویان وێنەی (ئەویتر)ە بە هەموو شێوە وەزیفەکانەوە، تەنانەت بوونی کارەکتەرەکانی نێو زەمەنی پێشوو لە ئێستادا بەلای ئەو نەوەیە ناوبردنیەتی بەخێو، ئەوەش گەڕانەوەی زەمەنی دەکات بە (ئامادەبوونی خێو) بەواتای زەمەنێکی نیهلیستیە، بەڵام ئەوەی لە ئامادەبوونی زەمەنی ڕابردوو دەمێنێتەوە، تەنیا ئەرشیفکردنی زەمەنە، بەوەی ڕابردوو دەبێ بە مێژووی من نەک بە زیندوبوونەوەی لەتەک مندا، بەڵکو تەنیا مێژوویەکەو دەتوانین بەڵگە و ڕووداوەکانی لەنێو چرکە زەمەنیە مێژووییەکان بپارێزین، ئەوەش دەبێ بەپرسیارێکی نێودەق و توانای بەرهەم هێنانی سیستەمێکی دەلالی جیاوازیی دەبێت بۆ ئەو خوێندنەوەیەش، خوێندنەوەیەک بەدوای کرانەوەی دەق دەرگا بۆ خوێندنەوەکانی دوای خۆی دەخاتەسەر پشت «چییە با ئەم ڕەسمانە بەم دیوارەوە بن؟ هەرچی دەیەوێ بیکرێ یان بەکرێی بگرێ، دەیەوێ ئەم ڕەسمانە لێبکاتەوە، بۆ؟» ئەوەش پرسیارە بۆ خوێندنەوەی جیاواز.

### زەمەنێکی تاریک و خەونی مردن

کاتێ زمان لەناو دەق دەیەوێ مردن بنووسێتەوە، ئەو پرۆسەیە بۆ دۆزینەوەی دەلالەتەکانی مردنە، گۆڕینیەتی لە کردەیەکی بایەلۆژییەوە بۆ چەمکێکی مەجازیی، بەوەش مردن دەبێ بەو دالەی کۆمەڵە مانایەک بەرهەم دێنێت، ئەگەر نمونە بە ڕۆمانی (تیریزیا پا تێستا)ی جۆرج ئەمادۆ بێنینەوە، دەبینین (تیریزیا) لە چرکە ساتی خەوتن لە تەک پیاوە پیرەکەدا، ئەوکاتەی پیاوەکە لەنێو چێژی شەهوەت دەمرێت (تیریزیا پاتێستا) دەڵێت: «ئێستا مردن لەناوەوەم دایە» بە واتای شەهوەتی پیاوەکە دەبێتە شەهوەتی مردن، ئەوەی پیاوەکە لەساتەوەختی خەوتن دەیپەڕێنێتەوە نێو جەستەی (تیریزیا) مردنە نەک لەزەت، بەڵام ئەو مردنە زمان دەگەیەنێ بە ئاستێک لە تەنیایی بۆ پاڵەوان، کە دواجار دەبێتەوە بەخولقێنەریی دەلالەتی مردن لەنێوان ئەو پیاوەی بەسەرییەوە دەمرێت و ئەو ئەفسەرە سادیەی کە لاقەی دەکات، هەدوو پرۆسەکە لەگەیشتن بەپلەی ئۆرگازم بۆ پیاوەکان وەدەست کەوتنی لەزەتە، بەڵام بۆتیریزیا دەسکەوتنی دەلالەتی مردنە، بۆیە، مردن چەندە فەنابووی جەستەیە لەناو دەقدا، هێندەش بەو فەنابوونە زمان زەمەنی دوای مردن دەنووسێتەوە، بەڵام ئاخۆ ئەو مردنە تا چەند لەنێو چیرۆکەکانی (ئاکۆ کەریم مەعروف) هەست پێ دەکەین، بەتایبەت لە چیرۆکی (دەلیا لەخەونی تاریکیدا)، بەڵام بەرلەوەی لەو چیرۆکە بدوێین، هەوڵ دەدەین چەمکی مردن لەنێو چیرۆکەکانی دیکەی نووسەر ئاماژە پێ بدەین، وەک لە چیرۆکی (بوونەوەرە شووشەییەکان) بوونی تەرمێک لەنێو تابووتێکی شووشەیی وێنای نووسین دەکات، مردن هاو واتا دەکاتەوە بە مردنی سرووشت لەوێنەیەکی شووشەیی، ئەوەش دەلالەتە بۆ مردنی ژیان، بۆیە پرسیارکردن لە مردن پرسیارە لەتاوانێک کە پاشماوەکانی خوێن بەسەر شوێنەوەیە، ئەو حاڵەتەش لە چیرۆکی (خەونێک لەبەربادا، مردن بەشێوەی لە دایکبوون بەمەداری زەمەنێک خول دەخوات، بەخوێن دەست پێدەکات و هەر بەخوێنیش دەرواتەوە، بەواتای مردن دەسەڵاتێکە دەسەپێنرێتە سەر ژیان، ئەوەش کوشتنی ژیانە، بەڵام تەنیایی وای لێ دەکات نەتوانێ ئیرادەی خولقاندنەوەی بوونی هەبێت، وەک چۆن زمان کۆمەڵێک دەلالەت بەماتریال و فیگوری کارەکتەرەکان دەبەخشێت، کە توانای گۆڕان لەدەلالەتەکان دروست ناکات، ئەگەر سەیری چیرۆکی (ماڵئاوا.. تا سەر زەمینێکی دیکە) بکەین، ئەو خاڵە بەرۆشنی دەردەکەوێت، دەبینین دەق جارێکی دیکە وەزیفەی دەلالەتەکانی دیکە دەبەخشێتەوە بە (مردن.. با.. باخچە.. دەلیا) دیارە ئەو دەلالەتە نەگۆڕانە وامان لێ دەکات چیرۆکەکانی نووسەر لەنێو کۆمەڵێک ئاماژەو شیعرییەتی ئەو زمانە بناسینەوە، کە دیارە ئەو ناسینەوەیەش لەبەرژەوەندی زماندا نییە، هەرچەند ئەوە بە جۆرێک لەسەربەخۆیی نووسین ئاشنامان دەکات، لێرەوە کە تێگەیشتنێکمان بۆ مردن لەجیهانبینی نووسەر لا ڕۆشن دەبێ، ڕستەکانمان دەگوازینەوە ناو چیرۆکی (دەلیا لە خەونی تاریکیدا) چەمکی مردن لەو چیرۆکەدا دەکەینە ڕووبەری خوێندنەوەکە، ڕووبەرێک بۆ خەونی مردن.

نووسینەوەی خەونیش بەرهەم هێنانی ئاماژەی

زمانەوانییە، زمان لەناوخەوندا سنورەکانی بیرکردنەوە تێک دەشکێنێ، ڕەهەندێکی دیکە بەدەلالەتەکانی ژیان دەبەخشێت، ئەوەش نووسینەوەی ئەو ویستە زاتییەی مرۆڤە کە پێی ناگات تەنها نووسینە توانای گەیشتنی بەو هیوایە هەیە، کە نووسین لە زەمەنی زاتییەت وامان دەپچڕێنێت و لەزەمەنێکی دیکە کە زەمەنی نووسینە هەوڵی خوڵقاندنی پەیوەندییەکان دەداتەوە، نووسینە دەیەوێ لەناو خەوندا تەئویلی خەونەکەمان بکەین، خەونێک کە لەو چیرۆکەدا زەمەنی (دەلیا) زەمەنی تەئویل کردنی خەونە، خەونێک کە لە مردنی ئومێدەکانەوە، زمان دەیەوێ لەناو گەمەی مردن جێگۆڕکێ بە دەلالەت بکات، تاوەک سیستمێک هەموو ئاماژەکان کۆبکاتەوە، ئەوەش خوێندنەوەی زمانە لەناو دەق کە وەرگر لەزەمەنی وەرگرتندا سەرلەنوێ دەق دەلالەتی مردن لە خەونی تاریکدا، کە مردنی باوک دەبێ بە چەمکێکی مەجازیی (باوک.. گوڵەکان... دەلیا) دەبێ بە ئاماژەی هەمە چەشن بۆ مردن، ئەگەر مردنی باوک بە مردنی دەسەڵاتی ڕاڤە بکەین، بەوەی مردن دەبێتە ساتی ئازادبوونی دەلیا، ئەوە دەکەوینە ناو جۆرێک لە هەڵەی ڕاڤەکردن، چونکە دەبێت ئێمە پێشتر جۆری ئەو پەیوەندیە بناسین، ئەوسا هەوڵی تەئویل کردنی بدەین، (باوک و دەلیا) دووکەسێتی نێو چیرۆکەکەن، کەماتریالێک هەیە بەیەکیان دەبەستێتەوە، مردنی باوک بۆگەنی بوونی ماتریالی دەقە (گوڵ) کە سوبجێکتی (گوڵ) ئاماژەی خۆشەویستی لەنێوان ئەو دووانە دەردەخات، بۆیە مردنی یەکێکیان شوێن تاریک دەکات، شوێنێک کە دایک تیایدا ئامادە نییە، بەواتای ئەگەر دایک ئامێزی بۆ کوڕ (ئۆدیب) لە شوێنێکی دیکە کردبێتەوە، ئەوا باوکیش لە ئامادەبوونی نێو شوێن دەبێ بەسەرچاوەی خۆشەویستی بۆ کچ (ئەلیکترا) و باوک، ئەوەش پەیوەندیی ماڵ بۆ دەلیا پەیوەندیەکی نوێیە، بەوەی باوک بۆنی دەبێ بەهێزو توانا و خۆشەویستی، بەمردنیش ئەو توانا و هێزە سست دەبێت و خەونەکانی شکست دەهێنێت و ئیرادەی زاتی خۆی لەدەست دەدات، مردن خەونەکانی بۆ تاریکی دەگۆڕێت، تاریکیش ئاماژەیە بۆ وێرانبوونی زات، کە مردن ئامادەی دەکات، ئەوەش ئامادەبوونی بۆنێکی ناخۆشە لە (گوڵ- دەلیا)، چونکە مردن لەو کاتەدا هەموو تواناکانی دیکە نەخۆش دەخات و دەیەوێ ڕۆشناییەکانی ڕەش بکات، ئەوەش کوشتنی زەمەنی ژیانە، زەمەنێک خەون دەکوژێت، کوشتنی خەونی دەلیا پەیوەندیی بە مردنی گوڵەکانەوە هەیە، ئامادەگی مردن فەرماندانە بەماتریالەکان، مردن دەبێتە خولقێنەری دەسەڵاتی مەرگدۆست لەنێو ماڵ، بەوەی مردن «بەیانییان بەرلەوەی پاسارییەکان لە خەو هەستن پەنجەرەکان دەخاتە سەرپشت، نێو شەوان دەرگاکان پێوە دەداو، هەندێجار لەناو ڕەنگی باخچەکەدا سەرخەو دەشکێنێ، بۆیە کاتێ مردن دەبێ بە دەسەڵات، ئەوسا توانای ئەوەش دەبێ ڕەنگەکانی دیکە کاڵ بکاتەوە، مردن لەو دەقەدا لە ماتریالێکی بێگیان دەگوازرێتەوە بۆ جەستەیەکی بزۆز، جەستەیەک توانای بەجێگەیاندنی وەزیفەکەی دەبێت، لەبەر وەزیفەبوونی مردن خەون ڕووە پاکیزەییەکەی خۆی دەدۆڕێنێت، بەکۆمەڵێک، ئاماژەی دیکە ڕەمزەکانی دەگۆڕێت، گۆڕین سەراوژێرکردنی خەوە تاوەکو تەئویلی بۆ مردن فراوانتر بکات، بەوەی مردن (با+ ئاو)ی لێ سەندووین، چونکە (با) ئەو هێزەی لەناو ماڵدا هەیە کە تۆزو خۆڵەکانی سەر پەنجەرەکان ڕاماڵێت، بەوەش (با) دەتوانێ ژیان بە باوک ببەخشێتەوە، ژیان بەخشینەوەش بە باوک.. زیندووبونەوەی خەونە، وەک چۆن (ئاو)یش دەتوانێ گوڵەکان لە هەڕەشەی مردن بپارێزێ و سەرلەنوێ ژیانیان بکاتەوە بەر، بۆیە مردنی باوک و چەندە توانای ئەوەی هەیە (دەلیا+ گوڵ) بکوژێت، بەهەمان ئاراستەی مردن، ژیان لە توانایدا هەیە (با+ ئاو) ئەو دووانە لە مردن ڕزگاربکات، ئەوەش ئومێدێکی دەلیایە کە نووسەر لەرێی پەپوولەیەکی پیرەوە بەدوای روناکیدا دەگەڕێت، تاوەکو بتوانێ خەونی تاریکی بە خەونی ڕۆشنایی بگۆڕێت، ئەو گەڕانەش ئومێدێکە بۆ گەڕان بەدوای خۆشەویستی خۆشەویستییەک خالی نییە لە یادەوەریی زات، بەڵکو یادەوەرییە وا دەکات بە مردن بڵێ، بەرلەوەی باخچە تاریک بکەی من بۆنی باخچەم گرت، بۆنگرتن پرۆسەیەکە بۆ زیندوبوونەوە، بۆنێک بەر لەهاتنی تاریکیی، چونکە تاریکیی بۆنی باخچەی گۆڕیی، بەڵام گواستنەوەی بۆنی سرووشتی ئاسایی باخچە بۆ ناو جەستەی کچ، وا لە (دەلیا) دەکات، بیر لە مردنی باوکی نەکاتەوە، ئەو بەهۆی ئەو بۆنەوە هێزێکی زاتیی هەیە کە دەتوانێ لە ڕێگەی خۆشەویستی مردن بکوژێت، ئەوەش خوڵقاندنی گیانێکی میهرەبانە لەناو مردن، خوڵقاندنی ئیرادەیەکی زاتیانەیە بەدوای مردنی باوک دەیەوێ ئەو خۆشەویستییە بەجۆرێکی دی بگۆڕێت، بەوەی لە ئەڤینی باوکەوە بۆ

ئەڤینی دۆستێک بیگوازێتەوە، بۆیە پەیوەندی نووسەر بە نووسین هەوڵدانە بۆ گۆڕینی خەون، نەک بۆ ئەوەی خوێنەر بە خەونێکی تاریک ئاشنا بکات، بەڵکو زمان لەناو دەقەکەدا دەیەوێ دەلالەتەکانی مردن بەتاڵ بکاتەوە، بەوەی ئەو ناتوانێ تاسەر دەسەلاتێکی مەرگدۆست بێت، بەڵکو زمان دەبێ بە نووسینەوەی ململانێیەک، کە هیوایەکی هەیە بۆ ئەوەی کۆتایی بە مردن بێنێت، ئەگەرچی لە چارەسەرکردنی بۆ گوتاریی ئومێد، نووسەر لە بری زمان ئیش دەکات، کە ئەگەر ئەوە خەوشێکی نێو نووسینیش بێت، بەلام ڕوویەکی پۆزەتیفیش دەبێت، کە دەیەوێ خەونەکەی (دەلیا) جێگیر نەبێت، چونکە نووسەر مەبەستیەتی گەڕانی خۆی لەژێر ناوی پیرە پەپوولەیەکەوە ڕابگەیەنێت،ئەویش گەڕانی نووسەرە بەدوای ڕۆشنایی، بەلام دەبێ لەناو نووسین لەوە دڵنیا بین، کە ئەوە زمانە ڕۆشنایی بەدەست دێنێت نەک نووسەر، نووسەر خۆی دەداتە زمان، زمانە ئەو پەیوەندیە لەناو زەمەنی نووسین دەنووسێتەوە، و خەون لە ڕەمزەکانی نەست دەگوازێتەوە بۆ کۆمەڵێک ئاماژەی زمانەوانیی، کە لەناو دەق سیستمێک دوای کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەیان هەوڵی تەئویل کردنیان دەدات ئەوەش تەئویل کردنی خەونی نێو زمانە.. خەونی مردن لەزەمەنێکی تاریکدا.

### گومانی تەئویل و ماناکانی پێڵاو

نووسینەوەی جەستەی ژن گوتارێکە لەناو هەڵچوون و حەزە چەپێنراوەکان نوقمی توندوتیژیی کۆمەڵگا دەبێ و دیدی ڕەخنەیی نێو ژیان دەگوازێتەوە بۆ نووسین، بەوەش نووسین لەتوانایدایە نابێت کە دەقێک بێنێتە بوون نووسینەوەی جەستە بێت، چونکە ئەوکاتە جەستە ناتوانێ خۆی بنووسێتەوە، هێندەی حیکایەتی توندوتیژیی دەوروبەرو باس دەکات، بۆیە زۆرینەی ئەو چیرۆکانەی ژن بەرهەمی هێناون بەدوورنین لەو تێڕوانینەو لە نووسینەوەی دەلالەتەکانی جەستە خۆیان بەدوور گرتووە، چونکە نووسینەوەی جەستە گێڕانەوەی حیکایەتەکان نییە، ئەوانەی ڕەخنەی کۆمەلایەتی و زەبرو زەنگەکانیان دەگێڕنەوە، بەڵکو نووسین دەبێ توانای ئەوەی هەبێ پارێزگاریی لەپێودانگە ئیستاتیکی و ڕەهەندە فکرییەکانی خۆی بکات، هەر بوونی ئەو خاڵەشە وا دەکات چیرۆکەکانی (سەحەر ڕەسایی) لە

چیرۆکی خانمانی تر جیابکەینەوە، بەوەی دەق پەیوەندیی نووسەرە بە خوێنەرەوە، جەستەی ژن خاڵی نییە لە ڕەخنەیەک لەودیو زمانەوە کە ماناکانی حەشاداوە، ونبوون مانایەکە بۆ پەراوێز بوون لەناو کۆمەڵگادا، ئیدی ئاخاوتن لەناو دەلالەتی هەڵچوونەوە خۆی بەتاڵ ناکاتەوە، بەڵکو (فرمێسک) یا (گەلا) ئاماژەی نێو زمان بنیات دەنێت، بەوەش نووسین ڕووبەڕووی جۆرە دەقێکمان دەکاتەوە کە بە نووسینی پارالۆگیزمی (گوتاریی پەراوێزیی) سەیری نەکەیت، بەوەی ویستویەتی ئەندێشە چەپێنراوەکان بنووسێتەوە، بەڵکو نووسین چوونە نێو زمانە، ماناکان لەنێو زماندا خۆیان حەشارداوە، لەوکاتەدا زمان هەر بەتەنیا نابێتە ڕوویەکی نەبینراوی مانا، بەڵکو دەلالەتی جیاواز دەخاتە ڕوو، ئەوەش پەیوەندیکردنی زمانە بەکردەی ناونانەوە، وەک لەیەکێ لە چیرۆکەکانیدا (دنیا) لەنێوان دەلالەتی جیهان و ناونانی کچەوەیە، ئەوەش پرۆسەیەکە بۆ کردنەوەی زمان، زمان نابێتە ئامرازێک بۆ نووسینەوەی ڕقی میەتیی، بەڵکو زمان بونیادێکی نێو دەقەکە دەلالەت دەنووسێتەوە لەنێو ئاماژەدا، بەلام تاوەکو هەوڵی چوونە نێو بونیادی شاراوەی زمان نەدەین، ئەوا ناتوانی کەشفی دەلالەت بکەین، وەک چۆن لە چیرۆکی (ئەو پیاوەی کەس ماچی نەدایە کاهوەکان نەبێ) کاهو دەکاتە ئاماژەیەک بۆ گۆڕین، کە پیاوە ناشرینەکە پەنای دەباتەبەر، تاوەکو لەزەتی ماچی لێ وەرگرێت، بەوەش پەیوەندیی پیاو بە (کاهو) دەبێ بە پەیوەندیی من بە ئەویتر، پەیوەندیەک نووسەر بە ڕقێکی ژنانە سەیریی ناکات، بەڵکو سەیرکردنی لە ڕوانگەی ڕەخنەیەکی کۆمەلایەتییەوەیە.

بەوەی پیاوەکە هێندەی هەر ژنێک بۆتە قوربانیی پەیوەندیی کۆمەلایەتی، هەربۆیە لە ڕێگەی ژنەوە ئەوت دەخاتە ژێر کاهوەکان، بۆ ئەوەی ڕێگە لە هەموو ئەلتەرناتیڤەکان بگرێت و پەیوەندیی سروشتی ڕەگەزەکان لە ڕێگەی پەیوەندیان بەیەکەوە بێت، نەک بە گۆشەگیربوون و خولقاندنی دیواریی ترس و دواجار تەنیایی ناچاری بکات ئەو لەزەتە لەشتی تر وەدەست بێنێت، ژنی ئامادە لەناو دەقەکەدا دەنگی چیرۆکنوسە، کە دەیەوێ دیدگازاتیەکانی خۆی بخاتە نێو نووسینەوە، بۆیە ئەو دەنگەی ئەوت دەخاتە ژێر کاهوەکان هەر ئەو دەنگەشە کە لەناو کارەکتەریی

لەشفرۆشێکەوە دەیەوێ لە ڕێگەی کارەکەیەوە فرۆکەیەک بەرێت و (سێو) بخاتە هەموو ماڵێکەوە، بۆیە سێو لە چیرۆکی (تاریکی) ئاماژەیە بۆ بەختەوەریی ماڵ و پەیوەندیی مرۆڤ بەیەکەوە، سێو لەو چیرۆکەدا دەبێتە ئاماژەی بەختەوەریی، دەلالەتی قوربانی دانی (خود)ە لە جەستەی خۆی، بۆ ئەوەی لەزەتی بوون بۆ کۆمەڵگا بگەڕێنێتەوە، هەستێکی غەریزەییە کە کۆمەڵگا ونی کردووەو (خود) دەیەوێ لە ڕێگەی (سێو)ەوە ژیان بەردەوامی هەبێت، چونکە مەترسی مردنی ژیان، ترس نووسەرە لەوەی مردن... مردنی شارە، شار بەبێ سێو بۆنی مەرگ پەرش بکات و مرۆڤ تیایدا تەنیا بیر لەگوناح بکاتەوە، بەوەش (سێو) لە ئاماژەی میتۆلۆژیی دەگۆڕێت کە هێمایەکە بۆ ناپاکی مرۆڤ لە باغەکانی فیردەوسی، بەڵکو دەق سێو لە ئاماژەی ناپاکیی و فریودان دەگوازێتەوە بۆ خۆشنوودیی، وەک چۆن ئەگەر فرۆکە بۆن سێو بەسەر شار پەرش بکات بۆ مردن، ئەوا پەرشکردنی بە سێو سبە فرۆکە لای (سەحەر) دەبێتە خەونێک کە مردن لە ئاماژەی واقیع دەگۆڕێت بۆ ئاماژەی ژیاندۆستی، بەو گۆڕینەش ئەدەب دەبێ بەوێناکردنەوەی جیهانێک کە زەمەنێکی جودابێت لەوەی ڕووی داوە، بەڵکو بینینمان وەک ئەو ژیانە بێت کە ئێمە خەونی پێوە دەبینین، ئەوەش بەتەنیا لە ڕێگەی گۆڕینی ئاماژەکان دەتوانین دەلالەتی جیاوازمان دەست بکەوێت.

زمان سەرباریی ئەوەی ددلالەت لەناو دەق بەرهەم دینێت، بەڵام خولقاندنەوەی مانا بەدوای گەمەیەکی زمانەوانیەوە دێ، ئەو گەمەیەی دەیەوێ ڕووبەرێکی زمانەوانیی بداتە ماناکان، تاوەکو بتوانێ لە دەلالەتی فکرییەوە مانا بخاتە ڕوو بەوەی جەستەی پارالۆگیزم خودێکە کۆمەڵگا لە پەراوێز بوونی بەر پرسیارە، چونکە ئەو خودە ئەمرۆ چەندە کۆمەڵگا بە پەراوێزیی کردووە، بەڵام فاکتەریی پەراوێزبوون پرسیاریی نێو دەقە، بوونی سۆزانیی لەناو دەقەکاندا ئاماژەیەکی زمانەوانییە بۆ دەرخستنی مانا لەوەی سۆزانی لە ئاماژەی کۆمەڵایەتیەوە دەگوازێتەوە بۆ ئاماژەی زمانەوانیەوە، وەک لە چیرۆکی (لەبیرچوونەوەی ناوێک) لەنێوان بۆن و هەڵمی (ئاو... مەرگ.. خوێن) پرۆسەی کوشتن ئەنجام دەدرێت، کە کوشتن مناڵە تازەبووەکەیە، ئەو منداڵەی خەونی بەرهەم هێنەری جەستەیە، کوشتنی منداڵەکە. کوشتنی خەونە، بەڵام بەدوای کوشتنی زمان (ئاوێنە) دەکاتەوە بە ئاماژەی ئومێد، سەیرنەکردنی ئاوێنەیە لەلایان پیاوەوە نەیهێشووەو دنیا پەمەیی تر بێت، بۆیە گوتاریی ئومێد لەو چیرۆکەدا لە پەراوێز بوون دەگوازرێتەوە بۆ مانایی جیاواز، (مانا)ش ڕوویەکی نەخوێنراوەی دەقە، کە زمان چالاکییە زیندووەکانی شاردۆتەوە، ئەوەش گومان دروست دەکات، چونکە مانا نادیارە، ڕووبەری مانا خاڵییە لە هەر دەلالەتێک، ئەوەش گومانی خوێنەر لەناو هەردەقێک زیاد دەکات، بۆیە ئەوەی گومان کەم دەکاتەوە و هەوڵی بەچالاک کردنی مانا دەدات تەئویلە بۆ دەق، کە ڕووبەریی شاراوەی زمان دەدۆزێتەوە، ئەوەش زیندووکردنەوەی مانایە، زیندووکردنەوەش کۆتایی هێنانە بە گومان، کە تەئویل مەبەستی ڕاڤەکردنی بابەت نییە، بەڵکو لابردنی گریمانەکە، بۆیە تەئویل لای (پۆل ریکۆر) پرۆژەیەکە بۆ کەمبوونەوەی گومان و زیادکردنی مانا، ئەو پرۆژەیەش بەشکاندنی بتەکانی گومان کۆتایی دێت، وەک کاتێک حەزرەتی (برایم) بتەکان دەشکێنێ، مەبەست سەرەکی لەوکارەدا، کۆتایی هێنان بوو بەو گومانەی لە هزری مرۆڤ بڕوایەکی پتەوی هەبووە، کە مەبەست لە شکاندنی کۆتایی هێنان بوو بەگومان و دۆزینەوەی مانا ڕاستەقینەکانی یەزدان، بۆ ئەوەی کۆتایی بە گومان بینێت، بۆ ئەوەش ئەو تەوەرەی بتەکانی پێدەشکێنێ دەیخاتە ملی بتە گەورەکە، تاوەکو کە پرسیاریی هۆی شکاندنی بتەکانیان کرد پێیان ڕابگەیەنێ «ئەوەتا تەورەکە لەملی خوایە گەورەکەتاندایە» ئەوەش بەمەبەست هەڵوەستەکردن و گومان کردنە لەوەی بەدوای مانا بگەڕێن، گەڕان بەدوای ماناش لەو دیو تەئویل کردنی دەقەوەیە، کە زمانی دەق دەخاتە نێو بزاوتێکی بەردەوام بۆ ئەوەی بمانگەیەنێتە ناو ئەو (مانا)یانەی کە دەق لەناو زمان حەشاری داوەو تەئویل جارێکی تر ئەو مانایە زیندوو دەکاتەوە، ئەوەش ئەوێنە نەگۆڕەی گومان دەگۆڕێت، ئەو وێنەیەی بەردەوام هەوڵی دەسخەڕۆ دانی مانا ڕاستەقینەکان دەدات، بۆیە زمان ئەو توانایەمان پێ دەبەخشێت کە مانا بدۆزینەوە، دۆزینەوەی ماناش بەواتای پڕکردنەوەی ئەو ئاماژە ناتەواوانەی کە دەق بواری بۆ بیرکردنەوە خولقاندووە کە وەرگر بیدۆزێتەوە، هەر بۆیە تێگەیشتن لە ئاماژەکان دەبێ بە خوێندنەوەی فیکر، چونکە ئاماژەکان ڕووی نەبینراوی نێو زمانن لە توانایدا هەیە خۆی هەڵبوەشێنێتەوە، تاوەکو ڕووە

نەبینراوەکان دەربخات، بۆیە تەئویل بەو ستراتیژەی هەوڵ دەدات مانالەناو زمان دەربکات و دواتر لەناو کۆدێکی ڕێکخەر یەکیانبخاتەوە، لەسەر ئەو چەمکەی (پۆل ریکۆر)ەوەش تەئویلی ئاماژەی زمانەوانی دەقی (پێلاو) دەکەین، کە تەئویل ئەو توانایەی هەیە گومانەکانی خوێنەرە کەم بکاتەوە، بۆیە تەئویل کردنی ئێمە لەسەر ئەو دەقە پڕۆسەیەک نییە بۆ کەشف کردنی واتا، هێندەی هەوڵدانێکە بۆ بێ دەسەڵات کردنی گومان، ئەوەش لە ڕێگەی پرسیارکردن لەناونیشانی دەق، کە ئەو پرسیارە دەکەینە هەنگاوێک بۆڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دەق، هەر لەو پرسیارەشەوە دواجار هەوڵی کردنەوەی زمان دەدەین بۆ کۆتایی هێنان بە گومان، کەوابێ ئێستا لەناو ئەم نووسینەدا ساتەوەختی پرسیارکردنە لەناونیشانی دەق، بەمانایەکی تر ڕاستەوخۆ بپرسین:

(پێلاوچیە؟)

ئەگەر پێلاو چەند دەلالەتێک ببەخشێت، دواتر هەموو دەلالەتەکان لەوە خۆیان کۆ دەکەنەوە کە بێبەها کردنیەتی، سەیرکردنیەتی وەک کالآیەک کە دەکەوێتە خزمەتی ئەندامەکانی تری جەستە، پەراوێزێکە لەپێناو ئەوانیترا، بەواتای جگە لە بکەرێکی بێبەها بەهیچ شتێکی تر سەیر ناکرێت، بۆیە کاتێ دەبێ بە ناونیشانی دەق، بەواتای دەق لەبێ بەهایەک و پەراوێزێک دەدوێت، پەراوێزێک هەموو دەلالەتەکانی تر لە پێلاو وەردەگرێتەوەو تەنیا وەک جەستەیەکی مێینەیی بە پەراوێز کراو سەیر دەکرێت، بۆیە ژمارەی پێلاوەکان وەیلان بوون نییە بەدوای پێلاو، بەڵکو بەدوای ژماردنی ژنەکانە، بۆیە قوڵبونەوە لە پێلاو ڕۆچوونە نێو جەستەی ژنە، هەر بۆیە دواجار (ئەو) و (هیتلەر) بە هەردووکیان هەر لە شێوەی پێلاو سەیری دەکەنەوە، جەستەی ئەو بینینێک بە بەرامبەر دەبەخشێت کە بینینی پێلاوە، جەستەیەکە تەنیا بۆ بەتاڵبونەوەی غەریزەیە، پەیوەندیی ئەو دووانە دەبێ بە پەیوەندیی (ئاگر/پێلاو»، پرۆسەی تەواو بوون... پڕۆسەیەکە (ئاگر) سارد دەبێتەوە، لە (نووستن) دەیگوازێتەوە بۆ (لەپێکردن)، بۆیە زمان کاتێ ناو لەدەق دەنێ (پێلاو) مەبەست دەلالەت پێدان و سنوری ناکۆتایە بەژن بەوەی لە هەڵچوونەکان بیگوازێتەوە بۆ سیستمی زمانەوانی، بەو کارەش ئاماژە زیاد لە دەلالەتێک وەردەگرێت، نەک لەوەی لە ژنبوون دووری بخاتەوە، بەڵکو هەوڵی نهێنی ئەو ڕوو شاراوەی ژن دەدات، کە نووسین لەوە دەریدەکات تەنیا گێڕانەوەی ڕووداوبێت، بۆ ئەوەش کاتێ گومانەکان لەدەلالەتی پێلاو دەسەنینەوەو لەیەک دەلالەتەوە تەئویلی بۆ دەکەین، ئەوسا ماناکان دەردەکەون، مانای سەیرکردنی پیاو بۆ جەستەی ژن بەپێلاو بینینە، بۆیە دەق دوو جەستە وەردەگرێت، یەکیان (هیتلەر) و ئەویدیش (دۆست)ە.

بە واتای لەنێوان دوو زەمەن و ژینگەو کلتوری جیاواز سەیری دەکات، تاوەکو سنورێکی فراوانتر بەمانا ببەخشێت، بەوەی جەستەی بە پەراوێزکراو لەلایان دۆستەوە سەیری مەراق و برینە مێژوویەکانی ناکرێت، چونکە هەمان بینینی هەیە بۆ بەرامبەر، نەک لەوەی ئاگر لە جەستەی بەرامبەر بەربدەن و بیسوتێنن، بەڵکو لە خەونە شەڕانگێزەکانی نێرینەش، بە واتای (دۆست)یش خوازیارە (هیتلەر)ێکی تر بێت، بەوەی لەشی هەر ژنێک ببێ بە خاکێکی تر بۆ داگیرکردن، ئەوەش سەیرکردنی وەک یەکە بۆ ژمارەی خاک و ژمارەی پێلاو.

بۆیە دۆست دواجار دەبێتەوە بەهیتلەرو لە هیتلەر بوونی خۆیان کۆتاییان نایەت تاوەکو نەبن بەمشتێ خۆڵ، ئەوەش ئاماژەی فەنابوونی جەستەی گڕگرتووە، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ چیرۆکی دروست بوونی جیهان ئەوسا دەبێ لە بەرامبەر ئەو دوو جەستەیەدا ئاوا ئاماژە بدەیت: (ئاگر ــ ئەهریمەن ــ هیتلەرەکان)دود جەستەی مێینەکە جەستەی مرۆڤایەتیە دەبێبە (خۆڵ ــ مرۆڤ ــ ژن) هیتلەرەکان تەنیا بە بوونیان بەمشتێ خۆڵ (مردن) دەگەڕێنە وە بۆ خەسڵەتی مرۆیی، چونکە وەک پێلاو سەیری جەستەی بەرامبەر دەکات، ئەگەرچی دواجار ددنگی کارەکتەرەکە دەنگی چیرۆکنووسە لەناو دەق، بێ ئەوەی هەڵبچێت بە دۆست دەڵێ: «من لە خۆتان و ژمارەی پێلاەکانتان گەورەترم» بەوەش تەئویل لە دەلالەتی زیادەڕۆیی ڕزگار دەکات و تێگەیشتن بۆ مانا ڕۆشن دەکات، ئەو ڕۆشنایی خستنە سەر مانایەش چوونە نێو ڕەگەزو پێکهاتەکانی دەقە، تاوەکو زمان لەداخستن ڕزگار بکات و تەئویلی ئەو زمانە بکات کە لەناویدا ژنبوون ئامادەیە

**Nihad Jami@hotmail.com**

# ڕۆژئاوا لە دیدێكی ڕۆژهەڵاتییەوە

# خوێندنەوەیەكی ئیستاتیكیانە بۆ كۆمەڵە چیرۆكی پەتاتە خۆرەكان

٢-٢

حوسێن عەبدولخالیق

## بەشی سێیەم

### بەپەراوێزبوونی تاكەكەس لە ئەوروپا

بەپەراوێزبوون، بەحاشیەبوون، گوێ پێنەدان بەو ئێش و ئازارو ناخۆشییەی كە لەدەروونی هەر مرۆڤێكدا دەخولێتەوە و پێویستی پێ هەیە ئەوەی بەرامبەری هەستی پێبكات و گەر نەتوانێ لای ببا، كەمی بكاتەوە كاتێ ئەمەی بۆ هەڵنەڕەخسێ ئەوا دەروونی دەشڵەژێ و هەست بەپەراوێزبوون دەكات.

بەپەراوێزبوونی تاك لەروانگەی كۆمەڵایەتییەوە بۆ وێنە: نووسەر كاتێ باس لە ڕوداوەكان دەكات لەدەقێكی ئەدەبی، كەسێتییەكە تاوانێكی خراوەتە ئەستۆ هەرچەندە دادگا بڕیاری داوە كە بێتاوانە، بەڵام لەناو خەڵكدا هەر لە پەراوێزدایە، هەژارو نەخۆش(نەخۆشی دەروونی، شێت...) لە پەراوێزدایە.

بەپەراوێزبوون لە ئەدەبی جیهانیدا لەسەر بنچینەی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی سیماو خەسڵەتی تازە هەمیشە داهێنەرو خولقێنەرەكان دەخاتە خانەی بەپەراوێزبوونەوە بۆ نموونە هونەرمەندێكی شێوەكاری داهێنەر(كاندینسكی) لە یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو لە پیشاندانی تابلۆیەكدا، تابلۆیەكی سەرتاپاڕەش لەژێریا نووسیبووی(بەفری مۆسكۆ) لە وەڵامی پرسیارێكدا كە زۆر سادە خۆی دەنواند ئەو وەڵامەی دایەوە«سەرسام مەبن! من بەفری مۆسكۆ بەڕەشی دەبینم هەروەها هەر لەهەمان وڵاتدا ڕۆماننووسێكی وەكو (سۆلجێنستین) لەترسی نووسینەكانی دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتە ڕاوەدویان دەناو بەناچاریەوە ڕوی لە وڵاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا كرد، بەڵام دوای پیرسترۆی گورباچۆف خۆیان بەڕێزەوە هێنایانەوە.

هەڵبەتە هەوڵە تاكەكەسیەكان بۆ خۆرزگاركردن لەكۆتوبەندی دەستووره باوو سواوەكان بە ئاسانی وەرناگیرێت كەمینە لەبەرامبەر زۆرینەدا نامۆ دەبێ و دەستەو ئەژنۆ دەوەستێ، چونكە لەگەڵ ڕەوتی گشتیدا ناڕوات بێگومان ئەمەش ورەبەرزی و خۆماندووكردن و شەونخونی پێویستە بۆ دەربازبوون لەو پەراوێزبوونەدا.

ئەم حاڵە شتێكی ئاوێزەو ڕێزپەڕ نییە بەڵكو لە ئەدەبیاتی زۆربەی نەتەوەكانی جیهاندا بەدی دەكرێت لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا نووسەرێكی بەزاتی وەكو(تەها حوسێن) بۆمبێكی لە سەدەی بیستەمدا تەقاندەوە بەوەی كە دەستێكی كوشندەی لە كەلەپووری كۆنی پیرۆزی عەرەبی وەشاند كە ساڵەها بوو عەرەب شانازییان بە(موعەللە قاتولسەبعی) عەرەبییەوە دەكرد، كە گوایە نموونەی بەرزی شیعری عەرەبی سەردەمی جاهیلی بووە، بەڵام ئەو بەم ئەفسانەو بەندوباوانە هەڵنەخەڵەتا، بەڵكو بەمشتێكی دروسكراوی لەقەڵەمدان هەولێدا بیانخاتە پەراوێزەوە، هەروەها لەسەردەمی نوێشدا لە شیعری نوێی هاوچەرخی عەرەبیدا ئەدۆنیس بە پشتكردن لە كەلەپووری عەرەبی و گەڕانەوە بۆ ئەفسانە كۆنەكانی یۆنانی هەمان ڕێچكەی پێشەنگێكی وەكو تەها حوسێنی گرت.

هەروەها لە ئەدەبی كوردیدا چەندین هەوڵی لەوبابەتانەی پێشتر و ئێستاش لە ئارادابوو لە سەرەتای حەفتاكاندا بزووتنەوەی- ئەدەبی ڕوانگە- هەوڵێكی لەو بابەتەبوو بۆ شكاندنی ڕێچكە كۆنەكانی شیعر لەپاڵ ئەوە هەوڵی تاكەكەسی لێرەولەوێ بەتایبەتی لەلایەن(عەباس عەبدوڵلا یوسف و دواتر ئەنوەر مەسیفی و گروپی وێران) نموونەی لەوبابەتەن.

ئەگەرچی لە بنچینەدا هەوڵێكن بۆ خۆ ڕزگاركردن لە پەراوێزبووندا، بەڵام دیسانەوە دەكەونە خانە یەكی دیكەی بەپەراوێزبوون، لەبواری چیرۆكیشدا خۆلە قەرەدانی هەندێ بابەتی ئاوێزەی كۆمەڵایەتی و مەزهەبی كە شیرازەی خێزان تێك دەشێوێنێ بەتایبەتی لە خستنە ڕووی هەندێ بابەتی تابۆ (المحرمات) وەكو بەرەوابوونی

**بەپەراوێزبوون لە ئەدەبی جیهانیدا لەسەر بنچینەی هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی سیماو خەسڵەتی تازە هەمیشە داهێنەرو خوڵقێنەرەکان دەخاتە خانەی بەپەراوێزبوونەوە**

سێکس و کوشتنی باوک و... گەر سەیرێکی(حەسارو سەگەکانی باکم)ی شێرزاد حەسەن بکەین ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە.

برجستۆن دەڵێ: (هونەر خاوەنەکەی دەلوێنێ بچێتە ناو ناخی ژیان و واقیعەوەو پەردە لەرووی ئەو حەقیقەتانە راماڵێت کە لەودیو پێداویستییەکانی ژیانی پراکتیکییەوە حەشاردراون). (١)

نووسەر روبچێتە ناو کێشەو راستییەکانی ژیان ئەوکاتە بەرهەمەکەی رۆحێکی تێدا دەبزوێ، ئەو لایەنانەی کە پێشتر باسمان لێوەکرد(دەربارەی بەپەراوێزبوونی دەروونی و کۆمەلایەتی و فیکری، ئەوانەو چەندانی دیکەش دەگەرنەوە وەکو قەومی و شارستانی...) دەیکاتە بابەتێک بە بینینی خۆی دایدەرێژێ بەتایبەتی گەرهاتوو بەرهەمەکە(خرۆشێکی نوێ لە کارەکەیدا هەڵقوڵێت بەچەشنێک کە هەستێکی نوێ لە دەروونماندا بخولقێنێ، یان خرۆشێکی وەها ئافەریدە بکات کە لەوەپێش بە خەیاڵماندا نەهاتبێ) (٢).

ئەو فیکرەی برجستۆن ئەوە دەگەیەنێ چیرۆکنووس ئەوکاتە بەرهەمەکەی جوان و پوختتر دەبێت گەرهاتوو بەسەر شێوازی پێشخۆی تێپەرێ و هەنگاوێکی نوێی هاوێشت، وەک ئاوی گۆمێک کەزوو بۆنی دەگرێ و بەکارنایەت نەبێ، بەڵکو بەردەوام لە رۆیشتندابێ و بەجۆرێک تازەبێ و درکمان پێ نەکردبێ.

ئێستاش کورتەیەک لە کورتە چیرۆکی(**پەراوێزەکانی ئەوروپاو**) چەند روونکردنەوەیەک.

کوردۆ کە پاڵەوانی چیرۆکەکەیە رۆژێک لە لاپەرەی رۆژنامەکەیدا لە گۆشەی یەکتر ناسیندا ئیعلانێک دەخوێنێتەوە، کیژێکی قژ زەردی چاوشین لەژێر وێنەکەی خۆیدا نووسیویەتی کە خەڵکی(سکاکن)ەو حەزدەکات پیاوێکی قۆزی رۆژهەلاتی خوێن گەرم بناسێت، دەستی هونەری هەبێت، ئیدی(کوردۆ) ناوی خوای لێدێنێت و پلیتی چوون و گەرانەوە دەبرێت و بەرێکەوت لەناو شەمەندەفەرەکەدا چاوی بە پیرەژنێکی تەمەن(٦٥) ساڵە دەکەوێت، تەعاروف دەکەن، قسەو باسی زۆر لەنێوانیاندا روودەدات تا دەگەنە شاری(سکاکن)و لەوێ(کوردۆ) سەری سوردەمێنێت کە پیرەژنەکە خۆی لێ ئاشکرا دەکات و باس و خواستی وێنەی کچە قژ زەردو ناوو ناونیشانەکەی بۆ دەگێرێتەوە، تا ئەویش بێکەس و تاک و تەنیایی و گۆشەگیری خۆی بەو شێوەیە پڕ بکاتەوە. بۆیە کوردۆ بریار دەدات لەگەڵ(بیرگێت)دا بمێنێتەوەو پلیتی گەرانەوەکەیشی دەدرێنێت و دەڵێت(هیچ نەبێت بۆ فێربوونی زمان، باشەو«لەگەڵیدا دەژیم».

تاککەسی ئەوروپایی تەنیایە، لە پەراوێزدایە. بەهەمان شێوە پەناهەندەی کورد.

چیرۆکی پەراوێزەکانی ئەوروپاو راڤەکردنێکی کورت: کوردۆی پاڵەوان(بەرای موکەرەم تاڵەبانی: رەمزی ئەو کوردانەیە دەچنە ئەوروپاو زۆر بەزەحمەت هاودەمێک پەیدا دەکەن و هەرشتێک بدۆزنەوە پری دەدەنێ، ئەگەر شتەکە لە پەراوێزی ژیانی ئەوروپاشەوە بێت)(١).

تاکی ئەوروپایی تەنیایە هۆکارەکانی زۆرن یەک لەوانە شیرازەی خێزان وەکو ئێمە نییە، مناڵ کە تەمەنی دەگاتە هەژدە ساڵ بەتەنیا دەژی.

کاتێ کوردۆ لەگەڵ پیرەژنەکە دەدوێت و لێی دەپرسێت کە چ جۆرە رەسمێک دەکەیت، خانم؟

ئەویش وەلامی دەداتەوە دەڵێ- رەسمی تەنیایی!

تەنیایی تاقە بابەتێکی رەسمکردنی منە. ئافرەتەکە باس لە تەنیایی دەکات و بەهەمان شێوە پەناهەندەش لەناو جیهانێکە نایانناسێ حەتمەن خۆشی تەنیایە، ئەنجامی ئەوەیە کە هەردووکیان لەیەک دەگەن و لە تەنیایی یەکتر ورد دەبنەوە.

پاڵەوان ناوی(کوردۆ)یە، هەڵبژاردنی ئەو ناوەش لەوانەیە کورتکراوەی ناوی کوردبێ، ئەوی دیکەیان پیرەژنەکەیە گوزارشت لەتاکی دانیمارکی دەکات.

لێرەدا کەسایەتی کوردۆ نقومی کێشەی خودی و دەروونی و کۆمەلایەتی و کولتووری بۆتەوە، هەست بەنارەحەتی و پەراوێزبوون و دابران دەکات و خۆشی تێناگات کەچۆن ژیان بەسەر دەبات: لە ئاوارەییدا، لەژیانی مەهجەر، لە

تاراوگـەدا، چیـرۆکنووس بەوردی ئامـاژەی حاڵەت و باری سـایکۆلۆژی و خوونەریتی ئەو کـەسـە دەکـات، کـاتێ کـە دیالۆگ و قـسـە گۆڕینەوە لەنێوان کوردۆو پیرەژنەکە رووددەدەن بۆ وێنە پیرەژنەکە بە کوردۆ دەڵێ:

(تۆ ناتوانی بچـیـتــە بنج و بنەوان و ناواخنەکەی)

(خوێنەر کە ئەم دیالۆگە دەخوێنێتەوە رەنگە بەشتێکی سادەی بزانێ، بەڵام لەناوەڕۆکیدا وانییـە، بەم دەربڕینە چیرۆکنووس یەکێک لە خەسڵەتە هەرە باوەکـانی مـرۆڤی کـوردی دیاریکردووە کە بەدرێژایی زەمەن لەگەڵیەتی، ئەمیش رواڵەت خوێندنەوەیە، بەدەر لە چوونە ناو کرۆکی پرسەکان(١).

مـرۆڤی کـورد بەگـشـتی دەتوانین بڵێـین بەچاوێکی رووی دەرەوەی شـتـەکـان دەنۆڕێ و بێ هەڵسـەنگاندن و راڤـەکـردن بۆیە ناشێ لەناناگاییەوە پیـرەژنەکە ئەم قسەیە بەگەنجە پەناهەندەکە بڵێ...

کوردۆ کە رەمزە بۆ تاکی کورد لەدیدی خۆی دایناوە مـرۆڤی ئەوروپایی لە بەهەشت دەژین و هەمـوو شـتێکیـان بۆ ئامـادە کـراوە، کـەچی بەپێچەوانەوەیە ئەگەر گرفتەکانی ئێمە تەنها کـۆمـەڵایەتی و جـەسـتـەیی بن، ئەوا کـێـشـەی ئەوان رۆحی و فـیـکرییـە، رۆحیـان تەنیـایە بۆ نموونە:

(تەنانەت وەک وتم هەمـوو ئەوروپا هەست بەم تەنیـاییـە دەکـەن). بۆ هەمـان مـەبەست لە شوێنێکدا کوردۆ لەدڵی خۆیدا وتی: ئەمدەزانی ئەوروپا هێندە زەبوون و تەنیـا و کـەسـاسـە، هەمـان کـێـشـەیان هەیە. وەکـو وتمان هەر خاسیـەتێکی (کوردۆ)ی پاڵەوان ئاماژەیەکی ناڕاستەوخۆیە بۆ خەسڵەتەکانی مرۆڤی کورد

زۆربەی زۆری ئەو خـەڵکانەی کـە بۆ دەرەوە دەچن، بۆ ژیانی تاراوگە بەتایبەتیش لاوان، بە مـەبەسـتی ئەوەیە ژیانێکی چاکـتـر بۆخـۆیان ئامـادە بکەن(سـێکس رەنگە یەکـێک بێ لەو کێشە بنەڕەتیانەی بۆشاییەکی گەورەی لەبنیای مـرۆڤی کـورد دروست کـردبێت، جـا ئەمـیش بە هەرهۆیەکەوە بێت)(٢).

کورە کوردەکە وەکو هەموو تاکێک کەرووی لە هەندەران کردووە ئەم کێشەیە روبەڕوی بۆتەوە، کاتێ دەڵێ....

کـەواتە کـوردیش هێندە بەدوای بەرژەوەندیە زاتیەکانی وێڵە هێندە خەمی گەلەکەی نییە!

پەراوێز نووسین یەکـێکە لە شـێـوازە هەرە نوێیەکانی چیرۆکەکە، پەراوێزەکان هەندێکیـان وەکـو رونکردنەوەیەک بۆ شـتـەکـان وایە، هەندێکی دیکە پەیوەندی راسـتـەوخـۆی بە چیـرۆکـەکـەوە هەیە، نموونە بۆ یەکـەم وەک لە پەراوێزی ژ(٥)لەلا(١١) دا هاتووە:

کـوردۆ لەناو خـۆیدا کـەمـێک داشکایەوە، هەستی کرد نوقتـەیەکی لاوازی ئەمی درکـاند ئایا مەبەستی چییە.....

وێنە بۆ راسـتـەوخـۆکـە لەپەراوێزی ژ(٨)لەل٧٦دا هاتووە: پیرەژن کاتێ گەڕایەوە، بەپەلەپرووزێ، دەستی بۆ جانتاکانی سەرەوە درێژ کردو بە کوردۆی گوت:

- هەڵسە! گەیشتین

سکاکن!؟

- بەڵێ، ئا. دەی خۆت کۆبکەوە! پێم بڵێ، حەزدەکەی رێبەرایەتیت بکەم لەشارەکەی خۆم؟

- بەڵێ ئەگەر سەغڵەت نابیت و لەوەختت ناگرم.

- بەخۆشحاڵییەوە، تۆ لێرە غەریبیت.

مەبەستمان لەو راستەوخۆیە چییە، گەربێتو لە پەراوێزدا نەنووسرابا بەتایبەتی لەو شوێنەی پاش- دەچمە توالێت ٨ .....

کـەمـێک مـژاوی دەبوو، بەڵام ئەوەی کـەبۆ روونکردنەوەی شـتـەکـان! دەکـرێ نەنووسرێ، تەنهـا بینینەکـانی نووسـەرە بۆ خـوێنەر روونەدکـاتەوە لەهەمـان کـاتدا بینینەکـان فەلسەفین کاتێ دەڵێ:

دەبێ مەبەستی پیرەژنەکە ئەوەبێ«کە ئێمەی کورد لە وڵاتی خۆماندا، تەمبەڵ و گەودەن، هەر خـەریکی شـەڕ، ژن و ئافـرەتەکـانی خـۆمـان بەسـتـۆتەوەو دەتێن لێـرە(لەئەوروپا) بەدوای سێکس و ژن و عەقڵ و ئاسوودەییدا دەگەڕێن، یان مەبەستی ئەوەیە کە بەکوردۆ بڵێ«فەرموو، ئەوەتا ئەنجـامی ئەوەی کـە تۆ وڵاتی خـۆتت جێهێشتووەو ئەوروپات بە بەهەشتی سەرزەمین زانیوە».

کەواتە خۆی چیرۆکەکە بەناوی پەراوێزەکانی ئەوروپایەو پەراوێزیش بۆ چیرۆک بەکار هاتووە

**لێرەدا کەسایەتی کوردۆ نقومی کێشەی خودی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و کولتووری بۆتەوە**

شتێکی زۆر جوان و پڕ ماناو هارمۆنییەتیشە لەهەمان کاتدا.

ئایا کوردۆ موعجیزەیە؟ بەڕاستی پەراوێزەکانی ئەورووپا نایەوێ باسی موعجیزاتمان بۆ بکات، بەڵکو لە نموونەکانی ئەو چیرۆکەی کە بۆمان دەڵێ چیرۆکی کوردۆ نییە وەکو تاک، بەڵکو چیرۆکەکەی وەکو رەمز، رەمزە بۆ جیلێک بۆ رۆژئاوا بەرێ دەکەون، لەوێ لە پەراوێزدان یان بەشێوەیەکی کامڵتر بڵێین لە پەراوێزی پەراوێزانەوە دەژین، چونکە ئەو ئیش و کارەیان بۆ دەست ناکەوێت کە پێی قایلن ناچارن لەگەڵ پیرەژنێک وەک(بێرگێت)دا بژین.

کوردۆ لە جێگایەکدا وەک دیارە پلیتی گەڕانەوە ددڕێنێت و دەڵێت «هیچ نەبێ بۆ فێربوونی زمان، باشەو» «لەگەڵیدا دەژیم».

**بێکاری و بەپەراوێزبوونی و نامۆبوونی تاکەکەس لە ئەوروپا، لە چیرۆکی (لامارتین) دەردەکەوێ**

بێکاری و بەپەراوێزبوونی و نامۆبوونی تاکەکەس لە ئەورووپا، لە چیرۆکی (لامارتین) دەردەکەوێ، چیرۆکەکە لەشێوەی گێڕانەوەو بەڕاناوی یەکەم کەسی قسەکەر دەست پێدەکات و دواتر لەشێوەی(دایەلۆگ)دا بەردەوام دەبێت و ناوە بەناوە،لەنێوان پەرەگرافی وتووێژەکاندا چیرۆکنووس دێتە ناو چیرۆکەکەوەو رێگە بۆ وتووێژێکی دیکە خۆش دەکات.

کەسایەتییەکە ماوەیەکە لە پاریس بەدوای کار دەگەڕێ دەچێتە ئاژانسی Anpe بەڵکو کارێکی دەست بکەوێت کەچی ئەوکەسەی کە پێشوازی لێدەکات ئافرەتێکە، پرسیاری لێدەکات. گوایە شارەزایی لەچ بوارێکدا هەیە لە وڵامدا دەڵێ: شیعر، یەکەم جار گوێی پێ نادات لە دواییدا دەڵێ: ئێمە وەرتدەگرین بە مەرجێک سێزدە هەزار فرەنک بنوێنێت نازانم چی و چی؟!

ئەویش ناچار دەبێ بڕوا، چونکە ئەو داوایانەی ئەوان دەیکەن پێی ناکرێ جێبەجێیان بکات، لەپاشان چیرۆکنووس ڕووی کامێراکە دەبات بۆ سەر شەقامێک دەبینێ پاڵەوانەکەی لە تەک پەیکەرێکی شاعیری فەرەنسی (لامارتین)ە، پاڵەوان لەگەڵی دەدوێ.

دەردەکەوێ ئەویش وەکو ئەو کەس نایناسێت و پارەی بە زەحمەت دەستدەکەوێت، نوسەر دەیەوێت ئەوە نیشان بدات کە پەناهەندە بێ کارە، کەس نرخی نازانێ لەلایەکی ترەوە لەو سەردەمە زۆر بایەخ بە شیعر نادرێ بەراوردکردن لەگەڵ سەردەمی لامارتین.

لامارتین و پەناهەندە و شیزۆفرینیا، دەچنە ناو رێبازی (داداییزم)*ەوە ئەم رێبازە هەموو پێوەرێکی ئایدۆلۆژی و ئیستاتیکی سەردەمەکەی خۆیان رەفز دەکەنەوە، ناماقولیەتی سەردەمە پڕ جەنگەکەی خۆیان دەردەبڕن.

تاک لەتاراوگەدا تووشی حاڵەتێکی ناخۆشی و دارمانی نەفسی بەهۆی ئەو گۆڕانکاریە سەیرو سەمەرانەی لەژیاندا دوچاری دەبێت.. دەکەوێتە حاڵەتی نامۆیی.

(نامۆبوون: واتە لەدەست چوونی دەسەڵات و گۆشەگیری و تورەیی و رق هەستان و پچڕان و تێکشکان لەواقیعی ژیان)(١).

تەوەری چیرۆکی (شێر)یش لە نامۆیی و بزربوونی تاک لە تاراوگەدا دەسوڕێتەوە.

ئەو ونبوونە لە ئەنجامی نامۆبوونەوە دروست دەبێت بۆ دۆزینەوەی خۆی یاخود کەسێتی خۆی پێویستی بە گەڕانەوە بۆ رابردوو هەیە.

(پۆل رێکۆر (١٩١٣) دەڵێت: مرۆڤ کەسایەتی خۆی لە رێگەی گێڕانەوەی مێژوو بەیەکەوە دەدۆزێتەوە)(١).

(رێبوار سیوەیلی)یش جگە لە ڕابردوو و مێژوو، زمانیش زیاد دەکات و دەڵێت: بۆ ئەوەی ئێمەی مرۆڤ بوونی خۆمان بسەلمێنین دەبێ مێژوویەکمان هەبێ و خاوەنی زمانێک بین(٢).

(شێرزاد) کە پاڵەوانی چیرۆکەکەیە، بەم جۆرە چیرۆکەکە دەست پێ دەکات:

لەبەر پەنجەرەی ژوورەکەیدا کزە بایەکی سارد لەسەرو قژی دەدا؛ غەمگینانە، تەماشای توالە بەفرە ئەستوورەکەی بەردەم پەنجەرەکەی دەکرد و لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

(تەواو ئیتر لەمەودوا ژیانم هەمیشە ئەم پیاسە ساردو غەمناکەیە) (لەم ژوورە بچوکەوە بەرەو سەربان، لەسەر بانیشەوە بەرەو ژوورەوە) (وەک زیندانی کراوێک).

(شێرزاد) مرۆڤێکە هەست بەشکان و دارمان دەکات، خۆی لە تاراوگەدا وەکو زیندانی کراوێک دێتە بەرچاو ژیان لەوێ تەنها لە چونە

سەربان و هاتنە ژوورەوەیەکی بێتام و ڕۆتینی دادەبینێ.

ئەوکاتانەی بۆ پەناهەندە دانراوە، چونە دەرەوەی ئەوەندە سەعاتە بێت، هاتنەوەی بە پاپۆڕ (کاتێ سەر لە هاوڕێیەکی دەدا) سەعات (٦،٥) گەر ئامادەنەبوو، پاپۆڕ بەجێی دێڵێ، ئەو لەسەری ڕانەهاتووە نەک هەر ئەمە بەڵکو چەندەها ئیلتیزاماتی دیکە هەیە ناگونجێ لەگەڵ ئەو ڕەوشەی کە ئەو تیایدا گەورە بووە.

چیرۆکی (شێر)ی د. فەرهاد پیرباڵ یەکێکە لەو چیرۆکانەی کە لەدوورە وڵاتی نووسراوە لەم چیرۆکەدا چیرۆکنووس کەسێتیەکی دوانەیی خوڵقاندووە.

(وێنەیەک لە ئێستاو وێنەیەکیش لە ڕابردوو، کە لە ڕێگەیەوە دەیەوێت تاقە گوتارەکەی خۆی بگەێنێت)(١).

واتە فلاش باگ، گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، باس لە نۆزدە ساڵ لەوەو پێش دەکات «زۆر سەیرە! ئەمڕۆ نێوارە لەبەردەم ئەم ئاوێنەیەدا بەم سەرو پۆتەلاکە شێواوەی خۆیەوە، بەم ڕۆحە پەژموردەیەی خۆیەوە، هەر بە تەواوەتی لەو شێرە ماندووە تێکشکاوە دەچێ، کەنۆزدە ساڵ پێش ئەمڕۆ لە گوندەکەی خۆیاندا بینیبووی».

وەسفی شێرەکە دەکات، لەڕابردوو ڕویداوە دەیشوبهێنێ بەخۆی، لەوکاتە دایکی سێوێک و لەتە مریشکێکی بۆ شێرەکە بردووە.

لەڕێگای ئاوێنە چوارگۆشەکەوە خۆی دەبینێ کە چەند سیمای تێکچرژاوە، زۆر جوان وەسفی خۆی دەکات، جگە لەو وێنەیەی (شێر) کە هاوتەبای خۆیەتی و بونی سێو و لەتە مریشکی برژاوی سەرمێزەکە ڕابردووەکەی دێتەوە یاد، ئاوێنەکەیش کاتێ مرۆڤ خۆی لە ئاوێنەدا دەبینێ شێوەی خۆی و باکگراوندەکەی پشتی دەردەچێ ئەوەیان گوزارشت لە ڕابردووی دەکات.

(بەهۆی سوود وەرگرتن لەمۆنتاژ و هونەری (سینەما)وە بۆ خۆی دروستکردووە هەربەهۆی هونەرەکانی (سینەما)وە وێنەی تری (ئێستاش) بۆ خۆی چا دەکات ئەوەتا لەشوێنێک وەسفێکی زەبونی خۆیمان دەداتێ)(١).

لەسەر بەردێک دانیشتبوو: خۆی لەسەرمان وێک هێنابۆوە بە دەم بیرکردنەوە سنگی دانوشتاندبۆوە و تەماشای مریشکێکی لاوازو بێ هێزی دەکرد کە لە پەنا بەردێکدا بەدوای کرم و دانەوێڵە دەگەڕا.

مریشکێکی زەبون لەدوای دانەوێڵەدا گەڕاو، وێنەی خۆیەتی، وێنەی ئێستای ژینی تاراوگەیەتی.

گەڕانەوەش بۆ ڕابردوو خاڵێکی دیاری ڕۆمانسیەتە، چیرۆکنووس ڕۆمانسیەت و خەیاڵ و فەنتازیای بەکارهێناوە لەهەمان کاتدا واقیعبینانەشە.

## بەشی چوارەم
## ململانێی تاکە کەسی کورد لەگەڵ شارستانیەتی ئەورووپایی و لەگەڵ سیستەمی ژیانی ڕۆژئاوایی

کورد یاخود هەر تاکێک لە ڕۆژهەڵاتدا بەرەو ڕۆژئاوا بڕوات، لەوێ لەتاراوگە، لەژیانی پەنابەرایەتی، لە غەریبی، لە ئاوارەیی و مەهجەر توشی چەندەها حاڵەت وڕووداوی ناخۆش دەبێت، چونکە خۆی (بونەوەرێکی هەراسان و بێزارو فەرامۆشکراوە، تا ئەوپەڕی خەفەبوون، دەروونی خەفەبووە و گەشتوتە قۆناغێکی گەورەی شەڕانگێزی)(١).

کاتێ دەچێتە تاراوگە ڕاستە ئەوێ جیهانی ئارەزووەکانە، جیهانی ئازادی و ڕۆشنبیری و ماف و مەدەنییەتە، بەڵام بە ئاسانی ناگاتە ئەو پلەیەی کە کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی پێی گەیشتووە، تەنها لەدوای کارو بژێو پەیداکردن و بەهێمنی ژیان بەسەربردن و هەندێک فێربوونی زمان دەگەڕێت.

زۆربەیان شتە باشەکانی ئەوێ وەرناگرن!؟ بۆ وێنە ئەو باوک سالاریەی لە ڕۆژهەڵاتدا لێی ڕاهاتووە، هەمان ئەوە چووەتە تاراوگە، نابێ ئافرەت لەدەرەوە کار بکات! هەموومان ئەو حەقیقەتە دەزانین.

ڕۆژێک لە ئافرەتێکی کوردم پرسی کە چەند ساڵێکە لە هەندەران دەژێت پێم وت: تۆ لە ئەڵمانیا چ کارێک دەکەی، یاخود ڕۆژانەت

**(ڕێبوار سیوەیلی)یش جگە لە ڕابردوو و مێژوو، زمانیش زیاد دەکات و دەڵێت: بۆ ئەوەی ئێمەی مرۆڤ بوونی خۆمان بسەلمێنین دەبێ مێژوویەکمان هەبێ و خاوەنی زمانێک بین**

بەچی بەسەر دەبەیت؟ وەلامی دامەوە: «هەرلەماڵەوەم، پیاوەکەم ناهێڵێ کاربکەم، تەنانەت دەستکەوتی ئەویش بەشمان ناکات!؟

واتە دەیەوێ لەسەر هەمان رەوشت بێ کە لە رۆژهەلاتدا فێری بووە یان وەری گرتووە، ئەمە خاڵێکە ناگونجێ لەگەڵ سیستمی ژیانی ئەوێ، ئەوەو سەدان نموونەی تر.

هەروەها (دژایەتیکردن و بەسوک سەیرکردنی پەنابەران لە جیهاندا بۆتە دیاردەیەکی سیاسی و کۆمەلایەتی و میللی)(١).

لەبەر ئەو جیاوازیانە لە کلتورو سیاسەت و زمان و رۆشنبیری و بیرکردنەوە.. هتد ئەنجامەکەی ململانێ دروست دەبێت.

نوسەران و شاعیران و روناکبیران جا چ خۆیان بەسەریان هاتبێ یاخود بۆیان باس کردبێ، دایانرشتووە بەشێوەیەکی ئەدەبی بۆ ئەوەی ئەدەبێکمان هەبێ پێی بلێین تاراوگە، یا ئەدەبی دورە ولاتی. هەروەها راستیەکان بە خەڵک رابگەیێن بۆ وانە وەرگرتن لەژیانی ئەوان و چێژێک ببەخشێ و نەوەکان هۆشیار بکەن.

بێگومان لەدایکبوونی (ئەدەبی نوێی کوردی)یمان پەیوەندی بەونووسەرو روناکبیرانەوە هەیە کە لە دورە ولاتیدا دەژیان بەماوەیەکی کەم یا زۆر، بەویستی خۆیان چووبن، یا ناردێنرابن یاخود هەلاتبن لەدەست سیستەم و شەڕو نەبونی ئازادی لەولاتی خۆیاندا.

**لەدایکبوونی (ئەدەبی نوێی کوردی)یمان پەیوەندی بەونووسەر و روناکبیرانەوە هەیە کە لە دورە ولاتیدا دەژیان بەماوەیەکی کەم یا زۆر، بەویستی خۆیان چووبن، یا ناردێنرابن یاخود هەلاتبن لەدەست سیستەم و شەڕو نەبونی ئازادی لەولاتی خۆیاندا**

بۆ رۆشنایی چاومان دێڕێکی حاجی قادری کۆیی دێنینەوە کە گوزارشت لەناخۆشی (ژیانی تاراوگە دەکات و بەهیوای گەڕانەوەیە دەڵێ:

«مودەدەتێکە دەربەدەر کردەی ولاتی غوربەتم
بەندە یادی ئاستانی بۆسی ئەتوی کورد هاتەوە»(١).

(پیرەمێردو مستەفا شەوقی و محەمەدی میهری و زێوەرو ساڵح بەگی ساحێبقڕان و ع.ع هەکاری و دەیانی دیکە لە ئەستەمبوڵ ئەحمەد رامزی زادەو میقداد مەدحەت و چەندی دیکە لە قاهیرە، عەبدولڕەحمان بەدرخان و حیکمەت بابان و شەریف پاشا لەژنێف- پاریس- فۆکستۆن... هتد)(٢)، بەرهەمەکانیان دەچێتە قاڵبی ئەدەبی تاراوگە.

لەبەشەکانی پێشتر باس لەسێ چوار چیرۆکمان کرد، خۆگونجاندن لەگەڵ ژیانی رۆژئاوایی و کەوتنە پەراوێزا لە چیرۆکی پەراوێزەکانی ئەوروپا، دۆزینەی کارو لەدەستدانی کەسایەتی ونبوونی خۆر لە لامارتینیدا، دیسان ونبون و خۆ ونکردن و لە ئەنجامدا شێت بون لە شیزۆفرینیادا.

چەند لاپەڕەیەکم هەڵداوە وشەیەکی گەورە و پرمانا هاتە بەرچاوم پەناهەندە، چیرۆکێکی پێکەنیناوی و (گەمەیەکی ئەدەبیە، هەم ئەرکێکی گەورەی دەروونی لەشان گرتووە هەمیش وەک چیرۆک دەخوێنرێتەوە)(٣).

کورتیەکەی ئەمەیە:

پەناهەندەیەکی کورد یازدە ساڵە لە ئەڵمانیا دەژیت و هێشتا مافی پەناهەندەی بۆ دەرنەچوە بەم دواییە ئەقڵی تێکچوە. دوێنێ لە گازینۆیەکی شاری میونخ دا پۆلیس بینیویانە کە داوای دە مۆزی کردووە. پاشانیش مۆزی یەکەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی دووەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی سێیەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی چوارەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی پێنجەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی شەشەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی حەوتەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی هەشتەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە، مۆزی نۆیەمی خواردووە پەلکەکەی فڕێ داوەتە سەر شۆستەکە.

گارسۆنەکە لەناکاو هاتەوە لای. رووی لە پەناهەندەکە کرد، بە توڕەییەوە وتی: کاکە تۆ بۆچی مۆزی یەکەمت خواردوو پەلکەکەت فڕێ دایە سەر شۆستەکە...هتد.

کەلەپچەیان لەدەستی پەناهەندەکە کردو راپێچیان، بە سواری جێبێکی پۆلیسیەوە بردیانە پۆلیسخانە.

ناونیشان گوزارشت لەناوەرۆکی چیرۆک دەکات، لەسەرەتادا کاتێ گارسۆنەکە دەپرسێ چی دەخۆیتەوە؟ پەناهەندەکە دەڵێ: دە مۆز!

ئایا مۆز دە خورێ یان دەخورێتەوە!
بەڕای محەمەد فەریق (گەر لە (میونخ) لە گازینۆ مۆز بفرۆشن ئەدی (خواردنەوە) لەکوێ دەفرۆشن؟ ئەی میوە فرۆشەکان چی دەفرۆشن؟! وەک لای خۆشمان بەسەبەتە یان بەقاپ و بەلەمی نایاب پێشکەش دەکرێت)(١).
یازدە ساڵ چاوەڕوانی بۆمافی پەناهەندەیی! کەچی ماوەی چاوەڕوانی لەئەلمانیا لەمانگێکەوە بۆ دوو ساڵ دەخایەنێ، دیارە بۆ خۆی نەگونجانی لەگەڵ شارستانیەتی ئەوێ توشی گیروگرفت بووە (هێمایەک لەتەک ناوی دراوە لە پۆلیسخانە) ئەو جۆرانە مافی پەناهەندەییان دوا دەخرێ.
هەست بە بێزاربونی پاڵەوان، پەلک فرێدانی سەرشۆستە بێ هودەیی و بێ تاقەتی کەسێتییەکەیە.
کاتێ پەناهەندە دەخوێنێتەوە ئاگاداری چەند شتێک دەبی نەختێ زێدەڕۆیی تێدا کراوە، لەگەڵ باوەڕی تۆدا یەک ناگرنەوە وەک دە مۆز داوا دەکات....
لەوانەشە لەبەر ئەوەبێ گەر مرۆڤ غەمبار بوو زۆرخۆر دەبێت. لەلایەکی ترەوە پۆلیس و T.V و رادیوو رۆژنامە بەکارێکی وا بچوک دەشێوێ و بلاوی دەکاتەوە، نوسەر قەزیەکەی گەورە کردووە، خوێنەر مژیل (غافل) دەکات.
دوبارەبوونەوەی وشەکان و پەیڤەکان ودوبارەبوونەوەی ژمارەکان دەلالەت لە بێزاری و ژیانە رۆتینیەکەی تاک بەیان دەکات و ئایا تاچ رادەیەک گوێگر ئارامگرە (کە ئەمەش دەبێتە تاکە چیرۆکێک مامەڵە لەگەڵ دیوی ناوەوەی بەشی ئارامگریی دەروون بکات بۆ مومارەسەکردنی (من) لەگروپی خوێنەردا بۆ خوێندنەوەی تەواوی چیرۆکەکە)(١)
خاڵێکی تر دێتە بەرچاو ئەویش بەراورد لەنێوان کۆمەڵی رۆژهەلاتی و کۆمەڵی رۆژئاوایی، قەزییەکی وابچوک لەلای رۆژئاوا یا ئەوروپا بە تایبەتی، گرنگی پێ دەدرێ، کەچی لەنا رۆژهەلات یا کورد بەتایبەتی بەهەند وەرنەگرتنی شتەکان. روداو و کارەسات وەک عەبدولقەهار نمونە دێنێتەوە روداوی ئەنفالی لای خۆمان.
لەپاشان پەناهەندەکە رەفزی ئەو کارە دەکا کە کردوویەتی، کاتێکیش لە ئافرەتەکە دەپرسن کە دەمێکە لە تەنیشتی دانیشتووە. لەترساناو لە ئەنجامی شڵەژانی باری دەروونییەوە دەڵێ «نەم بینیوە».
(وەرنەگرتن و باوەڕ پێ نەکردنی یەک ئافرەتە وەک شایەت لەکاتی زۆر تەنگاویدا)(٢).
خۆی دولایەنی پەیوەندیەکانی شارستانی (واتە هەبونی ئافرەت و پیاو) لە چیرۆکدا پێویستیەکی هونەری و رەمزییەتە(٣).

لە کۆتاییدا هەر ئەوخەتابار دەکەن و گوێ لە قسەکانی راناگرن ئینجا فرێی دابێ یان نا هەر دەیبەن بۆ پۆلیسخانە و بەشێتی لە قەڵەم دەدەن، خۆ پۆلیسخانە نابێ بڕیاربدا شێتە یاخود عاقڵە، ئەوە کاری پزیشکی دەروونییە، لێرەدا مانای نەگونجانە، تاک لەگەڵ ژیانی رۆژئاوا ئاخۆ یازدە ساڵە دەبێ نەزانی پەلکی مۆز لەکوێ فرێ دەدەن.
وەک نوکتەیەکی سەر پێیە ،کاتت زۆر ناگرێ، بەشێوەیەکی ئەدەبی جوان نوسراوە.

**ئەنجام:**
١- مرۆڤەکان یان پاڵەوانی سەرجەم چیرۆکەکان، لەژێر فشاری گەمارۆی تەنگو چەڵەمەکانی چەرخ، دەناڵێن و ئازار دەچێژن.
٢- ئەوروپا، وەدیهێنەری خەونی رۆژهەلاتییەکان نییە، چونکە ئەوانیش واتا رۆژئاواییەکان بەگرفت و خەم و دەردە کۆمەڵایەتی و تایبەتییەکانی خۆیانەوە دەتلێنەوە و ژیان خۆی لەخۆیدا دۆزەخێکی هاوچەرخە.
٣- چەند جۆرە تەکنیکێک دەست نیشان کراون، کە لە نووسینی کورتە چیرۆکی کوردیدا پێشتر بەرچاو ناکەون وەکو: لە چیرۆکی (شیزۆ فرینیا) و (پەراوێزەکان)دا دەردەکەوێت.
٤- لە هەردوو چیرۆکی (ڕاکردوو) و (لامارتین)دا تەکنیکێکی فانتازیای بەکارهێناوە کە جوانییەکی نوێی داوەتە چیرۆکەکان.
٥- کاریگەری نێگەتیڤی ژینگەو پێکهاتەی کولتوری و دەروونی و کۆمەڵایەتی ئەوروپا هێندە بەهێزە تەنانەت پاڵەوانی چیرۆکەکانی تووشی باری دەروونی و سەرگەردانی و خەمۆکی کردووە وەک لە چیرۆکەکانی: پەراوێزەکانی ئەوروپا، لامارتین، پەنا هەندە، شیزۆفرینیا.

**پەراوێزکان**
١٨- کەمال مەمەند میراودەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر، ل١١٣.
١٩- هەمان سەرچاوە، ل١١٩.
٢٠- موکەرەم تاڵەبانی، پەراوێزەکانی ئەوروپاو چەند سەرنجێک، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ (١٤٩)، ١٩٩٩.
٢١- سەدیق سەعید رەواندزی، خوێندنەوەیەک بۆ چیرۆکی پەراوێزەکانی ئەوروپا، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ(١٨١)، ٢٠٠٠.
٢٢- هەمان سەرچاوە، ل٣٧.

٢٣- ئەم ڕێبازە لەساڵی (١٩١٦) لەسویسرا، لەلایەن نووسەرو ڕۆماننووسی گەورە (ترستیان تزارا) ڕاگەیێنرا.
٢٤- ئەسکەندەر جەلال، کەسیەتی دووانەیی چیرۆکی (شێر)، گ. ئێستا، ژ(١٥)، ١٩٩٨، ل٢٣.
٢٥- ئەسکەندەر جەلال، کەسیەتی دووانەیی چیرۆکی (شێر)، گ، ئێستا، ژ(١٥)، ١٩٩٨، ل٢٣.
٢٦- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.
٢٧- ئەسکەندەر جەلال، کەسیەتی دووانەیی چیرۆکی (شێر)، گ. ئێستا، ژ(١٥)، ١٩٩٨، ل٢٥.
٢٨- ئاسۆ جەبار، کۆچ و سەفەر، ل٢٢٥.
٢٩- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٢.
٣٠- مەسعود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، ل١٩٠.
٣١- د. فەرهاد پیربال، ئەدەبیاتی دوورە وڵاتی، گ. ڕامان، ژ(١٨)، ١٩٩٧، ل١٧٠.
٣٢- عەبدولقەهاری شێخ، (پەناهەندە) و دیوێک بینینی (من) لەگرووپی خوێنەردا، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ (٧٦)، ١٩٩٨.
٣٣محەمەد فەریق حەسەن، پەناهەندەم خوێندەوە، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ(٦٢)، ١٩٩٨.
٣٤- عەبدولقەهاری شێخ، (پەناهەندە) دیوێک بینینی (من)، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ(٧٦)، ١٩٩٨.
٣٥- هەمان سەرچاوەی
٣٦- جورج طرابیشی، شرق و غرب/ رجولە وانوثە، ص١٧.

**سەرچاوەکان:**

**کتێبە کوردییەکان:**
١- ئاسۆ جەبار، کۆچ و سەفەر، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، هەولێر، ٢٠٠١.
٢- فەرهاد پیربال، پەتاتە خۆرەکان، ناڤەندا هاڤیبون یا لێکولین و وەشانێن کوردی، بەرلین.
٣- کەمال مەمەند میراودەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر، زانکۆی سلێمانی، سلێمانی، ١٩٧٩.
٤- مەسعود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەشی دووەم، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٤.
**ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان:**
١- ئەسکەندەر جەلال، کەسیەتی دووانەیی (شێر) لەنێوان هەردوو گوتاری (تاراوگە) و (پۆست مۆدێرنیزم)دا، گ. ئێستا، ژ(١٥)، هەولێر، ١٩٩٨.
٢-فەرهاد پیربال، ئەدەبیاتی دوورە وڵاتی، گ. ڕامان، ژ(١٨)، هەولێر، ١٩٩٧.
٣- فەرید عەبدوڵلا: وەرگێرانی لە عەرەبییەوە، ململانێی شارستانیەتەکان، گ. ڕامان، ژ (٣٨)، وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩.
٤- فەرمان حەسەن ساڵح: مرۆڤ و نامۆبون، گ. ڕامان، ژ(٢٤)، هەولێر، ١٩٩٨.
٥- عەبدوڵلا تاهیر بەرزنجی: فەنتازیای جەستەی دژە پاڵەوان لە چیرۆکی ڕاکردوودا، گ. گەلاوێژی نوێ، ژ(٢٦)، سلێمانی، ٢٠٠١.
٦- سەدیق سەعید ڕەواندزی، خوێندنەوەیەک بۆ پەراوێزەکانی ئەوروپا، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ (١٨١)، هەولێر، ٢٠٠٠.
٧- عەبدولقەهاری شێخ: شیزۆفرینیا، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ (٢٢٩)، هەولێر، ٢٠٠١.
٨- عەبدولقەهاری شێخ، (پەناهەندە، و دیوێک بینینی (من) لە گرووپی خوێنەردا، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ(٧٦)، هەولێر، ١٩٩٨.
٩- محەمەد فەریق حەسەن، پەنا هەندەم خوێندەوە، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ(٦٢)، هەولێر، ١٩٩٨.
١٠- موکەرەم تاڵەبانی، پەراوێزەکانی ئەوروپا و چەند سەرنجێک، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ (١٤٩)، هەولێر، ١٩٩٩.
١١- موکەرەم تاڵەبانی، کۆ چیرۆکی پەتاتە خۆرەکان چیمان پێ دەڵێت؟، ر. برایەتی ئەدەب و هونەر، ژ(٢٠٥)، هەولێر، ٢٠٠٠.
١٢- نەریمان عەبدوڵلا، فۆرم و تەکنیک لە چیرۆکەکانی فەرهاد پیربالدا، ر. ژین، (١١)، ٢٠٠٢.
**کتێبە عەرەبییەکان:**
١- جورج طرابيشي، شرق و غرب/ رجولة وا نوثة، دارالطلية، بيروت.
٢- زكي لجيب محمود، الشرق الفنان، دارالشؤون الثقافية العامة (افاق عربية)، بغداد و الهيئة المصرية للكتاب، القاهرة.
٣- علي لجيب عطوي، تطور فن القصة اللبنانية العربية بعد الحرب العالمية الثانية، دارالأفاق الجديدة، بيروت، ١٩٨٢.
٤- علي كمال، النفس وانفعالاتها و امراضها وعلاجها، ط٢، دارالوسط، بغداد، ١٩٨٣.
٥- غالي شكري، ثورة المعتزل دراسة في ادب توفيق الحكيم، ط٣، منشورات دار الأفاق الجديدة، بيروت، ١٩٨٢.
**لەگەڵ گۆڤارێکی عەرەبی:**
سعيد علوش الصورة الغربية في الذاكرة الشرقية، والصورة الشرقية في الذاكرة الغربية، مج. الثقافة الأجنبية، ع(٣)، ١٩٨٩

# مەرگ و گۆڕینکرن د چیرۆکا مەم و زینێ دا



ن: سائیب مەحەمەد

تشتەکێ خویا و ئاشکرایە چیرۆکێن کلاسیکیێن کوردی دوو توخم بوون، ئەگەر دیوماهی ب خۆشی و شادی هاتبا دابیژنێ(کومیدی) یان بەزمەسات و ئەگەر دیوماهی ب مرن و نەخۆشی هاتبا دابیژنێ(تراژیدی) یان کارەسات

بێشک مەرەمامەل ڤێرە چیرۆکا مەم و زینە ئەڤ چیرۆکەکا تراژیدیە چونکی دیماهیا چیرۆکێ ب مرنا مەم و زین ب دیماهی دهێت. پشتی (بەکرۆک) پلانەکێ دادنێت دچیتە دەف میر زەینەدینی و دبێژیتێ، تو فەرمانا ئازادکرنا مەمی دەربێخەو بێژە زینێ ئەڤە ژ بەر خاتراتە من مەم ئازادکر، گاڤا مەم زینێ دبینیت ژ کەیفا دێمریت، ئەز ژی دێ ژهەرێ دەمە تاژدینی و برایێت وی، ب ڤی رەنگی بەلا وان دێ ژ مە ڤەبیت.

میر زەینەدینی گەلەک هزرێن خۆ دکرن، ئەرێ گوهێ خۆ بدەتە پلانا (بەکرۆکی) یان نە، هەردەم د تەخمینو هزرا دابوو، هەر چەوابیت میر رۆژەکێ چوو سەرەدانا خوشکا خۆ زینێ، نیسازا وی یاخرابیوو، دەمێ چوو دناف ژوورا زینێ بەرێ خۆ دایێ ئودەکا تاری وبیس، پەردێت پەنجەرا هەمو دگرتینە، ئەوژی ئەگەرا هندێ بوو چونکی میر زەینەدینی هێلابوو و نەدهێشت کەس خزمەتێ لێ بکەت پشتی هندەک قسەو قسەلۆکێت کرێت بۆ میری هاتبوونە ڤەگێران.

بەلێ گاڤا میر زەینەدینی خوشکا خۆ زین ب ڤی رەنگی دیت زۆر دل تەنگ و عاجز بوو، نەخاسمە زین زۆر لاواز و زەعیف ببوو، رەنگێ وێ ژی ژ خەفەتا زەرببوو.

میر لێنێزیکبوو و دەستێ خۆ ب سەرێ وێ دائیناخارێ و گوت ئەڤە هەموو ئەز سەبەبێ خەم و خەیالێت تەمە:

زین گەلەکا نەساخبوو دڤیا ژ بەر میری هەستیتە سەرپێ لێ مخابن تاقەت و هێز ژ بەردا نەمابوو.

زین ژ خۆ چوو های ژ خۆ نەما، ستی و خەلکێ(بورجابەلەک) هەمی ئامادەبوون، ل هیڤیا هندێ بوون کو زین بێتەڤ سەرخۆ و هۆشیار ببیت، زینێ چاڤێت خۆ زل کرن دیت میر وەکو زارۆکان بێ دگریت، کەلەگری و دل سووتن کەفتە هناڤان زین دەمێ دیت میر بێ دگریت زۆر خەفەت باربوو گوت برا هیڤیدارم تۆ نەگری هەر رۆژ دوو سەد زین گۆری تەبن ئەو رۆژا من مەم بوخۆ هەلبژارت من خەم بۆ خۆ هەلبژارت وەک خانی ل سەر زمانێ زینێ دبێژیت:

**قوربانی تەبن هەرۆ دووسەد زین**
**ئەز هیڤی دکەم نەبی تۆ غەمگین**
**رۆژا وەکو بر مە مەم ژ بۆخۆ**
**بالجملە برن مە غەم ژ بۆخۆ**

ئەوێن ل ژوورا زینێ ئامادەبووین هەموو کروماتبوون، هەمیا چاڤ ل زارێ زینێ و میر زەینەدینی بوو کا دێ چ بێژن جارەکێ زینێ چاڤێن خۆ زل کرن و ل ئامادەبوان نیرێ

و بەرێ خـۆ دا برایێ خـۆ مـیـر زەینەدینی و دەست ب راسپاردەو وەسیەتا کر، هندەک جار دابێژتێ براو هندەک جار دابێژتێ میرم.

برا! بیـراتەتێت دەمێ سـتـیێ شی کـر تە چەوا باژەرێ جـزیرێ خـەمـلاند و ئاهەنگ تە بۆ وێ گـێـران هەروەک دبێژیت:

**رۆژا کوو ستی تە دایە تاژدین**
**چاوا تە دەشەهری بەستن ئاین**

زین دبێژیت مـیـرم ئەگـەر ئەز مرم بۆمنژی شـاهیـانەکـا زێماری بگیرەو بازارو دوکانا بخەملینە.

کــە کێ من! بیــرا تە تێت تە بۆ ســتـــیێ چەوا دەرگۆشەک(کەژاویەک) دروست کر هەروەک دبێژیت:

**مانەندی عمارەتا ستی تێ**
**رەهـ شبهتی محمەلا پەری تێ**
**تابووتەکی زەر نیگارو رەنگین**
**سندوقەکە خوردەکارو زەرین**

میـرم! ئەگەر ئەز مرم بۆمنژی تابوتەکێ دروست بکە لێ ژ باشـتـرین دارێ(ئبـیـونس)، سـەرپۆشا تابیـتێ بلا ب نەخشی و نیگارێت زێرین بێتە خەملاندن.

میرێ من! رۆژا من د بەنە گۆرستانا من شەرمەزار نەکە ل دەف خەلکێ و دانەبێژن:

**گاڤاکوو دچینە نیڤ مەزاری**
**دا خلق نەبێژن ب زاری.**
**عەقدا ستی چ رۆژا خۆش بوو**
**زین ژ ئەزەل چ بەخت رەش بوو**

بەلێ رێزداران ئەڤە دنیایە هەرکەس قـسـمـەت و نسـیبێ خۆ دبینیت هەروەک زین دبێژیت:

**شاهم ب مەرا نەبن منازع**
**ئەز بوومە ب حەسەیاخوە قانع**

زین بەردەوام دبیت و دبێژیت برا!!گەر ئەز بمرم بلا ستی خـوشکا من، من بشـووت و کـفن کـەت و دگەل من بێـتـە سەر مەزاران هەروەک د بێژیت:

**نەعشێ مە بلا ستی د گەل بیت**
**تاژدین د گەل مەمی ب دل بیت**

مـیـرێ من! راسپـاردا من بوتە ئەوە پاش مرنا من هەتا سالەکێ بۆ من خێر و خێراتا بکە، هەژارو بەلنگازان تێر بکە، بێ بەرگان ب بەرگ و جلک بێخە، بەندی و دیل و ئەسیران بەربدە هەر وەک دبێژیت:

**حەتا ڤەکە سالەکی تەمامی**
**هندی کوو تەلف دکەی تەعامی**
**هندی کوو ب دەردی لیباسان**
**هیندی ڤە دخوانی عام و خاسان**
**هیندی کوو ب کردکەی قوماشان**
**هیندی کوو بلاڤ دکەی معاشان**

برا ڤـان تشـتـان و ڤی پارەی خـەرج کە ژ سـەر حسـابا جـهـازێ من، دا شـەرمـەزار نەبم نـک خـەلـک و عـالـەمێ هەروەک دبێژیت:

**شاهم ل تەبیت وەسیەتا من**
**وان سەرف بکە ب نیەتا من**

میرێ من! راسپاردا من یا دیماهیێ ئەوە دەمێ ئەز دمرم د گەل مەمی د ناڤ یەک گۆرا ڤەژێرن چونکی ئەم ل سەر دنیـایێ هەر ب یەک شـاد نەبووین، بەلکو ل بن عـەردی مرادا مە حاسل ببیت و بگەهینە یەک هەروەک دبێژیت:

**وەڤتێ د مرم بدی تۆ دەستوور**
**دامن بگرم د گەل وی مەستور**
**من ژ نالی وی دەربەدەر ڤەگێری**
**بێ پەردە د گەل ئەوی ڤەشێری**

پاش وەسـیـەت و راسپـاردا زینێ، ئەو خەلکێ ل نودێ ئامادە بووین هەمـیـا بەردا گریێ دەنگێ نالین و فـیـغـانا چوو بەر پەرێ ئاسـمـانا، د وێ گـاڤـێـدا پاسـەوانەک ب ژوورکەفت و گوتە میری زەینەدینی میرێ من مەم گەلەکێ شرەو یێ نەساخە، ئینا میری فەرمانا ئازاد کرنا مەمی دا و گوت من مەم ئازادکر هەرن بەردەن.

**میر گوت هەرە مەمی بینە**
**گەر دێ مربیت ئەوی ڤەژینە**
**گەر هوون بمرن و گەر کوو رابن**
**نابیت تۆو مەم ژ هەڤ جودابن**

گـاڤا زینێ بهـیـسـت مـیـر زەینەدینی فەرمـانا ئازادکـرنا مەمی دەرانی زینێ پێکول کرن هێز و ڤەژن بینتە بەرخۆ،


قەبری مەم و زین

هەر چەوابیت زین د گەل خوشکا خۆ ستی و سەد پەرستاران بەرێ خۆ دا گرتی خانێ، گاڤا گەیشتنە وێرێ ستیێ نەهێلا زین یەکسەر بچیتە ژۆرڤە نەکو مەم ببینیت و د کەیفا بمریت. ستی چوو ژوورڤە بەرێ خۆ دایێ کو مەم یێ چوویە جیهانا سەرەمەرگێ هایژ خۆ نینە، ستیێ دەست پێکرو گوت:

مەمۆ! رابە میرێ بۆتان تۆ ئازادکری، هەستە هەرە دەڤ میری دەستێ وی ماچبکەو سوپاسیا وی بکەو ئەڤە من زین ژی یا بۆتە ئینای.

گاڤا مەمی ناڤێ زینێ گو لێ بووی چاڤێت خۆ ڤەکرن و ل خەلکی نری وەکو(موتەسەوفەک) دەست پێکر و گوت:

**ئەز ناچمە حزرەتا چۆ میران**
**ئەز نابمە بەندەی ئەسیران**
**ئەڤ میر وەزیر یا مەجازی**
**ئەڤ شەعبەدەو خیال بازی**
**بالجملە بەتال و بێ بەقانە**
**بێ عاقیبەتن هەمی فەنانە**
**میرێ کو مرن هەبیت ئەمیرە**
**مەعزولی هەبیت ئەو ئەسیرە**
**ئەم چوونە حزوری میرێ میران**
**وی حاکمی حاکم و فەقیران**
**شاهەنشەهی میرو پادشاهان**
**بەخشندەی تهتمە تا گو ناهان**

مەمی پەیڤێن خۆ تەمام کرن، چاڤێن خوە یێن بەلەک ل سەر یەک دانان روح و گیانێ وی دەرچوو و چوو بەر دلوڤانیا خودێ.

زین ژ لایێ خۆڤە وەکو دین و هارا لێ هات، خۆ ب سەر تەرمێ مەمی دادا، زیندان بۆ یەک پارچە ژ دەنگێ نالین و گرینێ، خەبەرێ مرنا مەمی گەهشتە میر زەینەدینی، هەر وەسا تاژدینی زانی کو مەم مر، تاژدین دین و هاربوو سیاری هەسپێ خۆ بوو و ب غاردان چوو. ب رێڤە(بەکروکی) د بینیت یەک سەر د کوژیت، زینێ زانی کو بەکروک هاتە کوشتن زۆر دلگیر و غەمباربوو، چونکە زینێ گوت ئەوژی یێ بێ تاوانبوو، هەروەک دبێژیت:

**ئەم سۆر گولێن ئەو ژ بۆمە خارە**
**ئەم گەنجینە ئەو ژ بۆمە مارە**
**گول حفز دبن ب نووک و خاران**
**گەنجینە خودان د بن ب ماران**
**ژ ئەول ڤە ئەگەر چێ وی جەفاکر**
**ئاخر ب مەرا ئەوی وەفاکر**
**زاهر وی ئەگەر مخالفت کر**
**باتن ب مەرا موافەقەت کر**
**گەر ئەو نەبوایە دنێڤ مە حائل**
**عشقا مە د بوو بەتال و زائیل**

رەش پووش و زێمار و تازی کەفتە باژەرێ جەزیرا بوتان، پیر، جحێل، کچکە، مەزن، ژن، مێر، هەموو خەلک گوڕ بوونە سەر شەقام و جادان، مرنا مەمی کارەکێ زۆر کرە سەر خەلکێ جزیرێ.

سەدەها ژ گەنجێت جزیرێ تەرمێ مەمی هلانین، میر ل دەستپێکێ بوو، دەنگێ نالین و گریانێ گەهشتە بەر پەرێ ئاسمانان، ئەڤ رێ و رەسمێ شکۆمەندێ ماتەمینی بەردەوام بوو هەتا گەهشتنە گوڕستانان.

زۆرجاران زینێ پێکولکر خۆ پاڤێژیتە ناڤ گۆڕێ مەمی بەلێ هندەکان وەنەکر، هەر ئەو دەم و گاڤبوو زین ژی چوو بەر دلوڤانیا خودێ، ل سەر وەسیەتا وێ زین برنەڤ(بورجابەلەک) ل وێرێ ستیێ خوشکا خۆ زین شوشت و کفن کر و دگەل چوو سەر مەزاران د رێ و رەسمەکێ زێماری. گۆڕێ مەمی سەرو نوی ڤەکرن و ل تەنیشت وی ڤەژارتن هەروەک خانی د بێژیت:

**حاسل ڤەکرن ژنوڤە سندوق**
**میر گۆتە مەمی ژ بۆتە مەعشوق**
**سێ جار ژ قالبی سەدا هات**
**ئاواز ب لەفزی مەرحەبا هات**
**هەمیان کوو بهیست سرە تحقیق**
**بالجملە کرن ب عشقی تە سدیق**

ب ڤی رەنگی دیوماهیا چیروکا مە بۆ تراژیدی هەردوو پالەوانێت چیرۆکێ مرن، پێدڤیە ئەم شانازیێ ب ڤێ چیرۆکێ بکەین، گۆڕێن مەم و زین یێ ل جزیرا بۆتان مە وێنێ گۆڕێن وان ل ژمارە(١٦٨) گوڤارا کاروان بەلاڤکربوو.

**سەرۆکانی:-**
**١- مەم و زین ئەحمەدی خانی چاپی هەولێر(١٩٦٨)**
**٢- مەم و زین محەمەد سەعید رەمەزان بۆتی (١٩٥٧)**
**٣- ئەحمەدی خانی شاعر«ومفکر» د، عزەدین (١٩٧٩)**
**٤- مناقشات حول خانی رشید فندی (١٩٨٦)**

# ئایا خانزادی سۆران مێردی کردبوو؟!

# ١٥٥٥-١٦١٥ ز



پیرداود مەخمووری

وتەیەکی پێویست،

زۆرن ئەوانەی رۆژێک لەرۆژان جێ پەنجەیان لەسەر رووپەڕی رەوڕەوەی ژیانی کوردەواریمان بەجێ ماوە، یاخود کەلێنێکی گەورەیان لەسەروەری بنیاتی وڵاتەکەیان پڕکردۆتەوەو نەوە دوای نەوە فەخرو شانازیان پێوە دەکەن و مێژووی رابردووی خۆیانی پێ دەنەخشێنن.

بەبیرم دێ منداڵ بووم گوێ بیستی بەیت و باڵۆرەی فۆلکلۆری کوردەواری خۆمان دەبووم، هەوڵمدەدا شتێک سەبارەت بەمێژووی پڕ کارەسات و تەژی تراژیدیای نەتەوەکەم بزانم، هەندێ لەو بەیت و باڵۆرانە کەوتوونەتە قاڵبی داستانی فۆلکلۆری و خەیاڵ و هەندێکیشیان بوونەتە ئوستوورەو هەندێکیشیان بەحوکمی ئەوەی پتر لەواقیع نزیکن و ئێستاشی لەگەڵدا بێ شوێنەوارو کۆچک و دیوەخانیان هەرماون، ئەوەی کە زۆر سەرنجی راکێشاوم بەیتی(قەڵای دمدم و مەمێ ئالان و خانزادو لەشکری)بوون هەر بەیت و داستانێکیش بەجۆرێک لەجۆرەکان کاری خۆی کردووە.

زانین و ئاشکراکردنی هەندێ لایەنی شاردراوە لەژیان و بەسەرهاتی کەسانی دیارو ناسراو زەروورەتێکە رەنگە هەموو لایەک درکی پێ نەکەین و زۆرجاریش بەهەندی هەڵنەگرین و گرنگی پێ نەدەین.

مرۆڤ چ نێرچ مێ، چ گەورە چ بچووک، چ سەرکردەو قوماندار چ عەوامی ورەشۆکی، وەک هەر کائینێک پێویستی بەرەگەزەکەی دیکەی بەرامبەری خۆی هەیە، سەبارەت بەباری کۆمەلایەتی کۆمەڵگا ئەگەر لەلایەن بیانییەکانەوە بایەخێکی زۆری پێ دراوە، بەڵام کۆمەڵگای کوردەواری ئەو بوارەی فەرامۆش کردووەو رەنگە زۆر بەزەرووری نەزانیوەو هەر بەکەمی و نەنگیشی زانیبێتن، تۆ بلێی ئافرەتانی ناوداری جیهانی کەزی سپیان هۆناندبێتەوەو شوویان نەکردبێ، ئەدی شیرین کچە بەگزادەو پاشا نەبوو، بەلقیسە کچە شانەبوو، زولیەخا کچی شای میسرێ نەبوو، لەبەر ئەوەی ئەو ئافرەتانەم هەڵبژاردو ناونووسم کردن وەک نموونە چونکە ئەوانە لەکن کۆمەڵگای کوردەواری نامۆنین و ناسراون، ئەو پێشەکییەو سەردوولکانەم بۆ ئەوەیە کە پرسیارێک دروست بکەم، تۆبلێی خاتوو خانزادی خۆشمان ئەو سەرە ژنە بەرەبەنی سەری نابێتەوەو مێردی نەکردبێ ئەدی هۆی ئەو سرپۆشیە چییە؟

ئەمە بابەتێکی کۆمەڵایەتی فۆلکلۆری مێژوویيە دەبێ دوو قسەی لەبارەیەوە بکرێ، باشەکە ئێمە باس لەحکومەتی کوردی یان راشکاوەتر بلێین ئیمارەتی سۆران دەکەین نابێ بزانین ئەو ئیماراتە هەر پاش تەواوبوونی دەرمان خواردنی سلیمان بەگی قولی زادەکە میرایەتی کەوتە دەست خانزادەخان پاشان چی بەسەرهات، تۆ بلێیی ئەو بنەماڵەیە ئاگردانیان کوژر بووبێتەوەو کەسیان نەمابێ لەبابانێ بابان، ئەگەر ژنیان هێنابێ و مێردیان کردبێ، کوانێ وجاغ و نەوەیان کێن ئەو کەسانەی کە میراتی ئەو کەڵەمێردەو ئەو سەرەژنەیان هەڵگرتبێ، خانزادەخانی سۆران خەریکە دەبێتە فۆلکلۆرو لەیاد دەچێ لەگەڵ ئەوەیدا کە مێژووش غەدرێکی زۆری لەم ئافرەتە کردووە، ئێمە گەورەترین غەدرمان لێ کردووە، چونکە لەکوردەواری خۆمان هەموو کەسێک یان کەم کەس دەزانێ ئەو ئافرەتە مێردی کردووە یان نا، خانزادی سۆران میری میرنیشینەکی گەورەی کوردی بووە، ئایا لەبەر نارێکی باری ئیمارەتەکەی نەیتوانیوە مێرد بکات؟ ئەدی چۆن و

کــەی ئەو هەمــوو کــۆشک و تەلارو مــەڵبــەندەی بۆ میرنشینەکەی دروست کردووە؟

پرسیارێک دێتە گۆڕێ، ئەگەر نووسەران و سەوادزانانی ئەوێ ســـەردەمێ هەر باسی شـــەڕوشـــۆڕو دەوڵەت و جبەخانەی خانزادیان نووسیبێـتەوە بۆچی ئەو لایەنەی ژیانی خانزادیان فەرامۆش کردووە؟ بۆچی کۆلکە مەلایەک یان سەرکردەیەک یاخود پیرە ناو ماڵێکی خانزاد ئەو شتە نەزانێ، تۆ بڵێی ی دەستووروو داب و نەریتی ئەو سەردەمە ڕێگربووبێ لەبەردەم نەنووسینەوەی سەربردەی ژیانی تایبەتی خاتوو خانزادی سۆران، ڕەنگە زۆر ئاسان بێ سەرجەلەی بنەماڵەیەک بنووسرێتەوە، بەڵام زۆر زەحمەت بێ ناوی ئافـــــرەتێک بێنی و ئەو لایەنەی ژیانی بنووسـیـەوە. کـە پاشای ئیـمـارەتێک بێت، تۆ بڵـێی گەنجێک یان پیرێکی دڵتەڕ ئەگەرچی بەخەیاڵیش بێ دڵی نەچووبێتە ئەو شۆڕە ژنە، دیسان دووبارەی دەکەمەوە خانزاد تێکەڵ بەیت و باڵۆرەی فۆلکلۆری کراوە، چۆن ئەو لایەنەی فـەرامۆش کراوە. ئەمن دەڵێم قـەڵەم بەدەست و نووســـەرو مـــێـــژوو نووس و تەنانەت کـــۆلکە خویندەوارەکانیش لەو سەردەم دا کەمتەرخەمن و گلەیی زۆریان لێ دەکرێ، دەبا لەجیـاتی ئیـسـمـاعـیل نامـەو جمجمە سولتان، باسی خانزادی سۆرانیان نووسیبایەوە.

نووسینەوەی مێژوو بە هەموو کەسێک ناکرێ و هەموو کـەس ناتوانێ ئەنجـامی بدات، چونکە پێـویسـتی بە کەرەستەو شتە زەروورییەکان هەیە، ئەگەر بتەوێ ئەو کارە ئەنجام دەی دەبێ زۆر راستگۆیانە بچیـە بنج و بناوانی بابەتەکانەوەو هەموو شـتـێک وەک خۆی بنووسرێتەوە، سەبارەت بە مـێژووی کوردو نووسینەوەی ئەو مێژووە پڕ کارەسات و دوژمن زۆریەی کورد ئەرکێکی یەکجار گران و زەحـــــەتە، لەبەر ئەوەی زۆربەی لایـەنەکـــانی بزرو شاردراوەن، ئەوەی کە نووسراوەتەوەش لە سێ سەرچاوەو دەکرێن بەسێ بەش،

**یەکەمیان:** ئەو مێژووە نووسراوەتەوە کە دوژمنانی کورد بۆ بەرژەوەندی خۆیان نووسـیـویەتیـانەوەو بەشی زۆریش لەگەڵ ویژدان و ناخی خۆیان راستگۆ نەبوونە،

**دووەمـیان:** ئەو کـەسـانە نووسـیـویەتیـانەوەو بژاریان کـردووە کـە بۆ بەرژەوەندی قـازانجی دەسـەڵاتدارانی نووسراون،ئەوەشیـان بەشی هەرە زۆری مـێژووی کوردە زۆربەشیان جێی باوەڕو متمانە نین.

**سێـیەم:** ئەو مـێـژوووەیە کـە کـورد بەخـۆی و کـۆلکە خویندەوارەکـانیـان راسـتگۆیانە نووسـیـویانەتەوە، ئەو دەسـتـەیەش زۆر نین و ئەگـەر هەشبن لەلایەن دوژمنانی کوردەوە باوەڕ پێ کراونێ هەر لەبەر ئەو هۆکارانەشە کەوا زۆربەی زۆری مـێـژووی کـورد بزرو شـاردراوەن، یان هەر فەرامۆش کراون و نەنووسراوەتەوە.

ڕەنگە هەندێ کـاریگەری دیکەش هەبێ و بوونەتە هۆی نەنووسـینەوەی مـێـژوو و بەسـەرهاتەکـان . لەپێش هەمـووشیـان نەخوێندەواری و باری کۆمەڵایەتی کوردو کـاریگەری دیکەی بەسـەرەوە بێ کـە ئێـسـتـا جـێگای باسکردن و ئاشکراکردن نین.

نامەوێ لەوە زیاتر لە کرۆکی بابەتەکەم دووربکەومەوە، دەترسم بەهەڵەدابچم تووشی شتێک بیم کە نیازم نییە، گـرنگی دانی من لەو بابەتە ڕەنگە هەتا ڕاددەیەک لە نووسینەوەی مێژوو نزیک بێتەوە، بەڵام ئەوەی کە لیرەدا پەیوەندی بەمنەوە هەیە لایەنە فـۆلکلۆریەکـەیەتی کـە لە چەندین شوێن و جێگادا باس لە خانزادی سۆران دەکات و گەلێ جاریش تێکەڵ بەمێژوو دەبێتەوە.

هەر سـەبارەت بەو مـەسـەلەیە کـاک ئەحـمـەد ڕۆژۆی شاعیر چەندین زانیاری پێدام لەمەڕ مەزاری هەردوو (میر سـولەیمان بەگ و خـانزادی سـۆران) لە گـەڕانەوەمـان لە بارزان لەگەڵ دەستەیەک لە یەکیتی نووسەرانی کورد لقی هەولێـر سـەردانی ئەو دوو گـۆڕەمـان کـرد کـە لەناو باخچەیەکی شارۆچکە (حەریرن) لیرەدا حەزدەکەم شتێک سەبارەت بەو دوو گۆڕە بڵێم، دەبێ هۆی چی بێ تەنیا ئەو دوو گۆڕە لەناو ئەو ڕەزو باخانەدا شاردرابنەوە کە ماوەی نیوکیلومەتر لە گۆڕستانی سەرەکی حەریرەوە دوورن

**خانزاد لەبەیتی(لاس و خەزال)دا.**

بەیتی لاس و خەزال لەزۆر سەرچاوە باسیان لێوەکراوەو چەندین تێکستی هەمە جۆریش باس لەلاس و خەزال دەکەن، لەهەمـووشـیان پەسندترو باشتـر نوو سرابێتەوە بەیتی(لاس و خـەزالە) لەتوحـفـەی مـوزەفـەرییـەی ئۆسکارمـان کـە مـامـۆسـتـای شـاعـیـرو روناکـبـیـر خـوالێخۆشبـوو(هێـمنی مـەهابادی) هێناویەتیە سەر ڕێنووسی کوردی خۆمان، ناکرێ دەسکاری تێکستێک بکرێ کـەچواریان پێنج سـەد سـاڵێک بەر لەئێـسـتـا گـوترابێت و نووسـرابێتەوە، منیش نامـەوێ لێکۆڵینەوە لەســـەر بەیتی (لاس و خـــەزال) بکەم، چونکـە لە کتێبەکەم(بەیتی لاس و خەزال) لەپێشەکی ئەو کـتـێبە گـەلێ شت گـوتراوەو بەراوردیش کـراوە، بەڵام ئەوەی لەو تێکسـتـە جـیـاوازە لێـرەدا(خـانزادە خـانێ هەرێر) ئامۆزای(لاس)ە، بەڵام ئەوەندە هەیە بڵێم کەبەیتی(لاس و خـەزال) باس لەدوو ئافـرەتی لاچەک بەسـەرو سـەرەژن دەکات، کەلەهەندێ شوێن و بەقسەی بەیتبێژان ئامۆزاشن لەسـەر ئەشـقی (لاس)ە شـۆڕێ نێـوانیـان تێکدەچێ و ناخۆشیان لێ پەیدا دەبێ، لەوبەیتەدا لاس و خانزاد لێک مارەکرابوون،

جارێکیان لاس دەیەوێ سەردانی ·خەزالە خانێ بکات

مرۆڤ چ نێرچ مێ، چ گەورە چ بچووک، چ سەرکردەو قوماندار چ عەوامی ورەشۆکی، وەک هەر کائینێک پێویستی بەرەگەزەکەی دیکەی بەرامبەری خۆی هەیە

بەو شەرتەی کە نابێ لەرێگادا سەردانی خانزادە خانێ بکات، لەو دەمیشدا(میر محەمەد خان و میرداغ) تالانی مەڕو ماڵاتی ماڵی مەلانەبییان دەکەن و هەرەشەش لەلاس دەکەن، بەڵام لاس بەم پارچە بەیتە قسان دەکات و دەڵێ:

(لاس هەڵستا بەپەلە پەل لینگدانە،
ئەرێ ماڵی وێرانم وڵاتی باڵەکیانم بەجێهێشت هاتە ئێرەکانە،
ئێستا هەزارو چارسەدماڵ خۆم و مامم سەرەوێرانە،
خانزادە خانێ هەریرێ بێ ساحێبە بێ خودانە.)

**«میری سۆران»**

کەباس لەمیرانی سۆران دەکرێ، یەکسەر هەردوو حکومەت و میرنیشینی سۆران دەبێ باسیان لێ بکرێ و (میر محەمەدی گەورە)و(میر سلیمان بەگ و خانزادە شۆڕێ هەریریان) سەربردەیان بگێڕدرێتەوە.

دیارە ئێمە لەم کورتە لێکۆڵینەوەماندا باس لەو ئیماراتە دەکەین کە (میر سولیمان بەگ و خاتوو خانزاد) ی خوشکی حوکمیان تێدا کردووە، ئەو حکومەتەی ئێمە مەبەستمانە دووسەد ساڵێک بەر لەحکومەتەکەی (پاشای گەورە) هاتووە، رەنگە حکومەتی پاشای کۆرە مشت و مڕێکی پتر هەڵبگرێ لەوەی کە ئێمە مەبەستمانە، چونکە لەم نووسینەدا تەنیا بۆ وەبیرهێناوەو جیاوازی کردنە لەنێوان ئەو دوو ئیمارەتە کوردییە.

میرایەتی خانزادەخانی حەریری پتر لە بیست و پێنج ساڵ حوکمی خۆی گێڕایە، لەو ماوەیەشدا چەندین قەڵاو کۆشک و تەلاری دروست کردووە کە تاکو رۆژی ئەمڕۆش وەک شوێنەوار دەناسرێن، ئەوەندەی وەک مێژوو بۆمان مابێتەوە، خانزادی سۆران نەوەی لەدوای خۆی بەجێ نەهێلاوە یان ئەوەتا مێردی نەکردووە یاخود لەشەرو شۆر لەدەستی داون کەچی هیچ سەرچاوەیەکیش راستی ئەومەسەلەیەمان بۆ روون ناکەنەوە.

ئەوەندە نەبێ کەپاش ئەوەی(سولیمان بەگی قولی بەگیان) لەبەغدا لەلایەن والی تورکان دەرمان خوارد دەکرێ و پاشان دەمرێ(عەلی بەگ)ی کوری لەشوێنی ئەو دەکرێ بەمیری سۆران، بەڵام دیارنییە ئەو(عەلی بەگە) چەند ساڵ حوکمی کردووە.

هەندێ ریوایەت دەگێرنەوە کە پاش مردنی(سولیمان بەگ) راستەوخۆ خانزادی خوشکی جڵەوی حوکمڕانیەتی دەگرێتە دەست و دەبێتە(میری سۆران) مامۆستا(محەمەد تۆفیق وردی) لەبەیتی(خانزادو لەشکری) کەلە ساڵی ١٩٦٠ چاپکراوە دەڵێ:

**(خانزادی سۆران کەشاژنی دەوڵەتی سۆرانە، خوشکی ئەو بووەو دیسان وەزیرو هەڵسوڕێنەری ناوەوەی(وەزیری داخلی) بوو، وە لەگەڵێ شت پرسی پێ ئەکرد گەرچی(محەمەد ئەمین زەکی بەگ) لەکتێبی ناودارانی کوردا ئەڵێت خوشکی نەبووە بەڵکە ژنی بووەو کچی(حەسەن بەگ)بووە)**

**(لەشکری کێیە؟!)**

سولەیان بەگ شەری ئێزیدییەکان دەکات و ماڵ و منداڵەکانیان بەتاڵان دێنێ، هەرچی کچی جوان هەبوو لەخۆیان مارە دەکەن(**ئایشێ حوسێن بەگان**) دیارە کچی میری ئێزیدیان بووە لەخۆی مارە دەکات، ئەو (ئایشێ حوسێن بەگە) کورێکی گەنجی لەگەڵدا دەبێ، هەر لە منداڵییەوە لەماڵی ئایشێ چاوی کردبۆوە، پاشان لەماڵی (سلیمان بەگ) فێری هونەری شەرکردن دەکری، ئەوجا پلە بەپلە بەرزکرایەوە تا وای لێهات بووە سەرکردەی هەموو سوپاو لەشکری میری سۆران، هەندێ دەڵێن(**لەشکری**) تەماعی لە(ئایشێ ی ژنی(سولەیان بەگ) دەکات، هەندێکیش دەڵێن حەزی لەخانزاد کردووە، بەهەرحاڵ کارەساتی کوشتنی (سولەیان بەگ) روویداو دەرمان خوارد کرا، پاشان لەشکری هەڵدێ، خانزادەخان بۆ تۆڵە سەندنەوە لە(لەشکری) لەگەڵ ئایشێ ژنی(سولەیان بەگ) رێکدەکەون کەبەهەر جۆرێک بێت دەبێ لەشکری بگەڕێتەوەو بە پیلانێک بیکوژن، نامەیەک بۆ لەشکری دەنووسن ، دەقی نامەکەی خانزادو ئایشێ بۆ لەشکری) ئەمەیە.

**( گەورەمان لەشکری زۆر تکات لێ دەکەین دەبێ بە گەیشتنی ئەو نامەیە روو بکەیتەوە هەریر، چونکە کەسمان نییە تۆنەبێ، بۆ هەڵسووراندنی کاروباری دەوڵەت، بۆسەرپەرشتی کردنی سوپای بێ سەردار**

**هەرتۆمان هەی، لەوە دڵنیابە ئەگەر بێیتەوە بۆ هەریر (ئایشێت) لێ مارە ئەکرێ و لەجێگەی سولەیمان بەگ دائەنێین)**
کەلەشکری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی خۆی لەلای خانزاد خۆشەویست بکات و دڵی رابکێشێ چەند بەیتێک بەسولەیمان بەگ هەڵدەدا

**بەندی یەکەم:**
سـەرێ من دێشێ، دڵێ لەشکری ئاریانم چەندی بەدەردە
چەندی بەدەردە دەردە
لەمن هەڵدەهات رۆژی منەوەر
شەوق و شەبەقی خۆی
لەدیوەخانێ ئەو سولەیمان بەگەی دەدا
ئاورەکم دەداوە لەملی راستی
ئەوا قۆشەنەک دێ لەسەردا
دەمپرسی ئەوە کێیە ؟
«ئەوە ئاغەی گەردیان، میری شکاکان»
«هەریەک پێنج سەد جووت خولامیان دەگەڵدا»
لەشەلواریان کەوتبوون تۆزو
لەبەتیەی سیلاحی هەلوەردبون گەردە
سەرو جووتەک تاژوو دەرستێدا.
ئاغا سولەیمان بەگ گازی دەکرد دەیگۆ:
«وەرە لەوقۆشەنەی لێ ببەسەرکردە
هەرو بەسەر بەحرکەی رەنگین دابدە»
لەبۆ خاتری حەرەمی لەشینەکەی ماڵ وێرانم دەکردە دیاردە
دامەنی خۆی دەداوە بەر چەری تاژوان،
گورەی مەحنەکان، چریکەی رکێفێ، دەنگی تەپلی بازێ،
سەدای لاوژە بێژان، دەیانبردەوە بنەی (تایی بێران)،
گۆمێ جووتیاران، داری خەرەک رێسان، گەلی شەدادو نەمرودان،
قورتێ مام لەشکری، بانێ بزاوان، زەویێ چل پشکی
لەباشووری فاتمێ، لەزەویەکە بەکوچک و کەلەک
لەبارەکی تۆزو گەردیان وەردەدا
هاوارتە لەمن لەپاشی ئەو ئاغا سولەیمان بەگی
کوو بەفنجانەکی ژەهرێ دەست لەدنیایێ بەردەدا»

**بەندی دووەم:**
سـەرێ من دێشی دڵێ لەشکری ئاریانم چەندی بمژانە
دەچوومە ئەو هۆدەو دیوەخانەی ئاغا سولەیمان بەگی
سەراسەر لیی راخرانە
دەچوومە هۆدەی خولامان
شیری (بەلۆیی) بەدارێ وەدەکرانە
رمی (ئەسیری) سەر سینگولان درێژ کرانە
دەچوومە تەویلەو تەویلە خانە
چەند بۆرەی خال خال کەوێتی قاپ رەش
شێی عارەبستانێ ناوە ناوە تێک ئێخرانە
دەچوومە لای مەکتەب خانێ
لەلایەک تەسکەرەو عەرزو حال نووسین بوو
لەلایەکی دیکە یان قۆڵ بەقۆڵ (تەتەر) رەوان کرانە
بەخۆم لێی دەبوومە سەرکردە
قۆڵێکم هەڵدەدا لەبۆ قەمچوغەی موبارەک
قۆڵی دیکەیان لەبۆ شەنەغەو گەزوەشانە
قۆڵی دیکەم هەڵدەدا لەبۆ زێی زەهاوێ
هی دیکەیان لەبۆ سەقزوبانە
قۆڵێ دیکەم هەڵدەدا لەبۆ سولەیمانی
مەملەکەتێ کوردستانە
قۆڵی دیکەم هەڵدەدا لەبۆ شنۆیێ مەملەکەتی لاجانە
حەیف و سەد مخابنی دنیایێ
لەپاش ئەو ئاغا سولەیمان بەگی
تاژی و تولە ئەگەڕێن بەبێ خودانە

**«بەندی سێیەم وەسفی دیوەخانێ»**
بەڵێ ئاغەم سەرێ من دێشی دڵێ من بمژانە ژانە،
ئەمن زەینێ خۆم دەدا دیوەخانێ خان سولەیمان بەگی
قولی بەگیانە،
چەندم دەدیتێ مافوور رادەخران کاری دەخۆراسانە،
لەسەر ئەوان مافووران کورسی دەدار سەندەڵوسێ
سەر دۆشە گیان مەخمەری دەهەمەدانە،
ئاغا ئەمن چەندم دەدیتێ کورە عەگیدو باب نۆکەر
خەنجەریان دەبانە،
شیریان دەکرمانە،

ئەمن دەڵێم قەڵەم بەدەست و نووسەرو مێژوو نووس و تەنانەت کۆلکە خوێندەوارەکانیش لەو سەردەم دا کەمتەرخەمن و گلەیی زۆریان لێ دەکرێ، دەبا لەجیاتی ئیسماعیل نامەو جمجمە سولتان، باسی خانزادی سۆرانیان نووسیبایەوە

هەڵیان دەکێشانە جزمەی دەچۆکانە
ورده ورده سەبر سەبر قونچکی شیری دەکەوتە
سەر لاسکی ئەوان جزمەی دەچۆکانە
بەدەستەکی دەیانگێراچایە، بەدەستەکی دەفنجانێ قاوەی
لەسەر دەستانە،
ئاغا ئەمن چەندم دەدیتێ حاجی و مەلاو سۆفی و ئیختیار
قەنەیان مارپێچن توتنیان بێ شەمانە،
مۆدنەیان کارەبانە،
ورده ورده سەبر سەبر لێوی خۆی دەهاویشتە سەر
ئەوان مۆدنەی دەقەننانە،
ئاغا ئەمن چەندم دەدیتێ میرزاو کاتب و لەلایەکیان
دەنووسی لەلایەکی بەرێ دەکرانە،
لەلایەکی دەدرا خەلات لەلایەکی بەراتی دەنۆکەرانە
بەلێ حەیفەک و سێ سەد مەخابن لەبۆ پیاوەکی وەک
«خان سولەیمان بەگی قولی بەگانە»
لەدیوانێ وان رۆمیان بەقومەک ژەهرێ ماریان
دەکردەوە بێ گیانە

**هاتنەوەی لەشکری**

بەگەیشتنی نامەی خانزاد لەشکری دڵنیا دەبێ و لەگەڵ چەند سوارێک دەگەرێتەوە هەریر، خانزادو ئایشێ لەهەوەڵ رۆژدا پێشوازییەکی باشیان لێکرد، بۆ رۆژی دووەم وەکو پەیمانیان پێدابوو خۆی لێ مارە دەکات، پاشان بەهەر جۆرێک بێ دەستگیری دەکەن و بەئەشکەنجەدان دەیکوژن، هەندێ ریوایەت دەڵێن خانزاد کەلەشکری ئەشکەنجە دەکات لەچیلەی دیواری دەگرێت.

خانزاد تابلێی ئافرەتێکی بەجەرگ و ئازاو سوارچاکێکی لێوەشاوە بوو، وەکو پیاوان چەک و سیلاحی دەپۆشی، مامۆستا (محەممەد تۆفیق وردی) لە نامیلکەی(خانزادو لەشکری)میری سۆران دەڵێ:(خانزاد قینی لەشوکردن دەبۆوە، چونکە نەیدەویست کەس بەسەریا فەرمان بەرداری بکات ئەوە لەلایەک لەلایی تریشەوە لەبەر ئەوەی سولەیمان بەگی برای بەدەستی تورکان لەناوبرا، هەموو شتێکی لەخۆی قەدەغەکرد بوو تا ماوەیەکی زۆر، بەلام لەئەنجامدا بیری مێردکردنی کەوتە کەللەیەوەو ئەگەرا لە پیاوێکی شایستە.)

هەروەکو لەسەرەتادا باسمان کرد میربداغ و میر محەممەد ماڵ و حاڵی عێلی مەمودیانیان بەتالان برد، کە خەزاڵی مەلانەبیان لەگەڵ تالانێ دادەبن، ئەوجا لاس جوابان بۆ ئەو دوو میره دەنێرێ ودەڵێ

«هۆی میر بداغ، میر محەممەدخان گیانە»
تالانی خەزالو بردووە، لەبژوێنی ئەلەوەرێ، یای خەزاڵ لێم دەکا گلەییانە،
بۆخۆو تالان دەکەم، لێو دەکەمە ئێخسیر ماڵ و خێزانە،

ئەوجا میربداغ و میرمحەممەد خان جوابی دەدەنەوە، بەلام دیارە ئەو کاتە(خانزاد) یاژنی لاس دەبێ یان دەستگیرانی چونکە بەناو هێنانی خانزادە خانێ لاس تێکدەچێ و هاروشێت دەبێ

میر محەممەد خان دەڵێ:
لاسی باڵەکی، ئەمرم ، بژیم، بمێنم،
بەگۆڕی ئەحمەد ئاغای باڵەکی دا دەرپێنم.
ئەگەر ئەمرم، دەچم وڵاتی باڵەکیان تالان دەکەم خانزادە خانێ بە ئێخسیری دێنم

هەندێ سەرچاوە بەیتەکە لەزاری میربداغ و میر محەممەد بەم جۆرە دەگێرنەوە، دەڵێ:
(ئەمرم، بژیم، بمێنم،
ئەگەر ئەمرم ، ئینشائلا وڵاتی باڵەکیان و مامودینانت راست و چۆپ بۆ تێک دەپەرینم،
یای خەزالی دەکەم بەجاریە، خانزادیش بەیەخسیری دێنم،هەندێ سەرچاو وای بۆ دەچن کە ئەو خانزادەی لەبەیتەکەدا ناوی هاتووە خانزادێ سۆران و هەریر بەگیان نییەو ئافرەتێکی دیکەیە، بەلام لەجێگایەکی دیکەی بەیتەکەدا هاتووە کە خانزادەخان بەراستی ئامۆزاو دەسگیرانی لاسە شۆرێ ئەحمەد باڵەکیانە، بۆیە لەبەیتەکەو لەسەر زاری خانزادە خانێ هاتووە و دەڵێ:
ئەلحەمدولیلا شوکرانە،
لاسی باڵەکیم دێ میوانە
ئامۆزای خۆمە ، سەرکردەی هەموو عێلانە
ئینجا ئەگەر ئەو تەدارەکەی بۆ لاسی دەگیرێ،
خانزادە خانی حەریرێ
لاس ناگاتە ماڵی خانزاد ێ، لەوسەری هۆبەی جلەوی دەگیرێ،

**چەند سەربردەیەکی شووکردنی خانزاد**

**چیرۆکی حرچانی**

خانزاد گوێبیستی ئەوە دەبێ کە پیاوێکی ئازاو چەلەنگ و جەربەزە لەشەقلاوە پەیدا بووە
ناوی (حرچان)ە، ئەو پیاوە لەمەیدانێ بەرامبەر سەد سواران رادەوەستێ، خانزاد مەیلی بینینی دەکات، بەدزیەوە تەتەرێکی خۆی رەوانەی لای حرچان دەکات، بۆ ئەوەی لەراستی مەسەلەکە بگات و بەدروستی سەربردەی بزانێ، بەلام بەختی خانزادە خانێ کە ئەوکاتەی بروایێ کراوەکەی خانزاد دەگات دوژمنانی حرچان شەوی پێشتر زەفەریان بەحرچان بردیەو کوشتوویانە، کابرا بۆ ئەوەی دلنیابێ و لەوکاتەی کە حرچان دەبەنە سەرتاتەشۆر ئەویش

زۆر بەجوانی تەماشای لاشەکەی دەکات، دیتی نینۆکەکانی وەکو نینۆکی پڵنگ درێژن، مووی سەری نەتاشراوە دەڵێی دێوانەیە، مووی سینگ و بن هەنگڵی دەڵێی تیسکی یەکانەیە، کە جاسوسی خانزاد دەگەڕێتەوە بۆ لای خانزاد لەسیری هەتا پیازی بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

نازانم چ شوێنێکی ئەوحرچانە جوانە و چی لەتۆ کردووە ئەوها ئاشقی ببی، خانزادیش دەڵێ:

ئەو شتانەی کە تۆ دیتت هەریەکەو سوودی خۆی هەیە، نینۆکەکانی کە درێژن بۆ ئەوەی هەرچ کاتێک کەسێنگی دوژمنی گرت دوژمن نەتوانێ لەدەستی هەڵبێ، پرچی بۆیەدرێژن ئەگەر لەمەیدانی شەڕدا کڵاوی کەوتە خوارەوە پرچەکەی سێبەری لێ بکات و نەیەڵێ ڕۆژ گێژی بکات مووی سینگ و بن هەنگڵی بۆیە درێژن چونکە لەشەڕکردندا ئارەقەیەکی زۆر دەکات بۆئەوەی ئارەقە هیلاکی نەکات ئەو موانە ئارەقەکە هەڵدەمژن.

**«چیرۆکی سێ فەقێی مزگەوتێک»**

وەکو هەر سەرکردەیەکی جەسور بۆ ئەوەی لە میللەتی خۆی نزیک بێ و هەواڵەکانی وردو درشت بزانێ، بەشەو بەدزی خەڵک خۆی دەگۆڕی و بەکوچەو کۆڵاناندا دەگەڕاو هەستی خۆی رادەگرت و بزانێ ئومووری وڵات چۆن دەڕوات بەڕێوە.

شەوێک لەشەوان کە جەولەی دەکرد لەگەڵ دەستەیەک لەباوەڕپێکراوەکانی خۆی، گەیشتنە لای مزگەوتێکی گەورەو لەپەنای دیوارێک خۆی حەشاردەدا گوێی راگرت بزانێ فەقێکان چی دەڵێن و سەربردەیان چییە، فەقێیەکان هەریەکەو رازی دڵی خۆی بەم جۆرە دەربڕی،

**یەکەم:** خوازیارم کە خوای گەورە سەرکەوتووم بکات و ببمە مەلایەکی دوازدە عیلم لەمزگەوتێکی گەورە دەرس بلێمەوەو وەعز بدەم و خەڵک گوێم لێ راگرێ.

**دووەم:** حەز دەکەم خوای گەورە ماڵێکی زۆرم بداتێ و پڕی بکەم لەکتێب و دەستێک جلی پێ بکڕم و هەموو خەڵکی هەرپێی سەرسام بێ.

**سێیەم:** من تەنیا یەک نیازم لەدڵدایە ئەویش ئەوەیە شەوێک لەگەڵ خانزاد بخەوم، ئەوجا خوای دەکرد پاش ئەوشەوە لەسەری دەدام.

شەو تێپەڕی ڕۆژ بۆوە خانزادەخان لەدوای فەقێکانی ناردو بانگی کردنە کۆشک و تەلاری حکومەت و پێی گوتن: بۆم باس بکەن شەوی رابردوو لەنێوان خۆتان چیتان دەگوت، فەقێکان هۆ پێکیان لەخۆزانی، قسەیان پێ نەکرا، لەترسی خانزادو زەبرو زەنگی خانزاد زەرد هەڵگەڕان، هەرچەندە گوتیان شەوێ دی باسی شەرع و حەدیس و قورئانمان دەکرد، ئەوقسانە بێ سوود بوو، فەقێکان ناچار کران هەرچی هەیە بەراستی بۆی بگێڕنەوە، پاش ئەوەی کە دڵنیابوون خانزاد خەڵاتیان دەکات، هەر یەکەو قسەو داخوازیەکانی خۆی بۆ گێڕایەوە، ئەمری کرد هەرچی زووە نیازی ئەو فەقێیانە جێبەجێ بکرێ، ناردی مەلای گوندی هات و خۆیشی بۆ شەوێک لەفەقێی گۆڕین مارەکرد، دەڵێن بەو شەوە لە فەقێ زکی پڕ دەبێ، گەیشتە وادەی خۆی کوڕێکی دەبێ، بەیەکێک لەخوڵامە نزیکەکانی فەرتی دەدات، هەندێک دەڵێن خوڵامەکە منداڵەکە رەوانەی لای یەکێک دەکات و لەگوندێکی دوور بەخێوی دەکەن، کابرای خوڵام دوای دەساڵان کە منداڵەکە دەگێڕێتەوە لای خۆی فێری هونەری کوشتیاری وشەڕوشۆڕو سوارچاکی کرد، ڕۆژێک لەڕۆژان کوڕەی رازاندەوەو سواری هەسپێکی رەسەنی کرد، چەکی لەقەدێ بەستاو جزمەی لەپای هەڵکێشا و بەرامبەر قەڵای خانزاد رایگرت و تەرادانێی پێ دەکرد، پاش ئەوە کوڕە چەندین هونەری پیشاندا کابرای خوڵام چووەلای خانزادو پێی گوت(میرم حەزدەکەم سەیرێکی ئەو سوارە بکەی کە چۆن هونەر پیشان دەدات، کەخانزاد سوارەکەی دیت سەری لەهونەرەکەی سوڕما، خوڵامەکە بەخانزادی گوت(گەورەم ئەو سوارە بەکێ دەچێ؟)

خانزاد دەمێک لە سوارەکە راماو تێیفکری، گوتی:

(لەرکێف ورانی بەکاکم سلێمان بەگ دەچێ، لەدەست و جڵەوی لەلەشکری دەکات، لەشان و باڵی دەڵێی حرچانە، لەدەست و پێی و سپیەتەکەی دەڵێی فەقێی گۆڕینە)

خوڵام رووی لەخانزاد کردو گوتی: میرم ئەوە جگەر گۆشەی خۆتەو من بەخێوم کردووەو فێری هونەری جەنگم کردووە، ئەوکاتە خانزاد ئاهێکی هەڵکێشاو دوو دڵۆپ فرمێسک لەچاوانی هاتنە خوارێ و گوتی(راستە دەڵێن تاقە سوار تۆزێ ناکا، بریا زوو مێردم بکردایە).

**تێبینی:**

**١- رەنگە هەر لەکورتی باسەکەم بڕبێتەوە، خوازیارم هەرکەسێک پتر زانیاری هەیە باباسەکەی ئێمە دەوڵەمەند بکات**

**٢- ناونیشانی ئەو نووسینەم لە کوڕێکی کاک ئەسعەد عەدێ ورگرتووە داوای لێبوردن لەو بەرێزە دەکەم**

**سەرچاوەکان:**

*** توحفەی موزەفەرییە/ ئۆسکارمان/ هێمن مەهابادی وەریگێڕاوەتە سەررێنووسی کوردی**

*** شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی/ هەژار ١٩٧٢**

*** خانزادو لەشکری .. محەممەد تۆفیق وردی**

*** سەردانێکی مەیدانی ، یەکێتی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر/ ٢٠٠٠.**

# زێمارێن چیای
# من هۆسا دیت



فەیسەل مستەفا حاجی

هۆزاندانا د. بەدرخـان سندی کـەڤـتـە بەردەستێ خویندەڤانان، کو ۲٥٦ لاپەرەو ۷٤ ناڤونیشان بۆ هۆزان و پارچە هۆزانان ڤەگرتینە.

ئەڤ هۆزاندانە نەخـریا (سندی)و نەخـریا (دەزگـەها سپیرێزیا چاپ و وەشانێ)یە هیڤیا سەرکەڤتنا هەردووان دکەم.

(سندی) ئەڤ هۆزاندانە ب چەند پەیڤەکێن پڕ بهاو ژدل پێشکێشی درویشیمێ کوردینیێ(بارزانییێ نەمر)کریە.

دکـتۆر بەدرخـان سندی، دەمـەکێ درێژ بوویە سـتـێرەکا گەش ل ئاسـمـانێ پەیڤ و رسـتـەو هەسـت و سـۆزو بیـرو ئەندێشـە و هۆزان و پەخـشـانێـن کـوردی. یێ نەدیتی ژێ گوه لێ بوویە.

خودانێ کـتـێبا«طبیـعـة المجتمع الكردي في أدبه»و، کتێبێن«الحكمة الكردية»، «المجتمع الكردي في المنظور الاسـتـشـراقي» و، چەندین کـتـێبـێن دی یێن هاڤلی ب پسـپـۆریا ویڤە هەی(کـو: دەروونناسـیـە) و سـالا ۱۹۷۹ بروانامەیا«دکتۆراه»ل ڤێ پسپۆرییێ ل بریتانیا وەرگرتیە.

«بیـرەوەریا بارزانی یێ نەمـر...» ناڤێ یەکـەم مـوریکا رسـتـکا ڤـەهاندیێن ڤێ هۆزاندانێـیـە. هەرچەندە، کـەس نەشـیـایەو کـەس نەشـێـت هەقێ دلـسـۆزی و خـەبات و گـۆریکاریا بارزانییێ نەمـر بۆ گـەلی و مللەتێ خـۆیێ کـورد بدەت. بەلێ بزانە خودانێ«زێمارێن چیای» چ گوتیە:

بازێ بازان، شاهێ کوردان، روهنیا چاڤێ مەیی
نێ مە نالینە ژدیری مەی یا عشقا مەمەیی

* * *

مللەتێ کورد پڕ وەفایە صۆفی یێن دەستێن تەنە
روح ژ ئێشا پڕ سەمایە عاشق و مەستێن تەنە

* * *

پڕ ئەڤینا مللەتێ مە ئێکە گەل زاتێ مە لێ
ئەو د دلدا نیشتەجێیە لێ بەلێ چاڤێ مە لێ

* * *

شاهێ بازان، میرێ قادان، وی ئەبادان هزرو بیر
لەو ژهینگێ ئەو ل سینگێ جانە بەخشێن گەنج و پیر

* * *

هوزانڤانی ب«بویکا کوردا» هەستا خۆ بەرامبەر بزاڤا« شریف پاشا»ی دەربڕییە کو خازناما مللەتێ کـورد سـالا ۱۹۱۹ پێشکێشی جڤاتا مللەتان کریە، دبێژیت:

ئەی فەلەک بۆتە دنالم: بۆچی نێرگز چرمسێن؟
ئەو چما بەختێ مە هۆیە؟ هەر بێ دۆست و بێ کەسێن!
قـەت دێ هێت ئەو رۆژا مـە دڤـێت؟ کـەهنی یا واری بزێت
ژێ ڤەخۆین، دەستا ب هەلینێن، ژێ ڤەخۆین چەند مە بڤێت
ئاگرێ سارو ڤەمری چاڤ مەلێیە گەش ببت
ئەو بوهارا تێهنێ کوشتی هێڤیدارم خۆش ببت.

* * *

ئەڤـرۆ کـانێ ل من وێ رۆژێ پڕ ژ خـۆشی و رەنگە رەنگ؟
ڤەبگوهێزن بویکا کوردان ئەو تورینا شۆخ و شەنگ
سالا ۱۹٦۸ هۆزانڤانی گرێن ژ دستارێ کـوردان ئینا، دستار ب ئەزمان هات،
چاڤ پڕ روندک و، دل پڕ کـۆڤـان، دەڤ پڕ پەمـان..

هەوارو ئاخ و فیغان.. لەش پری ژان..

کـو خـودێ پێ هێـلای«تحسین طە»ی دەنگێ خـۆ دگـەل تێکەل کرو کرە ستران.

سترانا«دستارێ»ی کەڤتە سەر هەمی ئەزمانەکی، کەس نەمـا بایێ خـۆڤی دسـتـارێ نەگـێـریت، دا خـەمێن خـو پێ بهێریت.

دهۆزانا«شـێـخ عـبـدلسـلام بارزانی»دا دیار دکـەت کـو چاڤێ کـوردان هەردەم ل خـوێندنێ یەو دلێ وان هەردەم لسەر زانینێ یە، هاتیە:

خودانێن هەردوو رێکێن موبارەک
نەقشەبەندی و قادری ب جارەک
بریار دان خاندن ب کوردی بێ
مللەتێ کورد پڕ هشیاری بێ

دیارە«بەهەشـتی شـێـخ عـبـدالسـلام بارزانی»ژبیـرو باوەرێن کـوردینێی مـاندوی نەبوو، دەست ژێ بەرنەدا تا خۆ گۆری مللەتێ خۆکر.

هۆزانڤان دگەهیتە«دەرگەهێ ژین و هیـڤی یا»، دبینیت پێ گرتیە!

لەوا گازندەکا مەزن دکەت و دبێژیت:

زاناو نەزان هەر ئێکن کوردینۆ، نابت ئەڤە
لەو ژ ئێشا ئەم دنالین، هەر ل مە دونیا شەڤە
ڤێ گازندێ ئەم ژ خۆ دکەین،
گازندەکا دی ژ بیانیان و، ژ بەختێ خۆ دکەین:
نابێ بومە تەوافا ئەو جهێ لێ مەم و زین
نابێ ئەڤرۆ ببورین ژتوخیبێ خانەقین
راستە هێشتا دەرگەهێ ژین و هیڤیان ل مە گرتیە!

١٩٧٥/٣/٢١ دلبـەرا هۆزانڤـانی نەساخ بوو لەوا پێ گوتیە:

دلبەرا چاردە بهاری، ئەڤ چ فیغانە گەلۆ؟
قەت دبت دلبەر نەساخ بت، ئەڤ چ لەیلانە گەلۆ؟
لێ نهو مار چارسەرینە، خوین لێ ئەرزانە گەلۆ
پێ و دەستێن مە دپیڤن، سەر بێ کێشانە گەلۆ

دلبـەر: هەر ئەو ئاخ و ئاڤ هەواو سـەروەریە، هەر ئەو ستان و

نیـشـتـمـان ووەلاتە، یێ دهوزانا«هەسپێ منۆ.. دلبـەر مر»دا

بەرەڤانییێ ژێ دکەت و دبێژیت:

ژ دلبەرێ ڤەبن
دەڤا ل رویەتێ نەدن
خالێن درەو بۆ چێنەکن
کرێت نەکن
گول ئاڤا ئەرزان
لێ نەکن

کو هاڤینا ١٩٧٥ هۆزانڤانی ئەڤ ئاخینکە راکێشایە، لەواژی هزرامـە رادکـێـشـیـتـە سـەر وان رەزو تربەو باخ و چیـمـەن و دارو دارسـتـانان یێن رک و کـینێن بێ دل و دل رەقـان دسـۆتن، دا کـوردان بکوژن و.. کـورد هەرمـان و نەمرن.

دیارە هۆزانڤانی ددەراڤێن تەنگدا قەبێ گـەلەک رەڤی و بەزیـیـان خوازتیـە، فەرمـوو، ل هۆلا«حصـری»و بەرامـبەر هندەکان ژوان گوتیە:

گەر نێچیرڤان ژ نێچیرێ برەڤت، چ بکم ئەز؟
زارۆ لبەر سینگێ دایێ نەنڤت، چ بکم ئەز؟
گەر پەڕ لبەر بابەلیسکێ نەلڤت، چ بکم ئەز؟
ئو کەس ب دەردێ ڤی دلی نەکەڤت، چ بکم ئەز؟

سالا ١٩٦٧، خودێ پێ هێلای«تحسین طە»ی بەرسڤا هوزانڤـان د. بەرخان سندی بۆ وان هەمی تۆپ و تانک و فرۆکە و بۆمباو رۆکێتان ئەوێن دوژمن و نەیارو خۆفرۆشان بێ وژدانانە دباراندنە کـوردسـتـانێ دا کـوردان بکوژن، مللەتی نەهێلن، باوەرا وان بهـەرفـێن، کـرە سـروودو گڤاشتە گوهێن وان و بدەنگەکێ بلند گوت:

مللەتێ مە نەمرە
ئەو ژمرنێ مەسترە
پڕ باوەرو خۆگرە
ئەو بۆ ژینێ هۆگرە

* * *

مللەتێ مە پڕ ئومێدو ئەیڤەزە
بۆ خەباتێ تێهنییە لەوێ بلەزە

* * *

کوردینی یا مە ئاگرەکە هەر هەلە
ئاگردانە دلێ مە تژی پەلە

* * *

دهۆزانا«دەنـگ ڤـەدانا خـانی»دا دەنگێ« زێمـارێن چیـای» بلند دبیت و گـازندێن دژوار ژ دلەکێ بریندار

دەردکەڤن:

هندەک بۆن ژچەپ، هندەک بۆن ژ راست
هندەکا ژی سەرێ هندەکا خاست

*　*　*

ژێهەل ب بیران دچین ئومێدا
ژوردا ب ژانان تێن سێ دارێ دا

*　*　*

هەتا نهو پەیامەک مە نینە
کوردینی ل بامە کەرب و خوینە

*　*　*

ب ئێک دو ڤەدین گەلەک دژوارین
ئەم دناڤ خودا کێرو قەنارین

*　*　*

بەختێ مە ژمەرا نابتە یار
گەر بۆ هەڤ نەبین ئێک دل و ئێک زار

*　*　*

لێ هێشتا بەکرۆک ساخ و بهێزن
بەکرۆک ئێک بوو، لێ نەڤرۆ رێز رێزن

*　*　*

تێـهنا نەورۆزێ گـەلەک لەش و دلێ هۆزانڤـانی گـەرم کـرینە، لەواژی ناڤێ وێ دگـەلەک هۆزان و پەخـشـان و نڤـیـسـینێن خـۆدا ئینایە. بەلێ رێزکـەکـا زۆر جـوان دهۆزانا«نەورۆزا ۱۹۹۰ێ»دا هاتیە، دبێژیت:

چ بۆ تە هلکم؟ نێ چاڤ چرانە
ئەز چ بسوژم؟ دل ئاگر دانە

*　*　*

ل «شۆرشا ئەیلولێ» ژی:

پەیڤا پێشمەرگە هاتە ڤەژاندن
سەر ژنوی ناڤێ مە هاتە شاندن

*　*　*

ددنیایێ دا کورد هاتە ناسین
مللەتێن ئەم پر زاخ و پر کەسین

*　*　*

ناڤێ کوردان هاتبو ژبیرکرن
هۆیە بێ خەباتی و بێکرن

*　*　*

لێ دەمێ داوەتا خورتینی یێ




سەرهەڵدا ب زاخا کوردینی یێ

*　*　*

عەگید و مێرخاس هاتن شاهی یێ
کال و پیرێن مە پێش بەراهی یێ

*　*　*

ب برنۆو چفتە و خەنجەرو گوپال
دەیک و باب و براو مام و خال

*　*　*

پێکڤە بسترین ئەی ملکێ کوردا
چ بخێرو بێرە عەرد مە تەڤدا

*　*　*

قـازی مـەحـەمـەدی.. رێزەکـا تایبـەت لنک مـەهەمی کوردان هەیە جهەکێ مەزن ددلێ مەدا هەیە.

لەوا ژی هۆزانڤـانی رت ل وی وەریسی کـریە، یێ بێ وژدان خـۆ دسـتـۆبی وی ئالاندنی و گـیـانێ وی ژێ سکاندنی و گوریا خەباتا وی ڤەمراندی و، گوتیێ:

تە شڤان گرت و پێڤەداو، بۆرە بۆرا پەزی یە
کەهرکا ئێک سالێ کوشتێ، خودێ وۆ هێشتا زوی یە

*　*　*

هۆبلندو سەرسێداریێ تو دمرنێ چەند بلندی
هۆیە توخمێ سەرفەرازان، زوی دبینێ خۆش ئەلندی

* * *

تە چ هاش عشقا کەوانە، چ دخوینێ شەڤ و رۆژ
چ دنالن، چ دکالن، خەم گرو کۆڤان و سۆژ

* * *

خۆ تەباش دیت ئەی وەریسۆ: کا چاوا وی سەر هەلاند
هینگێ هاتی بۆ سەمایێ دار سەما لێ هەژاند

* * *

«سندی» هەر ژسەری دگەل ئێککگرتنا کوردان و، ئێککگرتنا زمانێ کوردی و، ئێککگرتنا هزرا کورداندا بوویە.

لەوا ژی سالا ۱۹٦۷ دگەل خودێ پێ هێلای«أحمد رەشوانی»دا هەڤبەندی کریەو رێز کەکا هۆزانێ سندی ب کرمانجیا ژووری و ، ئێک رەشوانی ب کرمانجیا ژێری ڤەهاندینە:

س/ ئەگەر ببین دەست و دلەک
دەست ئاسنە، دل پیلانە.
ر/ دار پتەو بێ زۆر ئەمینێ
داری کرمۆل دارزایە.

* * *

س/ چارە نینە ئەگەر روینین
هلۆ برا قەسە بایە.
ر/ ئەمرۆ رۆژی تێکوشینە
قسە باوی هیچ نەمایە.

* * *

س/ ئەو باوەری هەر یا گەشە
هەردێ مینت بۆمە سایە
ر/ هەر کەسێ بۆ گەل دلسۆزبێ
بۆ ئەم رایە جان فیدایە.

* * *

ب راستی هندی«سندی» هۆزانێن رامیاری و نیشتمانپەروەری و دلێریێ گوتینە، دەمی هۆزانەکا «ئەڤینداریێ» ژی دبێژیت هەر ژمەڤە وەک وانە، هەکو دبێژیت: بەژنا بلند، رامانا وی چیایەو، چاڤێن رەش و لێڤێن نازک رامان ژێ کانی و چیمەنن و، پرچا درێژ رامانا وی سویلاڤەو، ئەو دلبەرا دبەر جانی و شیرینیا وێ را دکەت و دبێژیت: ئەو ، وەلاتە.

دا بزانین سەیرانا وی بریە«هزران» چ نازکە تێهن و نێرگزە بێهن ب دلێن مەدا کریە:

مە سەیرانەک برە هزراو، بهارا مەکەتە وێرێ
ل ناڤ بەینا دو شیلانان، ل ناڤ لێڤێن کەنی زێرێ

* * *

بهارا مە دوو نێرگزدان، دو چەهڤێن خۆ یاری هلدان
ل گەل کەنیا شەپالا من بنێن دارا چ جان گول دان

* * *

ب هەیبەت بو چنارا من کو وێ پرچا دەلال بادا
غەما عشقێ وەکی بازەک ل سەر بانێ دلی دادا

* * *

ئەڤە من هەمی نەگوت و، هۆزانڤانی بخوژی گەلەک ژێ بەرزە کریە، ڤێجا بزانە دلێ وی چ مەزنە هێلینەو؟ چەندێ پڕ گەرمە ئەڤینەو؟

هزراوی چ نازک و شیرینە؟

خودێ پێ هێلای«سەیدا: صادق بهاءالدین ئامێدی» گەلەک چاکی ل زمان و پەیڤێن کوردی هەیە ول هویرو گرێن وان ڤەکۆلییە، گەلەک دەقێن فۆلکلۆری ژ بەرزە بوونێ رزگار کرینە. گەلەک دابو ئەریت بۆ مە ڤە گوهازتینە، لەوا ژی چەندی بۆ ببێژین و بنڤیسین هەر کێمە.

دکتۆر بەدرخان سندی کو هەڤدەمێ ژینا وی بوو، باش دناسی و، کو ئەختوبارە:

ئەو خولەتا پیرۆزا وی کری ژبیر نەکریەو، پێ دبێژیت:
ئەرێ سیلاڤ، چما ئەڤرۆ مەلیل و هشک و زوهایی؟
کەلێ، بۆچی تۆ بێ دەنگ ونەگەشدارو ڤەرێل هایی؟
چرا دل تو وەسا ئەڤرۆ ژکاکل ڕاین ئارهایی؟
گوتن: یارۆ، نێ کەو رابو شەفەر کێشاو زاڤایە.

* * *

تە دا ڕێ ئەی میرێ پەیڤان بێ سازوماز ل پێش تە بچن
شاگردێن تە هەڤە چووبان ب مەوکب ئەو جلک رەش بن
هەتا پەیڤێن تە ژی سەیدا ل ڤێ شعرێ دا ژی گەش بن
غەریبێ ڤێ ژیانێ بو، شەڤا مرنێ ژی هو مایە.

* * *

تەسینگ دا بەر رەشە بایان، ب خزمەت چوویە ئەزمانی
مەهولێن تیژ چ جار نەشیان بکۆلن بەر دەرێ خانی
ژ توری ڕا تو دەرگەهـ بوی، ب سۆزی خوش زیرەڤانی

ب پیری ژی قەلەم گەش بو ئەوی خزمەت نەبەردایە.

* * *

مریدێ ڤینا زینێ بو، نەساخێ دەردێ مەمێ بو
روندکا تاج و ستێ بو، فیغانا سیاه و خەجێ بو
خوش ڤیێ طاف و مژێ بو، عەڤدال بو چاڤ هەر ل رێ بو
گەلۆ لەورا دسۆژت دل کو جه کەو نەڤرۆ ڤالایە.

* * *

چرایەکێ گـــەش، رێکا هزاران ژارو بەلنگازان، روهن دکر،

دەستێ خۆیی نەرم وەک یێ پەریان ب سەرێ هزاران بێ کەسان دا دئینا خارێ..

پەیڤـێن خـۆیێن نـازک بەری دەرمـانـان ب برینێن هزاران پێدڤییان دا دکرو تیمار دکرن..

بژیک بوو، نۆشـداربوو، پارێزەر بوو، هۆزانڤـان بوو، نڤیسەر بوو، جوامێر بوو..

دەسـتێن ب خـوین، دلێن پرکین، هزرێن رەش وشین ئەو چرا ڤـەمـراند، ئەو دەسـتێ نەرم بری، ئەو پەیڤـێن نازک کـوشتن و ئەو دەرمان براندن. دکـتـۆر نافع ئاکـرەیی(ب بێ دەستی)! کوشت.

«سندی» ژپێش مە ژی ڤە ئەڤ نازکە هۆزانە ڤەهاندینە، کو مزێ خودێ پێ هێلای نافع ئاکرەیی گەلەک مەزنەو ئەم نەشێین هەمیێ بدەینێ:

ئەی بلبلێن دەست شڤانان ما دبت بێ دەنگ بن؟
ئەی کەڤۆکێن سەرچناران مادبت بێ چەنگ بن؟
ئەی سیارێ پێلا ژینێ رێ چما بەرزە دبن؟
مە ژ خودێ ئاه و دادان رۆژ بۆ رۆژ دل ژەنگ دبن

* * *

خۆش هەڤالێن تە براوۆ چاڤ ل رێنە خۆ ژ پار
چاڤ دبارن، لێڤ بەیارن، دل دهارن، ب پسیار
قەت دبت هەر توب مینی ژمە دویر و نەدیار
سیسنا ڤێ سالێ سۆتن ئاکرێ مابو بێ بهار

* * *

پر ژتە ئاکرێ خەریبە ئەز دزانم ئەی برا
تو ژ ئاکرێ را هەڤال بۆی روهنی یو مۆم و چرا
مهرەبان و پر ئەڤین بۆی گولاڤا هەمی درا
کەس نەما بۆتە نەنالت کوشتیی دەست رێکرا

* * *

سالا ١٩٦٧ بێهنامە تەنگ ببوو، پشتیێ مە گران ببوو، خوها رەش و شینا وەستیـانا ژیانێ ب لەشێ مـەدا دهاتە خـارێ، زکێ مـە پری گل و گـازندە ببـوو، یا ژهەمـیـان نەخـۆشـتـر ئەم نەدشـیـابن روی برووی دلێ خـۆ بۆ کـەسێ دەرێژەکەین! لەوا ژی مە هاوارا خۆ دبرە بەر (دیواری)دا بۆ بێژین؛دا(پشت دیواری) گولێ ببیت.

هۆزانڤان هۆسا دهەوارا(بێریڤانێ) هاتیە:

بێریڤانێ مال وێرانێ
شرینێ وەی بی خودانێ
زەرکاتە بۆچی ڤالایە؟
مەشکاتە بۆچی قەتیایە؟
پەزێ تە بۆ چی یێ متە؟
بەلاڤە نەڤرۆ کت گتە.

* * *

نێزیکە ئەو بوهار بێتن
ئەو بوهارا پەز دێ زێتن

* * *

ئەم ژبرسێ قەت نامرین
ئەم ژ ترسێ قایمترین.

خـودێ پێ هێـلای(تحسین طه) ژی کـو ئێک بوو ژڤـان خەمگینان لەوا ئەڤ هۆزانە کرە سـترانو گڤاشتـە دگوهێن وی دیواریدا.

«شەرمنە دل» هۆزانەکە بەس دلێن پر ئەڤین دشێن هۆسا نازک ڤەهین.

شەرمنە دل هۆگەلۆ ئەم کرین قاچا دەڤان
زێرەڤان زۆرن ئەو چما نانڤن رۆژو شەڤان

* * *

ئەو بوهارا ل دێمێ رشتی لێ بەلاڤن لەعل و گول
لەو دخوینت کەو ب سۆتن هێروژانە ئەڤرۆ دل

* * *

گوت: خەتیرە یان چرایە؟ شەوق ددت دەشت و چیا
ئەڤ بوهارە شەرمزارە ژ جانی یا چاڤ وروبا

* * *

کی دێ هێت لۆ کا تەیارێ کەهنی یا شعرانی تو
کەو ژێ مەستە لەو دخوینت گەرمەو زۆزانی تو

هەرکەسەک دژینا خۆدا دکەڤیتە دەراڤێن تەنگ و، دەمێ ژێ رزگار دبیت، نەڤێت بینیتە بیرا خۆ چونکی بیرهاتنا

وان ژی یانە خۆشە، ئەخاسمە ئەخۆشی یا هەی و ئەخۆشی ژی یا هەی!

دابزانین ئەو بیرێن دهێنە بیرا هۆزنڤانێ(زێمارێن چیا)ی چ تۆفن؟

(١)

دەمێ بیر دێنە بیرا من
پەیڤ.. هزر.. هیڤی
درەڤن
قەلەم تیک دبن
کاغەز ددڕهن
تلێن دەستێ من
دبن ئاسن
چ ناگرن
نانڤێسن
نانڤێسن

(٢)

دەمێ بیر دێنە بیرامن
مرۆڤ.. هەڤال.. برا
خو ددزن
عەورێن ئەسمانا
بەلا خۆ ژ خۆ ڤەدکن
ل چیرۆکا بارانێ لێڤەد بن

* * *

گەمی یێن ئومێدان
رادوەستن
ل نیڤا دەریایێن فرەه
دناڤ رهێن خوینا من
بێ ئارمانج لدور خۆ
دزڤرن

* * *

سکرێن هیڤیا
ژ لیساڤێن بەفرا کویڤی
دهەرفن
بەرێن سکری
دهەرشن.

* * *

نیشتمانپەروەری و، گەلڤینی و، کوردینی ب گەلەک رێک و رەنگان دهێتە کرن و دروشمێ هەمی وان رێک ورەنگان ژی دلسۆژی یە.

رێک و رەنگەک ژوان ئەوە ئەوا ب بێ دەنگی دهێتە کرن و ئەنجامدان.

ژ سەرڤە یا دیار نینە بەلێ ژناڤدا وەیا گەرم و گورە پوپلای دبوژینیت، رەنگە کارێ وێ ژیێن دی دژوار تر ژی بیت چونکی چاڤێ خودانی ل چ دەسکەڤتێن تایبەتی نینەو لدویڤ ناف و ناڤدارییێ ناگەرێت.

دابزانین هۆزانڤان کوردینیا وی دلسۆژی چاوا دبینیت.

کوردینی یا وی
ئاهینەکە
سلاڤەکە
خو ناڤەکە
بێ رویەتی یە
بێ سالسکی یە
کوردینی یا وی
بێ دەست ماچی کرنە
بێ حڕ حڕە
بێ گەفە
متە
هشە
خوینە

* * *

ئەڤ هۆزانە سالا ١٩٧٢ هاتیە ڤە هاندن و ل خودانی بەرزە ببوو.

گەلەک جاران هەڤال ل مرۆڤی وەردەگەڕن و دەبنە دوژمن. هۆزانڤان گازندان ژوان هەڤالان دکەت- کو ئەهەڤالن- ئەوێن وەکی ماران و، دوپشکان ب مرۆڤی ڤەددەن و، دبێژیت:

بۆچی.. ئەرێ بۆچی؟
هەڤالێن مرۆڤی
ل مرۆڤی دبنە دوپشک!
پاکی
خۆشی
کەنی
قەنجی
ل مرۆڤی دبنە کێچ، دبنە رشک!

ئاخ لێ ئەلەک
بریندارم گەلەک
بۆچی دچاخێ مەدا
مشک دبنە مێرخاز؟
بۆچی«جوگرافیا»
دبتە ترازی؟
چاوا تاوانبار
دبنە قازی؟!

هۆزانڤانی دجهەکێ هۆزاندنا خۆدا نڤیسیە کو رەنگە«کۆترۆک» یا سالا ۱۹٦۲ یان ۱۹٦۳ ڤەهاندی یەکەم هۆزان بیت ڤە هاندی یان بۆ هەڤالێن خۆ خویندبیت.

هۆزانڤان د بارەکێ کرێت و چڤێل و زیانبەخشێ دناڤ جڤاکیدا هزرا خۆ دئیخیتە سەر زمانێ(زین)ێ کو ژپێش خۆو(مەم)ی ڤە(بەکرۆک)ی رویرەش دکەت، دبێژیت:

١- زین دبێژیت:
ئەم دزانین هون چنە
لێ بەلێ.. ئەم دزانین ئەم کینە
ئەم ب خو ئەڤیندار بوین
ئەم چیرۆکەک بوین
ناڤێ وێ مەم و زینە
خودانێن خۆو بەکرۆکەک بوین
وەلێ هون ئەڤرۆ
هەمی بەکرۆکن
دەڤێ وە پڕ خوینە
چ ئەڤیندار
ئەڤیندارەکێ راست
دناڤ وەدا دیار نینە

* * *

ئەم مەندە هۆشین
ژ چیرۆکا چەرخێ بیستێ
چیرۆکەکا درێژە
نەمەم تێدا مەمە
نە زین زینە
ئەڤینی د بازێرێ وەدا
پەیڤن
بێ رحن

درەون
بەرن
مرینە

* * *

دیارە نیسک و ماشێن ژیانێ لنک هۆزانڤانی ژی وەکی مە هەمیان ل دەمەکی تێکەل بووینە، لەوا ژی هاوکێشێن جڤاکی تێکچوینە، هزرێن هزرداران ئالۆز بووینە، لەوا:
نهو مخابن وە نینە،
ئێک و ئێک نابنە دوو،
دبنە هیچ.
ئێک ژ دووا مەزنترە،
ئێک ژ سەدا پترە،
ئێکێ ل ئێکێ بدە،
دبتە مەلیون،
پاش
دبتە هیچ،
ئەرێ..هیچ.

«سندی»ێ هۆزانڤان، رێزا هەمی وان کەسان گرتیە ئەوێن کوردینیا خو ژبیر نەکری و هەر ئێکی برەنگەکی رەوش دایە ڤێ هزرا پیرۆزا خۆو نێرگزەک ل ئاخا نیشتمانێ خۆشتڤیێ خۆ چاندی.

د. هۆزانا«دەمێ خانما بارکر»دا چەند رێزە هۆزانێن نازک و مۆسیقا و بێهندار پێشکێشی بەهەشتیا نەمر رەوشەن بەدرخان دکەت و دبێژیت:
خانما ئێش و رێماران، خاتونا دەردێ گران
شەهزاد عشقا وەلاتێ، رەوشەمالا بەدرخان
زێرینا پەرێن هاوارێ ، تیرۆژا پەیڤێن زەلال
رەوشەنا میرێ ئومێدان، گەوهەرا تاجا سەران

* * *

هەڤالا میرێ خەباتان، هەڤژیا جەلادەتی
تول بەر ئاڤا کۆڤانا، شەنگەبی بوی ، نەکەتی
خانەدانا بنەمالان، ئەڤرۆ شینی بۆتەیە
شینی یا جەرگ و دلانە، دلبەرا ڤی مللەتی
روح شیرینێ خانمێ، گەر ب ئاسمانان توکەتی
خۆش سلاڤان بگەهینە رێبەرێ پەیڤا پەتی
تو ژمیرێ پەیڤا بێژە: هێشتا گەشدارە میرۆ
«هاوار»اتە خۆش ڤەدا بو خۆش نڤشتا زێڕ خەتی

* * *

ژ دەستوریا (د. بەدرخان سندی) ئەز دێ هۆزانا (مارماسی) لدویڤ دلێ خۆ شرۆڤەکەم و دێ رەنگێ وەلاتی، نیشتمانی، کوردستانێ تێدەم و دێ بۆ خۆ ب ئەزمان ئینم ؛ دا پێن دهناڤاندا ب پەیڤ و رێزکێن وێ دەرێژکەم.

پەراسی پێن من
و هەمی هەستیێن من
ئەڤ شەڤە داگرتینە
گەلۆ تژی خەمن
هەمی رەزێن دلێ من
ئەڤ شەڤە
پێش چاڤێن من
تێن سۆتن
هەمی نهالێن جەرگێ من
ئەڤرۆبرینن.
هەمی کەهنی ێن ناڤ روحامن دزێن
وەلێ خوینن.
هەمی خەیالێن ڤینا بەرێ
ئەڤ شەڤە
من دبن و من تینن
من ژ رهارا دهەژینن
من نقۆ دکەن
جاران..
وجاران دفرینن.

* * *

چەندین هۆزانێن دی د پەرێن «زێمارێن چیای»دا هاتینە کو دخازت من ناڤێ وان ئینابا و چەند رێزەک ژێ نڤیسیبان. بەلێ ل من وەرە دا نڤیسینا من گەلەک درێژ بیت، چێدبیت ژی من بدروستی مزێ ڤێ هۆزاندانێ نەدابیت، لەوا ژی داخاز دکەم هۆزانڤان و خوێندەڤان ل من نەگرن و،

ژ دەستویریا «سندی» من هندەک ئاڤر هەنە ب کورتی دێ نڤیسم:

١- مخابن گەلەک هەلێن رێنڤیسێ تێدا هاتینە کو باهرا پتر ژ چاپێ پەیدا بووینە

٢- خالبەندی تشتەکێ فەرە بۆ نڤیسینێ ، نەخاسمە بۆ رێزکێن هۆزانێ گەلەک گرنگ و فەرو پێدڤییە، نەخاسمە بۆ ئەوێ «د. بەدرخان سندی» دناسیت کو: پەیڤێن هۆزانێ گەلەک جوان ژێک ڤاڤێر دکەت و هەر ئێکێ کەلەخێ دروست و راستێ وێ ددەتێ و ل خویندن و گوتنا هۆزانێدا گەلەکێ پێڤەهاتی و مەلەڤانە. مخابن خالبەندیێ مزێ خۆ نەوەرگرتیە لەوا ژی مزێ رستەو پەیڤێن هۆزانێن«زێمارێن چیای» هاتیە خارن و ئاوازو مۆسیقێن وێ وەکی پێدڤی بوو نەهاتینە.

٣- هندەک پەیڤ هەنە نابیت رێنڤیسا وان چەوت بیت و پێدڤیە سەرپەرشتیارێ چاپێ گەلەک های ژێ هەبیت، وەکو مانشێت و ناڤ و نیشانان، هەروەکی ئەو هەلا د ناڤونیشانا هۆزانا بە پەرێ ٤٣ داهاتی. پەیڤا (کوردستان) پیتا (د) نەهاتیە نڤیسین.

٤- ژبەرکو ئەز هۆزانڤانی بەری نهو دناسم، لەوا ئەوا ئەز دێ بێژم پتر بۆ وان خوێندەڤانێن هێژایە ئەوێن نەناسن.

پیڤکێ هۆزانێن کلاسیکێن«زێمارێن چیای» ژلایێ کێش و سەرواو تەکنیکا ڤەهاندنێ ڤەو ،ژلایی هەست و سۆزو واتایێ ژیڤە- هەروەکو، هۆزانڤان «سندی» بخۆژی گوتیە لدویڤ رێزا مەلایێ جزیری و ئەحمەدێ خانی هاتیەو، هەما بێهنا هۆزانێن وان ژێ دهێت کو چ بۆ ناهێتە گۆتن گوییتکا هۆزانێن کوردینە ، نەخاسمە مەلایێ جزیری.

٥- هەر بۆ رامانا دخالا (٤)ێ داهاتی، دێ بێژم:

هۆزانڤانی دەستەکێ رەنگێن دڤەهاندنا هۆزانێن رێزک کورت دا هەیە، بەلێ ل من وەرە هزراوی گەلەک بەرفرەهترە ژوان دەلیڤان ئەوێن رێزکێن کورت ددەنێ و تێرا وان هەمی پەیڤێن جوان و نازک ئەوێن دگەنجینا هزرو بیرێن«سندی»دا هەین، لەوازی درێژکێن درێژدا ئاڤێ ژێ دئینیت.

٦- رەنگە هۆزانڤانی پێدڤی ب ڤەهاندنا ئازاد- یانیکو هۆزانا ئازاد- نەبیت بۆ دەربرینا هەست ونەستێن خۆ- هەروەکو د خالا (٥)ێ دا من گوتی: بەلێ دیار دکەت کو د هۆزانا ئازاد ژیدا دەستێ وی دگەهیتە گەلەک هزرو بیرێن وەسا کو زۆر دەست ناگەهنێ.

«سندی» چاڤێ مە ل هێشتایە. ڤێ جارێ ناڤێ هۆزاندا نامە دێ کەینە «بهارێن چیای».

# «جۆرج سێفریس: ئوستوورە و مێژوو»

ئانتۆنی زاهارئاس

و. لە فارسییەوە: ئیسماعیل ئیسماعیل زادە/ بۆکان

جۆرج سێفریس ١٩٦٣-ی زایینی خەلاتی نۆبێلی وەرگرتووە. لەنێو شاعیرانی یۆناندا هیچ کەس وەکو ئەو ئاگاداری ئەو بۆشاییە قووڵە نیە کە لەنێوان رابردوویەکی شکۆدارو هەنووکەیەکی سووک و چرووکدایە. کاتێ شاعیر دەڕوانێتە راستیەکانی یۆنان و بێجگە لە ئازار چیتر نابینێ، هاوار دەکا:

«ئێستا روو لە هەر کوێ بکەم یۆنان دەمرەنجێنێ»

سێفریس لە کاتی وەرگرتنی خەلاتی نۆبێل پێش هەموو شتێک لەسەر گرفتێک بەنێوی یۆنانی بوون پێداگری دەکاو دەڵێ:

«من خەڵکی ولاتێکی بچووکم کە هەتا ئاوەکانی مەدیترانە خۆی کێشاوەتەوە. تەنیا هەوڵ و تێکۆشانی خەڵکەکەی و دەریاکەی و تیشک هاوێژی هەتاوەکەیەتی دڵسۆزی لەگەڵ دەکا. ئەم ولاتە ئەگەرچی بچووکە بەڵام سوونەتێکی شکۆداری هەیە».

یۆنان خۆشەویستی سێفریس-ە. ئەمەش بۆ خوێنەری بێگانە جێی سەرنجە. بۆ ویلیام فاکنێر-یش باشووری ئامریکا هەر ئاوایە. بۆیە خوێنەری بێگانەی لێ نزیک دەبێتەوە. هەل و مەرجی باشووری ئامریکاو یۆنان کە شوێنی سەرهەڵدانی پەخشانی فاکنێرو شیعری سێفری-ـە نیشاندەری چەند ساتێکی تراژیکە لە مێژوودا. ولاتێکی پێشێل کراو هەمیشە لەنێو نسێی رابردووی ئەفسانەیی خۆیدا دەژی و بەناچار ئیتر بایەخە سوونەتیەکانی ناتوانن وەکوو پێشوو هێمنی و ئاسوودەیی بەدیاری بێنن و تاهەتایی بن.

ئاکادیمی سوید ئاماژە بەخۆشەویستی سێفریس بەدیمەنی یۆنان دەکا. ئەم ئاماژەیە بەتایبەتی رووی لە نهێنی قووڵی بەردە-کانی نێو ئەندێشەی سێفریسە. رووی لە لەت و پەتەکانی مەرمەڕو پەیکەرەی نەرەخامۆشەکانی سەر لێوە. ئەم دیمەنە کە بەوێرانییەکان، پاشایەتی دەریاگەڕی کۆن، بەندەرە چۆڵەکان و ریزی وشکی کێوەکان، بەو پاپۆرانەی ئارام دەڕۆن، بەو شوێنە چۆڵانەی حەسانەوە لەبەستێنی دەریای ئێژە، بەهەتاو و با-ی بێلغاو داپۆشراوە، لەگەڵ تان و پۆی ئەزموونی هێلنیک چندراوە. بێجگە لەوانە ئەزموونی هێلنیک پڕە لە دەست درێژیی ئەخلاقی و گومان کە لە زۆربەی نووسراوەکانی ئێمەی دوور لە راستی سەردەمدا دەبینرێن. شاعیر دەڕوانێتە پەیکەرە بەردینەکانی و بەدوای شتێکدا دەگەڕێ کە لەگەڵ بایەخەکانی رابردووی خۆی تێکەڵ بکا، بەڵام پەیکەرەکان هەمیشە راستی شاراوەی خۆیان ئاشکرا ناکەن و مرۆڤ ناچارە لەگەڵ نهێنییەکان و هێماکان رووبەڕوو بێتەوەو هیچی تر:

کاتێ وەخەبەر هاتم ئەم کەللە سەرە بەردینەیەم بەدەستەوە بوو
بازۆڵەکانم پێوەی ماندووەو
نازانم لە کوێی دانێم
کاتی تێپەڕکردنی خەونم هەڵدێردرایە ئەوێ
ئیتر ژیانمان ئاوێتەی یەکتربوو و
هەلاواردن دژوارە.
دەڕوانمە چاوەکانی، نیوەی لە خەوتن دایە
دەست بەگۆنای دادێنم کە لەسەرێست پشکوتووە
من چیتر ناتوانم
دەستەکانم ون دەبن و دواتر بەلەت و پەتی
دەگەڕێنەوە لای من.

بەراوردی مرۆڤ لەگەڵ پەیکەرە، ئاشکرابوونی حەسرەتی وەلام گەلێکن بۆ بوونی ئێمە کە چارەسەر ناکرێ و سەمبوولێکە لە ئاکاری مرۆڤ کە لەرکەی رابردوو دایە. ئەم بەیتە لەو دوو شیعرە«mycene,,Santorin» وەرگیراوە:

«کەسێ بەردی قورس هەڵبگرێ تێک دەشکێ»

بەڵام هەرچۆنێک بێ مرۆڤ ئەم بارەقورسە هەڵدەگرێ، چونکە نیازی بەنزیکایەتی لەگەڵ رابردووی مێژوویی و ئەفسانەیی خۆی هەیە.

بەبارستای هێزم ئەو بەردانەم هەڵگرتووە
بەبارستای هێز ئەم بەردانەم خۆشویستووە
ئەم بەردانە چارەنووسی من...

بەم شێوەیە لەت و پەتی مەرمەڕ یان پانتای گەمارۆدراو، دیمەنە خۆماڵیەکانی یۆنان، پرش و بڵاوی، بێگانەبوون و گەریانی زەمان کە هەوێنی ناسراوی هەنووکەن لەنێو بەردە شکاوەکاندا ئاشکرا دەبن. گەران لەنێو وێرانیەکاندا و هەروەها کردەوەی ئازاردەری پرسیار لە خۆت، بنەمای هەمیشەیی شیعری سێفریس پێک دێنن و وەبیرهێنەرەوەی هەل و مەرجی تراژیکی گەران بەدوای رێگایەک بۆ بوون و رێگایەک بۆ مردنن.

ئێمە کە باش بەچارەنووسی خۆمانمان زانیوەو
سێ یان شەش هەزار ساڵ لەسەر گەردانی نێوان
بەردەشکاوەکاندا بووین،
بڵێی بتوانین؟
ئێمەی لەبەندا، ئێمەی پەڕیوەو
واکە دەڵێن دژ بەسامەکانی نەهاتی خۆڕاگرین
بڵێی بتوانین
مردنی یاساکان هاورێیی بکەین؟

وڵامی ئەم پرسیارە لە شیعری سێفریس دا چ «نا»بێ وچ«نا»، هەروەها بۆشایی نێوان بیرەوەری قارەمانی و شکستی هەنووکە پڕ بێتەوە یان پڕ نەبێتەوە، محاکەمەی ژاناوی مرۆڤێکە نیشان دەدرێ کە بەگەران، پرسیار، سەرگەردانی و خۆڕاگری، کە تێدەکۆشێ شوێنی راوەستانی خۆی بدۆزێتەوەو لەگەڵ راستیەکی هەرمان لەنێو خێلێک لە گومانەکاندا بسازێ.

جۆرج سێفریس دیپلۆمات بوو و بۆ خۆی بەنیوەی شۆخی و بەنیوەی راست گوتوویەتی کەقەت لە هەڵبژاردنی پیشەیەکی تەواو نامۆ لەگەڵ شیعر، پەشیمان نیە. ئێمە دەبێ لە دوولاوە بیروانین: شاعیرێکی هەستیار کە عاشقی ئوستوورەکانەو لە هەمانکاتدا پیاوێکی ئاشنایە لەگەڵ ئەو کێشانەی کە رەگیان لەمێژوودایە. چەند خاڵێک لە ژیاننامەی ئەو جێی وەبیر هێنانەوەیە. ئەو بەنێوی جۆرج سێفریس لە ساڵی ١٩٠٠ لە سمیرنە Smyrna لە دایک بووە و کاتی منداڵیی لە بەستێنی دەریای ئیژە تێپەڕ کردووە، هەرچەند تورکان دەسەڵاتداری ئەو ناوچەیەن بەڵام کەلتوورو نەریتی خۆیانیان پاراستووە.

لەساڵی ١٩١٤ بەهۆی دەسپێکردنی شەڕ ئەو شوێنەی بەجێ هێشت. لە ساڵی ١٩٣٣ یۆنانیەکان لە ئاسیای بچووک دەرکران، سمیرنە وێران کراو ئیتر سێفریس هەرگیز زێدی خۆی نەدیتەوە. زەبری کاریی ئەم رووداوە لەگەڵ رەنجی هەمەگری شاربەدەری و ئاهومێدی، هۆی پێکهاتنی شیعرەکانی ئەو بوو و ئەرکی پیشەیی ئەم ئیزنەی پێ دەدا هەتا بەشێوەیەکی ئاشکرا گرفتی وڵاتێک کە رۆژ لەگەڵ رۆژ لەناو دنیادا بەتەنیا دەماوە هەڵسەنگێنێ.

شوێن و جێگەی سێفریس وەکوو شاعیرێک لەگەڵ ئەزموونەکانی بەرەو دیپلۆمات بوون هاوتانە. ئەو لەستۆکهۆڵم بەزمانی فەرانسەو بەم وشانە کە نیشانەدەری دڵساردیی نووسەرێکی یۆنانی بوو رایگەیاند:

«ئێستا کە خۆم لە دژایەتیەکەدا دەبینم. لەراستیدا ئاکادیمی سوید وای بەباش زانیوە کە بە هەوڵەکانی من لەو زەمانەی کە سەدان ساڵ ناوبانگی بووە و بەڵام هەنووکە پێشکەوتنێکی زۆرکەمی وەچنگ هێناوە، ئەم شانازیە بدا. ئەم ئاکادیمیە ویستوویەتی رێز بۆ زمانی من دانێ. بەڵام لێرەکانە بەزمانێکی بێگانە سوپاستان دەکەم و داوای لێبوردن لە ئێوەو هەروەها لە خۆم دەکەم.»

سێفریس وتەبێژو هەروەها نیشانەی ئەو قۆناغەیە کە یۆنان تێیدایە. سێفریس بەپێچەوانەی باقی خەڵات کراوانی نۆبێل کە لە گیروگرفتی نێو نەتەوەیی دەدوان، باسی گۆرانکاری و گرینگایەتی شیعری هاوچەرخی یۆنانی دەکرد. ئەم کردەوەیە نیشانەی هاوپەیانی لەگەڵ یۆنان بوو ئەو لە ستۆکهۆڵم ئاوای گووت:

**جۆرج سێفریس دیپلۆمات بوو و بۆ خۆی بەنیوەی شۆخی و بەنیوەی راست گوتوویەتی کەقەت لە هەڵبژاردنی پیشەیەکی تەواو نامۆ لەگەڵ شیعر، پەشیمان نیە.**

«من پێــویســتم بەو هاوپەیمانەیە. چوونکە ئەگەر هەست بەهەموو بایەخ و کەم و کوڕیەکان کە خەڵکی وڵاتەکەم تێیــدایە نەکەم وابیــر دەکەمەوە کە ناتوانم لە ژیانی خەڵکی ئەم دنیا هەراوە تێبگەم»

بەم شێوەیە یەکەم یۆنانی خەڵاتکراوی نۆبێل نیشانی داوە کە هەڵبژێردرانەکەی مانای بێ وێنەی یۆنانیی پێوەیە هەر بەو شێوەیە کە لە ئوستوورەی تراژیکی ئۆدیپــوس و مــێژووی تراژیکی سوقراتدا خۆی نیشان داوە.

سێفریس نووسەرێکی پڕکار نییە هەر بۆیە یۆنانیەکی نەناسراوە. ئەو لە ماوەی سێ دەیەدا کتێبێکی شیعری، کۆمەڵێک وتاری رەخنەو کۆمەڵێک لە وەرگێڕانەکانی بڵاوکردۆتەوە. شێوازی لە نووسیندا کورت و پاراو و سانایە:

بێجگە لە سادە دوان چیترم ناوێ

چوونکە ئێمە هێندەمان ئاهەنگ لەسەر ئەم ئاوازە بارکردووە

هێور هێور لە نوقم بووندایە...

## سێفریس نووسەرێکی پڕکار نییە هەر بۆیە یۆنانیەکی نەناسراوە

زمانی شیعری سێفریس بەئانقەست کورت و پتەوەو لەم روانگەیەوە هەر کام لە رستە سادەکانی مانایەکی زۆر زیاتریان لەچاو رواڵەتی وشەکان هەیە.

هەر کام لە شیعرەکانی بێ وێنەن و بەرهەمی هەڵسەنگاندنی هەستکردانەی یەک یەکی وشەکانە و ئەمە هاودڵی و هەوڵی زۆری خوێنەری دەوێ.

یەکەم کتێبی شیعری سێفریس بەناویStrophe لە ساڵی ١٩٣١دا بڵاوبۆوە. سەردێری کتێبەکەش بەمانای Stanza«نشتە»یان «برگە»ی شیعرە. ئەمە سەردێرێکی پێشگۆیانەیە چوونکە کتێبەکە رێگایەکی بۆ شیعری یۆنانی کردەوە. سێفریس لەم کتێبەدا تووشی ماناگەلێکی وەکوو تێپەڕبوونی زەمان، دڵەڕاوکێ مەرگ، هەستیاری و نەزۆکی دەبێ. بۆ وێنە لە شیعری «Rima»دا هەڵسوکەوتی پێویستی ژیان لەلای ئەم بیرە دادەنێ کە مرۆڤ هەموو رۆژێ کەمێک دەمرێ هەتا ئەو کاتەی مەرگی کاملی پێدەگا:

هەنووکە کاتی ئاوابوونی تاریکاییەو

من هێلاک لە پشکنینی نێو تاریکی...

(هەموو رۆژێ لەژیانی ئێمە

نەختێک بەدم با-وە دەڕوا).

وەبیرهێنانەوەی شادی و ئاکاری رابردوو (عاشق بوون، راو، لەش سپاردن بەهەتاو) بەرەو تێفکرین لە بایەخی ئەزموونێک دەڕوا کە بێ دڵخوازی وەلانراوە. شیعری Erotikos Lojos (ئاوازی عەشق) تەنیا شیعرێکی دوور و درێژە کە لە یەکەم کۆمەڵە شیعریدا وەبەرچاو دەکەوێ.

ئەم شیعرە لە جۆش بوون و هەوەس لەنێو زەماندا شی دەکاتەوە: شاعیر هەرای شتێکی خۆشەویست دەکاو بۆ ساتێک لەمەستی و هیوادا نوقم دەبێ بەڵام لە کۆتایی دا تێدەگا ئەمە ئاڵوگۆڕیەکانی زەمانن کە پێداگری دەکەن:

گوڵی سووری با-و چارەنووس

تەنیا تۆ وەکوو سەنگێکی قورس

لەنێو یاد دای.

تۆ تێپەڕیوی گوڵی سووری شەوان، تۆفانێکی ئەرخەوانی

شۆڕشی دەریا... ودنیا ساکارە.

ئەو ئەزموونەی کە هاتۆتەوە بیر، زۆر ناکامڵە چوونکە شتێکی فەوتاوەو نیتر بەسەرنج راکێشی یەکەم جار ئامادە ناکرێتەوە. هەر بەو شێوەیەی کە لە «پرۆست»دا دەبینین پرش و بڵاوی زەمان (لێرەکانەدا«مەرجانی بیرەوەریەکان» یان «تریە بێ کۆتاییەکان») بەشێوەیەکی کاتی بەسەر هێرشی فرامۆشیدا زاڵ دەبێ. بەرهەمی ئەم داسەپاندنە مۆجزەی هاودەنگ بوونی مرۆڤ لەگەڵ رابردوویە. ئاڵوگۆڕی رۆحی کە لەم بەرزە فڕییەی وەدواکەوتنانەدا هەڵقوڵیوە دەبێتە هۆی وەرگێڕانی ئەم باسە کە دنیا لە پێش هەر شتێکدا، سادەیە. مەبەستی ئەم وتەیە ئەوەیە کە مرۆڤ بەرەو ئەوپەڕی خەونەکانی دەڕوا. سێفریس مانای گەڕانەوەی زەمان لەگەڵ تەلیسمێکی ژیرانەو خەماوی ئاوێتەی خۆی دەکاو ئەمە لە شیعرەکانی دواتریدا دەبێتە

ناوەندێکی سەرەکی.

ئەو دڵەڕاوکێیەی کە لە Stropheو«ئاوازی عەشق»دا بینیمان لە ساڵی ١٩٣٢ لە شیعری Sternaدا دەبێتە هاوڕێی بینینێکی تراژیک:

لێرەکانە لەژێر خاکدا کانگای ئاوێک ڕەگاژۆ دەکا

ئەشکەوتی ئاوە شاراوەکان کە

خەزێنە کۆ دەکاتەوە...

ئەم خەزێنە ژێر زەمینیە کە دڵنەوایی دەکا، ویژدانی هەمیشە بەخەبەری مرۆڤە، لە سەرەوە دەنگی هەنگاوی جەماوەرێک دەبیستی کەکپ و کوێرانە لەنێو فەزای درۆیینەی پڕەندو دۆزەخ ئاسادا بەشێوەی «تاریکاییەکی خەست» دەڕواتە پێش. بریا بمانتوانیبوایە لەیادی بکەین و لێگەڕێین تا «گوڵی سوور لە زامەکانماندا بپشکوێن». شاعیر بەنیگەرانییەوە چێژ و بەرهەم هێنانی درەختی شکۆفەی لیمۆ وەبیر دێنێتەوەو لە ڕۆژێکی بەهاریدا شوێنی تێپەڕینی جەماوەرێک دێنێتە زەینەوە:

نسێ ڕەش پۆشەکان لەسەر تاجەگوڵینەی سیس

هەنگاوەکان...

هەنگاوەکان...

گازەنگێکی ئاهەنگ ئەرم

زنجیرێکی ستەماوی دەپچڕێنێ

ئەمە دیمەنێکە لەبەخاک ئەسپاردنی«مەسیح» لە ئەسینا کە لە ساڵدا دوو ڕۆژ پێش جێژنی «پاک» بەڕێوەدەچێ جەماوەر بەئارامی هەنگاو هەڵدێنێتەوە، شەم بەدەستەوەن، لەژێر لێو دۆعا دەخوێنن، هیوا بەئازادی ئاشکرا دەکەن سەیر ئەوەیە کە لەم ماوەیەدا ئەم خێڵە لەژێر «ئاکرۆپۆلیس» تێپەڕ دەبێ:

ئێمە دەمرین، خوداکان دەمرن و

مەرمەڕەکان ئەمە دەزانن، کاتێ وەکوو کازیوە

گلێنە بەقوربانیەکدا هەڵدەواسن.

سەرانسەری پیلووەکان نامۆی چاوانن و لوتە شکاوەکانیش

ئەو کاتەی لەشکری مەرگ بەپێش گلێنەیان دا تێپەڕ دەبێ.

دیمەنێکی روون و ئاشکرایە: ریزی پارتنونەکان دەڕوانە ئەم جەماوەرە رەش پۆشە کە بەرەو قیامەت دەڕۆن، هەنگاوەکان هەنگاوەکانی ئەم جەماوەرەن و هەروەها هەنگاوە پڕ زایەڵەکان لەسەر عەمباراو کە زۆر بەتاقەت لەکەمینی ڕەخسانی هەلێکدایە:

ئەمە عەمباراوێکە بێدەنگی ئەزموون دەکا

لەنێو شاری بڕوادا...

ئەم شۆڕشە دژ بە عەمباردا راوەستاوە- یانی ساتێکە پێش ئەوەی مرۆڤ دوایین سنووری ژیان تێپەڕدەکا و بەرەو مەرگ دەڕوا- ئەم شۆڕشە لێرەدا خۆی دەنوێنێ و دەبێتە ئاگاداری لەبیرو زەینی مێژوودا و لەنێوان هیوای مەسیحی بوون و حەتمی بوونی کافرێتی هاوتاییەک بەدی دێنێ.

سێفریس پێوانەی مانایی و سەرنجدان بەسەنعەتە ئەدەبیەکان کە نیشتمان پەرستانەیە، هەروەها سادەبوونی بەیانی مانا ناڕاستەکانی «چارەنووسی» یۆنان و شکۆی قارەمانیەتیەکەی وەلادەنی. لە ژیانیدا دژ بەقارەمانەتیە. لەلای ئەو هەڵسەنگاندنی قارەمان خوازی سەرکەشانەو گوماناویە. شتێکی کە ئەو زیاتر خۆی پێوە خەریک دەکا هەل و مەرجی ئالەباری خەڵکی یۆنانی ئەمڕۆیە نەک قارەمانەکانیان. لەم ڕوانگەیەوە سێفریس بەشێوەیەکی هەڵسووڕاو لە دژایەتیەکانی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئەدەبی یۆنانی هاوچەرخدا بەشداری ناکاو ئەمە لە برامبەر ئەم هەموو وەسوەسەو گوشارە بۆ بەکێشەهاتن کارێکی دژوارە.

سێفریس متمانە بە بەڵێنی سووک و سانا ناکاو زیاتر خۆی لەگەڵ بێ نێو-انێک خەریک دەکا کە کەس ناوێری یادیان بکا:

ئەم جارە بۆ جارێکی تر

هەر لە دووپات کردنەوەی ئەم وتەیەدای، هاوڕێ

بەڵام تێبکۆشە

بیری شاربەدەران، زیندانی

بیری مرۆڤێک کە تەنیا کەل و پەلە، ئالووێر بکەی.

**بەبۆچوونی من هۆکری سێفریس بەلاوان (وەرگرتنی خەلاتی نۆبێل بەسەرکەوتنی لاوان دەزانێ) بەشێکە لە بەڵێنی ئەو لە بەرامبەر کەسانێک کە مێژوویان لەبیرکردووە**

نۆستوورە و مێژوو بەشێوەیەک لەپەنای یەکتر دانیشتوون و هەر کام راڤەی خۆی دێنێتە ئاراوە

کەناتوانی...

بەبۆچوونی من هۆگری سێفریس بەلاوان (وەرگرتنی خەلاتی نۆبێل بەسەرکەوتنی لاوان دەزانێ) بەشێکە لە بەڵێنی ئەو لە بەرامبەر کەسانێک کە مێژوویان لەبیرکردووە، هەروەها بەڵێنی لە بەرامبەر ئەو کەسانەیە کە نێویان ون و شاراوەیە.

سێفریس دوای شیعرە سەرەتاییەکانی خۆی، کێش وەلادەنێ و هەر شتێکی کە بۆنی هونەر نوێی بدا لە شیعرەکانی خۆیدا دەسرێتەوەو رووداوەکاتە بەیانێکی سادە، پتەو وردبینانەو ئاهەنگی ئەم بەیانە سادەیە لە قۆناغی تایبەتی یۆنان لە ساڵی ١٩٣٥دا دەبێتە هۆی خوڵقانی بەرهەمی ناوداری «mithistorema». ئەم بەرهەمە لە بیست و چوار شیعرێک پێک هاتووە کە هەرکامیان هەر لە خۆیاندا کامڵن و لە هەمان کاتدا بەشێکن لە بالایەک. سەردێڕی شیعرەکەش مانایەکی چەند لایانەی هەیە: ئوستوورەو مێژوو، نوستوورەی مێژوو، چیرۆکی ئەساتیری، رۆمانی ئەساتیری یان رۆمانسی ئەساتیری. رەنگە «ئەفسانە» هاوتایەکی باشتربێ- یانی هەواڵێکی راست یان ئەفسانەیەک کە لەرابردووەوە پێمان گەییشتووە. «درامی لەبیرکراو» یا «لە سەرتاوە دەسپێکردن»، سەفەرێکی تاقەت پرووکێنە کە تێیدا دەورگێڕەکان موسافیرانێکن کە تووشی کەمایەسی لەشی و تاسەیەکی ناهومێدانە دێن. هەر کام لە شیعرەکان لە بارەی شوێنێکی بیندراو، دۆزراوەیەکی مێژوویی، رووداوێکی پڕ کارەسات یان وەبیرهێنانەوەو بینین یان گریانێکی مرۆڤەکان ئارگۆنات (٢)-ەکانی مێژوویی مرۆیێن کە «بە عارەقە ڕشتنێکی زۆرەوە سەوڵ لێدەدەن» ئەو شاربەدەرانەی «نانێکی تاڵ دەجوون» زیارەت کەران لە سەفەرێکی بێ مەزڵ»، «ئۆرستێس داماوە لەوەڕسوورانێکی هەمیشەیی»، ئۆلیسی چاوەڕوان»، پەنابەران و زۆرشتی دیکە، ئاخێوەر (بگێڕەوە) لە زمانی «من»یان «ئێمە» دەدوێ و ئەم چەند دەنگییە لە چۆنیەتی لایانەکانی زەمان دادێت و دەڕوا هەتا ئەو جێیەی سنووری نێوان رابردوو و هەنووکە ون دەبێ. بەم شێوەیە سەفەر لەهەمانکاتدا کردەوەی تاقیکاری و رامان لە چۆنیەتی مرۆڤە کە بەتێپەڕبوون لە زەمانە جۆراوجۆرەکانی شارستانیەتی مرۆڤ و بەوێڵ بوون لە ئاوێنە جۆراوجۆرەکانی ئوستوورەدا ئەنجام دەدرێ.لە «mithistorema»دا ئێمە کردەوەی نالەباری مرۆڤی شکۆدار نابینین. ئەوەی کە هەیە گیرۆدەگەلێکی خامۆشن (هیچ گلەییەکیان نەدەکرد/ نەلەبزربوون، نەلەتینویەتی، نەلەسەرما»). مرۆڤ گەلێک لە مێژووی بێ ناو و نیشانی و تەنیا لە ئەفسانەکانی یاسون یان ئۆدیستۆس دا ئاماژەیەکی سەرزارەکییان پێکراوە:

خووی درەخت و پۆلیان بوو
وادەبنە میوانداری با-و
باران وشەو و رۆژ

بێ ئەوەی لەهەڵلاو بگری گۆڕان دا بگۆڕین.

موسافیری ئەفسانەیی- مێژوویی هەر ئەو پیاوە ناساییەیە کە لە تەواوی سەردەمانی مێژوویی یۆناندا لە هەموو شوێنێکە. مرۆڤێک کە لە ماوەی زەماندا دان بەجەرگەو لە کێشەی ئاڵوگۆڕی سیاسی، کۆمەڵایەتی و فەلسەفەی ئایینی بە ساغ و سلامەتی دێتە دەرێ. چوونکە ناچارە بەپێی فەلسەفەیەکی بنەڕەتی کە یاسای ژیانە بژی: مرۆڤ بەو چەشنەی کە دەتوانێ دەژی. ئارگۆناتەکانی گوێ لەمستانە گیان دەدەن و دان بەجەرگ دادێن. بەمەرگێک دەمرن کە عادلانە فەرامۆش دەبێ.

هاوڕێیان یەک لە دوای یەک گیان بەخت دەکەن
بەچاوی شۆڕەوە
سەوڵەکانیان ئەو شوێنە لەبەستێن نیشان دەدەن
کەلێی خەوتوون
کەس یادیان لێ ناکا، عەداڵەت...

ئێمە یاسون و ئۆدیستۆس وەبیردێنینەوە بەلام تازەلاوانێک کە بەدوایاندا رۆیشتن فەرامۆش دەکەین. دوایین وشە عەداڵەت، ئاگاداری ئەمەیە کە بێ هەموو شتێک شێوەی کایەکردن

ـاوایە. بەڵام لەهەمان کاتدا عادڵ نەبوون ئەم حووکمانە دەخاتە ژێر هێرشی شک و گومانەوە.

هات و هاوار و بگرەو بەردە هەروەکو سەرجەم تراژدیە یۆنانیەکان بەشێوەیەکی لێک جیانەکراو، ئاوێتەی یەکتربوون.

سەردێڕی شیعر بنەمای خودی شیعرەکە نیشان دەدا. چوونکە ئوستوورە و مێژوو بەشێوەیەک لەپەنای یەکتر دانیشتوون و هەر کام راڤەی خۆی دێنێتە ئاراوە. لەنێوان یۆنانی هاوچەرخ دا یانی ئەو جێیەی کە «جاشوان» لە دنیایەکی عەینیدا دەژی و یۆنانی کۆن، ئەو شوێنەی ئارگۆناتەکان لە دنیایەکی ئەفسانەیی دادەژین، جیاوازیەک بەدی دەکرێ. لەم روانگەیەوە جاشوانی هەنووکە و ئارگۆناتەکانی کۆن لێک دەچن کە عەیامێکی تراژیکە بەڵام لەم روانگەیەوە کەیەکیان راستەو ئەویتریان دەستکردی زەینی شاعیرە جیاوازیان پێکەوە هەیە. سێفریس سنووری هاوبەشی نێوان ئوستورەو مێژوو بۆ گەییشتن بەچوارچێوەیەک وێک دێنێ و دەیخاتە ژێر گوشارەوە. لەدنیای دەستکردی ئوستورەدا، ئارگۆنات نەناسراوەو چیرۆکەکە بەسەرهاتی پیاوێکی لەناوچووە، لەدنیای راستەقینەی مێژوودا، ئارگۆناتی نەناسراو تەنیا نسێتکە لەراستی، تەنیا نوستورەیەکە. بەڵام لەهەمان کات لەدنیای نوستوورەو مێژوودا ئارگۆناتی نەناسراو وەکوو گەوهەرێکی تراژیک بەدی دەکرێ - لەوپەڕی ئوستورەدا بەردەوام دەبێ و تایبەت بە دنیایەکە کە یۆنانی تێدا دەژی، هەرکام لەوان وەکوو ئەوی تر لەبێ ناونیشانیدا ئازار دەبینێ و خۆراگری دەکا. یانی بۆچوونی تراژیکی ئازار، هەوڵ و مەرگی بێ ناو و نیشانی مێژوو و ئوستوورە یەککگرتوو دەکا. ئارگۆناتەکان یان«ئێمە»ی هاوچەرخی یۆنان هەموو لەو هەویرەن کە ئوستوورەی لێ سازدەکرێ. تەنانەت ئەگەرچی مێژوو ژیانی ئێمەی گەمارۆ داوە. هەر بەهەمان شێوە کە مێژووی ئێمە گەوهەری تراژیکی ئەساتیریی ئێمە وەدی دێنێ، رابردووی ئەفسانەیی ئێمە تیشکێک دەخاتە سەر تراژدی. هاوڕێیەتی کردنی تراژیک پردێکە کە سێفریس هەڵیدەبەستێ هەتا بەنێوان ئوستوورە و مێژوو داتێپەڕین. «mithistorema» دوای جوولانەوەیەکی بەکاوەخۆ بەڵام بێ راوەستان بەرەو مردووانی کۆن کە «لە بێدەنگیەکی نامۆدا پێدەکەنن» و دوای هاوتابوون لەگەڵ ئەم پرسیارەی دانیشتووی نێوان ترس و هیوا کە ئایا مرۆڤ دەتوانی هاوئاهەنگ لەگەڵ قاعیدەکان بمرێ، بەبەیت گەلێک تەواو دەبێ کە هاوسەنگی بەیەکتری دەبەخشن:

ئەولاتر، تەنیا کەمێک ئەولاتر
ئێمە دەبینین ئەو درەختانەی بادام پشکوتوون
ئەو مەرمەڕانەی لەژێر هەتاودا پڕ تروسکەن
دەریاو شەپۆلە بەلرفەکانیش
تەنیا کەمێک ئەولاتر
باهەڵگەڕێین.

لە ئاکامدا گەییشتن بەروونی و ئاشکرایی ئاسوودەییەو هەست بەژان جوولانەوەیەکە بەرەو سارێژبوون. وەرسوڕانێکە بەرەو وەرگێڕان ئەو شوێنەی کە هەموو دەرگاکانی ئاسوودەبوونی لێ دانەخراوە. ئێمە ناچار دەبین سەرنجی سامناکی و هەروەها کەرەسەی هیواکان بدەین لە mi-thistorema-ی روانگەی سێفریس دا ناهومێدی و رزگاری کامڵ نین. بەڵکوو وەکوو تراژدیای یۆنانی شتێکە ترس و هیواو لەرینەوەیە لەنێوان هەرکیاندا. کۆتایی شیعرەکە بەئانقەست نیشاندەری ئاسوودەییەکی پڕ پێچ و پەنایە:

لێرە دەریا کۆتایی پێ دێ، عەشق کۆتایی پێ دێ
سەردەمانێک ئێرەکانە بۆ ژیانی کەسانێک، دوای تەواو بوونیان
ئەگەر بێتو لەزەینیاندا خوێنی تۆخ کەوتە گەڕیان
یادمان دەکەن، بێ هێزانێک لەنێو سۆسنە سپیەکاندا
سەری قوربانیەکان بەرەو دەسپێکی تاریکایی وەردەسوورێن
ئێمە کەدەست بەتاڵ بووین، بۆ ئاسوودەیی باریان دێنین

**وەبیرهێنانەوەی شکۆی رابوردوو، وەبیرهێنەرەوەی ئەمەیە کە لەبەرامبەر مەرگ و نەبوون تەواوی دیمەنەکانی جوانی بێ هێز و بێ بەرهەمە**

ماخولیای ئارامی ماڵئاوایی، بەمانایەکی تازە لە رابوردوی نێوان ژیان و مەرگ دا کۆتایی بەشیعری -mi thistorema دێنێ. ئەو هێمنیەی نیشاندەری ئاسوودەیی«بێدەنگییەکی نامۆ»یە رەمز و رازی چارەنووسی نیشان دەدا. یۆنانیەکان تایبەتمەندی مرۆڤیان بەبەشێک لە نەزم و نیزامی شتەکان دەزانی.

هەڵبژاردن لەنێوان حەتمی بوون و هیوادایە، لەنێو داهاتوویەکی تاریک. هەروەها بەم زانستە کۆتایی پێ دێ کە ریزبوونی بێ بەرنامەی شتەکانی لە خۆی دا خاوەنی نەزم و نیزامە.

«mithistorema» هەرچەند «بێ وێنە»یە و شێوەگەلی جۆراوجۆری «مۆدێرن» بوونە بەڵام شیعرێکی دەروەستە، چوونکە سێفریس بەڵێنی بەیۆنان داوە. هەر بەوشێوەیەی کە «ئانتۆماچادۆ»بە ئیسپانیاو «ویلیام باتلرییتس» بەئیرلەندی بەڵێنی دابوو. لەو سێ کەسەدا تایبەتمەندیەکی خۆماڵی دەبیندرێ. ئیسپانیا، ئیرلەندو یۆنان، بەقەرز لەوتەی «هاوسرن» دروست بەشێکن لەو خاکەی کە لە دڵدا جێی دەبێتەوە. ئەو کاتەی شاعیری یۆنانی لەسەر کەشتی بەندەر بە بەندەر سەفەردەکاو«پەردەی کێوەکان، دورگەکان، درک و داڵی رووت دەبینێ» هەست بەخەمڵیوی بەندەر دەکا ئەو کاتەی پاپۆرەکان رۆییشتن»، گوێ دەداتە گفتوگۆی هەموو رۆژێی ژیان و بەخراپەکاری، تاڵان، بێ دەرەتانی و هەژاریی شارەکانی یۆنان دەزانێ. ئاوا سروشتییە یۆنان بێ رەنجێتێ و بنووسێ:«ئەو پاپۆرەی لە سەفەردا نێوی ئازاری ٩٣٧-ـە یانی شاعیر دایە دنیایەکی تایبەت بەخۆی، دنیای یۆنان و دنیای بەرینتر نزیک بە «ئازار» دەبینێ. نزیک بوونەوەی هاوکات بەوڵات و جیهان، شیعری سێفریس پڕ چێژ دەکاو ئەو دەرفەتەی پێدەدا کە تەواو وەفادار بەعادەتی خۆی بێ- سێفریس دنیای مەدیترانەیی ئەساتیری دەخولقێنێ کە کامڵەو هەموو شتەکانی لەژیان سەفەرەکانی لە دەریای ئێژەو لە مێژووی مرۆڤ دا- تمثیلی- یان ئوستوورەییە.

سێفریس دایە هەوڵی داوە تاکوو شیعرەکانی زیندوو بێ. لە شیعرە ناسراوەکەیدا بەنێوی «شای ئاسین» کە لەسەرەتای شەڕی دووەمی جیهانیدا هۆنراوەتەوە تەکنیکی گوێزتنەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بەوپەڕی خۆی دەگەیەنێ. شاعیر لە قەڵای وێران لە هەرێمی ژێر دەسەڵاتی پاشایەتی دەریاگەڕی بچووکی ئاسین لە نزیک ناپۆئۆلین، بەشوێن باشاکەی ئەوێ دادەگەڕێ.«نەناسراو، لەبیرکراو، تەنانەت لەیادی هومێریش، تەنیا وشەیەک لە ئیلیاد لەبیرماوە ئەویش ئاوێتەی گومانە». شاعیر لێرەدا ئاماژە بەوتەی هومێر«Asinente» دەکا. لەوێکانە شاعیری مێژوو پێرێشتێک لەنێوی قارەمانانێ نیشان دەدا کە بۆ شەڕی ترۆیا رۆیشتوون. ئەم دووشەمەیە بەمانای «وئاسین»ـە. یانی یەکێکی تر لەو پاشایانەی لە شەڕ بەشداری بووە نێو دێنم. ئەم بەشوێندا گەڕان و ئاڵوگۆڕانە:«وێرانیەکان بەجێی قەڵای، نێوی پاشایەک، شەمشەمەکوێرەش نیشانەی چۆڵگەییە، بەجێی هات و چۆی ئەو پاشایەتیە.» سێفریس شیعری نوێی یۆنانی خۆی لە دەوری وتەی کۆنی یۆنانی هەڵدەچنێ:«Asinente..

شای ئاسین ئەو ناڕاستەی پشت رووخسارێکە
لە هەموو شتێک لەگەڵمانە
لە هەموو جێیەک لەگەڵمانە
لەژێر نێویک دا وئاسین، وئاسین.

ئەو ئەم رستەیە لە شیعری هومێر دەکاتە بەیتێک بۆ شیعرەکەی خۆی و زۆر شارەزایانە تێکەڵاوی مرثیە-ی دەکا. ئەم گێڕانەوەی هومێر کە وەکوو راپۆرتێکە «و لە قارەمانێکی تر»دا شێوەی پرسیاری- مرثیە-یەک بەخۆیەوە دەگرێ:«وئاسین چی؟ ئەو قارەمانەی هومێر بەئاماژەیەک لێی تێپەڕ دەبێ».

گریان بۆ ئەم پاشایە ئاماژە دەکا بەپرسیارێک لە بابەت ئەو راستیەکەم ماوانە کە هەست دەکرێن و هەست ناکرێن و ئەمەش فەرەنسواوین-مان وەبیر دەخاتەوە:«بەڵام بەفرەکانی دوێنێ لە کوێن؟:

بڵێی ئێستاش مابن؟
ئەو جووڵانەوانەی روخسار
سیمای عاتیفەی ئەوانەی ئاوانامۆ
لە ژیانی ئێمەدا لێکدراونەتەوە
ئەوانەی لە شەپۆڵ و هۆش
بوونەنسێ
لە پانتایی بەریندا بوونە دەریایەکی ئاواڵا.

وەبیرهێنانەوەی شکۆی رابردوو، وەبیرهێنەرەوەی ئەمەیە کە لەبەرامبەر مەرگ و نەبوون تەواوی دیمەنەکانی جوانی بێ هۆ و بێ بەرهەمە. لە شیعرەکەدا ترجیع-ی «ASINENTE» وەها جێگیربووە کە سەرجەم سەرنجەکان بۆ لای ئەوە و راستیەی تەنزاوش دەکێشێتە نێو لەحنی- مرثیەیی و هەروەها نێو بەیانی حەماسی هومێرەوە:

وشای ئاسین... وشای ئاسین
ئەو کەسەی لە ئاکرو پۆلیس
بست بەبست بۆی گەڕاین و
جـارجـارێکیش لەسـەر بەردەکـان هەسـتـمـان بەنەنگوستەکانی دەکرد
بڵێی ئاسین بووبێ؟

لەژێر کاریگەری «مەکبێس»دا: ئاسین تەنیا سێبەرێک بوو دەجوولاوە، دەورگـێرێکی تر لە دیمەنێکی گەورەدا و ئەم جار، ئیتر هەواڵێکی لێ نییە. قارەمانیگەریش بۆ خۆی بۆ چوونێکیترە. ئاسین بەپاشایەکی گەورە دادەنرا، بەڵام لەراسـتـیـدا ئەونسێی پاشـایەتیـە، سێبەری قـارەمـانێک- «ناراسـتـی پشت رووخسـارێک»و لە سەرانسەری حەماسەدا تەنیا رستەیەک نەک زیاتر، لە بابەت کەسایەتی قارەمانیی ئەودا نووسراوە.

«Thrush» لە دوای شـەڕی دووهەمی جـیـهـانیـدا بەناوبانگترین شیعری سێفریسە. ئەم شیعرە شیعرێکی زۆر پتەوە کە تێیدا هەمـوو شت وەکـوو راپۆرتێک لە ئەزموونی دوای شەڕ دەبیندرێ یان وەکوو پێکهاتەیەکی بەرین بۆ بوون، کـەتۆرێک لە ئاماژە بنەڕەتیـیـەکـان یان راسـتـیـەکـان ئامـادە دەکـا. - تمثـیـل- ە ئەدەبیـەکـان و ئاماژەکانی سەردەم کەشتێکە وەکوو «ئۆلیس»ی جۆیس، تەنیـابە تێـپەڕبوونی سـاڵەکـان دەکـەوێتـە بەرتوێژینەوە. شـوێنی شـیـعـرەکە دیمەنی جـوانی دورگـەی پۆروس-ـە (سـێـفـریس زۆربەی هاوینان لەوێ دەبوو) کـە دوای تەواوبوونی شـەڕ دیسـان دەتوانێ جـەسـتـەی پاپۆڕی بچووکی Thrush کە ئاڵمانیەکان لە ساڵی ١٩٤١دا نوقـمـیـان کـردبوو، ببـینێ. ئەم پاپۆڕە نیـوە نوقـمـە وەبیـرهێنەرەوەی خەساری و بیرەوەریە تاڵەکانی شەڕە و لەهەمانکاتدا شەلی و کوتی مرۆڤ وەبیردێنێتەوە. لێرەدا ئاخێوەر (بگێڕەوە) ئۆلیس-ێکە لە تەمەنی کامڵیدا کە لەشـەڕ دەگـەڕێتـەوە. ئەو شـاهیـدی زۆربەی پووچی و ئەزموونە تاڵەکانەو هەنووکە ئاوێتەی گومانەو لایەنگیری روونکردنەوەو وتووێژە. هەرێمی دەوروبەری شـوێنێکی باشە بۆ کێشەکانی ئاخی شاعیرو بیرکردنەوە لە مرۆڤ: مـاڵێک لەبەسـتـێنی دەریا، نیـشـاندەری بیـری ئارام و بۆشـایی بوونە، وتووێژی نێـوان شـۆرشگێـرێکی لاوەکـە وەبیـرهێنەری «ئێلپـێنۆ» Elpenor لە ئۆدیسـەی هۆمێـرەو ژنێکی هەوەسـاوی کە «کـیـرکێ Circe(٥)» دێنێتـەوە یاد بەشێـوەیەکی تەنزاوی نزیکایەتی لەش و لایانی رۆحـانی نیـشـان دەدا، رادیۆیەک لە بەسـتـێنی دەریاپووچی و لایەنگیریەکی بێ ئەندێشە لەوشتانەی کە بڕیار لەسەر دراوی رۆژانەن، وەبیـردێنێـتـەوە. پەیکەرەی تێک شکاوی Thrush ئاماژەیەکە بەنزیکایەتی مەرگ و لە کۆتاییدا کیژۆڵەیەک بەنێوی ئانتیگۆن لەبەستێنی دەریا نیشاندەری هیوا بەخولقانی دووبارەیە. ئۆلیسی بە ئەزمـوون، پوخت و پاراوە بەڵام ئیـتـر ناتوانێ وەکـوو رابردوو ئاوێتەی ژیان بێ.بەکورتی ئەو کەسەی نائارامەی دەگەڕێ، زۆربێ وازانە هەنووکە وەبیردێنێتەوە، لەزەینیدا هەرچی شـتـە دەبێـتـە تۆرێک لەئامادەکان، دروست هەر بەوشێوەیە کە لەبەرهەمەکانی ئاخلیوس دا دەیبینین. ژیان و مـەرگ، رابردوو و ئێسـتـا، شـەڕو تەبایی، ئەفسـانەو راستەقینە، زەمان و تاهەتایی، بیرەوەری و فەرامۆشی، هێزو بێ هێزی و زۆربەی ماناکانی تر یەک دەست دەبن و لە دەلاقـەی ئامادەکان، دیمەنەکـان و سوونەتەکانی یۆناندا دەیانڕوانێن.

کاتێ شاعیر بۆ تەماشای پاپۆڕی نوقم بوو دادەنیشێ، دەنگگەلێک لەنێـو کەشتیـەکەدا دەبیستێ. دەڵێی ئەو دەنگانە لە قـوولایی دنیـای بنەوە (هادس) هەڵدەستێ. شاعیر بەتایبەتی گوێ دەداتە دەنگێک.«ئارام و مەند»:

ئەگەر مەحکووم بەخواردنەوەی ژەهربم،
سوپاستان دەکەم
من بۆ کوێ دەتوانم بڕۆم
لە خاکێکی بێگانەدا سەرگەردان
لەسەر بەردێکی خللۆر
مەرگم پێ باشترە...

شـاعـیـر دیسـان سـوقـراتی سـتـەم دیـتـوو دەناسـێنێ. داهاتووی سـتـەم، شـاربەدەریی و مـەرگ، لە کـۆتاییـدا دەگـاتەوە خـود و ئێـمـە لە خـوێندنەوەی رابردووی، بریسکانەوەی هەمـوو دڵەڕاوکەکانی بوون دەبینین:

هێندەی ساڵان تێپەڕدەبن
زیاترن ئەو قازیبیانەی تۆیان مەحکووم کرد
هێندەی ساڵان تێپەڕ دەبن و
تۆ بەدەنگی نزم و نزمتر دەدوێی
بەچاوانێکی تر دەڕوانیە هەتاو...

شـاعـیـر بەئاشکرایی خـراپەکـاری، فـرۆفـێڵ، تانەی رەخنەگران و گاڵتەی دۆستان دەبینێ، بەڵام درام-ی تاکە کـەسی لە بەرامـبـەر درام-ی سـامناکی شـەڕدا خـۆی دەدۆڕێنێ:

رووناکیەکی پەری ئاساو رەش
پێکەنینی شەپۆل بەشارێیەکانی دەریا

پێکەنینێک بەفرمێسکی لێڵ
پیرە پیاو بەتکاوە دەتروانێ
ئەوکاتەی بەرەو رێیەکی ون دەبێ
بریسکانەوەی تیشک لە خوێنی دا
لە دایک دەبن لێی ئێتێئۆکلێس و پۆلاینیکۆس(٤)
رۆژی پەری ئاساو رەش.

رووناکـایی وتاریکی نیـشـانـدەری گـەڕیانی ژیانی مرۆڤن. پیرە پیاو، ئۆدیپوس- ـە لە تاریکاییدا رووناکی دەبینێ و بەم زووانە رێی دژوار بەرەو تێگەیین لەمـانای دروست وەڵامی خۆی- مرۆف- بەرەندی (ئێسفینکس)ی زانیوە. دواتر شاعیر روو لە ئانتیگۆن، لە کیژۆڵەیەک لە بەستێنی دەریا، دەکاو هەروەها کەسایەتیەک بەگومانێکی تراژیکەوە:

بخوێنە، ئەی ئانتیگۆنی بچووک، بخوێنە، ئاخ، بخوێنە
لەوشتانەی کە تێپەڕیون نادوێم، لەعەشق دەدوێم
تاجێک لەدڕووی هەتاو لەسەر زولفەکانت دانێ
ئەی کیژی تاریک
ئەو کەسەی قەت عاشق نەبووە
لە رووناکاییدا عاشق دەبێ...

ئانتیگۆن لەگەڵ خۆی دوو دنیای مرۆڤایەتی، دووبرا، ئێتێئۆکلێس و پۆلاینیکۆس، هەروەها رووناکایی پەری ئاساو رەش بەکوڵ دەکێشێ. «دیکتـاتۆری ناخی مـرۆڤ رۆیشـتووە» بۆ مرۆڤ ئەم هەلە رەخساوە کە لەم رۆژگارە نالەبارەدا شانازی بکا. بەڵام ئەمە مەشقێک نییە کە بە هاسانی بدۆزرێتەوە، چوونکە مرۆڤ دەبێ بەتێگەیشتنی رووناکـایی بکا- یانی بەتەواویەتی ئاگـاداریی هەست بەچارەنووسی ئێـمـە بکا بەهەمـوو زامـداری و شـومیـەکـانیـەوە سێـفریس لەکۆنەوە ئەو راسـتیـە خواسـتراوە کە شێـوەیەکی لەناسین و دۆزینەوەی پێوەیە، دێنێتە بەر زەینەوە، بەشوێن داگەڕانی دایە و هەمیشەیی شاعیـر- ئۆلیس و هاتنی ئانتیـگۆن تیـشکی تراژیدیای یۆنانیی خسـتـۆتە سـەر هەمـوو شـتـێک. چارەنووسی خەملـیوی مرۆڤ و هێزی ئەو بۆفێربوونەو وەکوو ئۆدیپوس رووناکایی پەری ئاسـاو رەش» بینینە لە خـوێنی خۆی دا. کۆتایی شیعرەکە نوقمی چەشنێک رووناکایی رەش بینیە یانی هەر ئەو نیوە رووناکییە کە دەسەڵاتداری تراژیدیای یۆنانە.

Thrush لە دوای تێـپـەڕکـردنی چەندین سـاڵ خۆێشکنین و شەڕی سامناک، دەڵێ راڤەکردن و وەڵامێکە بۆو پرسیارەی کە لە Mithistoremaدا هاتۆتە ئاراوە، مرۆڤ دەتوانێ هاورێ لەگەڵ قاعیدەکان بڕێ، بەڵام رێگا دژوارەو پڕە لەو وردە راسـتـیـانەی هەڵـتۆڵن. لە هیچ رێگایەکـدا بۆ رزگـاربوون بێ رەنج نیـیـە، بەڵام رەنج دەتوانێ بەرووناکایی و ئاگاداری لە چۆنیـەتی خـود بگاو مانای بوون بدۆزێتەوە.

هیچ کـام لەبەرهەمـەکـانی سـێـفـریس بۆ نیـشـاندانی ئەندێشەکانی شاعیر سەرکەوتووتر لە «ماکیریبیانیس، یۆنانیـەک، نین. ئەمـە وتارێکە لەبارەی یەکـێک لە قـارەمـانەکـانی شـەڕی سـەربەخـۆیی لەدەیەی ١٨٣٠دا.«مـاکـریبیـانیس مـرۆڤـێکی خوێندەواربوو کـە کـتـێـبی بیـرەوەریی باشی لە خـۆی بەجـێـهـێـشت. ئەو دەنووسێ:

«ئەو شـتـەی لێـرەدا دەینووسم تەنیـا بەم هۆیەیە کـە ناتوانم ببینم هەرچی بۆنی عەداڵەتی لێ بێ ستەم هیلاکی بکا، من کاتێ منداڵ بووم نەمدەتوانی فێری هیچ شتێک بم، هەر بۆیە لەسـەرەتای پیـریدا ئەلف و بێ فـێـربووم و بەرێنووسێکی خواروخێچ کاغەز رەش دەکەمەوە.»

سـێـفـریس فـریودراوی ئیـرادەی ئەم تێکۆشـەرە نەخـوێندەوارە لەبەیانی خـۆی و چۆنیـەتی ئەدەبیی ئەم بیـرەوەریانەدا دەبێ. هەرچەند لەمـپـەری تایـبەت بەخـۆی لەسـەر رێیە و قـۆناغی مێـژوویی و ئەو مەترسیـانەی کە دەیانتـوانی مرۆڤـە سـست ئیـرادەکـان کپ بکا، بەڵام ئەم بیرەوەریانە نووسراون. لە روانگەی سێفریس دا پێویستی ماکریبیـانیس بۆ گێـڕانەوەی خۆی هەر وەکوو«ئەم گژوگـیا پێچەقینە وایە، کاتێ رەگی داکوتا، دیوارەکان، بەردەکان و گۆڕەکان وەخۆدەگرێ».

مـاکـریبیـانیس لە سالـەکـانی دوای شـۆڕشـدا کـەوتە ژێر چاودێری و ئازاری هاووڵاتیـەکـانی و لەم وەرسـوڕانە تەنزاویەدا دروست هەر بەوشێـوەیەی کە ئێـمە لە درام-ی مێـژوویـیدا کـامڵ بوونی کـردەوەیەکی تراژیک و پڕ تەم و مژ دەبینین، سـێـفـریس-یش هەست بەمـەدەکا- ئەمـەش بەهۆی زەبرانەیـە کـە لەم کـەسایـەتیـە قـارەمـانە دەدرێ، بەڵکوو بەهۆی کردەوەی سێفریسە کە چوارچێوەیەک دەدا بەم درام-ـە. ئەم کردەوەیە لە بەرامبەر گوشاردا، دەتوانرێ لە گفتوگۆی درێژ ماوەو ساویلکانەی ماکریبیانیس لەگەڵ خودا ببیندرێ، لە هەر شوێنێک ئەوان تووشی گیروگرفت هاتبێتن لەبیرەوەری خۆیدا تۆماری کردوون. ئەو لەیەکێک لە راوەستـانەکانی لەبەرامبەر خودادا تووشی چارەنووسی خۆی دێت و هەروەکوو ئەوەی لە شانۆنامەیەکدا قسە بکا بەوشـەکـان کـردەوە لە خـۆی نیـشـان دەدا. ئەم قـارەمـانە

میللیە هەراسان و خەمناکە بەلام بەلەحنێکی قورس و قایم هاوار دەکا:

«تۆش دەنگی ئێمە نابیستی، نامانبینی... وەمن شەو رۆژ بەم وشانە دەناڵێنم، ناچارم هەموو رۆژێ بنەماڵەی بێ دەرەتان و منداڵەکانم کە پێخاوسن و لە هێزی گریاندا دەخنکێن، ببینم، شەش مانگ زیندان لە زاخرخانەیەک دا، بێ ئەوەی پزیشکێک بمانبینێ و ناهێڵن کەس لێمان نزیک بێتەوە یان چاویان پێمان بکەوێ. هەموویان چاوەڕوانن گوێ بێن. لێمان دەپرسنەوە، ماڵەکانمان، ژێرخانەکانمان، سەربانەکانمان وتەنانەت وێنەکانی تۆ دەپشکنن.».

ماکرییانیس ئیتر نەیدەتوانی نزیکایەتیەک لەنێوان خۆی و خودادا بدۆزێتەوە. عەیام و زەمان گۆڕدرا بوو. قارەمانی میللی هەنووکە ئەشکەنجەکراو، محاکمە کراو، تاوانبارو لە بەندیخانە خرابوو، بەلام خۆراگری دەکرد. بەوتەی سێفریس:«پیاوێکی کە بەپلەی مرۆڤایەتی گەیشتووە». لە روانگەی سێفریسەوە ئەو دیمەنی یۆنانە، چوونکە ماکرییانیس وەکوو «هاوڕێیانی ئوستوورەو مێژوو بەوەدەگا کە دنیا هەمیشە ژێرانەو عادلانەنیە». بێجگە لەوانە دەبێ لەبەرامبەر بەلا داسەپێوەکان وەکوو بەشێک لەرازو رەمزەکان تاقەت بێنین. ماکرییانیس- چەشنێکە لە ئۆدیپوس و ئەیوب لە وێنەی ئەمرۆییدا- تەنیا دەتوانێ رێز بۆ باوەڕەکانی خۆی دانێ و قورس و قایم راوەستێ و هیچی تر. ئەو لەگلەییەکدا کە لە خوداوە بۆ خودای دەبا«رووناکییەکی پەری ئاساو رەش» بەچارەنووسی خۆی دەزانێ، وەکوو یۆنان ئەمە فێربووە کە هاوڕێ لەگەڵ یاساکان بژی و بمرێ.

پەراوێزەکان:

(١). پێناسەی ئەم وتارە ئاوایە:

George Seferis; Myth and History, in world Literature Today, Spring 1989, 250 th issue.

(٢)«Argonauts» هاوڕێیانی یاسون لەسەفەرە دووردرێژەکەیدا.و.

(٣) «Orestes» کوڕی ئاگامنوون و کلیتمنسترایەو بەیارمەتی خوشکەکەی (ئیلیکترا) بۆستاندنی خوێنی باوکی شۆڕشی کرد.و.

(٤)«jason» قارەمانی یۆنانی، سەفەرێکی پڕ مەترسی کردو پەشمی زێڕینی وەچنگ هێنا.و.

(٥)«Circe» کچی هیلۆس، جادووگەربوو. ئەو مەلەوانانی بۆ دورگەیەک دەبرد کە بۆ خۆی لێی دەژیاو هەر لەوێ ئەوانی دەکردە جانەوەر.و

پاشماوەی پەراوێزەکان:

(٤)«PoLynikos, EteocLes» کوڕانی ئودیپ- ی پاشای تێبن. دوای مەرگی باوکیان بۆ وەچنگ هێنانی دەسەلات خۆ بەخۆ شەڕیان کردو لەئاکامدا یەکتریان کوشت.(و).

بۆ ئاشنایەتی زیاتر هەڵبژاردەیەک لە شیعرەکانی جۆرج سێفریس:

بەشی بیستەم لە شیعری «MyTHistorema»
کاتێ ئەستێرەکان دێنە خوارێ و لەگەڵ من
دەبنە جەستەیەک
کاتێ بێدەنگی لەتوێی هەنگاوی مرۆڤەکاندا
هەڵدەدێردرێ
زامەکان دیسان لەسەر سینگم دەپشکوێن
کاتێ ئەم بەرد-انە لەنێو ساڵەکاندا نوقم دەبن
هەتاکوو کوێ لەگەڵ خۆیانم کۆڵ کێش دەکەن؟
دەریا، دەریا،
کێ دەتوانێ ویشکی بکا؟
دەستەکان دەبینم لە هەر کازیوەیەک دا
هەرا لە شاهۆ و داڵ دەکەن.
من بەگابەردێکەوەم کەرەنج ملکایەتیی
پێ بەخیشوم
درەختەکان دەبینم کە هەوای سووکنایی تاریکی
مەرگ و
هەر ئەو کات بزەی کپی پەیکەرەکان هەڵدەمژن.

بەشێک لە شیعری «وتەیەک بۆ هاوین»
بۆ جارێکی تر لە پاییزدا هاتووینەوە
هاوین وەکوو دەفتەری وانەیەکی بێ تاقەت
پڕ لە وشەی رەش کراو، پەراوێزی لارووێر
پڕ لە نیشانەی پرسیار
بەجێدەمێنێ.
بۆ جارێکی تر لە وەرزی چاوانێکدا هاتووینەوە
کە هەڵدەواسرێن
لەنێو ئاوێنەی ژێر چرادا
لێوەکان پێک دادراون و خەڵکێکی نامۆ
لە ژوورەکاندا، لە شەقامەکان و لەژێر درەختی بیبار-

دان
لەکاتێکدا چرای ماشێنەکان
رووبەندی هەزاران بوونەوەر دەتارێنن
بۆ جارێکی تر هاتووینەوە
ئێمە کە دەست پێدەکەین
بەردەوام
بەتەنیا دەگەڕێینەوەو
دەستمان چۆلی دەستی خاک دەگرێ.
بەلام من عەیامێک لایەلایەی هەمیشەیی
جادەی بەرین
کە مۆعجیزە ئاسا ئێمەی دەگەیاندە دەریا،
دەریای تاهەتایی کە تاوانانی دەشۆردەوەو هەروەها
شەقامی سینگرۆس-م خۆشدەویست.
من لە چاوپێکەوتنێکی چاوەڕوان نەکـــراوی ئەم دوایانەدا
خەلکی نەناسراوم خۆش ویستووە
کە وەکوو کەشتیوانی زرێپۆشە نوقم بووەکان
لەگەل خۆیان دەدوان و
ئەمەش نیشانەی بەرینی دنیایە.
ئەگەرچی لەبەستێنێکی تردا
لەکەنار قامیشەلان و دورگە گەلێک لەلم
کە ئاوی زولالی لێ هەلدەقولێ
بۆ تینوویەتی شکانی گەمیەوان، لە دایک بووم
کە بەدەوری ئەنگوستەکانم دا دەیخولێنمەوە
کاتێ ماندووم- ئیتر نازانم لە کوێ لە دایک بووم
بەلام من ئەم شەقام و ستوون- انەم خۆشویستووە.
بەشـێکی کـورت لە «Stratis the sailor Describesa man:
گوتیان تەسلیم بن سەرکەتوو دەبن
تەسلیم بووین و تۆز و خۆلەمێش-مان دی
گوتیان عاشق بن سەرکەوتوو دەبن
عاشق بووین و تۆزو خۆلەمێش-مان دی
گوتیان لە ژیان لادەن سەرکەوتوو دەبن
لە ژیانمان لاداو تۆزو خۆلەمێش-مان دی.
«هەتاوی خۆمان»
من خاوەنی ئەم هەتاوە بووم و تۆش: پێکەوە بەشـمـان کرد
لەپشت ئەو پەردە زێڕینە کێ بەژانەوەیە؟ کـێـیـە بەرەو مردن دەژی؟
ژنێکە دەستی بەسینگی وشک هەلاتوویەوە ناو هاواری کرد:
«ئەوان کوڕیەی منیان رفاندووەو ئەنجنیویانن
بێ غیرەتان
ئێـوە کـاتێ بەنیگایەکی نامـۆ و ون لەسـەرنجـێکی ویرانەدا
مێشوولەی دەوری ئاگرتان دەڕوانی، ئەوانتان کوشت.»
لەسـەر ئەو دەسـتـەی خـوێنی لەسـەر ویشـک دەبوو،
تیشکی سەوزی درەختێکە
تێکۆشـــەرێ کـــەوتوو، لە توندگـرتنی نێـــزەیەکی درەوشاوەدا.
ئەم هەتاوە هی ئێـــمـە بوو. لەپشت پەردەی زێڕینەوە هیچمان نەدی
بۆیە هەوالنێران بەهیلاکی وچلکنی یەوە هاتن
زمانیان دەیگرت و وشە گەلێکی لێل یان درکاند
بیست رۆژو بیست شەو لەسەر خاکێکی قاقڕدا کە تەنیا درِوو بوو
بیست رۆژو بیست شەو بەزگی ئەسپانێکەوە کە خوێنی لێدەتکا
بەبێ ساتێک راوەستان بۆ خواردنەوەی ئاوی باران
گوتت لەپێش دا بنوون و دواتر بدوێن
تیشک چاوتی تاریک کردبوو
لەکاتی مردن دا گوتیان «ماوەمان نییە»و
دەستیان کەمێک تیشکی هەتاوی وەرگرت.
لەبیرت نەبوو قەت کەس ئارام ناگرێ
وەکوو سەگێکی نێو شەو شیوەنی ژنێک«بێ غیرەتان»
بێگومان ئەویش سەردەمانێەک
بەلێوی تەڕو رەگی وەجوولە کەوتوو ژێر پێست،
بەعەشقەوە جوان بوو
ئێمە خاوەنی ئەم هەتاوە بووین، تۆ هەمووت هەلگرت، نەتدەویست بەدوامدابێی
ئەو کات من زۆرشت لەپشت پەردە زێڕینەکەوە فێربووم
هەوالنێران راستیان دەگوت.
ئێمە ماوەمان نییە.

**پەراوێز:**

**(*) ئەم شیعرانەی سەرەوە لەم کتێبە وەرگیراون:**
**Poems,George seferie,1960, Nonpareil Books.**
**سـەرچاوە: مـتـرجم، فـصلنامـەی علمی- پژوهشی، فرهنگی.**
**سال سوم، شمارەی نهم، بهار ١٣٧٣.**

# جاک دریداو... تیۆری هەڵوەشاندنەوە

**خالیدە حامید تسکام**
و. حوسێن لەتیف

هەڵوە شاندنەوە deconstnaction گرنگترین بزووتنەوەی پاش بونیادگەرییە لەبواری رەخنەی ئەدەبیدا، جگە لەوەش بزوتنەوەکە مایەی وروژاندنی مشت و مڕە، رەنگە لە رەخنەی ئەدەبیدا تیۆرێک نەبێت هێندە سەرسوڕمان و حاڵەتی دوور کەوتنەوەو بێزاری هێنابێتە ئاراوە وەکو ئەوەی هەڵوەشاندنەوە لەم چەند ساڵەی دواییدا کردی، لەلایەک هەندێک لە پایەکانی رەخنە وەکو (ج. هیلس میلرو بول دی مان و جیفری هارتمن و هارولد بلوم)، سەرەڕای جیاوازی شێوازو حەماسەتیان ئەوان پێشەنگی هەڵوەشاندنەوەن لەسەر هەردوو ئاستی تیۆری پراکتیکی، لەلایەکی ترەوە زۆرێک لە رەخنەگرە تەقلیدییەکان دەبینین رق و بێزاری خۆیان لە هەڵوەشاندنەوەگەری دەردەبڕن و بە وێرانگەر و بێزراو و شەڕەنگێز ناوی دەبەن، ئەمڕۆ سەنتەرێکی فیکری نییە لە ئەورووپاو ئەمەریکا گفتوگۆی دەربارەی بەهای ئەم تیۆرەتازەیەی رەخنە تێدا نەبێت، ئایا هەڵوشاندنەوە بە ڕاستی وێرانگەرە؟ ئەگەر وەڵام بەڵێ بوو، چۆن دەبێت و هەروەها بۆچی؟ ئەگەر وەڵام نەخێر بوو، ئەوا ئەو ترسە لە پای چی؟ ناکرێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بدرێتەوە هەتا چەمکە بنەڕەتییەکانی هەڵوەشاندنەوە تێنەگەین و هەڵنەسەنگێنین، باشترین بابەتێک لەسەری بدوێین بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەمان کتێبی (لە زانستی نووسین دا) کەزمانی هەڵوەشاندنەوە ئامادە دەکات و یەکێکە لەو بەرهەمە گەورانەی دریدای فەیلەسوف و رەخنەگری فەرەنسی. باوەڕم وایە ئەو لێکۆڵینەوەی دریداو تیۆرەکەی کورت بکاتەوە بۆ هەڵوەشاندنەوە تووشی دوو گرفت دێت یەکەمیان دەبێت شێوازی دریدا سەرەڕای زاراوەکان و چەمکەکانی بە وروژاندنی سەرسوڕمان ناسراوە، دووەمیان زنجیرەیەک بۆچوونی رەخنەییە کە تەئویلی ناتەواو یان رەنگە تەئویلی هەڵە بکەن، سەرەڕای تیشک خستنە سەر هەندێک چەمکی قورس کە دریدا دروستی کردووە، هەوڵی بە بەڵگە کردن (توثیق)ی ئەولێدوانە رەخنەییانە دەدەم پێش ئەوەی دەست بکەم بە وەسف و هەڵسەنگاندنی خۆم بۆ چەمکەکانی هەڵوەشاندنەوە.

م.هـ. ئیبرامز جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە گەورەترین بەش لەتیۆری دریدا بریتیە لە:

١- دریدا لێکۆڵینەوەی خۆی لە زمانەوە دەگوازێتەوە بۆ نووسین، دەقی نوسراو یان چاپ کراو.

٢- دریدا دەق بە رێگایەکی دیاریکراوو نا ئاسایی وێنە دەکات.

(ئیبرامز)نایەوێت پێگەی دریدا سادە بکاتەوە لە میانەی یەکسان کردنی لەگەڵ بونیادگەرەکانی تری فەرەنسا، بەڵکو لە کاتێکدا هەوڵی ناساندنی هەندێک وشەی بنەڕەتی لە رەخنەی هەڵوەشاندنەوەدا وەکو وشەگەلی (ecrtiure نووسین) و (text دەق) دەدات، ئەمە روون دەکاتەوە کە نووسین لای دریدا دەقی چاپ کراو یاخود نووسراوەو چەمکی دەق بەشێوەیەکی نا ئاسایی دیاری کراوە.

لە خستنە رووی هەڵسەنگاندن و لێدوانەکانمدا بۆ دریدا دەیسەلمێنم تێڕوانینەکانی (ئیبرامز) جگە لە مشتێک تەئویلی هەڵە زیاتر نییە و دەربارەی هەڵوەشاندنەوەو جەوهەری هیچی پێ نەوتووین، بەڵکو دەربارەی شت گەلێک کە پەیوەندی بە هەڵوەشاندنەوە نییە بەڵام (غارنەر) کەگوتە بێژێکی ترە لەسەر دریدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە دریدا یەکێکە لە فەیلەسوفەکانی زمان، ئەو پێداگری لەسەر پێشینەی ڕەوانبێژی بەسەر لۆجیکدا دەکات: دریدا دەکەوێتە ژێر ئاڵای ئەو بزوتنەوەیەوە کە دەڕوانێتە ئەو جێکەوتەی وتراوەکات (utterances) لە گوتاری فیعلیدا دەیگێڕن وەک ئەوەی جەوهەری زمان و مانا بێت، ئەمەش هۆکاری ئەوەیە کە لۆجیک دەرهاوێشتەی ڕەوانبێژی بێت (موراس کریغ) باوەڕی وایە دریدا بونیادگەرێکی ڕەخنە گربوو لە بونیادگەری هەڵگەڕایەوەو پشتی تێکرد، ڕەنگە هەروەها بەتاڵی کردبێتەوە، بەردەوام دەبێت و دەڵێت: ئەو هێرشەی دریدا نوێتربوو لەو هێرشەی ئەفلاتون کردیە سەر شاعیرەکان بەو سیفەتەی ئەفسانە دەخولقێنن، فریدیک جیمسون جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە فکری دریدا نەفی وەهمی (تخطی) (میتافیزیکا)و هەڵهاتن لە نموونەی کۆت بوو بە مەبەستی لێوردبوونەوەی نوێ و پەی پێنەبراوەکان.

لەوانەیە هەموو ئەم لێدوانانە سەرچاوەی گومڕایی و ناڕاستی بن ئەگەر بێت و هەڵسەنگاندنێکی ڕاست بۆ تیۆری دریدا بکەین، سەرەڕای سودی (سیروورە)ی لێکۆڵینەوە لە هەڵوەشاندنەوە کاتێک دریدامان لەگەڵ ئەو فەیلەسوفانەدا داناکە باوەڕیان وایە لۆجیک دەرهاوێشتەی ڕەوانبێژییە، واتە داخستنی ڕێگای پەیبردن بەفیکری دریدا، هەروەک ئەوەی یەکسانکردنی دریدا بە ئەفلاتون و جەخت کردن لەسەر ئەوەی دریدا ململانێ لەگەڵ ئەفسانە دەکات و نەزعەی کۆن دووبارە دەکاتەوە زیان بە پێگەی دریدا دەگەیەنێت، جەخت کردن لەسەر ئەوەی دریدا هیچی نەکردووە جگە لەگواستنەوەی بایەخ لە «وتن»ەوە بۆ «نووسین» بەمە دەق لە ژوورێکی بچووکدا تەوق دەکرێت، بەڕاستی ئەمەش لێکدانەوەیەکی هەڵەیە کەواتە پێویستە مرۆڤ بە ئاگا بێت لەو سەرچاوانەی کە مەبەستێتی لە ڕێگایانەوە لە دریدا تێ بگات، ڕەخنەگرەکان دەبن بە دوو بەشەوە ئەوانە یان شکستی دەهێنن لە تێگەیشتن لە دریدا یان بە هەڵە تەئویلی دەکەن، لەبەر ئەمەش ناتوانرێ پشت بە مادەیەکی لاوەکی ببەسترێت، و ناتوانین ڕێگایەک دروست بکەین بمانبات بۆ جیهانی هەڵوەشاندنەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ڕەخنەگرانی تری وەکو هارولد بلوم وهیلیس میلرو بول دیمان و جیفری هارتمن هێندەی دریدا ڕەسەنن و هەریەکەیان تاڕادەیەک قوتابخانەیەکن لە تێگەیشتنی دریدای گەورەو یەکەم مامۆستای هەڵوەشاندنەوە.

تێگەیشتن لە دریدا هەنگاوی یەکەمە بۆ تێگەیشتن لە هەڵوەشاندنەوە، گومانی تێدا نیە هەنگاوی یەکەم مشت و مڕکردنی فیکری دریدا دەخوازێت، دەتوانرێت بووترێت تیۆری هەڵوەشاندنەوە پێویستی بەشیکردنەوەی زیاترو نوێ هەیە، هەر هەوڵێک لەلایەن هەر ڕەخنەگرێکەوە بدرێت بۆ شیکردنەوەی ئەم تیۆرە پێویست بە پێناسەکردنی هەڵوەشاندنەوە ناکات چونکە ئەم تیۆرە ئاڵۆزو دڕکاوییەو ڕێگا نادات پێناسە بکرێت، بەڵام بەپێچەوانەوە مرۆڤ لە توانایدا هەیە ئەو زاراوە بنەڕەتییانە ڕاڤە بکات کە دریدا بۆتێک شکاندنی ڕەخنەی تەقلیدی بەرهەمی هێناون وە ئەمە هەنگاوی یەکەمە کەمن پێی هەڵدەستم بەنیازم پاش وەسف و شیکردنەوەی ئەو زاراوانەی کە دریدا وەڵامی پرسیارگەلێکی پێدایەوە دەربارەی چۆنیەتی توانای هەڵوەشاندنەوە لە دووبارە ناڕاستەکردنی ڕەخنەی

ئەدەبیـدا، لەدوا قـۆناغی شـیکردنەوەکـەمـدا روونی دەکـەمـەوە ئەوەی بە پووچ وەسـفکراوە راست نیـیـە و هەڵوەشاندن ناوەڕۆکی ڕۆحی خۆی هەیە.

جـێگای بیـرهێنانەوەیە(نووسین)و(وتن) دوو وشـەی تەوەرین دەکرێت تێگەیشتنمان لێیانەوە دەست پێبکات، هەردوو وشەکە چێژ لە چەمکەباوەکانی زمان وەردەگرن، کـەواتە ئەم چەمکانە پێـشـینەی وتن دەدات بەسـەر نووسـیندا، وشـەی وتراو (دەنگ) phone وشـەیەکی دەرەکی نیـیـەو توانای سـڕینەوەی خـودی هەیە، وەک دەزانرێت وشەی وتراو وێنەی دەنگی بیستراوە وەزیفەشی ئامادەکردنی ئەو چەمکەیە کە لە وێنە دەنگییەکەدا هەیە، وتەی وتراو یاخـود بیـسـتـراو لە پرۆسـەی (سـیـرورە) بەرهەمهێنانی چەمکدا نامێنێت.

لەبەر ئەو هۆیەش بە سیفەتی دال signifier نامێنێت لە پرۆسـەی بە دەلالەت کـردن بەسـەر مـەدلولدا sig-nified کە بایەخی لە هەر شتێک زیاترە، ئەو مەدلولولە وێنەناکـرێت تەنهـا لەمـیـانەی وێنەی دەنگی نەبێت کـە داله، لە تواناداهەیە تێـبـینی پەیوەندییـەکی سـیـاندیی (ئالوث) لەنێـوان (دال وێنەی دەنگی، زهنی مـرۆڤ، مەدلول) بکەین.

ئێـستـا ئەو جێگەیەی چییە وشـەی نوسراو لەچمکی باوی زمـانـدا چیـیـە؟ لەچەمکی باوی زمـانـدا وشـەی نووسراو گوزارشتی نووسینە لەوشەی وتراو: بەم شێوەیە دال بریتـیـیـە لەوشـەی وتراو ... وشـەی نووسـراو دالی مـەدلولە دەبێـتـە ئانوی بۆ وشەی وتراو«وشـەی نوسراو ناتوانێت جگە لەنواندنی وشـەی وتراو هیـچی تر بکات لەکـاتێکدا وشـەی نوسـراو دالە.ئەگـەر من ویسـتـم چەمـکـی«گـــــــوڵ» ئـامـــــــــادە بـکـەم ئـەوا پێـویسـتـە«گ،و،ڵ»دەربڕم، دال ئەم وێنە دەنگی یاخـود بیسـتراوەیە، بەڵام کاتێک من دەنوسم گوڵ هیچ لەسەرم نیـیـە جگە لەنواندنی وێنەی دەنگی لەرێگای بونیـادی نووسینەوەgraphic stracture ئەم وێنە نوسراوە هیچ پەیوەندییـەکی بەچەمکەوەنییـە، بەڵکو وێنەی نووسـراو ناتوانێت چەمک بنوێنێت، چونکە بونیـادی بینراوی وێنە دەنگی تەنهـا نەبینراو نیـە، بەڵکو شتێکە لەشـەبەنگ دەچێت ئەوەش بۆ وێنەی دەنگی لاوەکـیـیـەو دەتوانرێت فەرامۆش بکرێت.

لێـرەدا دەبێت ئامـاژە بۆ بیـانووی تەقلیـدی بکەین کـەشـوێنی لاوەکی دەدات بە وشـەی نووسـراو وشـوێنی سەرەکی دەدات بەوشەی وتراو ئەوەبیانویەکە میتافیزیکی و لاهوتیـیـە. دریدا لەخـسـتـنەڕووی لێـدوانێکیـدا لەسەربنەمایەکی میتافیزیکی کەتەرکیزی لەسەرچەمکی وشـەی وتراوە دەنووسـێت: خـودا ناوێکی تری لۆگـۆسـە «logs»ە بەو سیفەتی ئامادەبوونێکی زاتییە، لە توانادا هەیە ئەو ناکـۆتایی و ئامـادەبوونی زاتی بێت، هەروەک چۆن سیفەتێکی زاتییەو لە رێگای دەنگەوە بەرهەم دێت، حەماسەتی دال لە دەرەوەی خۆی ناخوازرێت کە بە دواییدا بگەڕێت و لەهەمان کاتدا کاریگەرێت لە سەری هەبێت، هەمـان حاڵەت لەگەڵ ئەزموونی دەنگدا هەیە، ئەگەر بێت و ئەم ئەزمـوونە بە سیـفـەتی کورت کردنەوەی نووسینە، یاخـــود بەمـــانـایـەکی تر کـــورت کـــردنەوەی دالی (دەرکی)،(هەست پێکراو)و(شـوێن)خـۆی رابگەیەنێت ئەوا دەوری ئامادەبوونی زات دەدات،

دریدا جەخت لەسـەر ئەوە دەکات هەردوو چەمکی باوی وتن و نووسین لە دەوری ناوەندگـەرێتی عـەقڵ log-ocentric چەق دەبەستن، ئەمـە زاراوەیەکی گـرنگە کـە دریدا گرنگی پێدەدات بۆ ئاراستەکراوی میتافیزیکی یان لاهوتی، بۆ ئەوەی وردبینتـربم روونی دەکـەمـەوە هەردوو چەمکی وتن و نووسین مـیـتـافـیـزکا دروستی کردون و تەحەکومیان پێوە دەکات، لەراستیدا ناوەندگەرێتی عەقڵ

logocentrim ناوەندگەرێتیە لە دەوری دەنگ -phonocentrism. ئەمە ئەو باوەڕیە کە پێی وایە دەنگ نزیکە لە واقیعی ترنسێندنتالییەوە، لە تیۆری دریدادا دەبینین ناوەندگەرێتی لە دەوری عەقڵ -logocenterism و ناوەندگەرێتی لە دەوری دەنگ دوو زاراوەی جیاوازن و گوزارشت لەیەک دیاردە دەکەن کە ئەویش بریتییە لەگەشەی میتافیزیکی بۆ چەمکی وتن و تێگەیشتن. لۆگۆسەنتەریزم و فۆتۆسەنتەریزم تەرکیزیان لە سەر دەنگە چونکە ئەو دوو چەمکە لە باوەڕێکەوە سەرچاوە دەگرن کە پێی وایە دەنگ دەکەوێتە نێوان عەقڵی مرۆیی و واقعی ترنسێندنتالییەوە لە توانادا هەیە بووترێت ئەم بیانووە نزیکە لە چەمکی هنرییەوە بۆ دەسەلات mantras دەکرێت mantr واپێناسە بکرێت دەنگێک یاخود زنجیرەیەک دەنگە، ئێمە وا هەست دەکەین دەنگ دەسەلاتی هەیە چونکە دەبینین توانای وروژاندنی دەسەلاتی trasncendental ی هەیە ئەگەر بایەخ بدەین بە ئەبرەی ئەو وشانەی پێی دەدوێین... چۆن دەتوانین ناوی mantra بدەین بە وشەیەکی دیاریکراو ئایا چێژ لە دەسەلات وەردەگرێت؟

ئەو چێژ لەو سیفەتە وەردەگرێت چونکە دەبینین دەنگ وەکو ناوەندیار (وسیط) لەنێوان عەقڵ و دەسەلاتی transcendental کار دەکات، لێرەدا من هەوڵنادەم جەخت لەسەر ئەوە بکەمەوە چەمکی باوی لۆگۆسەنتەریزم و فۆنۆسەنتەریزمی رۆژئاوا هەمان چەمکی تایبەت بە mantra بەلام جەخت لە ئامادەبوونی لێکچوونی نێوانیان دەکەم، هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین لە هەڵوەشاندنەوەدا رەگەزێکیتر هەیە ئەویش ناوەندگەرێتی لە دەوری نووسینgrafhocenterism، ئەم زاراوەیە بەر لەوەی بڕواتە ناونیوەندی دریداوە پێویستی بە راقەکردن هەیە، دەکرێت بووترێت نووسین writting هێڵکاری graphic یە، هەرچی گرافیمە -grapheme رستێک پێتێ ئاماژە بۆ فۆنیم phoneme دەکات کە وشەیەک لە وشەیەک وتراوێک لە وتراوێکی تر لە زماندا لەیەک جیا دەکاتەوە، ئەگەر زانیمان نووسین هێڵکاریە لەبەر ئەوەش گرافیم بێگومان بە بیرخستنەوەی چمکە باوەکە، دالی پەتییەو مەبەست لێی تەنها یەکەی نووسین و پەیوەندیی نییە جگە لەوەی گوزارشتێکی وێنەی دەنگە، لەبەر ئەوەش دەتوانرێت بووترێت مەبەست فۆتۆنۆسەنتەریزم گواستنەوەی بایەخ و گرنگییە لە وتنەوە بۆ نووسین، ئەوەش گوزارشتە لە هەڵگەڕانەوە لەو چەمکە باوەی باوەڕی وایە وشە یان وشەی وتراو ئەولەویەتی هەیە بەسەر نووسین و وتەی نووسراودا.

هەندێک لە رەخنەگرەکان باوەڕیان وایە هەڵوەشاندنەوەگەری دریدا گواستنەوەیەک لە لۆگۆسەنتەریزمەوە بۆ فۆنۆسەنتریزم پێک دەهێنێت، ئەم تێبینیە گومان نییەو دەبێت تەعبیر لە دەلالەتەکانی بکرێت پێش پەخشکردنی لەلێکدانەوەدا، باشترین رێگا بۆ روون کردنەوەی ئەم کێشەیە هەوڵی سادەکردنەوەی بە هۆی قیاسەوە ئەگەر بکرێت بەراورد لەنێوان نووسین و وتن و چەمکدا بکەین کە جەستەو رۆح و واقیع ترانسندنتالی گوزارشتیان لێدەکەین، ئەوا لەو کاتەدا تەرکیز کردن لە دەنگ تەرکیز کردنە لەسەر رۆح و لەهەمان کاتدا تەرکیز کردنەوەیە لەسەر فۆنۆسەنتەریزم و لۆگۆسەنتەریزم).

بەلام تەرکیز کردن لەنووسین تەرکیزکردنە لەجەستەو لە گرافۆسەنتەریزم. ئەگەر هەڵوەشاندنەوە گرافۆسەنتەریزم بووبێت، ئەگەر گرافۆ سەنتەریزم مانای تەرکیز کردنە سەرنووسین بێت ئەوکاتە دەبێت هەڵوەشاندنەوە وا پێناسە بکرێت رەت کردنەوەی ئەولەویەتی رۆح و دەسەلاتی ناوەندیارە، هەڵوەشاندنەوە سنور بۆ هەموو ئەو شتانە

دادەنێت کە ئەخلاقین، لەژیانی دنیاییدا ڕۆدەچێت، واتە شاردنەوەیی خودا... ئایا مایەی قەناعەت پێکردنمانە بڵێی هەڵوەشاندنەوە عەدەمییە! نەهلەستی یە؟ دەکرێت بووترێت هەموو جەخت کردنەکان لەوبارەیەوە ڕاستن، و وەڵامی پرسیاری باڵا (بەڵێ) بێت دەربارەی هەموو ئەوانەی دریدا دەیڵێت، و هەموو مەبەستەکان هەڵوەشاندنەوەش، دەگەڕێمەوە سەر ئەم گرفتە پاش لێکۆڵینەوە لەو زاراوانەی دریدا کە بەسیفەتی ئەدەواتی هەڵوەشاندنەوە بەکارهێنراون و دەهێنرێن.

پاش ئەوەی دریدا بنەمای میتافیزیکی و لاهوتی هەردوو چەمکی وتن و نووسین دەخاتەروو، دەست دەکات بەتوێژینەوەی وەسفی زمانەوانی زمان و ئەو چەمکانەی وەسف هەوڵی بونیاتنانیان دەدات. لەڕاستیدا دریدا وەکو پەرچەکردارێکی تیوری سوسێر دەردەکەوێت، تیوری سوسێر دەڵێت ئاماژە singی زمانەوانی یەکێتی نێوان دال و مەدلولە، زمانەوانی نوێ تەرکیز دەکاتە سەر چەمکی دال و مەدلول، و بونیادگەری قەرزاری ئەو چەمکەیە، پێکەوە لێکۆڵینەوەی زمان، و پرۆسەی ڕەخنەیان کرد بەدووبواری مەعریفی زانستی، بەڵام دریدا ڕوونی دەکاتەوە ئەو پێشەوایەتی یە بەتەنها فێڵێک بوو، چونکە دال و مەدلول وێنەیەکیتری چەمکە باوەکانی وتن و نووسین.

پاشان دریدا لەخستنە ڕووی ئاڵوگۆڕی پەیوەندی نێوان میتافیزیکاو لاهوتدا تێبینی ئەمەی کردووە!

هەمیشە چەمکی ئاماژە بەجیاکردنەوەی دال و مەدلول لەخۆیدا دەژی... تەنانەت جیاکردنەوەیان لەیەکتری وەکو دووڕووی یەک دراوە، لەبەر ئەو هۆیە ئەو چەمکە لەکەلەپوری چەمکی لۆگۆسەنتەریزمدا دەمێنێتەوە کە لە ڕاستیدا فۆنۆسەنتەریزم نزیکی ڕەهای دەنگ و کەینوونەیە،و دەنگ و مانای کەینونەو میسالیەتی واتایە.

لەبەر ئەو هۆیە سەمتی زمان کەدەڵێت زمانەوانییەکان کردوویانە بەزانست و بوونیاد گەریش بەتاسەوە بەسیفەتی ڕەخنە خواستویانەتەوە، لەڕاستیدا هەمان سەمتە کۆنەکەیە، یاخود سەمتی لۆگۆ سەنتەریزم - فۆنۆ سەنتەریزم کە بەرهەمی میتافیزکایە.

ئاشکرایە دریدا میتافیزیکاو زمان لەخانەیەکدا دادەنێت و ئەمەش بەو واتایە دێت کەمیتافیزیکا بوار دەدات بەزمانەوان دیاردەی زمان لەبەر ڕۆشنایی دوو جەمسەردا ببینێتەوە، بەواتا چەمکە میتافیزیکییەکان... چەمکی واقعی و میسالی، چەمکی جەستەو ڕۆح، چەمکی خێرو شەڕ... بوار بۆ زمانەوان دەکاتەوە زمان لەبەر ڕۆشنایی دوو جەمسەری لێکچوودا ببینێتەوە، دەڵێت وێنەی بیستراو چەمک ئامادە دەکات یاخود دال و مەدلول ئامادە دەکات)، بەتەرکیزکردنە سەرئەوەی وشەی وتراو پێشینەترە لەوشەی نووسراو ئەوا زمانەوانی بوونیادگەری وێنەیەکی تەواوی فەرامۆشکردنی نووسینە، ئەو فەرامۆشکردنە بەرهەمی دوورکەوتنەوەی فەلسەفی و میتافیزیکییە لەمۆرکی دەرکی و بینراو بەرجەستەی وشەی نووسراوە، لەمەوە ڕوون دەبێتەوە لەپشت چەمکی باوی زمانەوە، لەپشت چەمکی ئاماژەی زمانەوە لای سوسێر میتافیزیکی بەشێوەی هێزی مەرجدارو بەهێز جێگەی دەبێتەوە.

دریدا «چەمکی بازاڕیی نووسین» دەبڕێت بەسەر چەمکی نوسینندا کەچەمکی باوی زمان و زمانەوانی نوێ فەرامۆشی کردووە، بەچەمکی لاوەکی ناوی دەبات، هیچ ئامادەبوونێکی نیە تەنها بەمەبەستی گوزارشت کردنی دەنگ نەبێت کە بەرجەستەکەری نووسینە، هەروەها دەڵێت ئەو باوەڕەی لەکەلتوری نووسینی ڕۆژئاوادا بۆ نووسن کەپێی وایە نووسین «حەرف»و «نەخشی بینراو» و

جەستەو مادەیە» لەدەرەوەی عەقڵە بەدیاریکراوی چەمکێکی بازاڕییە. دریدا ئەو چەمکی بازاڕییە دووردەخاتەوە کە تێگەیشتنمان بۆ زمان ئاراستە دەکات، سەرەڕای ئەوەش ئێمە تەواو ئاگادارین وەکو ئەداکردنمان لەبواری رەخنەی ئەدەبیدا ئاراستە دەکات بەرەو ئەو باوەڕەی کە هەموو شتێکی پەیوەست بەفیکرەوە مانا هەڵدەهێنجێت و مانا دەبەخشێت، و دەبێ لەبەرانبەردا پەیوەست بێت بەفیکرێکی ترەوە بەم جۆرە یەک لەدوای یک فیکرەکان دەربارەی کەینونەی ترانسێندنتاڵی لەفکری ئێمەدا کۆدەبێتەوە، لەبەرئەو هۆیەشە فیکری ئێمە دەربارەی کەینونەی ترانسێندنتاڵی لەبریتی فیکرێک کە تەحەکوم بەفیکری ئێمەوە دەربارەی زمان و رەخنە ئیش دەکات.

بەم شێوەیە رەخنە دەبێتە قەسیدەیەک بۆ دۆزینەوەی ماناکانی... مانایەک فیکر یاخود چەمک دروست دەکات کە بتوانرێت گرێ بدرێت بەفیکرێکی ترەوە، پاشان پرۆسەی گرێدانی فیکرەکان بەیەکترەوە دەربارەی کەینونەی ترانسێندنتاڵی لەتێگەیشتنی ئێمەدا دەکرێت. پێویستە ئاماژە بکرێت بۆ پەرش و بڵاوی فیکرەکان کە دەکرێت لەیەک سەمتدا رێکبخرێنەوە، لەچەقێکدا کەفکری ئێمە دەربارەی کەینونەی ترانسندنتاڵی گوزارشتی لێدەکات، و دەشێت بەئامادەبوونی کۆ بژێت. دەتوانرێت بڵێین پرەنسیپی «کۆ» فکرەی کەینونەیەکە داهێنراوی میتافیزیکایە، دریدا هەوڵدەدات تێگەیشتنی ئێمە بۆ زمان و رەخنە لەکاریگەری «کۆ» رزگاربکات کەمیتافیزیکا پەیڕەوی کردوە، ئەو دەگاتە پرۆسەی رزگاربوون لەمیانەی داڕشتنی دوو زاراوەی نوێ لەوانەیە چەمکی کۆنی زمان و رێگای کۆنی رەخنە بەتاڵ بکاتەوە. مەگەر «ذهن»ی ئێمە ملکەچی مەرجەکانی تێگەیشتنی باوی زمان بێت لەئاگایان یاخود لەنائاگایانەوە بێت، کاتێک فیکرێکی نوێ دادەڕێژین لەڕاستیدا هیچمان نەکردووە جگە لەگۆڕینی فیکری کۆن، بۆ نموونە ئەو زاراوانەی سوسێر لەگەڵیاندا هات و دەیگوت گەورەترین شۆڕشی لەتێگەیشتنی ئێمەدا بۆ زمان دروست کردووە بەرهەمێکیتری میتافیزیکابوو، ئێمە دووبارەیدەکەینەوە کاتێک دەڵێین سەمتی نوێی زانستی زمان لەڕاستیدا فیکری تازە ئەوکاتە لەدایک دەبێت کە «ذهن»ی ئێمە ئازاد بێت. مەبەستی دریدا لەبنەمای میتافیزیکی زمان و رەخنە هاندانی «ذهن»ی ئێمەیە بۆ بێلایەنی، چونکە ئێمە بەتەواوی هەست دەکەین دیاردەیەکی تەواو سروشتی وەکو زمان لەهەناوی خۆیدا تۆوی میتافیزیکای هەڵگرتووە، بەڵکوتەنانەت ئەو تەفسیرە زانستییەی سوسێر بۆ زمان خستیە روو لەڕاستیدا قوربانیی میتافیزیکابوو.

پاش خستنە رووی بنەمای میتافیزیکی کە زمان لەسەری دەوەستێت، لەداڕشتنەوەی زاراوە تایبەتیەکانیدا کە دەتوانێت تێگەیشتنی نوێ بۆ زمان بەرهەم بهێنێت.. دوو هەنگاو بونیادی هەڵوەشاندنەوە پێک دەهێنێت. ئێستا دەست دەکەم بەوەسف و هەڵسەنگاندنی زاراوەکانی هەڵوەشاندنەوە.

چەمکی نوێی نووسین کە دریدا دایڕشتووە پشت بەسێ وشەی زۆر ئاڵۆز دەبەستێت کە ئەویش: جیاوازی difference و جێکەوت trace نووسین ئەسڵی arche-writing ، بەگوێرەی توانا هەریەک لەوسێ زاراوەیە راڤەدەکەم تا ئەو ئاستەی سنوری ئەم پرۆژە رێگە دەدات، روونی دەکەمەوە ئەم زاراوانە چۆن گەیشتوون بەکرداری هەڵوەشاندنەوە. جیاوازی ئاماژە بۆ دوو کردە دەکات: ١- جیاوازە، هاوشێوەی نییە ٢- differ دواخستن، دەبێت سەرنج بدەین یەکەم کردە شوێنی spatialو دووەم کاتییە temporal دریدا وای دەبینێت هەموو ئاماژە singێک دوو وەزیفەی هەیە ئەوانیش: جیاوازی و

داواخستنە، لەبەر ئەو هۆیەی بونیادی ئاماژە لەلایەن جیاوازی و دواخستنەوە مەرجدارە، نەک لەلایەن دال و مەدلولەوە، واتا بونیادی ئاماژە جیاوازییە و ئاماژە شتێکە لەئاماژەیەکیتر ناچێت، هەرگیز لێک چوون لەئاماژەدا بوونی نییە دەکرێت نموونەیەک بهێنینەوە بۆ ئەم روونکردنەوەیە: کاتێک جیاوازی لەنێوان وشەی three واتە سێ، و tree واتا درەخت دەکەین لەنووسین و وتندا وا دوو وشەی جیاوازن و ناسنامەی خۆیان ئاشکرا دەکەن. ئەو جیاوازیە هێزێک لەدوو هێزی ئامادەبوونی نا ئاماژە پێک دەهێنێت، بەڵام هێزەکەی تر لەئاماژەدا توانایە لەدواخستن دا، بۆ نموونە وشەی «گوڵ» لەشیعرێکدا مانای کەشف نابێت تەنها ئەوکاتە نەبێت کە هەست بکرێت ئەو گوڵەی لەشیعرێکدایە ئەو گوڵانەنییە ئێمە دەیبینین لەواقیع دا. بەڵکو شتێکی تری هەیە، شتێک دەبێت پەی پێ ببردرێت، لەبەرئەو هۆیەشە ئاماژە نیوەی وانی و نیوەکەی تری وانی نییە. ئەم راستییە پێویستە بۆ سەرەتای تێگەیشتنمان بەڵام بەس نییەو بەهۆی کەم و کورتییەکانیەوە. هەروەک سوسێر جەخت لەسەرئەوە دەکاتەوە ئاماژە ناکاتە دال + مەدلول بەڵکو ئاماژە دەکاتە جیاوازی + دواخستن، سۆسێر وای بۆ دەچێت ئاماژە یەکگرتنە لەکاتێکدا دریدا وای بۆدەچێت ئاماژە جیاوازییە.

ئاماژە دانی نییەو کەم و کورتی تێدایە لەبەرئەوە دەبێت لەوەتێبگەین ئاماژە لەژێر سڕینەوە (under-erasure) دایە ئەمەش زاراوەیەکی ترە دریدا دایرشتووە بەمەبەستی ئاماژەکردن بۆ بێتوانایی ئاماژە، ئاماژە نووسراوە لەگەڵ ئەوەشدا سڕاوەتەوە، ئێمە دەیسڕینەوە تا کەم و کورتیەکانی دیاری بکەین. لەبەرئەوەش هەموو ئاماژەیەک ئەو نیشانەی لەسەرە، بۆ نموونە وشەی «بینراو» کە پێشتر بەکارم هێناوە هیچ نیشانەیەکی روونی لەسەرنەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا ئاماژەیە، ئەگەر لەدیدگای هەڵوەشاندنەوەگەرییەوە سەیری بکەین ئاماژەیەکی سڕاوەتەوە، بەم شێوەیە «بینراو»، دەبێت فیکرەی سڕینەوەی ئاماژە بەشێوەی حەرفی وەرنەگرین بەڵکو تەنها بەشێوەی ئیلهام. ئەم سڕینەوەی ئیلهام لەبێ توانایی و نوقسانی ئاماژە وەردەگرێت.

ئەگەر ئاماژەیەک نەبوو بڵێین ئەوە داله بۆ شتێکی ئەزەلی هەرگیز چێژ لەهیچ بەهایەکی رەها وەرناگیرێت، وەک چۆن ناگات بەشتی ترانسدنتالی.. ئاماژەی ناوکۆیە catextualو سەرابی مەدلول دەخولقێنێ، لەبەرئەوە ئاماژە «جێکەوتە» گوزارشتی بینراو یاخود نووسینی هەستی پێکراوی وێنەی دەنگی نییە بەڵکو ئەو جێکەوتەیە دریدا بەناسروشتی وەسفی دەکات، نیشانەو ئاماژەی سروشتی یاخود index نییە بەمانای هۆسری). زیاتر لەرۆشنبیری خۆیدایە، زیاتر دەروونییە نەک مادی زیاتر لەوەی بیۆلۆجی بێت رۆحییە.

بوون (کائن) لەئاماژەدا بیر بەناراستەی نابوون دا دەجووڵێنێ، لەبەرئەوهۆیە ئەوەی لەئاماژەدا هەیە هەڵگری ئەوەیە کە لەئاماژەدانییە، ئاماژەدەتوانێت بیربگرێت چونکە لەتوانامانداهەیە بیر لەوانە بکەینەوە کە لەئاماژەدانییە، دەتوانێت لەرێگەی بیرخستنەوە بیر هان بدات و بەرەو جوڵەی ببات. ئاوا دەڵێین ئاماژە جێکەوتە، دوو لە هێزی هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە یەکەمیان (جیاوازی)و دووەمیان (دواخستن) بەو شێوەیە لەگەڵ دەرکەوتنی هەردوو زاراوەی (جیاوازی) و(جێکەوت)دا پێویست دەکات چەمکی نووسین بگۆرێت لە پێناسەیەکدا نووسینی (حەرف)و(نەخشی هەست پێکراو) و (جەستەو مادە) لە دەرەوەی عەقڵ بوون، بەڵام دریدا پێناسەیەکی روونی بۆ نووسین هەیە و دەڵێت: نەخشە، حەرفی بێت یان نە، وە ئەگەر لەبۆشایی شوێنێکدا دابەش کرابێت لە

دەرەوەی سیستەمی دەنگیشدا بەم دیدگایە وێنەگرتنی سینەمایی و سەماو بالیەو مۆسیقاو پەیکەرسازی هەموویان نووسینن و لە فراوان بوونی چەمکی نووسیندا دریدا تێبینی ئەوە دەکات!

هەروەها مرۆڤ قسە لەسەر نووسینی وەرزش یاخود وەرزش دەکات بەگشتی یان نووسینی سەربازی یان رامیاری لە بەر رۆشنایی ئەو تەکنیکانەدا تەحەکوم بەو بوارانەوە دەکەن، ئەوە وەسفی سەمتی دەلالەت ناکات کە پەیوەندی لاوەکی بەم چالاکییەوە هەیە بە تەنها، بەڵکو وەسفی جەوهەری ئەم چالاکییە خۆی و ناوەڕۆکەکەی دەکات، زمان بۆخۆی نووسینە لەناومانادا غیتاری شبیفاک دەڵێت: شتێ هەڵگری شێنەواری گۆڕانی هەمیشەییە لەناو خۆیدا، بونیادی دەروون بونیادی ئاماژە، دریدا بەم بونیادە دەڵێت:نووسین (سیبفان لەتێبینی و روون کردنەوەی زیاتردا بۆ چەمکی نووسین دەڵێت: بەم شێوە دەبینین نووسین ناوی بونیادێکە هەمیشە جێکەوتێکی تێدانیشتەجێیە، ئەو چەمکە فراوانترە لەچەمکی ئەزموونگەری بۆ نووسین کە ئاماژە بۆ سەمتی ئەزموونی دەلالەت لە جەوهەری مادیدا دەکات.

دریدا چەمکی نووسینی ئەسڵی بۆ جیاکردنەوەی ئەم چەمکەی نووسین و چەمکی نووسین بازاڕی بەکاردەهێنێت، نووسینی کەوانەیی بەکاردەهێنرێت بۆ گوزارشت کردن لە نووسین و ئەوەی کە نووسین نییە، نووسین بەمانای بەرتەسکەکەی دادەنرێ نووسین graph-ic پشت بە چەمکی گرافیم دەبەستێت کە لە خۆیدا دالی پەتییە، بەڵام لەدیدی هەڵوەشاندنەوەگەریدا کە دریدا رەهەندەکانی دیاری کردووە نووسین مانای جیاواز وەردەگرێت کە جیاوازە لە بەکارهێنانە باوەکەداو دەکرێت بووترێت فۆرمی نووسینە graphic جێکەوتی دامەزراوە، ئاراستەی فۆتۆسەنتەریزمی تیۆری هەڵوەشاندنەوە بەهۆی جێکەوتی دامەزراوە بوو بە دەلاتێکی ناوەڕۆک فراوان، لەبەر ئەم هۆیەش ئەو گۆڕانەی دریدا هێنایە ئاراوە گۆڕانی گرنگ نەبوو کە چەمکی نووسین چێژی لێوەربگرێت چەمکی نووسین هێندەی پەیوەست بوون بەتێگەیشتنی باو هەریەک لەم زاراوەنە.

ئەگەر فۆنۆسەنتەریزم بەو مانایە بژێت دریدا دیاری کردووە، بە ئاراستەی هاندانی بیر بۆ وێنە کردنی وەزیفەی جێکەوت لە زۆربەی پێناسەکاندا هۆش یان درک بەدرێژەی دەبات، جێکەوت نیشی لە وێنەی پۆرترێت وێنەی تایبەتی و پۆستەری سەردیوار و ناوی زانراوو ئیماو وشەی وتراو و وشەی نووسراودا دەکات، فۆتۆسەنتەریزم هەستێکی نوێ بۆ وەزیفەی جێکەوت دەنوێنێ، کاتێ من وێنەی وێنەیەکی تایبەتی دەکەم هۆش یان بیرم دەکەوێتە ئیش و ئارەزووم تێگەیشتە لە دەلالەتی ئەو وێنەیە، پرۆسەی گرگرتنی ئامادی بیری دەست پێدەکات ، بیر بە دوای شتی دووردا دەگەڕێت کە لە وێنەدا هەیە واتا گەڕان بەدوای شتدا لە پشت تارمایی وێنەوە، هەموو ئەمانە وەزیفەی جیاوازییە، لە کاتێکدا تارماییەکان جێکەوتن، چونکە جێکەوت لەخۆیدا ئامادەبوونی نییە، دەکرێت فۆتۆسەنتەریزم وەکو پەیبردنی هەست بە شتێک کە نییە، تارماییەکان جێکەوتن، جێکەوت لەمیانەی جیاوازی و دواخستن ئیش دەکات، جیاوازی + دواخستن = جیاوازی.

خستنە رووی چەمکی باوی زمان بەسیفەتی ئەفسانە... تەنها لەناخی خۆیدا ئالۆزە و سەرچاوەدەگرێت وەکو نزیکی دەنگ لەمەدلولەوە، رەگەزی میتافیزیک رەگەزێکی ئالۆزە دەبینین، میتافیزیکاش زاڵە بەسەر تێگەیشتنماندا بۆ زمان، دریدا زاراوەو چەمکی تازەی دارشتووە بۆ ئەوەی تێگەیشتن بۆ زمان رزگار بکەین لە

تێگەیشتنی میتافیزیکی، لەبەر ئەو هۆیە ئازادکردنی تێگەیشتن لەزمان لەمیتافیزیکا سڕینەوەی ئاڵۆزی و سەرسوڕمانە، سڕینەوەی ئاڵۆزی سڕینەوەی ئەفسانەو سەرسوڕمانە، واباشترە بڵێین هەڵوەشاندنەوە بە سڕینەوەی و ئاڵۆزی و ئەفسانەکان لە تێگەیشتنی باری زماندا دەست پێدەکات.

لێکۆڵینەوەکەمان دەربارەی هەڵوەشاندنەوە لەسێ قۆناغەوە سەرچاوەی گرت، قۆناغی یەکەم لە تیشک خستنە سەر چەمکەکانی وتن و نووسین بوو، کە ئەویش دوو تەوەرە بوو، چی هۆیەک لەپشت ئەو باوەڕەوەیە کە دەڵێت: وتن لەپێشترە لەنووسین، میتافیزیکیاتا چەند کاریگەری لەسەری هەبە، لەقۆناغی دووەمدا لەو بۆچوونەمان کۆڵیەوە کە پێی وایە زمانەوانی نوێ مۆرکێکی زانستی داوە بە لێکۆڵینەوەی زمان و کردوویەتی بەبوارێکی زانستی هەردوو کێشە سەنتراڵیەکە لەم قۆناغەدا ئەوە دەنوێنن چەمکی زمانەوانی بۆ ئاماژە وێنەیەکی ترە لە چەمکی باوی وتن و نووسین و زمانەوانی نوێ قوربانی میتافیزیکا بووە، قۆناغی سێهەم وەسف و هەڵسەنگانی زاراوەکانی دریدا بووە کە ئەمانەن:

جیاوازی و نووسینی ئەسڵی، جێکەوت، وە تیشکمان خستە سەر فۆنۆسەنتەریزم لە دیدگای دریداوە.

لەسەر ئەوانەی پێشوو تێگەیشتنمان بۆ زمان گۆڕا، ئەی چارەنووسی رەخنە بەچی دەگات؟ وەڵامی ئەم پرسیارە بە گریمانێک دەست پێدەکات ئەویش ئەوەیە ئەدەب جۆرێکە لە جۆرەکانی نووسین، قەسیدەو چیرۆک و هەرکارێکی ئەدەبی بونیادی بەرهەمێکە .. دەزانرێت هەموو ئەو بەرهەمە رەسمی شتێکە لەسەر قوماش ئێمە جەوهەری نازانین ئەگەر دڵنیا نەبین لە کەینونەبوونی، بەڵام رەخنەبەوە ناسراوە گەرانە لە وشەدا لەدێڕ و لە دەق و هەر شتێک کە بیر (ذهن) لەخاڵێکی دیاریکراوی هەستەوە بەردو جیهانی لێکۆڵینەوە ببات بەمەبەستی بەرەوپێش بردنی هێزێک بۆ تەئویل بەگومان دەست پێدەکات ئەو گومانەی پشت بەقەناعەت دەبەستێت، رەخنەگر گومان لەرواڵەتی ئاماژە دەکات کە ببێت بەوشە، دێڕ، چیرۆکی پەیکەرێ، وێنەی پورترێت و... هتد، چونکە رەخنەگر هەڵگری قەناعەتێکە ئەوەی بۆ ئەو دەردەکەوێت هەموو شتێک نییە بەڵکو شتی تریش هەیە، ئێمە رازی نەبین بەوشتانەی کەوەک خۆیان هەن، بەڵکو ئارەزووی لێکۆڵینەوە دەکەین و دەمانەوێت بڕۆین بۆ دوورترین سنوری شتەکان بۆ دۆزینەوەی نهێنییەکان چونکە هەست دەکەین شتێک بزرە یاخود ئامادەنییە کەچی ئێمە وێنەی دەکەین و هەستی پێدەکەین، ئەم شعورە ئەزەلییە دەربارەی ئەوەی شتێک بزرە یان ئامادە نییە پێیدەوترێت نووسینی ئەسڵی. ئەدەب و رەسم و مۆسیقا هەریەکەیان جۆرێک گوزارشتن لەنووسینی ئەسڵی، نووسینی ئەسڵی بەسیفەتی جێکەوت ئیش لەبابەتەکاندا دەکات، جێکەوتیش لەشوێن پێی کەسێک دەچێت بەسەر لم دا بڕوات. کەسێک دەڕوات و جێگە پێی لەهەموو شوێنێکدا دیارە، هەموو جێگە پێیەکانی بیرمان دەخاتەوە ئەو بزرە، نووسینی ئەسڵی دەتوانرێت وا پێناسەی بکەین: لەراستی دا ئیدراکی ئێمە ون و نا ئامادەیە، ئەوەی هەست کردن بەموعاناتێک لەئەزموونی خۆمانەوە سەرچاوە دەگرێت دەستەوەستانی ئێمەیە لەدۆزینەوەی ئەو ون بووەدا سەرەڕای بێدەنگیمان، یان هاواری تیژمان، هەموو ئەو شوێن پێیانەی بەجێماون جەخت لەسەر ئامادەبوونی نادیارەکە دەکەن سەرەڕای نادیاریشی، رەنگە دەستنیشان کردن - یان زیادکردنی سیفاتی تایبەتی بۆ بێ عەقڵ شێوەیەکی ئاسان بێت یارمەتی تێگەیشتن بدات.

رەخنەگرتن لەقەسیدەیەک بۆ دۆزینەوەی ماناکانیەتی.

لەبەرئەوە مـانا فـیکرێکە یان چەمکێکە پەیوەسـتـە بەفـیکرێک یان چەمکێکی ترەوەو بەردەوامی دەدا بەم پەیوەستبوونە گرێدانی ئەم فیکرانەیە لەفیکری کەینونەی ترانسندنتالی یاخود راستی ترانسندنتالی. لەراستیدا گرنگی بەوەنادەین پێیدەڵێین (مانا) چونکە لەراستیدا ئەوە فیکرەیەکە لەمیتافیزیکادا پەناگەیەک وەردەگرێت. بونیـادگـەری رزگـاری نەبووە لەوەی پێـیـدەوترێت (سیـروره)ی شۆڕشگێڕییـە، لەچنگی مـیـتـافـیـزیکا، دەوترێت بوونیادگەری سروش لەسەمت وەردەگرێت، واتە لەشوێنێکدا چەقێک هەیە، ئەو چەقەچەمکی سێنترالیێیە کە دەکرێت بدۆزرێتـەوە بەسـیـفـەتی چەمکی کەینونە یاخود دەسەلاتی ترانسیندنتالییە لە چەمکی سەمت دا وا دەکەوێتەوە هەموو شتێک چەمکە لەباشترین باریدا، یان بەلانی کـەمـەوە شـیـاوی لێـتـێگەیشـتنە لەهەر جێگایەک سەمت هەبوو شلەژاوی یان تێکەڵن.

هەڵوەشـاندنەوە جـەخت لەسـەرئەوە دەکـاتەوە هەمـوو ئەوانە تەنهـا وەهمن، ئەوەی ئێـمـە بەحـەقـیـقـەت و کـەینونەی دەزانین تەنهـا فـەبرەکـەیە، ئەو شـتـانەی گوزارشت لەو فەبرەکانە دەکەن ئیشارە بۆ شکست دەکەن لەکاتی گەڕانمان بەدوای مانادا، ئەمەش واتا لەقۆناغێک لەقـۆناغـەکـانی مـێـژووی گـەڕان بەدوای مـانـادا لێکۆڵەرەوەکان لەبەر هۆیەک یان زیاتر رایان گەیاندوە گەیشـتـوونەتە دواین خاڵ و کـەس ناتوانێت ئەو خـاڵە تێپەڕێنێت، بەمەبەستی پاراستن ئەوەی کە پێیدەڵێن/ دواین خاڵ/ لەهەرەشە دەکرێت ئەوا پەیوەستی بکەی بە لێکۆڵینەوەی موستەقبەلی، هەموو ئەو خاڵانە جۆرێک لە پیـرۆزییـان دراوەتێ و ناویان ناوە راسـتـی truthیان کـەینونە being یاخود هەرشـتـێکیـتـر، دواین خـاڵی لێکۆڵینەوە یاخود چەمکی پیرۆز بەسـیفەتی سەنتەرێک بۆ رەخنە بەشێوەی باوو بونیادگەری ئیشی کردووە لەبەر ئەوەشە فیلێکی گەورە لەسەر رێگای چالاکی رەخنەیی تێگەیشتنماندا بۆ زمان تێپەڕیوە.

پێویستە دواجار بگەڕێمەوە سەر رەخنە، رەخنە بەمانا باوەکەی پراکتیککردنی نموونەیەکە دەیەوێت لەکارێکی ئەدەبی تێبگات، لەوانەیە ئەو نموونەیە فـەلسـەفی یان ئەخـلاقی دینی و زمـانـەوانی بێت، لەوانەیە رەخنەگـر تەواو بەو راسـتـایە نەزانێت کـە نموونەیەکی دیاریکراو پراکتیک دەکات، کە ئێمە ناویدەنێین هەڵسەنگاندنی خود یا(التقويم الذاتي) و لەراستیدا خودی نییە، ئێمە ئەوەی لەکـارێکی ئەدەبیـدا هەیە پەیوەسـتی دەکـەین بەشتێکەوە لەتێگەیشتنێکدا دەگات بەهەڵسەنگاندن. رەنگە«ئەوشـتـە» سـەمـتی ئەدەبی بێت کـە هێـزی بەرهەمـهـێنانی مـانا دەبەخشـێت لەرێگەی پەیوەست کردنی ناوەرۆکی قـەسیدەکەوە بەو زانیاریانەوە لەسەر ژیانی شاعیرەکە هەیە، زانیاری تایبەت دەربارەی میزاج بێزاری و ئەندێشە گۆڕانی خێرا، زوو بەسەرچوونی شتە جـوانەکـان، ودوورکـەوتنەوەی لەدەسکەوتی مـادی و عـەشـقی بۆ ژیانێ کـە خـەونی ئەو، دەکـەم، پاش ئەوە دەست دەکـەم بەپێکەوە بەسـتـنی فـیـکرەکـانی ناو قـەسیـدەکەوە بەو فیکرە دەرەکییـانەوە کە بەسیفـەتی سەمت بۆ پێکەوەگرێدانی فیکرەکان لەقەسیدەدا ئیش دەکـات. کـاتێک دەست دەکـەم بە پێکەوە بەسـتـنی فـیـکرەکـان بەدەرەوەی قـەسـیـدە ئەوا ئەو فـیـکرانەی قـەسیـدەی نەخشـاندووە تەنهـا دەبێـتە مانا، سـەرەڕای ئەوەش من لەهۆی بێزاری شیعرو هۆکاری عەشقی ئەو بۆژیانێکی خەون ئامێزو ئەو هۆکـارانەی وای لێدەکەن رقی لەدەرکـەوتی مـادی ببێـتـەوە دەکـۆڵمـەوە لەم جۆرە رەخنەیەدا تەرکـیـز ناکـەوێتـە سـەر سـەمت چونکە تەرکیزکردنە سەر سەمت بۆ لێکۆڵینەوە لەسەمت بەرەو بونیـادگـەریمان دەبات. بۆنموونە: مـەغـزای ئەوەچییـە

ـەرۆک شوێنی نیشتەجێ بوونی جێدەهێڵێت دەڕوات بۆ ـوورگـەیەک؟ ئایا مـەغـزایەکی تر هەیە: بەڵێ ـەنـیاییـەوە، لە هەندێک کـەسایەتی کـومیـدی لای ـکسپیـردا دەبینین وەکـو شانۆگەری(وەکچۆن خۆشت ـەوێ)و خەوی نیـوەشەوێکی هاوین هەندێ کەسایەتی ـرێک کـە بەدارستـان دەورەدراودو ملمـلانێی تێـدا جـزەسـەر دەکـرێت و حـیکمـەتی تێـدا بلاودەبێتـەوە حـێـدەهێڵن، بەم شێـوەیە هەندێک لەکـەسایەتی ناو قەسیدەو رۆمانەکان شارەکان جێدەهێڵن بەرەو دورگەکان، ـموونەی ئەوەش کەسێـتی (بروسبیسـو)یە لە شانۆگەری ـهۆز) و کەسێتی (جیلیفر) لە رۆمانی (گەشتەکانی حیلیفر) دایە لەبەر ئەوەش دەبینین (یتیس)ی شاعیر بە پەنابردن بۆ دوورگـە ئارەزووی نووسـەرەکان دەگێڕێتـەوە، ئێمە بڕیاردەدەین لە قەسیدە تێدەگەین، چونکە باوەڕێکی ئەم چەشنە دادەمـەزرێنین، باوەڕ بەجێـهێـشـتنی شارو پرشنگەکانی و رووکردنە دوورگـە لە شیـعردا مانایەکی گەورەی هەیە، ئەمـەش لەبەر ئەو رێکەوتنە ئەدەبییەیەکە پێی وایە ئەم فیکرە مانای هەیەو دەبینین شیکردنەوەی بونیـادگەری دەتوانێت تەرکیز بخاتە سەر رەگەزەکانی تری قەسیدە بە مەبەستی لێکۆڵینەوەی سەمتی شیعری، نە نموونەی یەکـەمدا نموونەیەک لە دەرەوەی بونیادگەری پراکتیک کرا، نموونەیەکی دیاری ئەدەب بەسەر قەسیدەدا تەنها لەپێناوی تێگەیشتن لە قەسیدە پراکـتیک کرا، بەڵام لە نموونەی دووەمدا نموونەی لێکدانەوەی بونیادگەری تەنها قەسیدەو رەگەزەکانی بۆ لێکۆڵینەوە لە سەمتی شیعر یاخود نموونەیەکی تری ئەدەب بەکارهێنرا، پێویستە ئەوە بیربهێنینەوە کە هەڵوەشاندنەوە گوزارشت لە هیچ کام لەو دوو حاڵەتە یاخود دژەکەیان ناکات.

هەڵوەشاندنەوە هیچ نموونەیەک نادات بە رەخنەگر، وە هیچ نموونەیەک بەسەر دەقی ئەدەبیدا پراکتیک ناکات، بەڵکو هیچ نموونەیەک پێشکەش ناکات و بگرە هەموو نموونەکـان تێک دەشکێنێت، لەبەر ئەمـەش نووسـینی هەڵوەشاندنەوە سەرسوڕمـانی گەورەی خستووەتەوە، بەپێچەوانەی رەخنەی بونیـادگەرییەوە هەڵوەشـاندنەوە باوەڕی بە سەمتێک نییە بتوانین لێی تێبگەین، ئەگەر فیکری نەست ئەوە بێت شتەکان رێکخراون یان دەتوانرێت رێکبخرێن ئەوا ئەو فیکرە لە راستیدا مواساتە، ئێمە مواساتمان لەسەرسوڕمان پێ باشترە، سەرەرای ئەوەی مواسات لە فێڵەوە سەرچاوە دەگرێت، بەڵام لە موعاناتی سەرسوڕمان باشترە، پاش ئەوەی کێشەی ئاڵۆز کردنی ئەدەب و فیکرەکانی رووبەرووی بونیادگەری راگەیاند ئاڵۆزی شیاوی شیکردنەوەو تێگەیشتنەو دەقی ئەدەبی دەتوانێت ئاڵۆزییەکان تەفسیر بکات، ئەوە جەخت کردنە لەسـەر ویستـێک کـەوا دەکـات پێشـەنگی ئەم بێت، بونیادگەری جەخت کردنەوەیە لە ویست و توانای مرۆڤ بۆ شیکردنەوەی هەمـوو ئاڵۆزییـەک، هەڵوەشـاندنەوە بە پێچەوانەوە بەدوای توانای سەمتدا دەگەرێت و پرسیار لە چۆنیـەتی ئەو نەریت و سیـفاتە ئەدەبییـانە دەکات کە هێناویەتیە بوون، رووبەڕووبوونەوەی نێـوان هۆشیـاری مرۆڤ و سەمتی ئاماژە ئاڵۆزو تێگەیشتنی قورسە، لەبەر ئەو هۆیەشـە وەکـو دیفدالسـیوون بیـرمـان دەخـاتەوە هەڵوەشاندنەوە جەخت لە پێویستی دووبارە بیرکردنەوە لە هەمـوو گـرفـتـەکـانی زمـان دەکـاتەوە و رەنگە بوارێکی مەعـریفی نوێ پێـویست بێت و ptymology بەکاربهێنێت و لەگەڵ دەروونناسیدا بە سیفەتی یەک بواری مەعریفی ئەو ئەرکە رابپەڕێنن، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین هەڵوەشـاندنەوە فـەلسـەفـەو مـیـتـافـیزیکا بە سیـفـەتی دووفریودەر دوور دەخاتەوە، هەروک زمانەوانی لە نموونەی تایبـەتی زمـاندا دەشـارێتـەوە، لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەدا ناگـونجـێت، هەروەها هەڵوەشـاندنەوەش پەنانابات بۆ

بونیـادگـەری کـە تەرکـیـزی بەهێـز ددخـاتە سـەر زمانەوانی.

هەڵوەشاندنەوە بارێکە ڕێساو سیستم و زمانی تایبەتی حوکمی دەکات و کەسی سەرەتایی بە گران لێی تێدەگات، ڕاستییەکی جیاوازە، ئێمە ڕێساو سیستم و زمانی تایبەتمان لە تیۆری ڕەخنەی باودا زیاترە وەک لە هەڵوەشاندنەوەدا، مرۆڤ ڕووبەڕووی زاراوەگەلێکی هونەری دەبێتەوە وەکو :کەسێتی، حەبکە، بابەت، وێنە، ڕەمز، شیعری لیریک و قەسیدەو.....هتد.

بەهۆی زۆر بەکارهێنانەوە بووە بەحاڵەتێکی سروشتی، سەرەڕای ئەوەش ئەگەر لە زاراوەکانی وەکو (جیاوازی) و (جێکەوت)، نووسینی ئەسڵی تێنەگەین، ئەوا ناتوانین لە هیچ بەرهەمێک کە دەکەوێتە خانەی ئەوتیۆرەوە یان لە هیچ شتێکی تازە تێبگەین، مرۆڤ ئەگەر هەوڵبدات سوودێکی زۆر لە فێربوونی ئەم تیۆرە وەردەگرێت، ئەم سوودەش خۆی لەو پرسیارەدا دەبینێتەوە کە ئێمە دەربارەی تێگەیشتنی مرۆڤ و پەیوەندی جیهانی مرۆڤ بە مەعریفەوە دەکەین، هەڵوەشاندنەوە تیشکێکی نوێ دەخاتە سەر چالاکییە فیکریەکانمان هەروەها ئاگادارمان ددکاتەوە کە دەسەڵاتی ئەدەب نەلە دەسەڵاتی ئەدەبەوە هاتووە نە لە دەسەڵاتی زمانەوە، چونکە دەسەڵاتی زمان لەهەمان بارودۆخی دەسەڵاتی مۆسیقاو پەیکەرسازی و سروتەکاندایە... هتد، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ هەستێکی ئەسڵی و سەرەتایی بەرامبەر بەشتێک کە بزرو نا ئامادەیە، پاشانیش ئیدراکی مرۆڤ ئاراستە دەکات.

* * *

١- نیوتن غارفر لای وایە لە مێژووی فەلسەفەی ڕۆژئاوادا، فەلسەفەی زمان و لە میانەی ئەودامیتافیزیکا بە زۆری، زۆرتریشتی بەلۆجیک بەستووە نەک بە بەلاغە، بەڵام دەربارەی ئەو دوو بزووتنەوەی لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا ڕوویدا دەڵێت: بزووتنەوەی یەکەم بەرز ڕاگرتن و نرخ دانان بوو بۆ فەلسەفە کە پشتی بە لۆجیک بەستبوو، بەڵام بزووتنەوەی دووەم کەلتووری بزووتنەوەی یەکەمی وێران کرد، وێران کردنێک کە دریدا وەک کۆتاییەک بۆ میتافیزیکا وەسفی دەکات.

٢- سەبارەت بە باکگراوندی میتافیزیکی بۆ چەمکی دال و مەدلول دریدا دەڵێت: جیاوازی نێوان دال و مەدلول دەگەڕێتەوە بۆ زەمەنێکی پێشووتر کە مێژووی میتافیزیکا دەگرێتەوە، ئەمە ئەگەر لە دیدێکی بچوکەوە سەیری بابەتێک بکەین، خۆ ئەگەر دیدگاکە بچوکتر بکەینەوە ئەوا سەیری قۆناغی خولقاندن و گەشەکردنی مەسیحیەت دەکەین کە هەماهەنگی چەمکە ئیغریقییەکانە.

٣- پێویستە تێبینی ئەوە بکەین کە دریدا وشەی جیاوازی لە کۆکردنەوەی وشەی جیاوازی difference بەمانای لێک نەچوون +deference بەمانای دواخستن هەروەها جێکەوتیش دەگەیەنێت، ئەوەش بە گۆڕینی پیتی E بە پیتی A لە وشەی جیاوازیدا، ئەم گۆڕانە ئاشکرایە، بەڵام لە گواستنەوەدا بۆ زمانێکیتر روون کردنەوەی قورسە.

٤- دریدا دەڵێت: نووسین بە جۆرێک لە جۆرەکان گوزارشت لە جێکەوت دەکات، نەک خودی جێکەوت، فیکرەی جێکەوت ملکەچی پرسیاری ئەنتۆر دیاردەگەرایی دەبێت، جێکەوت هیچ نییە، کیان نییە، بەڵکو جێکەوت ئەو پرسیارە تێدەپەڕێنێت کە دەڵێت: ئەوە چییە؟

**سەرچاوە: ئینتەرنێت**

# مەرگی ناسری

**شیعر- ئەحمەد شاملو**

**لێکۆڵینەوە/ محەمەد حقوقی**

**لەفارسییەوە: فەرەیدون سامان**




لەگەڵ ئاوازێکی رێک، دارێک
بەشوێن دەنگ دارینەیەکەوە
رێک، دارێک
لەلاکە لاکەیدا
هێڵێکی قورس و دەنگ دەرەوەی
دەکێشایە سەرخاک
« - تاجی درکێک بخەنە بان سەری!»

دەنگێکی دووری بەرووی شوێن هەڵگردا
لەورێنەی ژانەکەیدا
زنجیرەی ئاگرین، رێک
دەرژاند
«پەلە بکە ناسری پەلە بکە، پەلە»
لەریزی هەرای تەماشاکەران
ئەعوزو بیللا
هەنگاوی ژنانەی رێی خۆی گرتەبەر
دەستەکان
لەو دیویشەوە
پێکەوە گرێ دراو
گیانی لەئازاری سەختی قەرزی بژاردە
گەردن ئازاد کرد:
« مەگەر خۆی نەیدەویست و نەیدەتوانی!»

زنجیرەیەک چەرمچن
دەهات بەرەو خوار
ریس بێ کۆتایی بوو
لەدرێژەی خۆیدا تێپەری
«ناسری پەلە بکە ، پەلەبکە»

لەو بەزەییەی کەلەگیانیدا دۆزییەوە
وەک تاوسێکی لەخۆبایی
لەرووی خۆی روانی
«بییکوتن»
ئەم شیعرە بەتەنیا باسی حاڵەتی عیسایە(عیسا ئاساکان) کاتێ رووبەرووی چارەنووسی خۆی دەبێتەوە(خۆیان دەبنەوە) ئەوکاتە تەماشاکاران دەروانە ئەوان، دوژمنەکان فەرمانیان پێدەدەن و دەیاندەنە بەرقامچی و لەئەنجامدا ئەوان لەخاچ دەدرێن و خۆرو مانگ لەگەڵ یەکدا هەڵدێن، جوڵجوتا بێدەنگی بەسەردا دەکشێ، شیعرەکە بەم کۆپلەیە دەست پێدەکات.

**لەگەڵ ئاوازێکی رێک دارێک**
**بەشوێن دەنگ دارینەیەکەوە**
**لەلاکە لاکەیدا**
**هێڵێکی قورس و دەنگ دەرەوەی**
**دەکێشایە سەرخاک**
**«تاجی درکێک بخەنە بان سەری».**

ئەمە یەکەمین کۆپلەی شیعرەکەیە کەوەسفی حاڵەتەکانی عیسا لەساتەکانی هەڵکشانییەوەدو جوڵجوتا دەکات، ئەگەر بەوردی سەرنجی وشە هەڵبژێردراوەکان بدەین بەسەرنجدانیش لەحاڵەتی تەرم نێژەکان، ئاوێتەیەک لەبێدەنگی و مقۆ مقۆ دروست دەبێ، بەسانایی پەیوەندی (رێک) و سیفەتی

(دەنگدانەوە)و (قورس) دەرک پێدەکرێ، بۆچی کەهەردوو سیفەت لەهەڵکشانی عیسادا بەکێو دیارکردنی کێشی دارەکەو دیارکردنی تەرازووی ئارام گرتن و چۆنیەتی هەناسە لێدان، دیاری قورس کەلەکاتی هەڵکشانی زێتر هەست بە قورسیەکەی دەکرێ بەسەرنجدانیش لەلەرزینی دارەکەو شەکەتی دارهەڵگرەکە لەگەڵ وشەی (راچەنین)دا زۆر گونجاوترە.

**دەنگێکی دووری بەرووی شوێن هەڵگردا**
**لەورێنەی ژانەکەیدا**
**زنجیرەی ئاگرین رێک**
**دەڕژاند**
**«پەلە بکە ناسری، پەلە بکە، پەلە»**

لەم کۆپلەیەدا کەبەردەوامی هەمان وەسف کردنی کۆپلەی یەکەمە بودرێک «کارێزێک» لەدەروونی «مەسیح» دا لێدەدا، ئەگەر لەپارچەی سەرەتای شیعرەکە سیفەتی (دەستێک) بۆ (دەنگ) بەکاربهێنین لەراستییدا دەنگ دارەکە کە لەدەرەوەی دنیای مەسیحیدا نیشانی دراوە، لەم بەشەدا سیفەتی درێژ یان دوور بۆ (دەنگ) پەیوەندی بەهێڵێکی درێژەوە هەیە کەهاوکات لەسەرخاکدا کێشراوە. سیفەتی (دەستێک) بۆ (ورێنەی ژان) بۆ نیشاندانی حاڵەتی دەروونی عیسا دەنگی دووری کلکەدارینە لەدەروونی ئەودا رشتەی ئاگرین دەرێژێ، پێویستی دەربڕینی (رشتەی ئاگرین) بێ پەیوەندی بە نیعتیباری قامچی لێدەری دارەکەیە، بەڵام ئەم دەربڕە تایبەتە، بۆچی لێرەدا هێناویەتی؟ لەم لێکۆڵینەوەیە بەم تێڕوانینی ئامادەیی خوێنەر رێک و دروست وەک «مەسیح» لەگەڵ وا ئاگابوونی لەرۆحی خۆیدا بەرەو مەرگێکی حەتمی هەنگاو دەنێ.

**زنجیرەیەک چەرمچن**
**هات بەرەو خوار**
**ریس بێکوتایی بوو**
**لەدرێژەی خۆیدا تێپەڕی**
**«ناسری پەلە بکە، پەلە»**

ئەمە کۆپلەی چوارەمە، بەدرێژایی سرووشتی کۆپلەی پێشین، ئەگەر لەبەشی بەرایی لەزولاڵی جوانی مەسیحیدا قسەی کرد لەوێدا کەهەرچی پێستی جەستەی ناسکتر بێ، ژانی قامچیەکان. زۆرتر هەست پێدەکات و دوو هێندەش نیشان دەدرێ، جەستەی لاوازو جوانی کەبەرادەی ئەوەی شایستەنییە وشەی (قامچی) بۆ بەکار بهێندرێ کەلە ترسناکترین قامچیەکانە، هەمان شت کەبەگوریسی درێژی سوور دەردەبرێ، تایبەت بەنیعتیباری رژانی خوێنی مرۆڤێکی وەک عیسا ئەوساکە کەگوریسی درێژی سوور لەدرێژایی خۆیدا هەڵدەکشێتەوە (لەکاتی بڵند کردن و لێداندا) لەگرێی گەورەدا جێدەمێنێ، بەو شێوەیە ناراستەوخۆ بەزەبری قامچی نیشان دەدات کەقامچی لێدان شایستەی مەسیح نییە، قامچیەک کە لەپڕ بەساتەکانی پەیوەندییەکی لەگەڵ وشەکانی دواتردا دەردەکەوێ.

**لەو بەزەییەی کەلەگیانیدا دۆزییەوە.**
**وەک تاوسی لەخۆبایی**
**لەروونی خۆی روانی**
**«بیکوتن»**

لێرەدا کەهاوپەیوەندی ناوبراو لەگەڵ فەرمانی (بیکوتن) ئاشکرا دەبێ، واتە بەهۆی گونجانی زنجیرەی ئاگرین وەدیار دەکەوێ، زنجیرەی ئاگرین لەبەرامبەر مرۆڤێکدا کەدەروون پاک و جەستەی پیرۆزە، ئێستا کەسۆزێک لەدەروونی خۆیدا دەبینێ، وەک تاوس «قوو» سووک دەبێتەوەو لەزولاڵی خۆی دەڕوانێ، بۆیەش کەهێشتا حاڵەتی (دەستێک) تێکنەنراوەو هێشتا زەبری یەکەمینی پێنەکەوتووە، بەراستی بۆچی وەک تاوس (قوو) وایە؟ ئاساییە کەبۆچی لەنێوان دەربڕینەکاندا هزری شاعیر دەبێ ئاراستەی (تاوس)ەکە بێتەوە مەگەر ئەوەنیە کە (تاوس) لەئەفسانەی ژیانی گیانەوەراندا تاکە باڵندەیەکە پێشبینی ژیانی خۆی دەکات لەکاتی دیارکراودا لەزولالترین کەنارەکانی ئاودا بەرەو مەرگی خۆی هەنگاو دەنێ، تالە ئاکام لەگۆشەیەکی دوور مالاوایی لەژیانی خۆی دەکات و هەڵدەکیشرێ و لەدرێژایی خۆیدا و دواتر بەناو قەدی عیسادا لوول دەبێتەوە «گرێی گەورە» یان لەوەتەی شاعیر خۆی بەدەوری خۆیدا خوول دەخواتەوەو جارێکی دیکە دەگەڕێتەوەو لەگرێی گەورەدا جێدەمێنێ و بەقسەی شاعیر وەک بەدەوری خۆی خوول دەخواتەوە دووبارە دەکرێتەوە، لەدوایشدا بڕیارەکە دووبارە دەبێتەوە.

**«پەلە بکە ناسری، پەلە»**

کارێکە کەلەحاڵەتی ئاساییدا، بەچاوی توند لێخوڕین و خێرایی کردنی ئاژەڵ بەکار دەهێنرێ، لێرە بەکۆتایی ئازارەکە کەلەوێ پیاوێکی وەک عیسایە ئەوسا وەک بەشێ لەسەرەتای شیعرەکە بۆ هەلاتنی دوایەمین «قامچی خواردنی عیسا» ئامادەبوو لەکۆپلەی پاشتر «کۆپلەی پێنجەم» ئیدی لەمەسیحدا رادەبرێ و روو لەتەماشاکەران دەکا

**لەریزی هەرای سەیرکەران**
**ئەعوزوبیللا**
**هەنگاوی ژنانی رێی خۆی گرتەبەر**
**دەستەکانی**
**لەودیویشەوە**
**پێکەوە گرێ دراو.**

سەرچاوە: شعر زمانی ما: احمد شاملو. ۱۳۷۰ ه.ش
تحقیق: محمد حقوقی.

# هیلیس میلەر....
# ڕەخنە وەکو ئەخلاقناسییەک

نووسینی: پییر. ڤی. زیما

رەسوڵ ئیسماعیل

به پێچەوانەی بۆل دی مان کە لە وجودییەتی هایدگەرییەوە دەست پێدەکات بۆ ئەوەی ڕەخنەیەکی ڕەوانبێژیانەی نیچەیی پێشڤە ببات، هیلیس میلەر وەکو قوتابیەکی جۆرج پۆلیە دەستی بەکارە ڕەخنەییەکانی خۆی کردووە، پۆلیە کە مامۆستا بووە لە ئەمریکاو میراتگری ڕەخنەی بابەتی ریشارو ڕەخنەی هەندێک لە تیۆریستە سویسرییەکانی تری جنێڤ بووە. لە هەمان کاتیشدا میلەر وەکو بۆل دی مان سەر بە قوتابخانەی ڕەخنەی نوێیە بۆ بەرگریکردن لە خوێندنەوەی داخراو، کۆپی ئینگلیزی- ئەمریکیانەی ڕاڤە کردنی دەق. نووسینە سەردتاییەکانی ودکو (The Dis-appearance of God; Five Nineteenth- Century Writers) جێکەوتی پولیەو شیکردنەوەی بابەتی- دیاردەگەرایی ئاڕاستەکراو ڕووەو یەکێتی گەردوون لەمیانەی وشیاری تاکەوەی تێدا دیارە. هیلیس میلەر لەنێو (Victorian Sub-jects)دا دەنووسێت: «کارەکانی ڕەخنەگرانی جنێڤ کۆنترۆڵی خەیاڵی منیان کردبوو».

میلەر لەسەردەمی هەڵوەشاندنەوە گەراییانەی ڕەخنەی ئەدەبیدا، هێشتا هەر هەندێک چەمکی هەڵقووڵاوی شیکردنەوەی بابەتی بەکار دێنێت و دڵسۆزی خۆی بۆ خوێندنەوەی داخراو پیشان دەدات و زۆر زیرەکانە دەیکات بە ئامێرێکی ئاست بەرزی هەڵوەشاندنەوەیی، چونکە ئەو تێڕوانینە وردەی خوێندنەوەی داخراو دەبێتە هۆی تێکشکاندنی پتەوی دەلالی کە لای ڕەخنەگرە نوێیەکان شتێکی دانپێدانراوە. هوارد فیلبرین ئەم تێکشکاندنەی ڕەخنەی نوێ وا وەسف دەکات گوایە خاڵی هاوبەشی هەموو هەڵوەشاندنەوە خوازانی ییێڵ-ە: «ئەوەی هەڵوەشاندنەوە خوازانی ییێڵ دەیانکرد بەو سیفەتەی میراتگری دامەزرێنەرانی ڕەخنەی نوێن، بریتی بوو لە ئاشکراکردنی ئەوەی تا چەند پڕۆژەکەی پێش ئەوان ڕووپێوی فرەیی تیۆری بەزاندبوو، ئەو پڕۆژەیەی گوایە لێی دەکۆڵێتەوە». لەنێو بارودۆخێکی ئاوادا، ڕەخنەگری وەکو دی مان و میلەر ناتوانن شتێک بکەن تەنیا ئەوە نەبێت بنەما تیۆرییەکانی ڕەخنەی نوێ هەڵبوەشێننەوە، ئەوەش بە سەلماندنی ئەوەی ئەو ڕستە خاوەن دەلالەتانەی کە ڕەخنەگرە تازەکان بەکاریان هێناوە تەنیاو تەنیا وەهمی میتافیزیکی بوون: «بەپێچەوانەی ڕەخنەگرە تازەکان، هەڵوەشاندنەوەگەراکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە مەرج نییە کارێکی باشی ئەدەبی یەکێتییەکی ئۆرگانی پێکبێنێت». میلەر هاوتەریب لەگەڵ ڕەخنە لە قوتابخانەی ڕەخنەی نوێ، هەوڵدەدات پڕۆژە تۆتالیتارییەکانی پۆلیە هەڵبوەشێنێتەوە، پۆلیە وەکو ئەوەی میلەر پێی وایە گەیشتۆتە ئەوەی «تێزە بنچینەییەکانی تایبەت بە ئەو بخاتە بەر وتووێژ»، بەم جۆرە بەبێ ویستی خۆی ئەوە دەسەپێنێت کە ئامادەگی مانا مەسەلەیەکە ناشێت وێنا بکرێت و هەموو پڕۆژەیەکی میتاییش بەر دواخستن دەکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا میلەر دڵسۆزی خۆی بۆ



هیکل

**رەخنەگری وەکو دی مان و میلەر ناتوانن شتێک بکەن تەنیا ئەوە نەبێت بنەما تیۆرییەکانی رەخنەی نوێ هەڵبوەشێننەوە**



دریدا

قوتابخانەی رەخنەی نوێ دوویات دەکاتەوە، ئەوەش لە رێگای رەتکردنەوەی ئەو بیرۆکە سیمیۆلۆژی و دیاردەگەرایی و مارکسییەی کە دەڵێت دەشێت تیۆری ئەدەبی ببێتە زانست. بۆیە لەم بارەیەوە دەبێژێت «ناکرێت توێژینەوەی ئەدەبی بە هەمان شێوەی توێژینەوە زانستییەکان پاساو بدرێنەوە». میلەر کە هەموو ئاوێتەبوونێکی رەخنەی ئەدەبی لەنێو میتۆدۆلۆژی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا رەتدەکاتەوە، لەگەڵ دریداو هارتمان بەرگری لە ئاوێتەبوونی نێوان رەخنە و ئەدەب دەکات، بۆیە لە کتێبی (Theory Now And Then)دا دەنووسێت: «رەخنەی ئەدەبی ئەدەبێکی پلە دووە». لەم لایەنەشەوە، رەخنەگرە هەڵوەشاندنەوە خوازەکان وەکو میراتگری رۆمانتیکییەت دەردەکەون کە پێی وابوو رەخنە درێژبوونەوەی نووسەرە (لەم بارەیەوە بڕوانە هارتمان). بەگشتیتی میلەر ئەم رووگە رۆمانتیکییە بۆ تیۆر رووەو ئەدەب و گوتاری وێناکراو، هاوشانی رووگەیەکە بەرەو هەڵوەشاندنەوەگەرایی دریدایی و مان-ی. میلەر دەڵێت: «کە قسە لە بارەی هەڵوەشاندنەوەگەرایی دەکەم، مەبەستم ئەم جۆرە خوێندنەوەیەیە کە جاک دریداو پۆڵ دی مان و من کاری لەسەر دەکەین». ئەم جۆرە خوێندنەوەیە لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا مۆرکێکی ئەخلاقی وەردەگرێت بەشێوەیەک دۆگلاس ئەتکینز پێی وایە جۆرێک لە پاراستنی هەڵوەشاندنەوەیە لە ئاست ئەو رێژەگەراییەی بەردەوام بەدواوەیەتی.

خوێندنەوەی داخراو جۆرێکە لە خوێندنەوەی ئەخلاقی، چونکە بەڵێنی ئەوە بە خوێنەر دەدات ئەو بونیادە ئاشکراو جیا بکاتەوە کە دەق بەسەریدا دەسەپێنێت. جۆرێک لە پێناسەی ئەم خوێندنەوەیە لەنێو کتێبی (Victorian Subjects)دایە، ئەم کتێبەی میلەر لەبارەی ئەدەبی ئینگلیزی سەدەی نۆزدەیەمەوە نووسراوە: «ئەم ئەخلاقناسییەی خوێندنەوە بریتییە لە دەسەڵاتی وشەکانی دەق بەسەر هزری خوێنەرو وشەکانیدا». کەواتە مەسەلە پەیوەستە بەوەی سیمۆن کرتشلی ناوی دەنێت «ئەویتریی» دەق. ئەم رێزگرتنەی دەق خاڵی دەسپێکی هەموو «خوێندنەوەیەکی باشە» (میلەر- Good Reading) و میلەریش پێی وایە بنچینەی هەڵوەشاندنەوەگەرایی پێکدێنێت، چونکە لەنێو کتێبی (The Ethics of Reading)دا دەنووسێت: «هەڵوەشاندنەوەگەرایی لە خوێندنەوەیەکی باش زیاترو کەمتر نییە».

میلەر لەکتێبی (Fiction And Repetition)دا وەکو کەسێک کە بەرگری لە راڤەکردنی دەق بکات، قسە لەبارەی «تەئویلی گونجاو» دەکات، لە شوێنێکی تریشدا جەخت دەکاتە سەر «بێتوانایی خوێندنەوە»، وەکو ئەوەی هەڵوەشاندنەوەگەرایی ئەمریکی وەسفی هاوشانی دەقە: «شوێنگەی بێتوانایی خوێندنەوە لە خوێندنەردا نییە، بەڵکو لەنێو دەقدایە». لاوازی بنچینەیی ئەم وێناکردنە ئەخلاقییە بۆ ئەدەب، وەکو ئەوەی لەدەروازەدا قسەمان لەسەری کرد، لە کێشەی بزرکردن و نقومکردنی ئیشکالییەتی میتازمانی و بونیادنانی بابەتدایە.

ئەوکەسانەی لێکۆڵینەوەکانی خۆیان تایبەت کرد بەم بابەتە (هەندێک لە نوێنەرانی سیمیۆلۆژیا و تەئویلکردنی دەقە کۆنەکان) بێگومان دەڵێن میلەر بە هەڵەدا دەچێت کاتێک پێی وایە ئەوەی ناوی دەنێت بێتوانایی خوێندنەوە بەتەنیا لەنێو دەقدایە. رەنگە دەقێکی تایبەت هەبێت نەکرێت بخوێنرێتەوە، یا تەڵەزگەی تێدا بێت، یا ناکۆک بێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە سەر لەنوێ بونیادنانەوەی ناکۆکی

و تەڵەزگە لۆژیکییەکانی بەلایەنی کەم دەوستێتە سەر میتازمانی تیۆری (ڕەخنەیی)، بەهۆی جودایی میتازمانی تیۆری، هیچ جێگای سەرنج نییە ئەگەر ناکۆکییە دەقگەراییەکان کە مارکسیستێکی وەکو لوسیان گۆڵدمان، یا تیۆریستێکی ڕەخنەیی وەکو ئەدۆرنۆ دەریان دەخەن، زۆر لەوە جیاوازترە کە دریدا یا دی مان یا میلەر دروستی دەکەن و بونیادی دەنێن. لە قۆناغی یەکەمدا، هیچ سوود لەوەدا نییە جەخت بکەینە سەر ئەوەی کە ڕەخنەگرێکی- مارکسی یا هەڵوەشاندنەوەخواز- بەهەڵەدا چووە یا هەڵەی کردووە، چونکە بەرلەوەی بچینە نێو وتووێژەوە واچاکترە مەسەلەی میتازمان بخرێتە ڕوو کە میلەرو دی مان بەتەواوی فەرامۆشیان کردووە. ئەوەش دەبینین کە لە یادکردنی ئەم مەسەلە بنچینەییە ڕاڤەی وێناکاری نا- مێژوویيانەی دەق دەکات وەکو ئەوەی ئەو هەڵوەشاندنەوە خوازانە بانگەشەی بۆ دەکەن کە جەخت دەکەنەوە سەر ئەوەی هەموو دەقێکی هەموو سەردەمێک دەقی پڕ لە تەڵەزگەن و ناکرێت قسەیان لەسەر بکرێت و ناخوێندنەوەو خۆیان خۆیان هەڵدەوەشێننەوە.

بەرلەوەی بچینە سەر کێشەی مێژووگەرایی دەق و پێوەندی نێوان مێژوو هەڵوەشاندنەوەگەرایی، با بگەڕێینەوە سەر کێشەی بەیەکەوە کۆبوونەوەی دوو دژو بێتوانایی قسە لەسەر کردن و خوێندنەوە. هەروەکو دیداو بۆل دی مان، شوێنی میلەریش لەنێو سیاقی هیگڵ-ی و نیچەیی دەستنیشان دەکرێت، ئەوەش کاتێک ڕەخنە لەچەمکی (Aufhebung)ی هیگڵ-ی و سەرجەم کولتووری دیالیکتیکی دەگرێت. میلەر لەبارەی لۆگۆسێنترالیزم و ئەهلیستییەت لەنێو قەسیدەی (سەرکەوتنی ژیان- The Triumph of Life)ی شیلی-دا تێبینی ئەوە دەکات کە هەردووک «خراونەتە نێو پێوەندییەک لەگەڵ یەکتریدا بەشێوەیەک کە ناکۆک نین و هیچ گونجاندنێکیش لە شێوەی Aufhebungی دیالیکتیکی قەبووڵ ناکات. کەواتە مەسەلەیەکی جەوهەرییە ناکۆکی هەڵوەشاندنەوەیی وەکو بەیەکەوە کۆ کردنەوەیەکی تەواوی دوو ناکۆک وێنا بکەین کە هەموو گونجانێکی هیگڵ-ی یا یەکێتییەکی دیالیکتیکی ڕەتدەکاتەوە بەو سیفەتەی کە یەکێتی دژەکان و چرکەساتی حەقیقەتن (ئەدۆرنۆ).

ئەو بەیەکەوە کۆکردنەوەیەی دژەکان کە هەریەک لە دی مان و میلەر خەیاڵی دەکەن و پێشتریش نیچە پراکسیسی کردووە، بریتییە لە هەڵوەشاندنەوەیی و مەنزەقی و هیچ یەکێتییەکی دیالیکتیکی- واتا مەعریفەی ڕەخنەیی- بەرهەم ناهێنێت. ئەوەی شوێنی مەعریفەی ڕەخنەیی دەگرێتەوە بریتییە لە دواخستن-ی دریدایی وەکو ئەوەی میلەر لەنێو کتێبی (Theory Now And Then)دا باسی دەکات و لەنێو شیکردنەوەکانی بۆ وردزۆرس پراکسیسی دەکات. وادیارە ئەو هیگڵ-یش بەسەراوێژی دەخوێنێتەوە، کاتێک لەنێو (The Linguistic Moment)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ناکرێت لەنێو کارە ڕۆمانسییەکانی وردزۆرس-دا هیچ گونجانێک لەنێوان وشیاری و سروشت هەڵبهێنجێنرێت و لێکنزیکردنەوەی میتۆدیانەی قەسیدەکانیشی- لە یەکتریەوە- نابێتە هۆی ڕستەیەکی خاوەن دەلالەت، بەڵکو دەبێتە «بەدوایەکدا هاتنێکی بێکۆتایی خوێندنەوەی دواخراو».

ئەم شێوازە لە تێڕوانین بۆ ئەدەب و فەلسەفە شێوازێکی نیچەییانەیە، چونکە نیچە یەکەم کەسە بە شێوەیەکی گشتی دیالیکتیکی هیگڵ-ی ڕەتکردەوە، بەبێ ئەوەی وەکو تیۆریستانی ڕەخنەیی تر لەنێو یەکێتی دژەکاندا بەدوای چرکەساتی حەقیقەتدا بگەڕێت. لە بارەی پێوەندی نێوان نیچەو میلەریش توانیمان تێبینی ئەوە بکەین کە: «هەڵوێستی فەلسەفییانەی میلەر کە بەشێوەیەکی لاوەکی پشت بە نیچە دەبەستێت، هەر وەکو نووسینەکانی نیچە، هەڵوێستێکی بۆست- فەلسەفییە».

مۆرکی پۆست فەلسەفییانەی لەوەوە دێت کە

**«شوێنگەی بێتوانایی خوێندنەوە لە خوێندنەردا نییە، بەڵکو لەنێو دەقدایە»**

بیرۆکەی خودی هیگڵ-ی ڕەتدەکاتەو، کە پێشتریش نیچە ڕەخنەی ڕیشەیی ئاراستە کردووە. میلەر سەرلەنوێ پێوەندی بەم ڕەخنەیە دەکاتەوە کاتێک قسە لەبارەی هەوتی نیچە دەکات بۆ «هەڵوشاندنەوەی بیرۆکەی یەکێتی من- منی بیرکەرەوە». میلەر لەنێو کتێبێکی تازەیدا لە ژێر ناوی ( Ariadnes Thread)دا بەپشت بەستن بە نیچە ڕەخنە ئاراستەی بیرۆکەی خود دەکات: «ئەو پارچە پارچە کردنەی نیچە بۆ بیرۆکەی منی جەوهەری کاتێک دەگاتە لوتکە کە بشێت جەستەی تاکە کەسێک پڕ بێت لە کۆمەڵێک من». ئەو فرە من-یە گونجاوە لەگەڵ دژایەتییەکانی نێو دەقی ئەدەبی و فەلسەفی، چونکە میلەر کە دژە هیگڵ و دژە نیچەیە، دەڵێت: «دوای ونبوونی خواوەندەکان، شاعیر خۆی لە حاڵەتێکدا دەبینێتەوە کە تێیدا لەیەک کاتدا دژەکان دەبن بە حەقیقی».

ئەم دەستنیشانکردنەی لەبارەی شاعیری ئەمریکی والاس ستیفنس-ەوە کراوە، میلەر بەسەر هەموو نووسەرو نووسینێکدا پراکسیسی دەکات کە شرۆڤەیان دەکات، جا مەسەلەکە پەیوەست بێت بە (سەرکەوتنی ژیان- The Triumph of Life)ی شێلی، یا بە Adam Bedeی جۆرج ئەلیۆت، یا بە Wuthering Heightsی ئەمیلی برۆنتی، یا بە Die Wahiverwandtschaftenی گۆتە، بەردەوام میلەر بەلایەنی کەم دوو خوێندنەوەی دژ بەیەک دەدۆزێتەوە کە تەڵەزگەی لۆژیکی و توانای قسە لەسەر نەکردن بەرهەم دێنن. میلەر لەنێو کتێبی Fiction And Repetitonدا هەنجەتی بنچینەیی خۆی لە بارەی Wuthering Heightsدا و اکورتدەکاتەوە و دەڵێت: «قسەی من ئەوەیە کە باشترین خوێندنەوە ئەو خوێندنەوەیە کە بەشێوەیەکی باشتر دژایەتی نێو دەق ڕوون دەکاتەوە، پێشکەشکردنی کۆی ئەو دەلالەتە مومکینانەیە کە دەق بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە و بەشێوەیەکی میتۆدیانە دەستنیشانیان دەکات، بەڵام لەلایەنی لۆژیکییەوە دژی یەکترن».

**ئەوەی شوێنی مەعریفەی ڕەخنەیی دەگرێتەوە بریتییە لە دواخستن-ی دریدایی وەکو ئەوەی میلەر لەنێو کتێبی (Theory Now And Then)دا باسی دەکات**

لەکاتی ڕاڤەکردنی میلەر بۆ ڕیالیستی جۆرج ئەلیۆت-دا، بەتایبەتیش ئەوەی پەیوەستە بە ڕۆمانی Adam Bede، هەوڵدەدات ئەوە ڕوون بکاتەوە کە ڕێبازی ڕیالیستی وەکو ئەوەی لە بەشی حەڤدەیەمدا خراوەتە ڕوو، لەلایەتی میتۆدییەوە پێچەوانەی پراکسیس کردنی نوسینە. لەلایەکەوە ئەلیۆت دێت نیستاتیکای ڕیالیستی دەکاتە پاشکۆی نووسینێکی ڕاستگۆیانە کە توانای دەسبەرداربوونی هەیە لە خەیاڵی نامۆ Fan-tastique و دەسبەرداربوون لە هەر ڕەوانبێژییەک کە ناکرێت بڕوای پێبکرێت، لەلایەکی تریشەوە، دەقەکەی بەگشتی لە هەموو هەنگاوێکدا پاشکۆیەتی خۆی بۆ خوازەو مەجازو ڕەوانبێژی ئاشکرا دەکات. بەشی حەڤدەیەم زۆر بە توندی ئیدانەی ڕەوانبێژی خوازەکان دەکات، میلەر ئەم مەسەلەیە لەکتێبی The Ethics of Readingدا بەم شێوەیە باس دەکات: «گێڕانەوەی ڕۆمانی ڕیالیستی، لەم بەشەی Adam Bedeدا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر لەسەر زمانی وێنەیی وەستاوە». لەکتێبی Victorian Subjectsدا بەم شێوەیە تێزی سەرەکی خۆی لەبارەی ڕیالیستی جۆرج لە ئەلیۆت کورت دەکاتەوە دەڵێت: «دەق لە سایەی خوازەوە، ئەوانەی خودی دەق دەچنە ژێر باری، لە ئاخافتنمان ئاگادار دەکاتەوە».

لەسەر ئاستی بونیادگەریدا ئەم هەنجەتە بونیادگەرییە لەو هەنجەتە دەچێت کە دی مان شیکردنەوەی دەقی ڕۆمانی (گەڕان بەدوای زەمەنی لەدەستچوو)ی بڕۆست پێشکەشی دەکات. هەروەکو دی مان-یش دەڵێت: بڕۆست جەخت دەکاتە سەر باڵادەستی خوازە بەسەر مەجازی نێردراودا، بەبێ ئەوەی ڕەچاوی ئەو واقیعە بکات کە «دەقەکەی لە بەهێزی ڕازیکردنیدا، قەرزاری بەکارهێنانی بونیادی مەجازی نێردراوە».

تەئویلە ڕەوانبێژییەکانی میلەرو دی مان بەلایەنی کەم و دوو پرسیاری ڕەخنەییانە دەوروژێنن: ئایا بەڕاستی ئەو نووسەرانەی

کارەکانیان ڕاڤەکراوە جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە شێوازی ڕیالیستی لەگەڵ زمانی وێنەیی ناگونجێت و خوازەش بە باشتر دەزانن لەمەجازی نێردراو؟ خوێندنەوەیەکی وشیارانەی ئەو دەقانەی قسەیان لەبارەوە دەکرێت، ئەوە دەردەخات کە جۆرج ئەلیۆت هەوڵدەدات خۆی لەموبالەغە و ئایدیالیستی کلاسیکی لابدات، بروست-یش خوازەو مەجازی نێردراو بەکار دێنێت، نەوەکو بەتەنیا خوازە کە تەنیا دەتوانێت جۆرێک لە ئەمری ببەخشێتە شێوازو لە وتارەکەی خۆیدا قسە لەبارەی شێوازی فلۆبێر دەکات. ئەلیوت پێی وایە هیچ ناکۆکییەک لەنێوان ڕیالیزم و خوازەدا نییە، بروست-یش پێی وایە بەهیچ شێوەیەک خوازە بالادەست نییە بەسەر مەجازی نێردراودا (بگرە دەشێت خاوەنی خاسیەتی وابێت کە خوازە نییەتی)، بەلام پرسیارەکەی تر پەیوەستە بە میتازمانی میلەرو دی مان. باشە پێناچێت ئەو دژکارییەی هەڵوەشاندنەوەخوازان لەنێوان ڕیالیستی و زمانی وێنەیی، لەنێوان خوازەو مەجازی نێردراودا دەیدۆزنەوە، سەپاندنی بونیادی گوتاری ڕەوانبێژیانەی تایبەت بەخۆیان بێت، نەوەکو بونیادی دەقە تەئویل کراوەکان بێت؟

هەڵەی هەڵوەشاندنەوەخوازە ئەمریکییەکان کە بیرکردنەوەی ڕەخنەیی- خودی لەبارەی میتازمانی تیۆری بەلاوە دەنێن، هەڵەیەکی مێژووییە، چونکە وادیارە میلەرو دی مان جەخت دەکەنە سەر ئەوەی کە هەموو دەقێک، بەبێ ڕەچاوکردنی بەرهەمهێنانی و ئینجا وەرگرتنی لەنێو سیاقێکی مێژوویی تایبەتدا، دەبێت وەکو بونیادی ناکۆک و تەڵەزگەی لۆژیکی و نەخوێنراو تەماشا بکرێت. میلەر لەبارەی Allegories De La Lecture ی پۆل دی مان-ەوە تێبینی ئەوە دەکات کە «هەموو دەقێک لای دی مان، ئاماژەیەکە بۆ بێتوانایی خوێندنەوەی خۆی». ئەگەر بەڕاستی ئەوەش حاڵەکە بێت، ئەوە تیۆری ئەدەب حوکمی ئەوەی بەسەردا دەدرا کە نامێژووییەکی نەزۆکە عەقیمە. لەکاتێکدا لەو دەسپێکە لۆژیکییەی سەرەتاییدا دەست پێدەکات کە گومانی لێدەکرێت ڕاست بێت و دەڵێت هەموو دەقێک بەو ڕادەیە ناکۆکە کە لەکۆتاییدا بەخۆی خودی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە، لەسەر ئاستی دەلالیدا بێتوانایە لەوەی دەقێکی تاک مانای سەدەی نۆزدەیەم لەگەڵ دەقێکی فرە مانای کافکا یا پێشڕەوەکان لەیەکتری جیا بکاتەوە.

لەم لایەشەوە، دی مان جیاوازە لەگەڵ سیمۆلۆژستی وەکو ئەمبرتۆ ئیکۆو دیاردەگەرایی وەکو وڵفگانگ ئیزەر کە هەوڵدەدەن لە سایەی پێشڤەچوونی سەدەکانەوە وەسفی پێشکەوتنی فرە مانایی ئەدەبی بکەن تاوەکو بتوانن سیما جیاکەرەوەکانی مۆدێرنیزم هەڵبهێنن. ڕەخنەگرانی ییڵ جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە هەموو دەقەکان مەنزەقین و ناخوێنرێنەوە و هەوڵدەدەن قۆناغە ئەدەبییەکان هەڵبوەشێننەوە، کە بە چیرۆکی تەواو خەیاڵی دادەنرێت،دێن پەیوەندی بەکولتووری نا مێژوویانەی قوتابخانەی ڕەخنەی نوێ دەبەستنەوە.

ئەوانە بە تەواوی جیاوازن لە تیۆری ڕەخنەیی ئەدۆرنۆو هۆرکهایمە، چونکە جەخت دەکەنە سەر مۆرکی ڕەوانبێژییانەی- وێنەییانەی- هەموو دەقێک و ئەوە ڕەت دەکەنەوە دان بەناوەڕۆکی حەقیقەتێکی ئەدەبی یا فەلسەفی دابنێن، بەڵکو پرۆژەی تیۆری ڕەخنەیی خۆیان دەخەنە بەر وتوویژو دیالۆگ. دیارە ڕەخنەو حەقیقەت لە یەکتری جیا ناکرێنەوە: ڕەخنە بێسوودە ئەگەر حەقیقەت نەدۆزرێتەوەو بەشاردراوەیی بمێنێتەوە، ئەگەر هیچ شتێک بوونی نەبوو تەنیا ماسکی ڕەوانبێژییانە نەبێت..

بۆ نموونە میلەر لەنێو کتێبی Hawthorne And Historyدا قسە لەبارەی «ئەستەمی گوزارشت کردن لە هەر شتێک کە دەکرێت لێی دڵنیا بین» دەکات. میلەر پێچەی ڕەشی کاهین، کە کەسایەتی سەرەکی نێو چیرۆکی هاوترن-ە The Ministors وەکو ڕەمزێک بۆ «نەخوێندنەوەی نێو هەموو ئاماژەکان تەماشا دەکات». هیچ حەقیقەتێکی دەروونی یا کۆمەلایەتی نییە بشێت لەو دەقە هەڵبهێنجرێت کە ماسکەکان تێیدا ماسکی تر دەشارنەوە، لێرەدا تەنانەت خودی دەموچاویش وەکو ماسکێک دەردەکەوێت، بەلام ئێمە بەناوی چییەوە ڕەخنە لە ئایدیۆلۆژیاکان دەگرین- میلەر بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕەخنە لە ئایدیۆلۆژیای تیۆری و ئایدیۆلۆژیای تر دەگرێت- ئەگەر حەقیقەت، تەنانەت حەقیقەتی جوزئی و کاتیش، ئەستەم بێت پێی بگەین؟ خودی چەمکی ئایدیۆلۆژیا لەژێر مەترسی لەدەستدانی مانادایە ئەگەر ڕەوانبێژی بەلاوەناو سڕییەوە، یا دژەکانی وەکو حەقیقەت و زانست و تیۆر، هەڵوەشاندەوە.

**سەرچاوە:**

التفكيكية، بيير: في. زيما، تعريب، اسامة الحاج، الطبعة الأولي، بيروت.

# «موسڵمانەکان خوێنی نوێ دەرخواردەی ئەوروپای پیر دەدەن»

[illegible]یری وستا وەهاب

**ناوی کتێب/ ئایندەی ئیسلام لە فەرەنساو ئەوروپا**
**ناوی نوسەر/ کۆمەڵێک نوسەر بەسەرپەرشتی میشێل فیفیورکا**
**ناوی بڵاوکەرەوە/ بالاند- پاریس.**
**خوێندنەوەو لێدوانی/ هاشم صالح**

بەپێ ی ئامارە رەسمی یەکان هەنووکە لە ئەوروپا پانزە ملیۆن موسڵمان بونیان هەیە، ئەمە گەر هاتوو کۆچبەرە «سربی»یەکانیشمان زیادکرد، گەورەترین کامپی پەنابەرانی موسڵمانیش لە ولاتانی فەرەنساو ئەڵمانیاو بەریتانیادان، بەڵام ژمارەیەکی زۆر پەنابەری تریش لە بەلجیکاو هۆڵەندەو ئیسپانیاو ئیتالیاو، دەوڵەتانی ئەسکەندەنافیاو..هتد بوونیان هەیە، لە فەردنسا بەشێکی زۆری پەنابەرانی موسڵمان خەڵکی ولاتانی باکوری ئەفریقیای رەش پێستن، لە ئەڵمانیاش زۆربەی پەنابەران تورکن و لە بەریتانیاشدا زۆربەیان هیندی و پاکستانین، بەبێ ئەوەی ئەمە بەمانای نەبوونی جالیەتی دیکە بێت.
ئەو موسڵمانانەی بۆ ماوەیەکی کورت یاخود دوورو درێژ لە ئەوروپا دەژین دەکرێ بارودۆخی مۆدێرنی باو کاریگەری هەبووبێت لە سەریان، لێرەوە بەسروشتی حاڵ تێگەشتنمان بۆ ئایین نوێ دەبێتەوە، ئەمە گەر بەشێوەیەکی راستەوخۆ یاخود- ناراستەوخۆ بێت، بەپێچەوانەی گومانەکانی ئێمەوە، چونکە تەواوی پەنابەرانی موسڵمان لەچینی پرۆلیتاریا، یاخود لەچینە هەژارەکانین زۆربەیان توانیویانە لە ژیاندا سەکەوتووبن و بگەنە بەرزترین ئاست، هەروەها گەڵێک پزیشک و ئەندازیارو- بزنسمان و رۆشنبیرو کادیریان تێدا کە لە کۆمپانیا جیاوازەکاندا سەرگەرمی کارن، دواتریش لەناو ئەم پەنابەرانەدا ژمارەیەک رۆژنامەنووس و مامۆستای زانکۆش هەڵکەوتوون، هەروەها لە هەندێ ولاتی دیکەش جێگرو وەزیریان تێدایە کە لە دوارۆژدا بایەخ و گرنگیان زیاترو زیاتر دەبێت.
لێرەوە هەندێک توێژەرەوە لەو باوەڕەدان ئەمانە چانسێک بۆ ئەوروپا د روست دەکەن، بە قەدەر ئەوەی کە ئەوروپا بەخت و چانسێک بووە بۆ ئەوان تا بەم پلەو پایەیە بگەن، لەبەر ئەودی ئەم موسڵمانانە لە عەرەب و نەتەوەکانی تر بە خوێنێکی نوێ ی چالاک و زیندوو«ئەوروپای پیر» تێر دەکەن. بەڵام ئەوروپا بیرکردنەوەی عەقڵانیان دەرخوارد دەدات و بەمۆرکە ژیاریە هاوچەرخەکەی فێریان دەکات، بەم مانایەش ئەمانە دەبنە دروستکەری چانسێکی نوێ بۆ زێدو ولاتەکانی خۆیان، چونکە زۆربەیان پەیوەندیان لەگەڵ جەزائیرو تونس و مەغریب و تورکیاو سەنگال دا نەبچراندووە. ئەمە گەر بێتوو ولاتانی رۆژهەلاتی عەرەبی وەک عێراق و میسرو لوبنان و.. هتد لە یادنەکەین، چونکە پێشبینی ئەوە دەکرێت بەریەککەوتنی ئەم جالیەگەورانەی پەنابەرانی موسڵمان لەگەڵ نوێگەری ئەوروپیدا رۆژانە ببێتە مایەی لە دایک بوونی فۆرمێکی گونجاوی نوێ لە نێوان ئیسلام و مۆدێرنەتیدا پاشان دەکرێ ئەم فۆرمە گوزارشت لە ولاتانی کەناری دەریای ناوەراست تادەگات بەئاراستەکەی تری بکات، واتە تادەگاتە ئاراستەکەی ئێمە بۆ ئەوەی یارمەتیدەرمان بێت لە رزگاربوون لەو قەیرانەی کە ئێستاکە کەوتووینەتە ناوی. ئەمە ددڵێم بەتایبەتی پاش پەرەسەندنی بزووتنەوەی ئوسولی پەرگیرو توندڕەو لەسەر ئاستی سی ساڵی رابردوودا.
من ئەم قسانە دەکەم لە پەراوێزی ئەم کتێبە نوێ یەدا کە لە پاریس دەربارەی هەمان بابەت بڵاوبۆتەوە، کە گەڵێک توێژەرەوەو پسپۆڕ بەنووسینی هاوبەشیان تێداکردووە. لەناویشیاندا دەکرێ ناوی «جیل کیپیل» بێنین کە مامۆستای پەیمانگای سیاسەتە لە پاریس و خاوەنی کتێبە ناسراوەکان دەربارەی بزووتنەوە ئوسولیەکان، بەتایبەتی کتێبی«جهادی مەزن، ۲۰۰۰» هەروەها ناوی «ئۆلیڤەر رواش» دەهێنین کە بەرێوەبەری توێژینەوەیە لە ناوەندی نەتەوەیی بۆ لێکۆڵینەوەی زانستی فەرەنسی، لە

بنچینەشدا ناوبراو پسپۆڕە لەبواری ئیسلامی ئەفغانی و پاکستانیدا، بەپێچەوانی «جیل کیپلە»وە کە تایبەتمەندە لەبواری ئیسلامی عەرەبیدا، لە هەردوو شێوازە رۆژهەلاتی و رۆژئاوایی یەکەیدا. دواهەمین دوو کتێبی «ئۆلیڤەر روا»کە بلاوبوونەتەوە بریتیین لە «ئیسلامی سەردەمی جیهانگیری»و کتێبی «وەهمەکانی ١١ی ئەیلول» دواتر ناوی«عەبدولرەحمان لەمشیشی» دەهێنین، کە مامۆستای زانستی سیاسەتە لە زانکۆی «بیکاردی» باکوری پاریسدا، کە بەرەگەز مەغریبی یەو پسپۆرە لەبواری گرفتەکانی ئیسلامی هاوچەرخدا، هەروەها بەشداری کردنێکی گرنگیشی هەیە لە رۆشن کردنەوەی هەلومەرجی ئێستادا. لەناو کتێبەکانی ئەم دواییانەیدا ناوی ئەم کتێبانەی دەهێنین«بۆ ئەوەی لە ئیسلامی سیاسی تێ بگەین،٢٠٠١»و کتێبی«ئیسلام- رۆژئاوا، ئیسلام ئەوروپا: پێکدادانی شارستانیەکان، یان پێکەوەژیانی کەلتورەکان، ٢٠٠٠»و کتێبی» جوگرافیای سیاسی بزووتنەوەی ئوسولیەکان،٢٠٠١» ، پاشان ناوی«ئەحمەد جاب الله» دەهێنین کە بەرێوەبەری پەیمانگای زانستە مرۆڤایەتیەکانە لە پاریس و مامۆستای فقهی ئیسلامی یەو ئەندامی لیژنەی ئەوروپی یە بۆ فتوادان و لێکۆلینەوەکان. لەم بوارەدا ژمارەیەک ناوی دیکە هەن کە کەمترینەکانیان ئەمانەن:«کریستان جابیتە» پسپۆر لە فەلسەفەی ئیسلامیدا،«محمد ئەرکۆن» کە پێویستی بەناساندن نییە، هەروەها ژنە توێژەرەوەی تورکی«نیلۆ فەرگول»و لێکۆلەرەوەی ئێرانی«فەرهاد خوسرەو خافار»و «جان رۆبێرزی» لێکۆلەرو«ریمی لیتۆ»ی توێژەرو ئەوانی تریش، کە داوای لێبوردن دەکەم لەبەر تەسکی شوێنی وتارەکە ناویان نابەم.

هەر لە سەرەتای موداخەلەکەیدا«جیل کیپل» ئەم پرسیارە دەخاتەروو: ئایا لادانی تیرۆریستانە شتێکی پەراوێزە لە ئیسلامی هاوچەرخ، یاخود گوزارشت لە بزوتنەوەیەکی بەهێزی هەمیشەیی دەکات؟ وەلامی ئەو بۆ پرسیارەکەی ئەم ئاراستەیە وەردەگرێت: من لەوە دوور دەکەومەوە بیرۆکەی ئاسانم هەبێت دەربارەی لێکچوون و گونجان لەنێوان موسلمانەکان و تیرۆردا، بەلام ناکرێ لەمەڕ کاروباری ئەو موسلمانانە بدوێین کە لەناوماندان و لە ئەوروپا دەژین، بەبێ ئەوەی گرفت بە هەموو راشکاویەک نەخەینەڕوو، چونکە ئەمە چاکەی بۆ ئێمەو موسلمانەکانیش تێدایە لەهەمانکاتدا پێکەوە، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەوانەی پرۆسە تیرۆریستی یەکانیان ئەنجامدا بەم دواییانە لە گەڕەکە موسلمان نشینە هەژارەکانی خۆرئاواوە هاتبوون، بەلام ئەمانە کردەی تیرۆریان پاش ئەنجامدانی پرۆسەی شۆردنەوەی مێشک «غسل الدماغ» بەتەواوەتی لە ئەفغانستان و هەندێ شوێنی تر ئەنجامدا، چونکە لە سەربازگەکانی«موجاهدین»دا بەتەواوەتی مەشقیان پێکراوەو مێشکیان پڕ کراوە لە فیکرو بیرۆکەی هەلە، کە دواجار ئەمە پالیان پێوە دەنێ بۆ ئەنجامدانی کارە توندڕەوییەکان وەک تەقاندنەوەی کۆگا بازرگانی یە گەورەکان لە رۆژئاوا یاخود تەقاندنەوەی میترۆکان و...هتد. سەر ئەنجامیش ئەوەی بەدەستیان هێنا، هاوشێوەی ئەو دەسکەوتانەیە کە لە ناوەندی گروپە رۆژئاواییی یە داخراوەکاندا بەدەست هات، نموونەی ئەم گروپانەش، گروپە ناوازەکانی رۆژئاوای وەک گروپی«مون»ە کە گروپێکە هیچ پەیوەندیەکی بەئیسلامەوە نییە، بەلکو بەهۆی قەیرانی ژیاری رۆژئاواوە دروستبووە، سەرکردەی ئەم گروپە داوا لە شوێن کەوتوانی دەکات کە بەکۆمەل خۆیان بکوژن، ئەوانیش خۆیان دەکوژن بەبیانووی ئەوەی کە رۆژی دوایی نزیک بۆتەوەو ئەم جیهانەش هەمووی خراپەیەو پێویستە بەجێ ی بهێلین، ئەم رووداوە سەیرانە لە سویسراو ئەمریکادا لەم سالانەی دوایی دا روویانداوە.. پاشان لە تێڕوانینی «جیل کیپل»دا بزووتنەوە ئوسولیە ئیسلامیە هاوچەرخەکان دابەشدەبن بۆ دووبەش: بەشی یەکەمیان ئەو گروپانەن کە لەم سالانەی دووایدا توندوتیژی و رادیکالیەتیان پەرەی سەندووە، هەتا گەیشتە رادەی تەقینەوە خۆ کوژیەکان «١١ی سێپتەمبەر»و«بالی»لە ئەندەنووسیاو پرۆسە خۆکوژییەکانی تریش، بەشەکەی تریان بەرووکارو ئاراستەی عەقلانیەت و دادپەروەریدا وەردەچەرخێنی، گەورەترین نموونەشیان پارتی- «گەشەپێدان و عەدالەت»ە لە تورکیا، کە هەلبژاردنەکانی تورکیای بەسەرۆکایەتی «رەجەب تەیب ئەردۆغان» مسۆگەرکرد، ئەم پارتە دروشمەکانی پێکەوەگونجان و هەلکردن لەنێوان ئیسلام ی نوێ و نوێگەریدا دەخاتەروو،

**ئەو موسلمانانەی بۆ ماوەیەکی کورت یاخود دوورو درێژ لە ئەوروپا دەژین دەکرێ بارودۆخی مۆدێرنی باوو کاریگەری هەبووبێت لە سەریان،**

گروپی،مون،ە کە گروپێکە هیچ پەیوەندییەکی بەئیسلامەوە نییە، بەڵکو بەهۆی قەیرانی ژیاری ڕۆژئاواوە دروستبووە، سەرکردەی ئەم گروپە داوا لە شوێن کەوتوانی دەکات کە بەکۆمەڵ خۆیان بکوژن،

بەڵکو لەمە زیاتریش یەکەمین شت کە «ئەردۆگان»ی سەرۆکی پارتەکە پێ ی هەستا داوای پەیوەندی کردن بوو بەیەکێتی ئەوروپاوە، لێرەوە ئەم پارتە لەسەر چەند بەهایەکی ناکۆک بە دیوێکداو چەند بەهایەکی ئوسوڵی چەق بەستوو نەگۆڕدا دژی بە دیوێکی تردا. دیارەگەر ڕێکەوتنێکی لەم چەشنە بێتەدی دەبێتە مایەی پەراوێز خستنی بزووتنەوەی توندڕەوی و ڕادیکاڵ، کە ئێستا کە گۆڕەپانەکەی پڕکردووە لە ئاژاوە گێڕی. «جیل کیپل» پێ ی وایە دەبوایە پێشتر لە دەرگای ئەم بابەتەمان بدایە، چونکە گۆڕەپانی ئیسلامی تا هەنووکەش سەرشارە بەزۆربەی چەشنەکانی کارلێککردن، لێرەوە ئەم گۆڕەپانە کراوەیە بەڕووی هەرگریمانەیەکدا.

ناتوانرێ پێشبینی ئەوە بکرێت کە بزوتنەوە عەقلانی و دادپەروەرە ئیسلامیەکانی وەک بزووتنەوەکەی ئەردۆگان و عەبدولا گول و محەمەد خاتەمی و جەمال ئەلبەناو ئەوانی تریش جەنگەکە دەبەنەوە دژی بزووتنەوە پەرگیرەکانی وەک بزوتنەوەکەی بن لادن و زەواهیری و هاوشێوەکانییان، چونکە ئەم جەنگە هێشتا زۆری ماوەو دووررودرێژەو لە ماوەی چاوەڕوانکراودا کۆتایی نایەت، بەلایەنی کەمەوە ئەمە بیروڕاو لێدوانەکانی منە لەسەر قسەکانی«جیل کیپل» ، دواتر ئەم لێکۆڵەرەوەیە ئاماژە بە حەقیقەتێکی ترسناک دەدات، کە ئێمە زیاد لە جارێک لێرەوە لەسەر لاپەرەکانی ڕۆژنامەی «الشرق الاوسط» ئاماژەمان پێداوە، ئەویش شتێکە کە تایبەتە بەتێگەشتنی ئایین و تەفسیرکردنیەوە، لەبەر ئەوەی فیکری سونەتی و کتێبە زەردەکان لە هەموو ناوچەکانی جهانی عەرەبیدا بلاودەبنەوە، نەک بیرکردنەوەی هاوچەرخ و فیکری مۆدێرن، هەروەها لەواقعدا کتێبە تازەکان دەربارەی ئایین ناگەنە هەموان تەنها دەست کەمینەیەکی زۆرکەم لە کەسانی دەستە بژێرو نوخبە نەبێت، لێرەوە چۆن دەکرێت بزوتنەوە عەقلانیەکان سەرکەون بەسەر بزوتنەوە پەرگیرەکاندا؟ هەروەها«جیل کیپل» ئاماژە بە حەقیقەتێکی دیکە دەدات کە مەترسیەکەی لەوەی پێشتر کەمتر نییە گەر زیاتر نەبێت: ئەویش ئەوەیە کە کەناڵە ئاسمانی یە عەرەبیەکان بەتایبەتیش کەناڵی «الجزیرە» فیکری تەقلیدی و تایەفەگەری بەسەرچوو بەدرێژایی بیست و چوار کاتژمێر پەخش دەکات، گەر بێتوو ئەمە لە چوارچێوەی بیرکردنەوەی هونەری تازەش دابێت. بەم مانایە جهانی عەرەبی هیچ شتێکی لە نوێگەری خۆرئاوا وەرنەگرتووە جگە لە توێکڵەکەی نەبێت و ناوەرۆک و جەوهەری نوێگەریشی ڕەت کردۆتەوە. ناوەڕۆک لە پرۆسەی وەرگرتنەکەدا بەمانای تەواوی وشەکە کۆنەپەرستانەیە، شێوازیش زیودەرو سەرنج ڕاکێشە ئەمەش ئابروو چوونێکی راستەقینەیە مادەم ئەم کەناڵانە بریتین لە خۆراکی ڕۆژانەی بینەری عەرەبی لەوپەری کەنارەکانی رۆژئاوای عەرەبیەوە تا باکوری سوریاو عێراق. لێرەوە دەتوانین فەنتازیای قەوارەی ئەو زانیاریانە بکەین کە بەرهەمی زوڕناکانی ئەم کەناڵە ئاسمانیانەیە. ئەم کەناڵانە بە ئاشکراو بێ پەردە بانگەش بۆ بیرکردنەوەی توندڕەوانەو پەرگیرانە دەکەن بەسەر سەری شەهیدەکانەوە بەشێوازێکی ڕاستەوخۆ یان ناراستەوخۆ. ئەم کەناڵانە لەوانەیە پێیان وابێت کوشتنی هەریەک لە نوێنەری نەتەوە یەکگرتووەکان و، خاتوو«عەقیلە الهاشمی» یەکێکە لەکارە بەرگرییەکان، لێرەوە تووڕەیی من بۆ ئەم کەناڵە ئاسمانیە بێ نەوایانە گەورەترە لە تووڕەیی «جیل کیپیل» ، بەڵام چی بکەین چونکە بمانەوێ و نەمانەوێ پەخشی ئەم کەناڵانە ڕەنگدانەوەی حاڵەتی بەشێکی گەورەیە لەبۆچوونی گشتی جهانی عەرەبی و ئیسلامی، کە بۆچوونێکە هێشتا ئازادنەبووە لەبەدبەختی یەکانی سەردەمی دارمانی دووررودرێژ، پەخشی ئەم کەناڵانە ڕەنگدانەوەی حەساسیەتی راست ڕەوی عەرەبی پەرگیرە، کەتا ئەمڕۆکەش جەسارەت ناکات باس لە هەڵوەشانەوەی بیروباوەڕە شەڕانگێزەکانی، یاخود باس لە ئایدۆلۆژیا پەرگیرەکەی بۆ ڕۆحی سەردەمی تازەگەری بکات، بەڵام ناکرێ بەشێوەیەکی ڕەها ئەم کەناڵانە تاوانبارکەین، چونکە هەندێ جار جامی قسەکردنیان داوە بە نوێنەرانی ڕۆشنگەری و عەقلانی لە گۆڕەپانی کەلتوری عەرەبیدا.

دواجار «جیل کیپل» موداخەلەکەی بەخستنەڕووی پێشنیارێکی پراکتیکی کۆتایی پێ دەهێنێ، کە لەهەمانکاتتدا بۆ من کتوپڕو دڵخۆشکەریش بوو، ئەمە دەڵێم بەتایبەتی کە دەنگی ئەو لە فەرەنسادا گوێ ی لێدەگیرێ و بەخێرایش دەگاتە سەرچاوە بەرزو بالاکان «جیل کیپل» فەراهەم بوونی ئاشتی یەکی دادپەروەرانە لە ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا

پێشنیار دەکات، بەڵام گەر کەسێک بپرسێت و بڵێت چ شتێکی تازە لەم پێشنیارەدا هەیە هەموو خەڵکی ئەم پێشنیارە دەخەنەڕوو؟ لە وەڵامدا دەڵێم: ئەوەی لەم پێشنیارەدا تازەیە کە ئەو بانگەشە بۆ نوخبەی ڕووناکبیر دەکات نە ئەوروپا کە فشار بخەنە سەر سەرکردە سیاسیەکانیان، واتە فشار خستنەسەر «جاک شیراک و، تۆنی بلێرو، شرۆیدەر»و ئەوانی تریش، تا ئەم کێشەیە بەئاراستەیەکی پۆزەتیڤ دا بەرن، هەروەها بانگەشەکەی ئەو بۆ ئەنجامدانی ئەم کردەیە، بەتەنیا لەپێناو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نییە لە عەرەب و ئیسرائیلیەکان، بەڵکو ئەم بانگەشەیە لەپێناو خودی فەرەنسی و ئەوروپی یەکانیشدایە. چونکە ئاشکرایە «جیل کیپل» ئەوە دەترسێت درەنگ یان زوو، ئەوروپا باجی مل ملانێ ی عەرەب- ئیسرائیل بدات. لەبەر ئەوەی جالیەی عەرەبی یاخود موسڵمانەکان بەشێوازێکی پراکتیکی بەر لە ئارامبوونەوەی ئەو مل ملانێ درێژخایەن و تێکشکێنەرە تێکەڵ بە ئەوروپا بن. هەر بەم مانایەش ئەم جالیەیە، «جالیەی عەرەبی و ئیسلامی» بۆتە مایەی خولقاندنی مەترسی لەسەر ئاشتی مەدەنیانەی کۆمەڵگای فەرەنسی یان کۆمەڵگای بەریتانی و کۆمەڵگای ئەڵمانی و..هتد. بەم پێیەش ئەم مەترسیە بەتەنیا لەسەر کۆمەڵگای لوبنانی و سوری و میسری نییەو ناکرێ ئەوروپیەکان بتوانن بڵێن: ئەم مل ملانێ یە زۆر دوورەو پەیوەندی بەئێمەوە نییەو- پرپشکەکانی ناگەنە ئێمە. بەڵام پێشنیاری دووەم کە «جیل کیپیل» پێشکەشی دەکات خۆی لە گەورەکردنی قەوارەی لایەنە پەڕگیردکاندا نمایش دەکات لەناو جالییە موسڵمانەکاندا کە لە فەرەنساو ئەوروپادا بەشێوەیەکی گشتی دەژین. لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گروپە پەڕگیرانە ڕێژەی کەمینە پێک دەهێنن لە بەرامبەر ڕێژەی زۆرینەی ئاشتی خوازدا، لە موسڵمانە عەقڵانیەکان کە بەهێمنی و ئارامی دینەکەیان دەژین و نەوەکانیان لەپێناو ئایندەیەکی باشتردا پەروەردە دەکەن، بەڵام موسڵمانە پەڕگیرەکان زۆر دەبزوێن و ئاژاوە دەنێنەوە، دواجاریش دەبنە مایەی خراپ کردنی باری زۆرینەی موسڵمانە پەنابەرەکان و خراپ کردن و شێواندنی وێنەی ئیسلامیش لە ڕۆژئاوادا، ئەو

کردەوە توندڕەو و تاوانبارییەی پەرگیرەکان ئەنجامی دەدەن ڕەنگدانەوەی دەبێت لەسەر زۆربەی موسڵمان نشینەکانی ڕۆژئاواو دەبێ باجەکەشی بدەن، بەشێوەیەک وایلێهاتووە هەموو عەرەبێک یاخود موسڵمانێک لە وڵاتانی ئەوروپاو ئەمریکا گومانلێکراو بێت، بەهۆی کۆمەڵێک کەسانی پەرگیرو توندرەوەوە کە گەندڵی و خراپە بەسەر رووی زەویدا بڵاودەکەنەوە.

لێکۆڵەرەوەی مەغریبی«عەبدول رەحیم لە مشیشی» بەهەمان ئاراستەی «جیل کیپیل» ڕێدەکات، بەڵام بەشێوازێکی دیکە، چونکە ئەویش بەهەمان شێوە جیاکاری دەکات لەنێوان دووچەشنە بزووتنەوەی بنەڕەتی دا لەناو جالیە عەرەبی و ئیسلامیەکاندا کە بە دیاریکراوی لە فەرەنساو ئەوروپا دەژین. یەکەمیان بزوتنەوەی زۆرینەیە کە بێدەنگەو بەئاشتی و پێکەوەژیان دەژی لەناو کۆمەڵگەی ئەوروپیداو ڕێزی یاساکان دەگرێت، بەبێ ئەوەی واز لە تایبەتمەندیەکانی خۆی بهێنێ، هەروەها دووەمیشیان بزاوتی کەمینەی پەرگیرە.. کە بەشێوەیەکی سەرەکی لەگەڕەکە هەژاردکانی ڕۆژئاوادا دەژی، لە گەڕەکە هەژار نشینە گەورەکانی پاریس و لەندەندا بەدیاریکراوی، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەندامەکانی ئەم بزاوتە بێکارو- پەراوێزکراودکانن و هیچ ئاسۆو ئومێدێکیشیان نییە، لێرەوە بەشێک لەمانە دەگۆڕین بۆ کەسانی تاوانبار، یاخود تاوانبارێک کەماشێنەکان دەدزن- یاخود دەست درێژی دەکەنە سەر ڕێبواران ، بەشێکی دیکەشیان بەشێوەیەکی چەق بەستوانە دەگەڕێنەوە بۆ ناو شوناسە ئایینی یەکەیان و دەبنە کەسانێک کە ڕقیان لەو کۆمەڵگایەیە کەتیایدا دەژین بەم پێ یەش دەبنە نێچیرێکی ئاسان بۆ سەرکردە ئوسوڵی یەکان، تابیانکەنە سەرباز بۆ ئەنجامدانی پرۆسە تیرۆریستەکانیان، دوای ئەوەی کە سەرکردەکانی ئیسلامی سیاسی دەیانکەنە سەربازو لەخۆیاندەگرن هەلومەرجی ئابورییان باش دەکەن و مێشکیان دەشۆنەوەو لەیەکێک لە سەربازگەکانی ئەفغانستان یاخود سەربازگەی دیکەدا بۆ مەرگ مەشق و ئامادەیان دەکەن.

*** سەرچاوە/ ڕۆژنامەی «الشرق الاوسط» ژمارە ٩٠٧٨ی ساڵی ٢٠٠٣.**

> **لەواقعدا کتێبە تازەکان دەربارەی ئاین ناگەنە هەموان تەنها دەست کەمینەیەکی زۆرکەم لە کەسانی دەستە بژێرو نوخبە نەبێت، لێرەوە چۆن دەکرێت بزوتنەوە عەقڵانیەکان سەرکەون بەسەر بزوتنەوە پەرگیرەکاندا؟**

دلشاد عەبدوڵڵا

# شیعر جگە لەمەبەستی جوانیی و شیعرییەت هەر مەبەستێکی دیکەی هەبێت زیانی پێدەگات

دلشاد عەبدوڵڵا لەیەکەمین کەشی دەرکەوتنی، خۆی دەکاتەوەو ئەزموونی ئازادبوونی نووسین وەک تیشکۆ و نوختەی دۆخگۆڕین وەردەگرێت، دەیەوێت بڕواهێنانی دیاریکراو بەرەو لەناوچوون ببات، یان ڕۆڵیان بەلای باری بێهێزی بشکێنێتەوە. هەقیقەتی نوێیەخشی نوێنەرایەتی گیان و بیرکردنەوە بکات، ناوەندێکی بەزەبری هزریشبێت بۆ دامەزراندن و بووژاندنەوە.

شوێن وەک شێوەیەک لە شێوەکانی ڕۆشنبیریی لای دووبارە دەبێتەوەو لە ڕێگەی یادەوەرییەوە درێژە بە بیناکردنەوەی دەدات (هەولێر، ئالپاریز، هەمەدان) ئەدگاری دیکەیان دەداتە پاڵ، بەهێزکردن و جوانیی شوێن لە نووسینی داهێندراودا کارێکە لە فۆرمی کارامەییدا دەخەملێت، ئازادییەکانی داهێنەر دەیخاتەوە، هەست دەکەیت شوێنێک هەیە بەرەو دیدەنی دەچیت، ئازاری مرۆیی لە سروشت هەڵدەهێنێت و لە کۆتاییەکانی رادەمێنێت کە خولقاندن و واقورمانی بوونەوەری تێدا دووبارە دەبێتەوە، زمانی وەک پەخشاننووسێکی وێنە سازیی نوێ هەڵیدەبژێرێت بۆ نووسینی ڕۆمان. بەهەمان خەیاڵپەروەری توکمەو وردی شیعریی هێزی ئەم چەشنە بینینە دەناسرێتەوە.

لە تەمەنی نۆزدەساڵیدا یەکەمین شیعری خۆی نووسیووەو بڵاوبکردووەتەوە، ئێستا چل و هەشت ساڵ لە تەمەنی رابردووە. لە هەولێر دەژیت و لێشی لە دایکبووە، ئەم دیوانانە لە ٦٩٨ لاپەڕەدا بەخششی بیرکردنەوەی ئەون.

١- بەفرنووس- ٢٥٦ لاپەڕە، ١٩٩٩ سلێمانی.
٢- شەوی دووەم- ١٩١ لاپەڕە، ٢٠٠٠ سلێمانی.
٣- بزوبوونی ناوێک- ١٢٠ لاپەڕە، ٢٠٠١ سلێمانی.
٤- هەولێک بۆ کوشتنی کات- ١٣١ لاپەڕە، ٢٠٠٢ سلێمانی.

هەڤپەیڤینی: سەباح ڕەنجدەر

*** چارەگە سەدەیەک زیاترە سەرگەرمی شیعر نووسینیت، ئەو تایبەتمەندیانەی لە شیعری کوردیدا داهێنانی تۆن چین؟**

- لە ناوەڕاستی حەفتاوە کەم کەمە شیعرم دەنووسی و زیاتر دەمخوێندەوە، تووشی گرێیەک ببووم بۆم نەدەکرایەوە، پێم وابوو پێویستە ئەوەی دەینووسم تەواو جیاواز بێ لەوەی نووسراوە، ئەو بەراوردکردنە ئەگەرچی زۆر سوودی هەبوو بۆم ، بەڵام لایەنێکی خراپیشی ئەوە بوو کە گرێیەکی لە دەمی قەڵەمم دابوو بە زەحمەت بۆم کرایەوە. دوای دە ساڵ ماوەی دەرکەوتنی دواخستم، لەسەرەتاوە بڕیاری ئەوەمدا کە دەبێ لە پۆل جیاببمەوە، بەشێوەیەکی جودا لەفڕینی ئەوان و لەئاسمانێکی جودا بفڕم ، لەسەرەتای هەشتادا دەستم بەنووسینی قەسیدەیەکی درێژکرد، دەمویست لە ڕێی دەقێکی قورسەوە خۆم بناسێنم ئەو قەسیدەیە یەکەمجار ناوی (گورگ) بوو کە هەندێ لە برادەرەکانم دیوویانە، لەوانە کاک مەحموود زامدار، کاک فازل جاف، کاک قەرەنی جەمیل، کاک جەلال بەرزنجی. لەهەندێ دانیشتندا

خوێندوومەتەوە، دواتر دامە کاک شێرکۆ بێکەس ئەویش هەندێ پەرەگرافی سەر لەنوێ بەخەتی خۆی نوسیبوو وەو ئیقاعیی بۆ دروست کردبوو کە من لەسەرەتادا باوەڕم بەو ئیقاعە نەبوو کە گوێی خوێنەری شیعری کوردی پێ ڕاهاتبوو، من قەسیدەی پەخشانم نوسیبوو، دوا دارشتنی ئەو قەسیدەیەم بەناوی (سووتانی رەنگەکان) لە گۆڤاری (بەیان)دا بلاوکردەوە، لەو قەسیدەیەدا هەندێ تایبەتمەندی شیعری من دەرکەوتووە، لە رووی بایەخدانی بە زمانێک کە سێ بەشی لە ناوەوەیەو بەشێکی دیارەو هێما بۆ قوولایی ئەو جیهانە دەکەن کە دیار نییەو هێزی خولقاندن هەر جارەو هەندێکی دەردەخاو لە رۆتینی وتنەوە رزگارمان دەکا، رستەیەکی شیعریی چڕو ئاوێتەم نوسیووە، بۆ ئەم مەبەستەش سوودم لە ئالۆزی و تێکەلاوی زەمەنەکان وەرگرتووە، هەروەها تێکەڵکردنی شوێنەکان، بۆ ئەوەی کات و شوێنێک بخولقێنم جیاواز لەوەی هەبوو.

لە چڕکردنەوەی وێنەکاندا سوودم لە ئەفسانە وەرگرتووە، لەهەندێ ئەفسانەوە هاتوومەتە ناو ئەو ساتەی تێیدا دەژیم و هەندێجاریش ئەو ساتەم بردۆتەوە ناو زەمەنی ئەفسانە، لەو پرۆسەیەدا تەنیا شیعرییەت و جوانیم مەبەست بوو، شیعر جگە لەو دوو مەبەستەش هەر مەبەستێکی دیکەی هەبێ زیانی پێ دەکەوێ و تووشی کلۆربوون دەبێ لەو قەسیدەیەدا بایەخم بە هێزی دامەزراندن داوە لە رێی بەرهەمهێنانی مانا. رستە بۆ رستە نییە، وشە بۆ وشە نییە، وێنەی رووت نییە، هەر دووکیان هێزێک دەردەخەن کە شیعرییەتە لە بووندا، واتە دیمەنەکان پەرش و بلاونین، بەڵکو وەکو بینا رستە دوای رستە دارێژراون لە دەرەوەی هەستدا، دەرچوون لەپۆلەکەو دروستکردنی فەزانی شیعریی تازە کارێکی قورسە، من خۆشم بەو تەماشکردنە قورسەوە دەستم پێکرد، بەر لە هەموو شتێک رامان و وردبوونەوە لەوەی لە دەوروبەرمدا روو دەدا، سوود وەرگرتن لە ئەزموونی ئەوانیدیکە، خوێندنەوەی دەقی تازە. بەو شێوەیە چەشەی شیعریم گۆڕا، ئەوەش



دلشاد عبدالله

بەفرنووس

هەنگاوی یەکەمم بوو.

لەنووسیندا بایەخێکی زۆرم بە تەکنیکدا، ئەوەی زۆر فریامکەوت لەم رووەوە خوێندنەوەی شیعریی فەرەنسایی و خوێندنەوی ئەدۆنیس بوو، پاشان ئیلیەتم دۆزیەوە، تا ئەمرۆ لە خوێندنەوەی ڤالیری و ئیلیەت و ئەدۆنیس تێر نابم، لەناو شاعیرانی کوردش دوو شاعیر سەرەتا سەرنجیان راکێشام خانی و مەولەوی، (خانی) بۆ نووسینی رستەی ئاوێتە و (مەولەوی) بۆ شەپۆلدان و دارژانی شیعرییەت، مەولەوی هەموو سروشتی کردۆتە بەشێک لەبوونی خۆی، هەندێجار ئەو شاعیرە خواپەرستەم وا دێتە بەرچاو کە مولحەدێکی گەورەیە بە تایبەتی کە خۆی بۆتە خولقێنەری رووداوەکان لە رێی رژانی هەستەکانییەوە.

من شتێکی ئەوتۆم نەکردووە تا ئیدعای گەورە بکەم، هەوڵمداوە لەوانیدیکە جودا بم، لە دەنگی ئەوان نەچم، خۆم لە دەربڕینی راستەخۆ دوور گرتووە، بایەخم بەشتە بچووکە پەراوێزکراوەکان داوەو لەشتی زەق خۆم پاراستووە، لەوە زیاتر زەحمەتە باسی جۆری نووسینی خۆم بکەم ئەوەبە کاری خۆم نازانم.

*** ئایا شاعیر دەتوانێت خۆی لە دەوروبەرو واقیع دابماڵێت و نیرڤانایەک بۆ خۆی دروست**

**لەسەرەتاوە بڕیاری ئەوەمدا کە دەبێت لەپۆل جیاببمەوە، بەشێوەیەکی جودا لەفڕینی ئەوان و لە ئاسمانێکی دیکەدا بفڕم**

رستەیەکی شیعری چڕو ئاوێتەم نووسیووە، بۆ ئەم مەبەستەش سوودم لە ئاڵۆزی و تێکەڵاوی زەمەنەکان وەرگرتووە




بکات . لەناویدا خەریکی داهێنان و پەروەردەکردنی ئەزموونی خۆی بێت؟

– شیعر لە منداڵدان دەچێ، لە دەرەوەی بنێن دایە، کەچی هەستی پێدەکرێ و ئامادەیی خۆی هەیە و مایەی ئارامی و ئومێد بەخشینە، پرۆسەی خوڵقاندنە لە پشت پێستی واقیعدا و دواتر لە ناسکترین شوێنی بوون سەردەردێنێ و تێکەڵ بە بوونەوەرەکانیدیکە دەبێ.

شیعر وەکو ئاوی ژێر زەوی لە تاریکییەکانی ئەو دیوی هەستدا کۆدەبێتەوەو لە هەر شوێنێکدا هاتە دەرێ زیندەگی دەبەخشێ و ژیانێکی خرۆشاو دروست دەکا.

شاعیر دەتوانێ ئەو ئاوە بە سادەیی لەبن داری باخچەی تەنیشت شەقامێکدا دەربێنێ و هی واش هەیە لە کێوەنەوە بە پشتی گابەردو جۆگەو لەو رووبارەوە لەچاوی ئەفسانەدا دەربیهێنێ و لە شارە گەورەکاندا تێکەڵ بە هەست و خەیاڵی ئاڵۆزی ئەو دیوو رستە ئاوێتەکانی دەکا، جوانی شیعر لەو فرە ئەزموون و فرە دەرکەوتنەیدایە.

*** نهێنێ دەقی زیندوو لەچی دایە؟**

– هەندێجار وا دێتە بەرچاوم کە پێوانەی دەقی زیندوو لەهەموو سەردەم و رۆژگارێکدا هەمان پێوانەیە، هەر لە هۆمیرۆس و ڤرجیلەوە

تا سان جۆن پێرس و ڤالیری، ئەمسەرو ئەوسەری داهێنان بەیەک پەلکەزێڕینەی جوانی گیراوە، کەچی هێندە نابا خۆم بە خۆم دەڵێم، ئەی چۆن هەر شاعیرەو زمانحاڵی سەردەمەکەی خۆیەتی.

پرسیار گەلێک تێم دەورووژێنێ ناتوانم لە خۆمیانی بکەمەوە، پێوانەی (خانی) بۆ دەقی زیندوو جیاوازە لە هی (نالی) و هی ئەویش جیاوازە لە (مەولەوی) و ئەویش تەواو جیاوازە لە (گۆران) و بەو شێوەیە، هەندێ لەو شاعیرانە ناوەوە دەگونجێن لەگەڵ دەرێ، کەچی شاعیری زیندوو ئەوەیە کە دەرێ بکاتە بەشێک لەناوەوەی لەکاتی هەڵچوون و خوڵقاندا، من ئەوە لای مەولەوی زۆر بە روونی دەبینم .

*** لەناو هونەرکاندا کامیان پێویستیەکی کلتووری نەتەوایەتییە، ئایا لەم بارەدا شوێنی شیعر لە کوێدایە؟**

– هێشتان سەردەمی خانی لەناو ئێمەدا برەوی هەیە، شیعر و پەیامی نەتەوایەتی زۆر تێکەڵی یەکتر بوون، ئێستا ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو ئەزموونە تێپەڕیووە، زۆر لەو سەردەمە دوور کەوتووینەتەوە کەچی هەندێجار شاعیر بێ ئەوەی هەست پێ بکا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە، گەڕانەوە بۆ خانی ئەزموونی رستەی ئاوێتەو دۆزینەوەی بیانوو بۆ دەربڕین، ئەزموونێکی دەوڵەمەندە. من خۆم لەتازەترین ئەزموونی شیعرمدا گەڕاومەتەوە بۆ سەر لەنوێ دروستکردنی گفتوگۆیەکی شیعریی لەگەڵ ئەحمەدی خانیدا وەکو باوک و نەوەیەکی جیاواز لە دیدو چەشەو دەربڕیندا، بەڵام شیعر دەبێ لەپەیامی نەتەوایەتی جیاواز بێ، سەردەمی ئەوە بەسەر چووە کە شیعر زمانی نەتەوەو هۆز بێ، زمانی شاعیرە بۆ خوڵقاندنی پرسیار لای تاک لەو پەڕی راستگۆیدا لەگەڵ خۆی، لەکاتی تەنیاییدا.

من خۆم هێندە سەرسام نیم بە ئەزموونی ئەو جۆرە شاعیرانە، لە (حاجی قادری کۆیی)دا ئەو قەسیدانەم پێ خۆشە کە شیعرییەتیان لانەداوە لەبەر پەیامی نەتەوایەتی، لای (گۆران) یش هەمان حاڵەت دەبینم، ئەوە دەلیلی ئەو راستییە

کە هەر کاتی شیعر کرا ئامراز بۆ خزمەتی پەیامێکی زەق شیعرییەت کز دەبێتەوە.

دیارە حاجی قادر کەسایەتییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەرە دیاری سەردەمی خۆی بووە نەتەک ئەوەی شاعیر بووە، بۆیە زۆرجار ئەو لایەنەی دوایی کردۆتە قوربانی لایەنیدیکەی، بەڵام کە هات و باسی ئەزموونی شیعریی کرا حاجی ئەو هێزو گوڕە شیعرییەی نامینێ بۆ نەوە شیعرییەکانی دوای خۆی، جگە لەو چەند شیعرانەی کە هونەری شیعر نەکراون بە قوربانی پەیامی دەرەوەی خۆیدا.

لەناو هونەرەکاندا کامیان پێویستن. هەر هەموویان هەر چەند باڵای ئەوانیش هەڵکشێ، هێندە زەمینەی چڵ و پۆپ دەرکردنی شیعر زیاتر دەبێ تەکنیکی شیعر فرە دەبێ، بەڵام ڕاستیەک هەیە کە هێزی کلتووری کوردە، ئەویش ئەوەیە کە کۆڵەگەی سەرەکی ئەو کلتوورە تا ئەمڕۆ شیعرە، لای فارسییەکانیش وایە لەگەڵ جیاوازی هەژاری ئەدەبی کوردی و دەوڵەمەندی ئەدەبی فارسیدا.

تائێستا لەناو ئێمەدا شیعر بوونی ئەوانیدیکە دەسەلمێنێ، ئەوانەی دەیانەوێ حیکمەتێک بەرهەمبهێنن لە هەر بوارێکدا پەنا بۆ شیعر دەبەن. لە تاریکییدا یەکەم شت کە بیری لێدەکەیتەوە ڕووناکییە، شیعریش تا ئەمڕۆ ئاگری دەستی پرۆمشیتوسەو هەتا ناخی مرۆ پڕ دەبێ لە هەژان و وتاریکی و ئەندێشەی بێ سەروبن، شیعر پەناگەی گەورەیە بۆ ئارامبوونەوە .

*** ئایا شیعری تاراوگەی کوردی توانیوویەتی سیماکانی خۆی دەستنیشان بکات، لەکاتێکدا مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە، هەر لە چامەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم - نالی) و چامەی (گوتم بە بەختی خەوالوو - حاجی قادری کۆیی) تا دەگاتە شاعیرانی ئێستا؟**

- ئەدەبی تاراوگە. دەستەواژەیەکی ئاڵۆزە. هەندێجار تاراوگە لەوێیەو هەندێجار لێرە، لەبن پێستدا گەورەترین تاراوگە دەبینم.

شیعری تاراوگەو ناوەوە جیاوازنین، شیعر شیعرەو هیچیدیکە ناگووترێ. هەردەم شاعیر بەدوای کەرەستەدا دەگەڕێ، لەخۆیدا، لەوانیدیکەدا..

تاراوگە کەرەستەیەکی دەوڵەمەندە، بەتایبەتی بۆ ئەوانەی خەون بە منداڵی و شوێنەکانی منداڵیدا دەبین، بۆ ئەوەی نۆستالژیا هێزێکی گەورەیان پێ دەبەخشێ بۆ دەربڕین.

نالی لەگەڕانەوە بۆ نیمارەتی بەبان، بۆ سلێمانی، بۆ ژوورەکەی خۆی. هەروەها حاجی، لەبەرانبەردا وەڵامە نامەکەی سالمیش هەیە، ئەویش نەخشاندنی جیهانی تاراوگەی ناوەوەیە کە هێزی غوربەتی کەمترنییە لەنامەکەی نالی.

شاعیر کاغەزێکی سپی نییە، سپیش بێ بەمەرەکەبی دیکەش زۆر شتی لەسەر نووسراوە هەر هێندە شێی موعانات و دەبڕین لێیدا، هەموو شتەکان دەردەکەونەوە.

هەندێجار تاراوگە دەبێتە دەروازە بۆ گۆڕانی گەورە، ڕەهەندی نوێ دەکاتەوە، بەڵام نازانم بۆ هەمیشە چەشەی ئەدەبی بەلای ئەو جۆرە دەقانەدا لاردەبێتەوە کە تامی گەڕانەوە بۆ منداڵیان لێدێ، گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، ئایا شیعر زمانی منداڵی مرۆڤە لەگەورەبوونیدا.

ئەوانەی لە ڕۆژگاری تازەدا کەوتنە تاراوگە کەمیان توانیان بەپشتی گەرداوو شەپۆلان بگەڕێنەوە، من ئەزموونی (شێرکۆ بێکەس)

**شیعر لە منداڵدان دەچێت، لە دەرەوەی بینیندایە، کەچی هەستی پێدەکرێت و ئامادەیی خۆی هەیە، مایەی ئارامیی و ئومێد بەخشینە**



لەدیوانی دەربەندی پەپوولەدا بە ئەزموونێکی پێشەنگ دەزانم لەو رووەوە.

(عەبدوڵلا پەشێو) گوڵی زەردی غەریبی خۆی دایە هەموو ئەو کچانەی لەوێستگەکانی مێژوودا تووشیان دەبوو، لەپشت هەر درەختێکی تاراوگدا داربەڕوویەکی وڵاتەکەی دەدی، بەدەنگی هەر قەڵبەزێک رادەچەنی وای دەزانی دەنگی تاڤگەیەکی وڵاتی خۆیەتی.

کەچی (ئەنوەر قادر محەمەد) زریانێک بردی و نەیهێنایەوە، داخ بۆ ئەو سەفەرە.

(رەفیق سابیر)، (جەلال بەرزنجی) ئەدەبی تاراوگەیان نەنووسی، هەمان ئەزموونی ناوەوەیان درێژە پێدا.

ئەوانە بەو جیاوازیەوە جوانن . هەمان رای پێشووم دووبارە دەکەمەوە، شیعری ناوەوەو شیعری تاراوگە نییە، تەنیا شتێک هەیە ئەویش شیعرییەتەو هەر جارەو لە هەرشاعیرێکدا بەجۆرێک خۆی دەسەلمێنێ.

*** شیعری کوردی وەکو شیعری هەموو نەتەوەکان بەگەلێک وێستگەو قۆناغ تێپەڕیوە، ئایا هیچ لەووێستگەو قۆناغانە بۆت بوونەتە سەرچاوەیەک هەمیشە بگەڕێیتەوە سەری؟**

- مێژووی داهێنان بەقۆناغ ناپێورێ، بەبازدان لەو شاعیرەوە دەچێ بۆ ئەم.مەم و زینی خانی یەکێکە لەوێستگە گرنگەکانی خوێندنەوەو سوود وەرگرتن، لەوێوە هاتووم بۆ سەرشاتە لەو دەڤەرەدا وەکو مەلێکی عاشق بەسەر ئەو لقانە نیشتوومەتەوە کە بۆنی شیعری مەولەویان لێدێ، بۆنی پاشماوەی هێلانەکانی ئەو، بۆنی پیاسەی ئێوارانێکی ئەو، ئەو جا مەولانا خالیدی نەقشبەندی، نەک شیعرەکانی بەتەنیا بەڵکو رۆحی شیعرییەتی ئەو، رۆحی دەرچوون لەتەلبەندی سنوور، رۆحی فڕین بەناو گەردووندا، کەمن لەوداو لەسەلاحەدینی ئەیوبیدا دەیبینم، ئەو دووانە دوو وێستگەی گرنگن لای من، هێزو نیما یان شیعریان پڕ کردووم لەکەف و کوڵ . ئەوانە فێریان کردووم کە ئاوی ئەسرەوتی هەردەم رژاو لە پەنا بەردو تاوێران گیرنا خوا، هەرچەندی برژێ هێندە هێزی گەورە بوون و رۆیشتنی زیاتر دەبێ، وەکو «سوارە» دەیلێ، تا نەگا بەدەریا ئارام نابێتەوە.

*** لەو شیعرانەی بەرهەمتهێناون هەست بە پێوەندییەکی گیانی لەگەڵ نیشتمان دەکرێت، ئایا شیعر بەپێوەندییەکی گیانی و روانینی گەردوونی دەزانیت، یان نیشتمان دەوری لە پێوەندی گیانی و روانینی گەردوونی بۆ شیعر چییە؟**

- شیعر هەمیشە لەسوچەکان داگیر دەخواو دەخنکێ، بۆیە گرێی دەدەم بەمرۆوە، ئەو لەگەڵ خۆیدا دەیبا، بۆهەر کوێیەک دەچێ بۆ ئەوێی دەبا. نیشتمان پارچە زەوی نییە، چوارچێوەیەکی یاسایی و سیاسی نییە، بۆ شاعیر نیشتمان شوێنی خۆشەویستییە، لەهەرکوێ خۆشەویستی هەبێ ئەوێ نیشتمانی شاعیرە ،هەندێجار ئەو شوێنە پان و گەورە دەبێ هێندەی هەموو جیهان و هێندێجاریش لە گوندێکدا چڕ دەبێتەوە. جارێکیدیکە نموونە بەمەولەوی دەهێنمەوە. کاتی خۆی کە شیعرەکانی مەولەویم دەخوێندەوە هەستم دەکرد شاعیرێک لەناو کەوندا وەکو ئەستێرەیەک تیشک دەهاوێ، زۆر شوێنی جیهان گەڕاوەو لەهەر مەملەکەتێکدا شیعری بۆ خۆشەویستێک نووسیوە، بەرووناکی چرایەکی ئەوێی




**ئائێستا لەناو ئێمەدا شیعربوونی ئەوانیدیکە دەسەلمێنێت، ئەوانەی لە هەر بوارێکدا دەیانەوێت حیکمەتێک بەرهەمبهێنن پەنا بۆ شیعر دەبەن**

هەڵداوە،کەچی کە چوومەتە« سەرشاتە»، ئینجا هەستم کرد مەولەوی هەر بەوە نەوەستاوە، بەڵکو چاوی هەموو مەملەکەتەکانی بۆ رووناکی ژوورێک راکێشاوە لەکوێرە گوندێکی هەورامان، ئەو لەرێی درەوشانەوەی کەمەوێنەی جوانی شوێنێک فێری ئێمە دەکا کە تێیدا نەژیاوین.

ئایا ئەوە ناو دەنێی چ جۆرە خۆشەویستییەک.

نیشتمان کەوتۆتە کامەلای گەردوون، ئایا رێک چەقی نییە.

من بۆ خۆم بەر لەوەی ساموئیل بەتلەریتس و جیمس جۆیس بخوێنمەوە شتێکی ئەو تۆم دەربارەی ئێرلەندە نەدەزانی، دەمزانی لە ئەدەبیاتی مارکسدا باسی شۆڕشی نەتەوایەتی ئێرلەندییەکان کراوە، بەلام یتس و جۆیس ئێرلەندەیان بەهەموومان ناساند.نیشتمان بە داهێنەرەکانیەوە جوانە.

*** شیعری نەوەی خۆت چۆن دێتە بەر زەینت وکێن ئەوانەی بەلاتەوە لێزیادبوونێکان بۆ نەوەی پێش خۆیان کردووە؟**

— هەشتاکان سەرەتای گۆڕان و وەچەرخانێکی گرنگ لەشیعری کوردیدا دروست بوو. ئەو گۆڕانە زۆربەی جیهانی گرتبووەو پروشکێکی بەر شیعری کوردیش کەوت. لای ئێمە بەدۆزینەوەی ئەوروپا دەستی پێکرد، ئەوروپا وەکو فیکرو ئەدەب.

لەناو شاعیرانی کورد، هەندێ وێستگەهەن کە لێزیادبوونیان خولقاند لەوانە، دیوانی«سەمای بەفری ئێواران»ی جەلال بەرزنجی،«پیانۆی رۆژهەلات»ی کەریم دەشتی، «گوناهو کەرنەڤاڵ»ی بەختیار عەلی،«کتێبی شیعر»ی ئەحمەدی مەلا. گۆرستانی ئەپیکۆرۆس-ی(هاشم سەراج) بۆ نووسینەوەی رستەیەکی پڕ لەدەنگی ئەوپەڕی بێدەنگی کە گوێچکە پێیان رانەهاتووە، (دلاوەر قەرەداغی) لە پیاسەی ناو ئێوارەکانیدا،رووەکەکانی خواوەند-ی (سەباح رەنجدەر) بۆ نووسینی رستەی تجریدی، شیعرەکانی (کەژاڵ ئەحمەد و ڤوباد جەلیزادە) ئاشکراکردنی ئەو دیمەنە جوانانەی کە شەرم پەردەیەکی ناشیرینی خستبووە سەریان ئەوان هاتن و ئازایانە پەردەکانیان داماڵی، ئەوانە بەشێکن لەو لێزیادانەی هەشتاکان کەتا ئەمڕۆ درێژەیان هەیە، ئەگەرچی بەشێکی ئەوانەی ناوم بردن لەنەوەدەکان دانوسراون، بەلام من بە شیعری نەوەی خۆمی دەزانم، ئەوانە دەنگی دوای ئەزموونی (شێرکۆ بێکەس) و برادەرەکانی نییە لەشیعری کوردیدا.

ئەڵقەکان بەوشێوەیە فراوان بووە.

*** کاتێکی دیاریکراوت بۆ نووسین هەیە، یان ئیلهام کاریگەری وای هەیە کاتی نووسین دەستنیشان بکات و کاتی کتوپری خۆی بسەلمێنێت؟**

— کاتێکی دیاریکراو نییە بۆ نووسین، سوچێک پێویستە، کاغەزی سپی و قەڵەمێکی پاندان و مەرەکەبی رەش. زۆرجار بەشەو دەنووسم، هەندێجاریش بەیانی جاری وا بوو لەشوێنی کارکردنی رۆژانە، ئیتر شیعر خۆی ئەو کاتە دەدۆزێتەوەو ئیشارەت دەکا بۆ چوونم، هەندێجار خۆم ئەوکاتە دوا دەخەم، بۆ ئەوەی لەهەڵچوونی خێرا خۆم بپارێزم.

*** دەڵێن رۆمان شیعری بەرەو لێژی بردووەو هەڕەشەیەکە بەسەریەوە، ئایا تۆ هەستت بەو مەترسییە کردووە.لەکاتێکدا تائێستا شیعر لە ولاتی کوردستاندا جێگای تایبەتی خۆی هەیە؟**

— بەپێچەوانەوە رۆمانی نوێ سوودی لەهێزی شیعرییەت و زمانی شیعریی وەرگرتووە. زەمەنی شیعرو زەمەنی پەخشان جیاوازن، یەکیان لەرێی چوونە ناو وردەکارییەکانەوە زەمەن خاو دەکاتەوە کەچی ئەمیدیکە چڕو خەستی دەکات لەرێی وێنەدا.

من خۆم زۆرم رۆمان خوێندۆتەوەو سوودم لێیان وەرگرتووە، چونکە ئەزموونی ئەوان گرنگە بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەزموونی خۆم، کەچی (ئەدۆنیس) لەچاو پێکەوتنێکیدا دەڵێ: من حەزم لەخوێندنەوەی رۆمان نییە. لەبەر ئەو هۆیەی لەسەرەوە باسم کرد ، زەمەن لای ئەو هێندە چڕ بۆتەوە بواری شتە وردەکان نەماوە.

**شیعر هەمیشە لە سوچەکاندا گیر دەخوات و دەخنکێت، بۆیە گرێی دەدەم بە مرۆڤەوە، ئەو لەگەڵ خۆیدا دەیبا**

نازناز محەممەد عەبدولقادر:

# ئێمە لەکوردستاندا تەنها بەڕواڵەت کۆمەڵگای مەدەنیمان وەرگرتووە



**نازناز محەممەد عەبدولقادر. مامۆستای بەشی مێژووە لە کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین، خاوەن ماستەرنامەیە لە مێژووی نوێ، تێزەکەی لەژێر ناوی(میرنشینەکانی کوردستانی ڕۆژهەلات- میرنشینەکانی ئەردەلان و لوڕستان- لەسەدەی نۆزدەهەم) لە دەزگای موکریانی چاپکراوە،**

**لە چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیریدا، سێ کتێبی لەبواری منداڵاندا چاپ و بڵاوکراوەتەوە، کە زیاتر زانستین. کتێبەکان بەناوی(گیانلەبەران چۆن قسەدەکەن) و(گیانلەبەران چۆن دەبینن)**

**لەکۆتایی هەشتاکان و سەرەتای نەوەتەکانەوە(٣) ڕۆمانی وەرگێڕاوە (دوورە وڵات)،(کارەساتی گەورە، جان پۆل سارتەر)، (فڕینی هەڵۆ) ئەم سێ بەرهەمە بەداخەوە بەهۆی شەڕی ناوەخۆوە فەوتاون.**

**چەند لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی کۆنفرانسی تەعریب ئامادە کردووە. کە گەڕانەوەیەکی مێژوویە بۆ ڕەگوریشەی تەعریب لە کوردستانداو ئامادەیە بۆ چاپ.**

**کتێبی مێژوویی سەبارەت بەمێژووی کوردستانی ئێرانی هاوچەرخی وەرگێڕاوە بەناوی «اوضاع سیاسی کردستان» کە ئامادەی چاپە.**

**کۆمەڵێک وتارو نووسینی لەگۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکاندا بڵاو بۆتەوە، وێڕای بەشداری کردنی لە کۆڕو سمیناری زانستی و کۆمەڵایەتی و مێژوویدا.**

**لەم هەڤپەیڤینەدا بەهەڵمان زانی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی چەند پرسیارێکی بکەینەوە لەسەر ڕەوشی ئافرەتی کورد و کێشەو گرفتە هەنووکەییەکانی، کاریگەری جڤاتی مەدەنی لەسەر گەشەسەندنی ڕەوشی فەرهەنگی ئافرەتانی کوردستان.**

*** ڕۆڵ و شوێنی مێینەی کورد لەو قۆناغەدا لەبەرجەستەکردنی بنەماو کۆڵەگەکانی کۆمەڵگای مەدەنی لە کوردستاندا چین؟**

– هەروەک دەزانین بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنی بریتین لە سێ کۆڵەگە. فەرهەنگی، سیاسی، ئابووری، لەبەرئەوەی گەلی کورد بەگشتی بە نێرو مێیەکەی. میللەتێکی داگیرکراوە لەناو سیستەمێکی تارادەیەک خێڵەکی ماوەتەوە و سەپێنراوەو بەهەموو شێوەیەک کەلتوورەکەی شێواندراوە، بەگشتی جارێ ئێمە دەبێ لەرۆڵی مرۆڤی کورد بدوێین، ئایا مرۆڤی کورد توانای ئەوەی هەیە ئەم کۆڵەگانە دابمەزرێنێ و هەنگاوی یەکەم بهاوێژێ بۆ کۆمەڵگەی مەدەنی، ئایا ئەو زەمینەیە لەبارەو دەتوانێ. بەبۆچوونی من کورد زۆر بە ئەسپایی زەمینە دروست دەکات بۆ ئەوەی کە بتوانێ کۆڵەگەکانی کۆمەڵگای مەددنی لەسەر بنەماو هەوێنێکی عەقڵانی کە دەبێ دابمەزرێ، ئەو زەمینانە دروست بکات. قسە هەیە کە ئێمە دەمانەوێ

کۆمەڵگای مەدەنی دروست بکەین، بەڵام لە ڕاستیدا ئێمە نەمانتوانیوە ئەوکارە بکەین، چونکە هیچ بنەماو زەمینەیەکمان نییە بۆ ئەوەی بڵێین هەوڵدەدەین بەرەو مەدەنیەت بڕۆین، وڵاتانی دەوروپشتی خۆمان وەک ئێران- سوریا- تورکیا، زەمینەیەکی لەباریان هەیە، کۆڵەگەیەکی ئابووری بەهێزیان هەیە، کۆڵەگەی فەرهەنگیان بەهێزترە لەهی ئێمە، کۆڵەگەی سیاسیشیان لەئێمە بەهێزترە، چونکە کیانێکیان هەیە، ئەوە ئاسانترە بۆئەوەی تۆ هەنگاوبنێی بۆ کۆمەڵگای مەدەنی، جا لەنێو ئەو کۆمەڵگا نەریتیە دواکەوتووەی ئێمە ئەو میللەتەی چەندین ساڵە داگیرکراوە، دەیان کەلتوور بەشێوەیەکی نەگەتیڤ کاری تێکردووە، ئایا دەبێ ڕۆڵی خەڵکی لاواز کە مێینەش بەشێکە لەو خەڵکە لاوازەی ناو کۆمەڵگای کوردی دەبێ ڕۆڵی چیبێ؟، بێگومان ڕۆڵەکەی زۆر لاوازە، دەشتوانین بەراشکاوانە بڵێین ئەو ئافرەتانەی لەناو کۆمەڵگای ئێمەدا دەتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن پێویستیان بە زەمینەیەکی زۆر بەهێزە، هەروەها دەبێ نێرینەیەکی بەهێزیش لەپشتیانەوەبێ، ئەوە بەمانای کەمکردنەوەی ڕۆڵی مێینە نییە، بەمانای ئەوەنیە مێینەکان خۆیان هیچیان لەباردا نییە بۆ نێرینەکەیان، بەڵام ئەگەر نێرینەیەکی بەهێزیان لەپشت نەبێ بەو عەقڵیەتە دواکەوتووەی کۆمەڵگای ئێمە ناتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن.

*** ئاماژەت بەشوێنی مرۆڤی کورد کرد، دواتر بەتایبەت هاتیە سەر شوێنی مێینە، بەڵام تۆ هۆکارەکان بۆ ئەو دەسەڵات و دامەزراوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیانەی کۆمەڵی کوردی ناگەڕێنیتەوە کە ئەوانیش هەمیشە ویستوویانە ئافرەت لە پەراوێزدا بمێنێتەوەو ڕۆڵی دیارو بەرجەستەی نەبێ لە نێو کۆمەڵی کوردیدا؟**

- من بەدەستی ئەنقەستی نازانم کە دامەزراوە سیاسیەکان و دامودەزگا حکومیەکان، کە لەماوەی ئەو دوانزە ساڵەدا نیمچە حکومەتێکمان هەیە، بیەوێ بەرنامەیەک دابڕێژێ بۆ ئەوەی ڕۆڵی مێ بە پەراوێز بکات، ئەوە بەڕاست نازانم، بەڵام ئەوەندە دەڵێم کە ئەوانیش هەڵگری ئەو کۆمەڵگا تەقلیدیەن کە بەمجۆرە زۆربەیان بیردەکەنەوە ، ژمارەیەکی کەم لەوانەی ئێمە لەناو حکومەت یان لەناو ڕێکخراوەکان و دەزگاکان کاردەکەن کەوتوونەتە ژێر کاریگەری کەلتووری پێشکەوتووی گەلانی دیکە یان ڕۆژئاوا. لەوێ خوێندنیان تەواو کردووە، یان بەحوکمی شۆڕش لەگەڵ کۆمەڵێک کەلتوور تێکەڵاویان پەیداکردووە، ئەوانە مەگەر زەمینە خۆش بکەن و بوارێک بڕەخسێنن. بەڵام بە گشتی مرۆڤی کورد کەوتۆتە ژێر ئەو کەلتوورو نەریتە، خودی ژنەکە ناتوانێ ئەو نەریتە بشکێنێ، بەداخەوە ئەوە ڕەوشتی کۆمەڵگای ئێمەیە، ئەگەر لە ئامارێکدا ئاماژەی بۆ بکەین لە ۹۵٪ ئافرەتی کورد هەست بە ئێش و ئازاری خۆی ناکات و نایەوێ خۆی بگۆڕێت کەواتە ئێمە پێوستیمان بە پرۆسەیەک هەیە، پرۆسەیەکی فەرهەنگی، کە تۆ بتەوێ کار لە تاکی کورد بکەیت بۆ ئەوەی جۆری بیرکردنەوەی خۆی بگۆڕێت و مێشکی خۆی ئازاد بکات، ئەوەیەکەمیان، دووەمیشیان دەبێ دان بە خۆماندا بگرین، یەکەم لە ڕووی ئەوکۆڵەگە سیاسیەمان، کیانێکمان هەبێت، لەناو ئەوکیانە، تۆ دەتوانی زۆر خێراتر و فراوانتر کار بکەیت تا دوو کۆڵەگەکەی تر دابمەزرێنی، تا بتوانی یەکەم هەنگاو بهاوێژی لە بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا، چونکە ئێمە کۆمەڵێک هەنگاومان لە پێشە بەر لە دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنیدا، کە دەستوورو یاسایەکی نوێت دەوێ، کە دەستورێکی عەلمانی بێ، دیموکراسیانە مامەڵە بکات، لەژێر کاریگەری هەموو ڕێساو یاساکانی ئاییندا دەربازبێت، دەبێ تەفسیرێکی دیکە بۆ ئایین بکرێتەوە لەوەی کە پێشتر کراوە لە مێژوودا، وایان لێ کردووە ئێستا کە تەماشای سەرجەم ئاینییەکان دەکەین، بەو جۆرە تەفسیر کراوە کە ژن پلە دووە، کەچی لە کۆمەڵگای مەدەنیدا هەموو هاوڵاتیەک یەکسانن لە ئەرک و مافدا، بە هەموو ڕەنگ و توخمێکەوە، ئێمە ناڵێین ئایین وای گوتووە،

**لەکۆمەڵگای ئێمەدا پێویستیمان نەک هەر بەچاکسازی بەڵکو بەگۆڕینی یاساکانیش هەیە**

بەلام تەفسیراتی وای بۆ کراوە، پیاو زاڵە بەسەر ژن، لەو بابەتانەدا کە هێشتا ساغ نەکراوەتەوە، خەباتێکی نەکردووە بەرامبەر بەو دەستوورانەی لەسەر کۆمەڵێک بنەما هاتۆتە خوارێ کە تۆ بە پلە دوو دادەنێ، چۆن دەتوانی بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنی دابمەزرێنی.

*** تەماشا دەکەین هەمیشە کەناڵەکانی راگەیاندن و رۆژنامەگەریی حزبەکان بانگەشەی کۆمەڵگەی مەدەنی دەکەن، لە کاتێکدا ئەو رێکخراوانەی وەک ئافرەتان و ژنان سەربەخۆیی خۆیان نییە باشتر وایە بڵێم بە پاشکۆی حزبەکان ناسراون، ئایا ئەوە خۆی لەخۆیدا گرفتێک نییە لەبەردەم بەمەدەنی بوونی کۆمەڵگای کوردی دا؟**

– ئەوە واقیعی کۆمەڵگای ئێمەیە، چی دەکەی کە رێژەیەکی زۆر لە ئافرەتانی ئێمە، بگرە پیاوانیش، بەلام بەتایبەتی ئافرەتانمان، نە خوێندەوارن، نە خوێندەوار ناچارە پاشکۆی خوێندەوار بێ، ژمارەیەکی یەکجار زۆر لە ئافرەتی ئێمە لە رووی ئابوورییەوە، هەروەها لەرووی کۆمەلایەتی و فەرهەنگەوە، پشت بە پیاو دەبەستن، زۆربەی ئەو ئافرەتانەی لە رێکخراوەکانیش کاردەکەن، پاشکۆن، هەوڵدەدەن لە رێگەی ئامانج و پەیرو پرۆگرامە و چالاکیەکانی ئەو رێکخراوانە، خۆیان لە پاشکۆیەتی رزگار بکەن، کەواتە زۆر ئاساییە ئەو رێکخراوانە پاشکۆی حزب و دەسەلات بن، بەلام ئەوە بەو مانایە نییە ئەو پیاوانەی لەناو حزب و دەسەلاتدا کاردەکەن و پاڵپشتیان دەکەن نایەنەوێ ئەوانە پاشکۆبن، ئەوەش بەو مانایە نییە کە ئەو ژنانە دەیانەوێ بەردەوام پاشکۆ بن، بەڵکو هەوڵی بۆ دەدەن، لەوانەیە هەوڵەکانیان زۆر سادەو ساویلکانەش بێ، رەنگە زۆرجار هەڵەش بکەن لەو هەنگاوانەدا، رەنگە ئەو بوارەشیان بۆ برەخسێنرێ کە لەسەر پێی خۆیان بوەستن، بەلام ترس و شەرم بواریان نەدات، بەڵکو لایان بۆتە کارێکی ئاساییان کە هەردەم پاشکۆ بن.

*** چەندین کێشەی یاسای و کۆمەلایەتی و تەنانەت تەفسیراتی ئاینیش وەک لەمپەر وان لەبەردەم گەشەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی لە کوردستاندا، ئەوانە هەمیشە لەبەردەم پێشکەوتنی توخمی مێینە و خەباتی بێ وچانیان بۆ ئازادبوون لەو کوتانە، خۆیان قووت دەکەنەوە، بە بۆچوونی تۆ چ بکرێ باشە بۆ چارەسەرکردن و نەهێشتنی ئەو لەمپەرانە؟**

– بێگومان ئەوە راستیەکە، لە رووی فیکرییەوە دەبێ خۆمان ساغ بکەینەوە وەکو ئافرەت، چیمان دەوێ، لە دوایشدا ئایا رازین بەو دەستوورو رێساو یاسایانە وەکو ئافرەتی رۆشنبیرو خوێندەوار، وەکو پیاوی رۆشنبیری کوردیش ئەوە لێک دەدەنەوە، تەماشا دەکەین ئەو دەستوورو رێسایانە کە تا ئێستاش باون، کۆمەڵێک گرفتی تێدایە کە دەکرێ چارەسەری بکات، زۆربەی زۆری ئەو یاسایانەش بەپێی شەرع دانراون، دەبێ ئێمە خوێندنەوەیەکی نوێمان بۆ ئەوە هەبێ، کە ئایا دەکرێ ئێمە بەپێی ئەو تەفسیراتەی کە هەزارو چوار سەد ساڵ پێشتر بۆ کۆمەڵگا کراوە مامەڵە بکەین! ئایا بڕوامان بەوەی هەیە کە ئاین لە شوێن و کاتێکی دیارکراودا هاتووە، لەسەردەمێک هاتووە کە شۆرشێکی گەورە بووە و مرۆڤایەتی رۆشن کردۆتەوە لە کۆمەڵێک گرفتی زۆر گەورە رزگاری کردووە، ئەگەر ئێمە بڕوامان بەوە هەبێ، کەواتە زۆر ئاساییە لەژێر کاریگەری ئەو ئاینەش بێن ئێمە دەتوانین بۆ کرۆکی ئاین بگەرێینەوە، بەلام کۆمەڵێک گۆرانکاری لە دەوروبەریدا بکەین بۆ ئەو پێکهاتە کۆمەلایەتی و رێساو یاسایانەی کە تا ئێستا لەناوماندا هەیە، بەلام بەداخەوە لێرە ئاینیان بەو وشکییەوە هێشتۆتەوە کە ناهێڵێن هیچ گۆرانکارییەکی بەسەردا بێ، کە ئەوە ناکرێ، تۆ ناچاری بڵێی ئیتر بە گوێرەی ئەو دەستوورانە ناتوانی کاربکەی، بۆیە دەبێ لە دەستووردا، لە دانانی رێساو یاسادا کە ئێمە دایدەنێین، ئاین لە سیاسەت جودا بکرێتەوە، کە ئەوەی جودا کردەوە، ئەو حکومەت و دامەزراوانەی کە دایدەمەزرێنێ، لەژێر کاریگەری ئەقل و ئەزموونی گەلانی تر دایدەمەزرێنێ کە لەبەرژەوەندی کۆمەڵگاکەتدا بێ.

**دەبێ ئێمە بچینە ناو پرۆسەی بەمەدەنی بوونی کۆمەڵی مەدەنی نەک هەر تەنها دیاردەکان لەخۆمان بئاڵێنین**

بێگومان گۆڕانکاری لەو دەستوورو یاسایانەدا کاری جدی دەوێ، دەبێ چاوێک بە بڕیارو یاسای دادگاکاندا بگێڕینەوە و کۆمەڵێک بابەتی پەیوەنداری بە باری یاسایی ئافرەت، سەرلەنوێ تاوتوێ بکرێنەوە. لەو پێکهاتە کۆمەڵایەتییەی ئێمە تەنانەت خۆشەویستی حەرامە، هەموو ئەو بابەتە حەرامکراوەی مرۆڤ لە قاڵب دەدرێ، ئەو یاسایانەی دانراون، ڕێگرە لەبەردەم مرۆڤ بەرەو خۆشەویستی و ئازادی بڕوات، لە پێش هەمووشیانەوە لاوازترین ئەندامی ئەو کۆمەڵگایە کە ژنە. باجی ئەو یاساو ڕێسایانە دەدات، ناڵێم پیاویش بەدەرە لەو واقیعە، بەڵام ڕێژەی ئافرەت زیاترە.

لە کۆمەڵگای ئێمەدا، هەموو شتێک لە قاڵب بدرێت و یەک شێوە بۆ ژیان هەبێ. واتە خۆشەویستی و عەشق و ئازادی و بۆچوونی تایبەت بەدەر دەبێ بە پێی یاسا دانراوەکان، دەبێ بزانین ئەو یاسایانە لەژێر کاریگەری و بەپێی بەرژەوەندی سیستەمێکی تۆتاریالیزمی عەرەبی شۆڤینی دانراوە، ئێمە شتێکمان بۆ خۆیان دروست نەکردووە، ئەو هەوڵانەش کە کراون، هەندێک هەنگاوی باش نراوە بەتایبەتی هەموار کردنی هەندێ یاسا لەپەرلەمانی کوردستاندا ئەوانە بابەتی لاوەکین، بەڵام زۆر گەورەن، لەناو ئەو پێکهاتە، ئاڵۆزو نا سروشتی و نارێکیە، هەندێک کاری چاکسازی کراوە. بۆیە ئێمە پێویستیمان نەوەک هەر تەنها بەچاکسازی، بەڵکو گۆڕینی ئەو یاسایانە هەیە و سەرلەنوێ دارشتنەوەیان بە هزرێکی نوێ و بیروبڕوایەکی نوێ کە تەنها ئەقل پێوەربێ، کەچی لە بەرژەوەندی ئەو مرۆڤەیە کە ڕاودەنرێ، ئەو پیاوەی کە ژنی تەڵاق دەدات و چی ئەوەی کە بە زۆر بەتەڵاق دەدرێ، چۆن بتوانین ئەو کارەساتە لەسەر ژن لابدەین، کە لە هەر ساتێک بەتایبەتی لە کۆمەڵگای ڕۆژهەڵاتیدا دەکرێ ژنی بەسەردا بێ.

چۆن بتوانین ئازادییەک بدەینە ئەو ئافرەتەی کە دەستنیشانی چارەنوسی خۆی بە هەڵبژاردنی هاوسەرەکەی بکات، هەموو ئەوانە بەرای من گۆڕانکارییەکی ڕادیکالیانەی دەوێ.

*** لە ڕوانینێکی فەرهەنگیەوە، کۆمەڵگای مەدەنی لە کوردستاندا چۆن شی دەکەیتەوە؟**

- سەبارەت بە کۆمەڵگای مەدەنی، ئێمە لە کوردستان هەنگاوی زۆر بچوکمان ناوە، زیاتر بە ڕووخسارو شکڵەوە کۆمەڵگای مەدەنیمان وەرگرتووە، بۆ نموونە: قوتابخانەمان هەیە وەکو کۆمەڵگای مەدەنی، بەڵام ناوەڕۆکی سیستەمی قوتابخانەکەمان کەمێک جیاوازی هەبێ لەگەڵ سیستەمی کۆنی بەر لەمەدەنیەت، هەمان توندوتیژی و لە قاڵبدان و وشکی لەنێو سیستەم و پرۆگرام و خوێندندا ڕەنگە هەبێ، زانکۆمان هەیە بە هەمان واتا، دەبێ ئێمە ئەکتیڤی ڕێخکراوەکانمان بکەین، خەڵکی ئەکادیمی و ڕۆشنبیرو خویندەوار بێن و جارێکی تر شێوەی هێلکاری کۆمەڵگای مەدەنی دابڕێژنەوە. بۆ ئەوەی بنەماو کۆڵەگەکانی کۆمەڵگای مەدەنی دابمەزرێنن و سەرلەنوێ کاراتری بکەین و پێناسەی تازەی بدەینێ، نەوەک بێین تەنها دیاردەکان وەربگرین و شێوەو ڕووخساری مەدەنی لەخۆمانەوە بنالێنن، دەبێ ئێمە بچینە ناو پرۆسەی بەمەدەنی بوونی کۆمەڵگای کوردی.

*** بەرای تۆ تا چەند ئازادی هزرو دیموکراسیەت و پلورالیزم بۆ ڕەوشی ئەمڕۆی کوردستان بە پراکتیزە کردنی ئەم چەمکانە دەتوانن بنەماکانی کۆمەڵگای مەدەنی لەکوردستان بچەسپێنن؟**

- بێگومان، ئەوانی کە باست کردن هەمووی بنەماو دەرهاویشتەی کۆمەڵگای مەدەنین، ئێمە بەکۆمەڵگایەک دەڵێین کۆمەڵگای مەدەنی کە فرە حزبی تێدابێ و دەنگی جیاوازی تێدابێ، لەو چەند ساڵەی دواییدا کاری چاک لەو بوارەدا کراوە گۆڤاری ئازادمان هەیە، ڕۆژنامەی ئازادمان هەیە، خەڵکی بەرهەڵستکار قسە دەکات، ئەوانە هەمووی کاریگەری خۆی هەیە، بەڵام ئێمە هێشتا نەمانتوانیوە بڵێین هەنگاوی یەکەمان هاوێشتووە، ئەوانە هەمووی زەمینە ڕەخساندنن بۆ دامەزراندنی کۆمەڵگای مەدەنی، ڕەنگە بۆ یەکەم جار لە کۆمەڵگای

**سەبارەت بەجیهانگەرا بیەوە گەشبینیم بەرامبەر بەرەوشی کۆمەڵی مەدەنی لەکوردستاندا**

کوردیدا رۆژنامەیەک بە گژ دەسەلاتدا بچێتە دەر ڕەخنەی لێ بگرێت، بەلام تا چەند دەسەلات ئارەزوویەکی ئەو زەمینەیە وەربگرێتەوە ئێستا ئێمە هەوڵ دەدەین ئەو زەمینە فیکرییە دروست بکەین بۆ ئەوەی ببینە کۆمەلگایەکی مەدەنی، دەکرێ ئێمەش لە ١٠ ساڵی داهاتوودا ئومێدمان هەبێ بە دامەزراندنی کۆلەگەکانی کۆمەلگەی مەدەنی.

*** بۆچی لەماوەی ئەو ١٢ ساڵەی ڕابردوودا، ڕێکخراوەکانی ئافرەتان یان دامەزراوەکانی حزب و ناوەندەکانی حکومی و نەیانتوانیوە هەر نەبێ گەلاڵەی پرۆژەیەک یاخود هیچ نەبێ زەمینەیەک خۆش بکەن بۆ هەنگاونان بەرەو کۆمەلگەی مەدەنی لە کوردستان دا؟**

– سەرەڕای کەم و کوڕی کارەکانی ئەو ناوەندو ڕێکخراوانەکەبەڕای من زۆر سروشتییە، چونکە ئافرەتانی کورد لە بارودۆخێکی دواکەوتووی ناخۆشدا دەژین، هەر ئەو ژنانەی کۆمەلگای ئێمەن کە لەناو بازنەیەکی زۆر داخراو و نەبوونی ڕۆشنبیرییەک و هاندەرێک دەژین، بۆیەکە بوونی خودی ژن لەناو ئەو ڕێکخراوانە خۆی هەنگاوێکی گەورەیە، هەر هاتنە دەرەوەی جورئەتێکی گەورەیە و ڕاهاتنی چاوی مرۆڤی کوردە کە ژنیش دەتوانێ لە ڕێکخراوێکدا کار بکات و بەڕێوەی ببات، دەبینین ئێستا گۆڤارێک خاوەن ئیمتیاز و سەر نووسەرەکەی بە ڕاستەقینە ژنن، وە نووسەرەکانیشی ئافرەتن و بەتوانای ماددی و مەعنەوی ئافرەت بەڕێوەدەچێت، کە بە زیرەکی و کاری دیپلۆماسی خۆیان توانیویانە ئەو کارە بکەن، ئەگەرچی ئەو گۆڤارە ئەگەر لاوازیش بێ، بەلام ئەوە تەحەدایەکەو لە هەنگاوی یەکەم، لاوازە زۆر سروشتیە، ئێمە لە هەنگاوی یەکەمینی بۆ ڕێنسانس و چاکسازی و دامەزراندنی کیانێکی کوردی و بەرەوچوون بۆ دیموکراسی و ئازادی، وە خەونی ئەوەش دەبینێ کە کۆمەلگایەکی مەدەنی بێ، ئەوەی گرنگە بوونی تەحدایە لای ژنان، لە سلێمانی و هەولێر زۆر بە ڕوونی ئەو هەنگاوانە دەبینین، بوونی ئەو ڕێکخراوانەش زۆر سروشتییە، جۆراوجۆری لە بیروراکان و ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتی سروشتیە، لێرە کۆنفرانسێک دەبەسترێ لەولاش کۆنفرانسێک کاری چاکە، خۆم بەشداریم کرد لە کۆنفرانسی دەسەلات دانوە بە ئافرەت کە لە هەولێر بەسترا، ئامادەبووم. گرنگ ڕاسپاردەکانی کۆنفرانسی نەبوو، هەر بوونی ژمارەیەکی زۆری ترن لەوێ و بەشداریکردنی لە گفتوگۆ و لێکۆلینەوەکان، بە بەشداری چەند پیاوێکی ڕۆشنبیرو ئەکادیمی و گوێی گرتنیان لە ئازارەکانی ژن و ئامادەبوونی سێ ڕۆژی ژن بۆ خستنەرووی بۆچوون و هزرەکانیان، هەنگاوێکی زۆر گەورەیە، دەتوانم بلێم لەماوەی ٣ ڕۆژدا (٢٠٠) ژن بەشدارییان کرد، تارادەیەک لە قۆناغی ڕۆشنبیریدا کاری باشی بڕیوە، ئەوە خۆی ڕێنسانسێکی گەورەیە، تۆ (٢٠٠) ژنت پێشکەش کۆمەلگایەک کرد کە بڕوای بەخۆیەوە هەبێ، کە بیربکاتەوە، بوونی ئەو ئافرەتانە لە کۆنفرانسدا ئاگایی ئافرەتە بەکێشەکانی خۆی، تەحدایەکە بۆ مێردەکانیان و بۆ کۆمەلگاش، ئەو فەزا ئازادییەی لای ئافرەتان هەیە، کۆمەلگا پێ بەخشیوە، بەلام دیدی ئەو کۆمەلگایە بۆ خودی ئافرەت دەبێ بگۆردرێ، دیدی ئێمە بۆ ژیان و ڕۆلی ئافرەت چەندە گۆڕاوە، دەبێ کاری بۆ بکەین.

دیدی کۆمەلگا بۆ ژن ئەوەیە کە هەمیشە لە شوێنی چێشت لێنان بینویەتی، نەیبینیوە لە دامەزراوەکانی هاتوچۆو شوێنە گشتییەکان کاری تر ڕاپەڕێنێ، من هیچ کام لە دەسەلات و حکومەت و دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە بەرپرس نازانم لەو پاشەگەردانییەی کە هەیە، بەلکو کولتووری پاشکەوتووی ئێمەیە کە بەسەرماندا ڕەنگ دەداتەوە، خۆشمان پێویستە خالی لاواز نەدەینە دەست کەس، بۆ ئەوەی خەلکی تر متمانەمان پێ بکەن و هەنگاو بەرەو کۆمەلگای مەدەنی بنێین.

*** کاریگەری جیهانگەرایی بەسەر کۆمەلگای کوردستان و بەمەدەنی کردنیدا چییە؟**

– لەو ڕۆژەوەی جیهانگەرایی پەرەی سەندووە، بەهۆی تۆڕی ئینتەرنێتەوە و تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو، جیهان بەیەک دەگەن. دەیالۆگ دەکات و لە یەکتر نزیک دەبنەوە و سنورە جوگرافیاکان دەبەزێنێ، من لەو ڕۆژەوە ئومێدێکی گەورەم پەیدا بووە کە کورد ڕزگاری دەبێ، چونکە ئێمە بە حوکمی ئەو جوگرافیە داخراوە و نەبوونی هیچ فەزایەکی ئازاد بەسەر ولاتەکەماندا، هیچ کاتێک نەماندەتوانی لەگەڵ شارستانییەکانی تر تێکەل بین و بازرگانییەکی پێشکەوتوومان هەبێ، بەلکو هەمیشە لەسەر پشتی ئێمە ولاتانی تر پەرەیان بە بواری بازرگانی دیپلۆماسی و فەرهەنگی خۆیان داوە، وەک سوریا، ئێران، تورکیا، ئێمە ئەمڕۆکە دەتوانین بەو شوێنە جوگرافیەی هەمانە، ئەگەر جیهان لێی نەنابایە ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆژیایەی ئەمڕۆکە هەیە، ئێمە لەکاتی شەڕی نێوان ئەمەریکاو عێراق هەر ئەمساڵ توانیومان لە ڕێگەی زانکۆوە لە ڕێگای ڕۆشنبیرانەوە، کۆمەلێک

نامەو فاکس و ئیمێل بۆ کەسایەتی جیاجیا لە دەرەوەی وڵات بنێرین، کە بێگومان کاریگەری خۆی هەبووە، رۆژانە بە رێگەی ئینتەرنێتەوە کوردەکانی هەندەران لەگەڵ کوردەکانی ناوەوە قسە دەکەن و رادەگۆڕینەوە، بە پێشنیارو رەخنە توندەکانمان، بە هەرحاڵ بەهەمموو شێوازێک ئەمڕۆ دەتوانی ئومێدێکت هەبێ کە کوردستان لەسەردەمی جیهانگەراییدا رزگاری دەبێ.

بێگومان من لێرەدا وەک ئافرەتێک کە کاردەکەم لە رێکخراوێکی ئافرەتان یەکسەر پەیوەندی بە رێکخراوەکانی دیکەی جیهان دەکەم کە بزانم ئەوان چیان کردووە، پاپەندی چ رێککەوتنامەیەکن، یەکسەر ئەوە دەبێتە هاندەرو رێنیشاندەرێک بۆ من، بەڵام من جاران رێکخراوی یەکێتی ئافرەتانم هەبوو، بەوپەڕی هەژاری و نەدارییەوە کاریان دەکرد، بەڵام چاوەڕێی چی بکەم کە ئافرەتان لە ساڵانی چلەکان و پەنجاکاندا کە ناهیدە شێخ سەلام بەوپەڕی ماندووبوونی خۆی لە گۆڤاری هیوادا، وتارێکی بچووکی دەنووسی ئایا چوار رۆشنبیر دەیانتوانی بیخوێننەوە یان نە،، بەڵام من ئەوڕۆ یەک وتار کەرەنگە نیوەی بە پێزییەکەی ناهیدەی نەبێ، بەڵام دەیخەمە ناو ئینتەرنێتەوە و دونیایەک خەڵک دەیخوێنێتەوە، هەمان کات داوا دەکەم لە دەزگاکانی تری خێرخوازی و ژینگە پارێزی و منداڵپارێزی، ئەوانەی بەرگری لە مافەکانی ئافرەت دەکەن بەشێوەیەکی زۆر پێشکەوتوو کاریان بۆ دەکەن دژایەتی توندوتیژی دەکەن، دێم و پەیوەندیان لەگەڵدا دەکەم، لەرووی سیاسیەوە من دەتوانم قسە لەگەڵ سەرۆک بوش بکەم، ئەوە هەنگاوێکی زۆر گەورەیە، ئێستا ئێمە توانیومانە رای گشتی جیهان بەلای خۆمانەوە راکێشین، بۆ ئەوەی سوپای تورک نەیەت و ستەممان لێنەکات، بەڵام دەبینین هەر ئەو سوپایە بوو لەسەرەتای سەدەی بیستەم هات و زوڵمی لێ دەکردین و جینۆسایدی دەکردین، کێ ئاگای لێ بوو، هەمموو ئەو ئاگاداربوونە لەرێگای هاوکاری بازرگانی و دیپلۆماسییەوەیە کە کوردی پێ دەوڵەمەند دەکا، سنوورەکان دەبەزێنێ، کورد بەدونیا دەناسێنێ.

لەرووی دیکۆمنێتەوە ئەمساڵ سێ فیلمی گرنگ و بەڵگەنامەیی لەسەر مێژووی هاوچەرخی کورد دروست کرا، ئەوانە هەمووی لەکەناڵە ئاسمانیە کوردییەکان بڵاودەبنەوە و وەردەگێردرێنە سەر زمانانی دیکە، خەڵک لە رێگای سەتەلایتەوە کە ئەویش ئامێرێکە بۆ بەجیهانبوون، لە ئەمەریکاوە دانیشتووە ئاگاداری رەوشی سیاسی و فەرهەنگی و ئابووری و کۆمەڵایەتی تۆ دەبێ، ئەوانە ئومێدی زۆرن، بۆ کورد دەبا لە رێگەی مێژووەوە چاوەڕێی جیهانگەراییبباین تا لەو سنوورە جوگرافیە زیاتر بناسرێین.

*** تۆ خۆت بەگەشبین دەبینی بەرامبەر بەو هەموو گۆڕانکارییەی لەجیهاندا هەیە سەبارەت بەرەوشی و دۆزی کوردو بەمەدەنی بوونی کۆمەڵی کوردیدا؟**

- بەڵێ گەشبینم، چونکە بەڕاستی بە پێچەوانەی بۆچوونی رۆشنبیرانی کوردەوە کە زۆر جار نووسینەکانیمان دەخوێنمەوە زۆر رەشبینن، چونکە لەناو هەندێکیان تەنها لایەنە سلبیەکانی بزووتنەوەی سیاسی کوردی و دەسەڵاتی کوردی دەبینن، بەڵام پێویستە بە چاوێکی تر سەیری رەوشی کوردی بکەین، لەناو هەموو ئەو بازنە داخراوەی خۆمان و رابردووە تاڵەی خۆمان بێینەدەرێ و مێشکمان پاک بکەینەوەو ئازادی بکەین و کێشەی کورد بەراورد بکەین لەگەڵ ساڵانی پێشوو کە تا چەند پێشکەوتووە، من دەڵێم زۆر پێشکەوتووەو ئەرکمان زیاتر بووە، من وەک تاکێک ئەرکەکانی خۆم دەبێ دابرێژم، چونکە تازە ئێمە لەسەرەتاین بڵێین بوونمان هەیە، ئێستا دەبێ بیرکەینەوە چۆن ئەو بوونە راگرین و پێشخەین و ناوەرۆکێکی باشی پێ بدەین، بەو رەشبینییە بەداخەوە ژمارەیەک لە رۆشنبیرو رۆژنامەنووسانی ئێمە دانیشتوون و لە رەوشی کورد دەکۆڵنەوە، ناکرێ بەتەنها لایەنی سلبی بخەینە روو، بەڵکو دەبێ بەوپەڕی گەشبینی و بڕوا بەخۆبوونەوە مامەڵە بکەین، چونکە جیهانگەرایی لەبەرژەوەندی ئێمەیە، بۆیە دەتوانین سوود لەو تێکەڵیە بینین وێڕای کرانەوەی سنورەکان. سەرنجی رێکخراوەکانی بیانیش بۆلای خۆمان راکێشین هەریەک لە روانگەی خۆیەوە، رۆژنامەنووس لەرێگەی سەندیکاکەیەوە، مامۆستایەک لەرێگای زانکۆیەوە، ئافرەتێک لە رێگەی رێکخراوەکەیەوە، دەبێ خۆی لەناو لیستی رێکخراوەکاندا بدۆزێتەوە، دەبێ ئەوانە بەهێز بکرێن و رکابەرییەکی شەرعی لەنێوانیاندا هەبێ، بۆیە بەوپەڕی گەشبینەوە تەماشای رەوشەکە دەکەم لەگەڵ دیتنی هەموو کەم و کوڕی و لایەنە ناخۆشەکانی کە لەنێو کەلتوورماندا هەیە، دەبێ ئەو واقیعە چاک بکەینەوە.

- ناز ناز خان، سوپاس.
- سوپاس بۆ گۆڤاری کاروان.

**ئا/گۆڤاری کاروان**

# چاوپێکەوتنێکی بڵاونەکراوە لەگەڵ بۆرخێس دا

و: تاهیر عوسمان




**خۆرخە بۆرخێس کە ساڵی ١٩٨٦- لە تەمەنی (٨٧) ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، نووسەرێکی خودان ڕۆشنبیرییەکی سەیرو فراوان بوو، بەڕادەیەک هەر دیاردەیەک بوو بۆ خۆی.**

**نووسەرێکی نابینا، کە هەرگیز ڕۆمانی بەتەنیا نەدەنووسی. بەڵکو چیرۆک و ڕۆمانی کورت واتە نۆڤلێت کاروپیشەی ئەم بلیمەتە بوو، ئەو ژانرەی کە بۆرخیس تیایدا گەیشتبووە لوتکە، کەس نەبوو شان لە شانی بدا. هەر بەم شێوازە گرنگترین ئەفسانە ئەدەبییە هاوچەرخەکانی نووسی لەوانە کتێبخانەی بابیلی- کەتیایدا بەشێوازێکی فانتازیا تامێزو چەندین بەسەرهاتی هەناسەبڕو گەشتی خەیاڵی دەخاتە بەر دیدی خوێنەران و سەرجەم بوارەکانی فیکری مرۆڤایەتی تەی دەکات. سەرباری نابینایی بۆرخێس هەمیشە لە گەشت و گەڕاندا بووە. نووسەرو ڕەخنەگری ئەسپانی ڕامۆین تشاو ساڵی١٩٧٨- بەدیداری شاد دەبێ، ئەم دیدارەی خوارەوەی لەگەڵدا سازدەکات کە لە ژمارەی ئابی ساڵی ٢٠٠١-ی لۆمۆند دیپلۆماتیک-دا بڵاوکراوەتەوە......**

**+ ئەو کاتەت باش بەڕێز بۆرخێس سوپاست دەکەم کە پێشوازیت لێکردم.**

- هەر تەنیا بە- بۆرخێس- بانگم بکە، تەمەنم ئێستا لە دەوروبەری هەشتا ساڵیە، سەرجەم هاوڕێکانم ون بوون، بیریان دەکەم، بیر لە تارماییەکان دەکەمەوە، ئێمە گشتمان تارماییین، وانییە؟، ساڵی ١٩٥٥ بینابیم لە دەست داوە توانای خوێندنەوەی ڕۆژنامەکانم نەما، کەمجاریش هەلی ئاخفتنم لەگەڵ خەڵکی دەست دەکەوێ، کە چاو پێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیش دەکەم، من خۆم سوپاسی ڕۆژنامەنووسەکە دەکەم، بەڵکو لەوە ئاگاداری دەکەمەوە کەوا من زیاد لە پێویست ڕاشکاوم، تەنانەت هەندێک جار بێزارکەریشم، لەوانەشە ئەمە کاردانەوەی ڕێزگرتن و شەرم کردنم بێت. هەرگیز لەسەر وشەکانی خۆم ناوەستم، کەشتێک دەڵێم، یەکسەر لێی دەکەومە گومانەوە، بۆیە پێشنیار دەکەم بەر لەوەی چاوپێکەوتنەکە سازبکەین چەند دەستەواژەیەکی گوماناوی دابنێین وەکو (لەوانەیە)، (دوورنییە)، (واپێدەچێ)، (مەحاڵ نییە) وەخوێنەر دەتوانێ لەو شوێنانەیان دابنێ کە بە پێویستیان دەزانێ.

**+ ئایا دەتوانی ڕوویەک بەدەنگ ببەخشی؟**

- نەخێر، وەپێویستم پێی نییە، بیریارێکی ئینگلیزی دەڵێ- دەکرێ بەدەنگ گوزارشت لە هەموو هزرو هەست و سۆزێک بکرێ. پێم خۆش بوو چاوەکانم لەدەست نەدایە بەڵام دەنگ تایبەتمەندیەکی وای هەیە، بینینی تۆ هیچ گرنگیەکی نەمێنێ، زۆر ئەستەمە لێکچوونی چەند کەسێک ڕاڤەبکرێ. بەڵام پەیوەندی نێوان شتەکان زیاتر هەڵدەگرێ، چونکە شتەکان نادوێن و ناچارم دەستیان بدەمێ، دەبوو ببمە پەیکەرتاش، وەپێشم باشتر بوو چاوەکانم ساخ بوونایە، بۆیە دەبێ ڕێگە چارەیەک

بدۆزمەوە، ئەم کوێریە یارمەتیم بدا. وانییە، هەروەها نامەوێ خەڵک بەمنەتەوە بەزەییان پێم بێتەوە. بەرناردشۆ دەڵێ بەزەیی لەپایەی بەزەیی پێکەرو بەزەیی پێکراو کەم دەکاتەوە.

**+ ئەم بۆچوونە ئایا لە کەسایەتی تایبەتی خۆتەوە هەڵقوڵاوە، یاخود لە باپیرانتەوە بۆت جێماوە، چونکە بەڕێزتان ئەوەی بنەماڵەیەکی سەربازی زۆر نازان؟**

– باپیرە گەورەم ساڵی ١٨٧٤ لە جەنگێکدا لەگەڵ هیندیەکان گیانی لە دەست داوە، سەرجەم جەنگاوەرانی هێزەکەی دەکوژرێن و بەتەنیا لەگەڵ ئەسپەکەیدا دەمێنێتەوە بۆیە بەوپەڕی لەخۆ بوردوییەوە ڕوو لە دوژمن دەکات، ئەمەش پێویست بەوە ناکات ئاماژە بەنازایەتیەکەی بکەین، ئەو کەسەی سەرجەم ژیانی لەسەنگەرێکەوە بۆ سەنگەرێکیتر بردبێتە سەرو ستراتیژیەتی سەربازی خوێندبێ دیارە بێگومان پێویستی بەنازایەتی نییە. هەروەها بیرۆکەی دەستەلات و خەیاڵی ئەوەی هەموو کەس لێت بترسێ و مل کەچت بن سیمای هزرە ناکامڵەکانە. پێم وایە ستەمکاران خەڵکێکی کاڵفام و پێ نەگەییون!

**+ سەیرە، سەرباری نەژادە سەربازیە توندو تیژیەکەت، ئێوە پیاوێکی ئاشتی خوازن و ڕقتان لە توندو تیژی دەبێتەوە، ئایا هەر لەبەر ئەو هۆیەش نووسینەکانت تژی تاوان و ململانێ و ستەمکارین؟**

– هەرگیز بیرم لەوە نەکردۆتەوە، دووریش نیە بەو جۆرەبم، و ببمە بیرۆکەی باپیرانم لەوانەشە ئەوان بیانەوێ لەڕێگای منەوە ژیانی شەڕانگێزی و توندوتیژی سەردەمی خۆیان بەتەواوی بسڕنەوە.

**+ کەی بیرت لەوە کردەوە ببیتە نووسەر؟**

– هەر لە سەرەتای بوونمەوە، لە تەمەنی سێ، چوار ساڵان بووم کە دەستم بەنووسین کرد **باوکم بەراشکاوی بەهای شیعری بۆ ڕوون کردبوومەوە کە چۆن وشەکان هەر تەنها ئامرازی گەیاندن نین. بەڵکو دەنگی مۆسیقی پڕ لە شیعرن.** کە تەمەنم گەیشتە (٢٤) ساڵ باوکم ئامۆژگاری دەکردم لە خوێندنەوە بەردەوام بم و توخنی نووسین نەکەوم، تا ئەوکاتەی بەتەواوی پێویستیم پێی دەبێ. وەبۆی دوویات دەکردمەوە لەبلاوکردنەوەدا پەلە نەکەم. خۆیشی ڕۆمانێکی نووسی بەڵام هەرگیز چاپ نەکرا. بەڵکو من بوومە ئەو نووسەرە کە خۆی ئارەزووی دەکرد. بەڵام نەیتوانی بەدەستی بێنێ.

هەموو ئامۆژگاریەکانیم جێ بەجێ کرد. زۆر بەخەفەتەوە دەڵێم کوێریم لە ساڵی (١٩٥٥)ەوە لە خوێندنەوەی کردم. هەر لەو ساڵەدا دوو ڕووداوی گرینگ لە ژیانمدا ڕوویاندا.

بەبەڕێوەبەری نامەخانەی نیشتمانی لە بوینس ئایرس دامەزرام و دووەمیان هەر لەم ساڵەدا چاوەکانم لە دەست دا. کارەساتەکە ئەوەبوو (٢٠٠) هەزار کتێبم لەبەردەستدا بوو. بەڵام نەمتدەتوانی تاکە یەک پیت بخوێنمەوە.

**+ پێم وایە ئاواتی باوکت هێنابێتە دی. بەڵام بەتەواوەتی نا، هەروەک لەپێشەکی (چیرۆکەکان)دا ئاماژەت پێکردووە باوکت هەڵەبووە. پاشان هیچ کەڵکێک لەوەدانیە (٥٠٠) لاپەڕە لە (٢٠) یا(٣٠) لاپەڕەدا کورت بکەیتەوە.**

– لە ڕاستیدا ڕۆمانم زۆر نەخوێندۆتەوە وەکو هەموو خەڵک (کۆنراد، دیکنز، ملڤیل، دەستۆیڤسکی، دۆن کیشۆت و...)م خوێندۆتەوە. بۆیە هیچ ڕەوا نیە ڕۆمان بنووسم کەمن خۆم ڕۆمان نەخوێنمەوە.

**+ ژیان زۆر ڕووداوی سەیری تیایە، لەوانە خەڵاتی (سیرڤانتس) بەتۆ بەخشراوە، هەرچەندە تۆ زمانەکەی ئەو واتە زمانی ئەسپانیت خۆش ناوێ؟**

– من ئەم گووتوە هەرگیز خۆشم ناوێ. دەتوانم بڵێم زمانی فەرەنسی زمانێکی زۆر جوانە، بەڵام چەند فەرمانێک لە زمانی ئەسپانیدا هەیە کە لە هیچ زمانێکدا هاوتایان نیە، ئەسپانیەکان زۆرشتیان لە زمانەکەیاندا هەیە کە شانازی پێوە بکەن، بەڵام نازانن چۆن پێی بناخڤن واتە بەجۆرێک دەیڵێنەوە هەروەک مەسەلەکە پابەند بێ بەزمانێکی بیانیەوە.

**+ کەواتە ئەو ڕایە لە کوێ هاتوە کە ئێوە بەزمانی ئەسپانی پەست دەبن؟**

– تکایە بۆچوونەکانم بەم شێوەیە وەربگیرێت، کە دەینووسم، ئەوەک هەروەک دەتوانم بیڵێم ناچارم دەکەن دەربیبڕم، چونکە من لەبەر شەرم کردن ناتوانم ڕووبەڕووی بەرامبەرەکەم بوەستم. لەبەرامبەریشدا کشتێک دەنووسین ئەوە تا هەتایە ڕاستی دەکەینەوە.

لەڕاستیشدا ئەو ڕایەی ئاماژەیان پێکرد لەو چاوپێکەوتنەدا قۆستراوەتەوە کە لەگەڵ (پاپلۆنیرۆدا) سازم کردبوو، کە تاکە جار بوو چاومان بەیەک بکەوێ. کەتیایدا لەماوەی (٢) کاتژمێری تەواو بووینە مایەی سەرسوڕمانی یەکتری، پێی گوتم ناتوانین بە ئەسپانیایی بنووسین وەڵامم دایەوەو گوتم ڕاست دەفەرمووی، هەر بۆیە هیچ کەس بەو زمانە نانووسێ بۆیە پێشنیاری کردو

گوتی کەواتە بۆ بەئینگلیزی و فەرەنسی نەنووسین، بەڵام ئێمە لەوە دڵنیانین هیچ چێژێک لە نووسین بەزمانەکانی تر وەرگــرین، هەر لەبەر ئەوە بڕیارمـــاندا لە نووسین بەزمانی ئەسپانی بەردەوام بین.

**+ گـفت و گـۆیەکی خـۆش بووە لە نێـوان دووکـەسی ناکۆکدا!**

- نیـرۆدا پێشـتـر شیـعـرێکی لەدژی سـتـەمکارانی ئەمەریکای لاتین نووسیبوو، کەتیایدا ئاماژەشی بەوڵاتە یەککگرتوەکان کردبوو، بەڵام هیچ شتێکی لەسەر- بیرۆن- نەدرکاند بوو لە ڕاستیدا- نیرۆدا- بیری لەوە دەکردەوە کـــارێک لە ئەرژەنتین ئەنجـام بدات بەڵام نەیتـــوانی حکومەتی وڵاتەکەم بێزار بکات. لەبەرئەوەی خێزانەکەی ئەرژەنتـینی بوو، دەیزانی کـامـە شت نابێ بوترێ، کـە چوومە شیلی خۆی شاردەوە تا نەیبینم، ئەو کـارەشیم بەدڵ بوو، چونکە خەڵک حەزیان دەکرد هەمیشە ناکۆک بین، ئەو شـاعـیـرێکی کـۆمـۆنیـسـتی شـیـلی، منیش شـاعـیـرێکی ئەرژەنـتـینی پارێزگـار، کە هەمـیـشـە دژی کۆمۆنیستەکان بووم.

**+ چیت لە کۆمۆنیستەکان دەوێ؟**

- لەگەڵ ئەو تیۆرەدا تەبانیم، بەڵام ئەوەی دەیڵێم ڕای من نیە سەبارەت بەشیعرەکانی نیرۆدا.

چونکە ساڵی ١٩٦٧ کە خەڵاتی نۆبیل درایە (میگیل ئەنخیل ئەستۆریاس) یەکسەر گوتم نیرۆدا زیاتر شایەنی ئەو خەڵاتە بوو. لەبەر ئەوە هیچ ڕەوانیە لە کڵاورۆژنەی بیروڕا سیاسیەکەی حوکم بەسەر نووسەرێکدا دەربکەی. ڕاسـتـە ردیاردکلینگ- داکـۆکی لە ئیـمـپـراتۆریەتی بەریتـــانی دەکـــرد، بەڵام دەبێ دان بەوە دابنرێ کـــە نووسەرێکی مەزن بووە.

**+ بەر لەوەی چاوەکانت لە دەست بدەی رەخنەگرێکی سینەمایی بووی، ئایا خەم بۆ ئەو رۆژانە ناخۆی؟**

- زۆر نا چونکە سینەما وەکو جاران بێدەنگ نیە.

**+ ئەمەیان باشتر نییە؟**

- بێگومـان، دوای ئەوەش سـینەمـای ڕەنگاورەنگ دەرکەوت، کە کارەساتێکی دیکە بوو.

**+ ئەگـەر کـەڕبوویتـایە، هیچ چێـژێکت لە مـۆسـیـقـا وەرنەدەگرت، وانییە؟**

- حەزم دەکرد ببومایەتە مۆسیقاژەن، من تەنها پیاوی ئەدەبم، لەوانەشە مـەسـەلەکە بۆ کـەرێی مـۆسـیـقـیم بگەڕێتەوە، چونکە هیچ لە مۆسیقا نازانم تەنها گیتار نەبێ، بەگشتیش ئەرژەنتینیەکان هیچ لەگیتـار نازانن تەنهـا ئەوە نەبێ کـە ئامـــادەن چەندین کـــاتژمـێـــر بەبەردەوامی گوێی لێبگرن.

*** دەڵێن بایەخ بەزانستی نەژاد ناسیش دەدەی؟**

- ئەمـە لەلای من شـێـوازێکی ئەدەبیـە، ئینگلیـزەکـان دەڵێن (ئەو منداڵە زانایە کە باوکی بناسێ).

دەکـرێ وشـەی (زانا)یەکی تریشـی بخـەینە پاڵ ئەگـەر بڵێین ئەوەی باپیرە گەورەکانی خۆشی بناسێ.

*** باسی باوکت بۆ کردین ئەی لەبارەی دایکتەوە؟**

- دایکم ئینگلیـز بوو، وەبەزمـانی ئینگلیـزی لەگـەڵم دەدوا، لەگــەڵ خــۆیدا بردمی بۆ ســویســرا، لەگــەڵ مـامـۆسـتـاکەم بەفـەرەنسی دەدوام، لە مـامـۆسـتـایەکی گـەورەتر فـێـرە لاتینی بووم، لەگـەڵ باوکم بە ئەسـپـانی دەئاخـڤـتم و پێم دەنووسی. شـتـێکی سـەرسـوڕهێنەرە، سەدان ملیۆن وشەو دەستەواژە، تەنانەت وای بۆ دەچووم هەر یەکێکمان زمانێکی تایبەتی خۆی هەبێ.

*** ئایا تۆ وەکو باوکت دەنووسی، یا ئەو لاسایی تۆی دەکردەوە؟**

- شـێـوازێکی تایبـەتی خـۆم هەبوو، وەکـو ئەویش دەمنووسی، ئێمە لە نووسیندا لاسایی مـامۆسـتـاکـانمان دەکـەینەوە، وابزانم نووسـەر دوای چەندین سـاڵ شـێوازی خـۆی دەدۆزێتــەوە. **کـە منداڵ بووم لاسـایی باوکـم دەکردەوە، بەدوای وشە کۆنە دەگمەنەکاندا دەگەڕام، بەڵام ئێستا خۆم لە وشە خواستراوەکان، یازاراوە نارەسەنەکان و هەموو ئەو شتـانەدا دوور دەگرم کەناچارم دەکەن پەنا بۆ- فـەرهەنگۆک- ببـەم.** بەکـورتی دەمــەوێ بگـەمــە بناغەیەکی هاوبەشی زمان.

*** ئایا بهـرت لەوە کـردۆتەوە کـەوا تۆ ئێــســتــا (بۆرخیس)ی و کۆمەڵێک- بەرهەم-ت هەیە؟**

- بەم پیـاهەڵگوتنە شـەرم دامـدەگـرێ، تکا دەکـەم وشـەی- بەرهەم-ەکـان بخـەیتـە نێـوان دوو کـەوانەوە، لەسەرەتادا بیرم لەوە کردەوە هیچ شتێک بڵاونەکەمەوە، پاشـان بوومـە فـاڵ گـرەوەیەکی ئەرژەنتـینی، ئەگـەرچی ئێـسـتـا وازم لێ هێناوە، مـیـدالیـای شـەرەفی فـەرەنسـیم پێـدرا، چەندین بڕوانامــەی دکـــتـۆرای شـــانازیم لە زانکۆکـانی جیـهـان وەرگرتووە، بەڵام ئەوەی- بۆرخیس- مـەبەسـتـیـەتی هیـچی تری پێ نەدرێ، چونکە بۆ ئەوە دەنووسێ تابنووسێ، بەواتایەکی دیکە لەپێناوی ئەوەی کە پشکنیـویەتی و لەنێـوان هێڵـەکاندا شاردویەتیـەوە. لێـرەشـدا خـەڵاتی- سـێـرڤـانتس و ئەدەبی فـەرەنسـی و ئینگلیزی پێ دەبەخشرێ. چونکە ئەسپـانیەکان بەگشـتی حەز بەخۆ بەگـەورە زانین دەکەن. بەڕای من کـەمێک لە نووسەران گەیشتوونەتە پلەی کەماڵ، کاتێک نووسەرێک

تاکە یەک وشەی زیاد نانووسێ، بەبێ لە خۆبایی بوون دەمەوێ لەو نووسەرە فێربم. واتە ئاسایی و تەمومژاوی بم لەهەمان کاتدا، زۆر بابەت هەن ئەوەندە هەڵدەگرن بکرێنە ڕۆمان لەوانە پەلاماری ناپلیۆن بۆ سەر ڕووسیا- بەڵام من هەرگیز بیر لە نووسینی ڕۆمان ناکەمەوە.

*** بەتایبەتیش کە تۆ بەرهەمەکانی تۆلستۆی ناخوێنیتەوە!!**

- دەستم بەخوێندنەوەی (شەڕو ئاشتی) کردبوو، بەڵام کە بینیم کەسایەتیەکانی جێگیرنین، وازم هێنا. **(جۆرج مۆر) دەڵێ تۆلستۆی ئەوەندە بەووردی باسی کەسایەتیەکانی دەکات. تادەگاتە کەسایەتی چوارەم، خەسڵەتەکانی کەسایەتی یەکەمی بیر دەچێتەوە**، وەلەبەر ئەوەی چارەگە سەدەیەک بینایم نەماوە، کەواتە چارەگە سەدەیەک ناخوێنمەوە، حەز بە دووبارە خوێندنەوەی شتێک دەکەم، سەبارەت بەنووسینیش من تیایدا بەختەوەرم، چونکە تەمەنم لە (٨٠) ساڵیدایەو چەندین پرۆژەم لەبەر دەست دایە.

*** ئەی ئێستاش بایەخ بەناکۆکیە لاهوتیەکان دەدەی؟**

- لاهوت ئێستا بەتەواوی پشت گوێ خراوە، خەڵک ئێستا تەنها باسی سیاسەت و وەرزش دەکەن، دوو بابەتی بێ کەڵک کە هەستی نەتەوەیی دەورووژێنێ، بەر لە ماوەیەک حکومەتی ئەرژەنتینی خولێکی تۆپی پێی سازکرد، شتێکی سەیرو چاوەڕوان نەکراو، باوەڕ دەکەی سەرۆکی حکومەت لە شوێنەکەی خۆی هەڵدەپەڕێ و پڕ بەدەنگی هاوار دەکا (گۆڵ)، پاشان خەڵکان و ڕۆژنامەکان دەنووسن و دەڵێن (بەسەر ئەو وڵاتەدا زاڵ بووین!)، ئەرێ دەشێ سەرکەوتنی (١١) لاوی ئەرژەنتینی بەدەرپێ و فانیلەوە، بەسەر (١١) لاوی وڵاتێکی دیکە بە (دۆڕانی) وڵاتێکی تر، لە قەڵەم بدەین!

*** لەگەڵ ئەو هەموو شتانەی کە دەیان کەی، ئایا بیرۆکەیەکت لەبارەی گەردوونەوە لەلا دروست نەبووە؟**

- من مەسەلەی سنوورو نەتەوەکان بەشتێکی بێ هودە دەزانم، لە تەمەنی (٩) ساڵیدا بووم لەگەڵ باوکم چوومە (مۆنتیگۆ)، باوکم پێی گووتم باش سەیری (ئاڵاکان و گومرگ و سەربازەکان و پیاوانی ئایینی بکە) چونکە ئەمانە هەر هەموویان لەناو دەچن تۆ بۆ منداڵەکانتی دەگێڕیتەوە. بەڵام بەپێچەوانەوە ڕوویدا چونکە ئاڵاکان و سنوورەکان لەزیادبووندان. بەچی بزانین باوکم (ڕووەکی) بوو ئاماژەی بۆ دووکانی گۆشت فرۆشێک کردو گوتی: دەتوانم بۆ منداڵەکانم بگێڕمەوەو بڵێم (جاران دووکان هەبوو گۆشتی تیا دەفرۆشرا!). لەوانەیە باوکم ڕاست بووبێ، یاپێشبینیەکەی زۆر زوو درکاندبێ و ئەو خەونانە لەسەدەکانی داهاتوودا بێنەدی!!

*** زۆر درەنگە!**

- منیش زۆر بەساڵاچووم، وانییە!

*** مەبەستم ئەوە نەبوو!**

- من بەشەوقەوە چاوەڕوانی مردن دەکەم، مردن لەگەڵ خێزانەکەی ئێمەدا زۆر بەخشندە بووە. دایکم لە تەمەنی (٩٩) ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، هەرگیز لە مردن ناترسم بەڵام لە ئاکامەکانی دەسڵەمێمەوە، بەمردنی من بنەماڵەیەک کۆتایی دێ، ئەمەش بۆ شەیدایەکی زانستی- نەژاد ناسی- زۆر ناخۆشە!

*** زۆر نیگەران نابی چونکە هیچ میراتێکت جێ نەهێشتوە!**

- ئەوە خۆت دڵم دەدەیتەوە، بەمەش دەتوانم زۆر بەهێمنی چاوەڕوانی مردن بکەم.

*** ئایا بۆرخێس لە مردن دەترسێ؟**

- نەخێر، من چەشنی باوکم دەمەوێ تەنها یەک جار بمرم، مردنێک بەجەستەو گیانەوە، زۆر لەوانەی دەیانناسم تۆقیان لە مردن چووە، هەندێکیان حەز دەکەن بچنە بەهەشتەوە. هەندێکی دیکەیان لە دۆزەخ دەترسن. بەڵام خۆم نازانم، پێم وایە شایانی پاداشت و سزا نەبم. بۆیە زۆر پێویستە لە چاوەڕوانیدا بمێنمەوە.

*** لە دواییدا دەمەوێ ئەدرەسی کۆمەڵەکەی خۆمانت پێ بدەم (کۆمەڵەی مافی مردن بەسەر بەرزی).**

- خۆم بکوژم، هەروەک (لۆگرنیس) دەڵێ (هەروەک چۆن خۆم گەورەی ژیانی خۆمم بەهەمان شێوە دەمەوێ ببمە گەورەی مردنم)! بۆیە خۆی کوشت، زۆرجار بیرم لەم مەسەلەیە کردۆتەوە بەتایبەتی ئەو دەمانەی کە زیاد لە پێویست بەدبەخت بووم. حەزم دەکرد بزانم دوای مردن چیم بەسەر دێ. دوای ئەوەی زانیم پاش ئارام نەگرتن چیمان لێ دەقەومێ.ئینجا لە دڵی خۆمدا گوتم (تەنها خۆکوشتن) چارەسەری گشت ئەوانە دەکا.

ئێستاش کە پیرو پەک کەوتەم دەڵێم کار لەکار ترازاوەو کاتەکە زۆر بەسەرچووە. دوورنیە مردن خۆی مەڵاس دابێ و بەم نزیکانە بمانگاتێ. هەرچەندە هێشتا کۆمەڵێک پرۆژەم لەبەردەست دایە کە (٢)تا(٣) ساڵ دەخایەنن!!

*** سەرچاوە: الموقف الثقافي ژمارە (٣٨) ساڵی(٢٠٠٢) لاپەڕە (١٠٦-١٠٩) ایمان احمد کردویە بەعەرەبی.**

## شاعیرو ڕۆماننووسی مەکدۆنی: لوان ستارۆڤا

# من داهێنانم بەنیشتمان بۆ خۆم هەڵبژاردووە

ئەزموونی شیعرو ڕۆماننووسی لوان ستارۆڤا بە بەردەبازێکی پێویست بۆ خوێندنەوەی ڕێڕەوەکانی وێژەی نوێی مەکدۆنیا دادەنرێت، لەکەش و هەوای نووسینەکانیدا شوێن پەنجەی ڕەگەزی ئەلبانی و یادەوەری دەوڵەتێک پێی دەگوترا یۆگۆسلاڤیاو دەنگی وڵاتێکی نوێ یەک دەگرنەوە لەشتە سەیرو سەمەرەکانی ئەوەیە کە ناوی لە ئینجیلدا هاتووە. لوان ستارۆڤا ساڵی ١٩٤١ لەئەلبانیا لەدایک بووە، لەگەڵ خێزانەکەیدا، کە موسڵمان بوون، چوونەتە مەکدۆنیاو لەساڵی (١٩٤٥)وە لەوێ دەژیت. وەک باڵیۆزی یۆگۆسلاڤیا لای ڕێکخراوی ڕزگاریخوازی فەلەستین کاری کردووە لەتونس، پاشان بووەتە باڵیۆزی یۆگۆسلاڤیا لە(پاریس)ی پایتەختی فەرەنسا. ئێستا مامۆستای وێژەی فەرەنسییە لەزانکۆی سکۆپی لەمەکدۆنیا. لوان ستارۆڤا بە ڕۆمانێکی سێ بەرگی ناوی دەرکردووە کە کارەساتی گەلانی ناوچەی بەلکان دەگێڕێتەوە، گۆڕراوەتە سەر زۆربەی زمانانی جیهان، تەنیا کوردی خۆمان نەبێت، کەبریتییە لە«کتێبەکانی باوکم»١٩٩٢و«سەردەمی بزن» ١٩٩٣و«مۆزەخانەی خوانەناسی»١٩٩٧، چیرۆک و ڕۆمانی دیکەیشی هەیە لەوانەش «سنووری بەهار»١٩٧٢و«پاساری ئەفسانەیی» ١٩٩١و«کلیلی بەلکانی» ١٩٩٤و«خاکی لەرەگەوە دەرهاوێژراو»١٩٩٨.

وێڕای ئامادەیی لوان ستارۆڤا لەبواری نووسینی ڕۆمان و چیرۆکدا، توانیویەتی کەش و هەوای تایبەت بە خۆی لەبواری شیعردا دروست بکات، لەم ڕووەوە کۆشیعری (چامەکانی قرتاج)ی لەوڵاتی (کەنەدا)بەزمانی فەرەنسی کەوتە بەردەستی خوێنەران پاش ئەوەی بە هەردوو زمانی مەکدۆنی و ئەلبانی لەساڵی ١٩٩٢دا کەوتە بازاڕەوە. ئەم کۆشیعرە وەرگێڕراوەی ستارۆڤا، شاعیری ناودار(ئەدۆنیس) پێشەکییەکی قووڵی بۆ نووسیوەو باسی یادەوەرییەکانی لەگەڵ فەلەستینییەکاندا تێدا کردووە.

ئەم هەڤپەیڤینە لەگەڵ لوان ستارۆڤادا دەخەینە بەرچاوی خوێنەران:

*** مەکدۆنیا وڵاتێکی نوێیە ئەگەرچی ناوی لەئینجیل دا هاتووە، ئەم کارە سەیرە چی دەگەیەنێت؟**

**ستارۆڤا:** بەڵێ مەکدۆنیا ناوی وڵاتێکی دێرینە چەندین سەدەیە هەیە. گەلی سلاڤی، کە هاتووەتە ئەم وڵاتەوە، زۆر لەنیشانە ڕۆشنبیرییەکانی ئەو وڵاتەی بۆبەجێ ماوە، کەچی لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاریشدا چەندین نیشانەی دیکە کوژانەتەوە، ئێستا مەکدۆنیا دەیەمین بەشی یۆگۆسلاڤیای پێشوو پێک دێنێت، سەرلەنوێ سەرهەڵدانی ئەم وڵاتە پێوەندی بەو تەقینەوە گەورەیەوە بەهەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤیەت و بلۆکی سۆسیالیستەوە هەیە. لەراستیدا ئەگەرچی یۆگۆسلاڤیا توانی گەشەسەندن و پەرەسەندنێکی دیاریکراو بەخۆوە ببینێت و چەند گەلێک لەچواردەوری خۆی کۆ بکاتەوە، بەڵام سیستەمی کۆمۆنیستی وڵاتەکە نەیتوانی چارەسەری دوورمەودا بۆ کێشەو گیروگرفتەکانی ئەو فرە گەلییە بدۆزێتەوە. مەکدۆنیایش بەشێکی ئەو رابوردووەی بۆ ماوەتەوە. ناوچەیەکە هێمنایەتییەکی تایبەت بەخۆی هەیە، کە هەندێک جار، بەشێوەیەکی جیاکار، ناوچەیەکی

بەهێز پێک دێنێت، بێدەنگییەکەی لەوەدایە کە گرنگترین نیشانەکانی بەردەوامبوونی سێبەری ئیمپراتۆریەتی عوسمانلی و سێبەری ئایدۆلۆژیاو مێژووە. ئەمەیش بەشێوەیەک وا لەمەکدۆنیا دەکات لەجۆرە مۆزەیەکی هەموو جۆرە کەلتوورو ژیارو زمان و ئەزموونەکان بچێت. بۆ نموونە دەبینین زۆربەی دانیشتووانی مەکدۆنیا بەنەژاد سلاڤین، هەروەها ٣٠٪ یان ئەلبانی یان تورکن، ٩٠٪ ی ئەو رێژەیەیش موسڵمانن، بەداخەوە پاش چەندین ساڵی ژیان و گوزەرانی برایانە ئەم ناوچەیە ناکۆکی ناخۆشی لەنێوان مەکدۆنییەکان و ئەلبانەکاندا بەخۆوە بینی، خۆشبەختانە، ئەوەندەی نەبرد دامرکایەوە.

## یەک پارت، یەک وێژە

*** واپێدەچێت قورسایی کەڵەکە بەستووی مێژوویی بەسنوور دانەری لایەنێکی بارودۆخی ئێستای رۆشنبیری مەکدۆنیا دابنرێت، چۆن گرنگترین نیشانەی ئەم دیمەنە دەست نیشان دەکەیت؟**

**ستارۆڤا:** ناتوانم جیاوازی لەنێوان دوو ئاستدا ببینم کە تایبەتمەندی بارودۆخی هەنووکەی رۆشنبیری مەکدۆنیا دەست نیشان دەکەن. لەلایەکەوە، مەکدۆنیا سامانێکی راستەقینەی لەئاستی شێوەکانی فۆلکلۆرو وێژەدا بۆبەجێ ماوە، لە لایەکی دیکەوە، نەیتوانیوە دەزگای رێک و پێک دروست بکات، وەک لۆجیکی پەرەسەندن ئەوەی دەوێت. رابوردوو پڕ لەکەلێن و درزبوو، ئەویش وێڕای کۆششی ئەو نەوانەی هەوڵیان دەدا باز بەسەریدا بدەن و لێی بپەڕنەوە، بەدوای دەروازەی نوێ و ئاسۆی بەردەوام لەئاستی هونەرو وێژەو مێژوودا بگەڕێن. ئەو کۆششانەیش لەراستیدا نیشانەیەک بوون بۆ بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری دیارکراو، وێڕای ئەوەیش

قۆناغی کۆمۆنیستی کاریگەری و شوێن پەنجەی خۆی تێدا بەجێ هێشت، چونکە بڵاوبوونەوەی چەمکەکانی ریالیزمی کۆمەڵایەتی لەو ئان و ساتەدا، رێگەی لەتوانابوونی درێژە پێدان و داهێنان دەگرت، لەبەر ئەوەی لەهەڵس و کەوتێکی سەر بەتاکە پارت دادەنرا، ئەو کارەی کە لەگەڵ بەردەوام بوونی سێبەری گۆشەگیریدا چەسپا کە ناوچەکەی پێدا تێپەری.

کەواتە نووسەرەکان خزمەتکاری ئەو رژێمە بوون کە هەبوو، ئەوەیش بەشێوەیەک مەودا هونەری و ستاتیکیەکانی کارە وێژەییەکانی لاوازو کەم نرخ دەکرد.

بەڵام لە خۆشبەختی، ئەوە زۆر درێژەی نەکێشا، ئەوەبوو، بۆ نموونە شەستەکان، جۆرە دەروازە والابوونێکی بە خۆوە بینی، نیشانەکانی لەکارەکانی وەرگێڕان و، لەشوێن پەنجە قووڵەکانیدا دەرکەوت، ئەوەبوو کارەکانی رامبۆو مالارمێ و بۆدلێرو نووسەرە گەورەکانی قۆناغەکە وەرگێڕران، کەچی ئەم بارودۆخە وڵاتەکانی دیکەی ناوچەکەی نەگرتەوە، چونکە وەرگێڕانی دەقەکانی شاعیرە فەرەنسەییەکان، کە ئەو کاتە مۆرکی هیماگەرییان پێوە دیار بوو، بەپاشەکشێ لەگیانی شۆڕشگێڕیەتی دەزانرا.

ئەو دەروازە والابوونەیش کە ناوچەکەمان بەخۆوەی بینی مۆرکی دوو نیشانەی سەرەکی پێوە دیار بوو. یەکەمیان پێوەندی بەپەنابردنە بەر فۆلکلۆر لەلایەن شاعیران و پەنابردنە بەر کلتووری میللی بوو، هەرچی نیشانەکەی دیکەیە گەڕان بۆ پەراوێزێک بوو جۆرە بەردەوامییەکیان بۆ بەدی بێنێت، بۆ نموونە دۆزینەوەی گارسیا لۆرکا مارگیز وێستگەیەک بووکە پتر لەبەڵگەو نیشانەیەکی ئینتمابوونی بۆ ساتی شیعریی ئەورووپی دەگەیاند، کە ئەو کاتە لەسەر گەڕان بەدوای شتی نەزانراوو سەیردا پێکهاتبوو، ئەم رێبازە تا ئێستا بەردەوامە، بەڵام بەشێوەیەکی جیاوازتر.

ئەم گوزەران کردنەی نێوان هەردوو نیشانەکە پێوەندی بە پەرەسەندنی مێژوویی ئارەزووی نەگۆڕایی دانیشتووانەوە هەبوو، چونکە ئەو نووسەرانەی بەنەژاد خەڵکی گوند بوون سەرچاوەی کەلتووری میللی خۆیان لەدەست نەدا، ئەگەرچی رژێمی کۆمۆنیستی زۆری هەوڵ لەو بوارەدا داو مەبەستی ئەوەبوو ئەو ئارەزووە بگۆڕێت، کە لە چوارچێوەیدا ناوچە لادێییەکان ٧٠٪ ی دانیشتووانی تا نزیکەی ساڵانی سەرەتای پاش کۆتایی هاتنی دووەمین جەنگی جیهانی پێک دەهێنا.

## تاریکایی زمان

*** نیشانەیەکی ناوەندی دیکە هەیە بەسەر دیمەنی کەلتوورو داهێنانی مەکدۆنیدا زاڵە، لەوەیش مەبەستم فرە زمانییە، چۆن بیر لەم فرەییە دەکەنەوە؟**

**ستارۆڤا:-** حەز دەکەم لەچوارچێوەی ئەزموونەکانی خۆمەوە وەڵامت بدەمەوە. من خۆم لەئەلبانیا لەدایک بوومەو لەمەکدۆنیا ژیاوم و خوێندوومە. بۆیە بەهەردوو زمانی ئەلبانی و مەکدۆنی دەنووسم، هەمان قسەیش ئەو ئەلبانیانە دەگرێتەوە کە لە مەکدۆنیا دەژین و ٣٠٪ ی دانیشتووانی ئەم وڵاتە پێک دێنن، ئەم دۆخە

مەکدۆنیەکان ناگرێتەوە. ئەمەیش ئاساییە وێنەیەکی پێوەندی بەردەوامی نێوان زۆرینەو کەمینەکان دەخاتە روو، چونکە زۆرینە خۆی لەفێربوونی زمانی کەمینەکان دوورە پەرێز دەگرێت، هیوادارم بتوانرێت باز بەسەر ئەم دۆخەدا بدرێت وێڕای جیاوازی پێکهاتەی نێوان هەردوو زمانەکە، بەوەی کە زمانی ئەلبانی سەر بەهیچ گرووپێکی زمان نییە، بە پێچەوانەی مەکدۆنییەوە کە زمانێکی سلاڤییە. هەر چۆنێک بێت، بڕوام وایە ئەم فرەزمانییە، وێڕای کێشەی بەردەوام بوون و لێک گەیشتن کە زۆر جار دروست دەبێت، ئەوە هۆکارێکی هاندەرانەی بزووتنەوەیەکی رۆشنبیری دیارکراو پێک دێنێت، بەتایبەتی لەگەڵ هەبوونی چالاکی وەرگێڕاندا، کە بگرە لەکاتی رووداوەکانی پێکدادانی نێوان ئەلبانییەکان و مەکدۆنییەکانیشدا رەوتی خۆی پاراستبوو، ئەمەیش کارێکە دەبێت شوێن پەنجەی دیار بێت لەبەر ئەوەی نیشانەیەکی بەشداربوونی هەردوو گەلە لەمێژوو وچارەنووسێکی هاوبەشدا. بەش بەحاڵی خۆم، بەقووڵی زمانە سلاڤیەکانی دیکە دەزانم بەشێوەیەک دەتوانم نهێنییە پەردەپۆش کراوەکانیان لەنێو نووسینەکانمدا بەکار بهێنم. ئەگەرچی هەر زمانەو تاریکایی خۆی هەبێت کە ناکرێت وەربگێڕێتە سەر زمانێکی دیکە، ئەوە من خۆم بەبەختەوەر دەزانم کە ئەم تاریکاییە دوو چەندانەو سێ چەندانەم هەیە، ئەمەیش وام لێ دەخوازێت کۆششی بەردەوام و پشوودرێژی راستەقینە بنوێنم.

*** لەدەقەکانی گێڕانەوەتدا باوک و ئەندامانی دیکەی خێزان زۆرجار ئامادەن. ئایا ئەم ئامادەگییە قەرەبووکردنەوەی گریانەی ئاوارەیی و نامۆبوونیتە؟**

**ستارۆڤا:-** من کوری خێزانێکی ئەلبانیم کە کۆچی بۆ مەکدۆنیا کردووە، بۆیە بۆ من خێزانەکەم نیشتمانێکی هەمیشەیی بووە، بەردەوام بەدوای رەگ و ریشەیدا وێڵم. لەقرتاج دەچێت کەتوانی بەرەنگاری مەترسی سڕینەوەو لەناوبردن ببێتەوە.

کەواتە خێزان بۆ من رەگەزی بنەڕەتی نێو رێڕەوی ژیانم پێک دەهێنێت، بۆیە سەرقاڵی گەڕانم بەدوای پەراوێزێک بۆ بەیەک گەیشتن لەنێوان هەردوو نەوەکەیدا باپیران و کوڕو کوڕەزاکانیاندا، ئەمەیش بەتایبەتی لەنووسینی گێڕانەوەو چیرۆکەکانمدا دیارە، ئەویش بەوریاییەکی زۆرەوە نەوەک بکەومە نێو نووسینی پۆرترێیەکی راپۆرتیانەی خێزانەکە، کە دەکرێت لەسەر حسێبی بەوێژەیی بوونی نووسینەکە بێت. من پەنجا ساڵ ژیاوم، ئێستەیش بەشێکی دیکەی ژیانم دەگوزەرێنم، کە بەشێکە بەدیاری خواوەندی دەزانم، بۆیە بڕیارم داوە پاشماوەی ژیانم بۆ گەڕان بەدوای رەگ و ریشەی خێزانەکەمدا تەرخان بکەم لە چوار چێوەی نووسین و گوێگرتن بۆ دەنگە شاراوەو کپەکانی دایک و باوکی کۆچ کردووم، چونکە نووسین چێژی بەسەربردنی کاتێکی خۆشم لەگەڵیاندا پێ دەبەخشێت.

**خاین نیم**

*** تۆ بەنەژاد ئەلبانیت. چۆن نووسینەکانت توانیویانە ناسۆزی تایبەت بەخۆیان لەناو دیمەنی داهێنانی مەکدۆنیادا پێک بهێنن؟**

**ستارۆڤا:-** ئەمە پرسیارێکی گرنگە . رەنگە بەپێی بۆچوونی هەندێک کەس وەک یەکێک دەرکەوم خیانەتی لەگەلی خۆی کردبێت تا لەناو کەسانی دیکەیدا بەدوای شوێنێک دا بۆخۆی بگەڕێت، بەڵام ئاشکرایە من لەوانە نیم، هەروەها جۆرە لێبوردەییەک لەنێوان هەردوو گەلی ئەلبانی و مەکدۆنیدا هەیە، پەراوێزێکی راستەقینەی ژیان گوزەراندنم پێ دەبەخشێت، ئەگەرچی ئەوەیش ئەوەندە سانا نییە بەتایبەتی لەکاتی گرژی و بەگژیەکدا چوونی نێو هەردوو گەل، لەوکاتی لاوازییەدا زۆرجار بە دوای تاوانباران و خیانەتکاراندا دەگەڕێن یان پێویستی کرد دروستیان دەکەن. هەرچۆنێک بێت ، من داهێنانم بەنیشتمان بۆخۆم هەڵبژاردووە، هەروەها زمان موڵکی گەلێکی دیاریکراو نییە بەڵکو موڵکی ژیانە، بۆیە رەگ و ریشەی زمانەکان لەشوێنێکدا بەیەک دەگەنەوە بۆ نموونە وشەی«mother»وەربگرین، دەبینین هەمان وشەو زاراوەیە لەزمانەکانی دیکەدا، بەعەرەبی(أم)، بەفەرەنسی(mere) بەئەلمانی (mutter)، بەئەسپانی(mader)، کەواتە زمان چەندین پێپلکەی هەیە رووەو هەمیشەیی هەڵدەکشێن، هەروەها جۆرە هاریکارییەکی بۆ خۆی پاراستووە لە بەکارهێنانەکاندا، چونکە بوونی دوو یان سێ زمان رەنگە مەوودایەکی شیعری بەزمانە بەکارهێنراوەکە ببەخشێت.

ئاشکرایە بەدیهێنانی ئەوەیش پێوەندی بەشتی دیکەوە هەیە.

**رێ بزرگەکانی ئەفسانە**

*** بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەفسانە لەبەرهەمەکاندا**

**بەکاردەبەیت. ئایا ئەوە ئارەزووکردنێک بۆ سڕینەوەی شوێن پەنجەی ریالیزم پێک ناهێنێت، کە مۆرکی بەکارەکانی سەردەمی کۆمۆنیستییەوە دیاربوو؟**

**ستارۆڤا:-** ئەفسانە بازنەیەکی ئەوتۆیە ئەزموونە مرۆییەکان لەچوارچێوەیدا گرد دەبنەوە. بڕوام وایە بەکارهێنانی ئەفسانە پێویستی بەجۆرە وریاییەک هەیە بۆ ئەوەی خۆت لەداوەکانی دووره پەرێز بگریت، چونکە لەجۆرە رێ بزرگەیەک دەچێت چوونە ناوەوەی ئاسان بێت بەڵام لێ دەرچوونی دژوارو هەندێک جار سەخت بێت. بەش بەحاڵی خۆم، لەکارەکانی خۆمدا لەگێڕانەوەکاندا لەبارەی قوربانیدان و ئەفسانە پێوەندارەکانیەوە کاردەکەم.

بۆ نموونە ئەوە لەرۆمانی (سەردەمی بزن)دا، ج بەشێوەیەکی هۆشیارانە یان ناهۆشیارانە دەردەکەوێت، ئەوەیش لە لایەنێکیدا بۆ ئامادەگی ئەفسانە لەنێو سەرچاوەی کەلتووری دێرینی ناوچەی بەلکان دەگەڕێتەوە، چونکە لەوێ ئەفسانە مرۆییە گەورەکان سەریان هەڵداوە، وەک ئەفسانەکانی سیزیف و پرۆمیسیۆس و ئۆدیب. ئاشکراشە لە رۆمانەکەمدا بەتەنگی ئەوەوە بووم گۆڕانکاری نێو رەوتی ئەفسانە رەچاو بکەم، لەگەڵ گۆڕینی خودی ئەفسانەدا کەهەندێک لەناوەڕۆکەکانی لەکاتی ئێستەدا لە درۆکردنەوە نزیکترە، تەواو وەک ئەو ئەفسانەی پێوەندییان بەهتلەرو مۆسۆلینی و دیکتاتۆرەکانی جیهانەوە هەیە. تەنیا وێژە بەباشترین رێگە دادەنرێت بتوانێت مرۆڤ بیباتە ناو ئەفسانەوەو بیهێنێتەوە بەبێ ئەوەی پێی لەکۆسپ و تەگەرە شاراوەکانی هەڵنووتێت.

*** لەرۆمانی(سەردەمی بزن)دا گیانی گاڵتەجاڕی هەیە.**

**ئەویش بۆ نموونە لەوەدا دەردەکەوێت کە بزنت کردووەتە پاڵەوانی رۆمانەکە. ئایە ئەوە رێبازی تۆیە بۆ دەستە مۆکردنی واقیع؟**

**ستارۆڤا:-** قۆناغی رژێمی ستالینی بۆ ئێمە ماوەیەکی پڕ لەکارەسات بوو. ئەو کاتەیش هاوکات بوو لەگەڵ سەردەمی منداڵیمدا. بۆیە وێنەی بەرەنگاری لەناو ئەندێشەو مێشکی بچووکمدا پەیوەست بوو بەئاژەڵی بزنەوە، کە ئاژەڵێکە هەر لەمێژە لەنزیک مرۆڤدا دەژێت، بە پێچەوانەیشەوە، ئەو رژێمە ویستی ئەو ئاژەڵە لەناوببات تا شێوازی ژیان و گوزەرانی کۆچەرەکان بگۆڕێت، دەکرا بەشێوازێکی مێژوویی و کرۆنۆلۆژی لەمەڕ تراژیدیای وڵاتە کۆمۆنیستەکان بنووسم، بەڵام ئامانج ئەوە نەبوو دەربارەی ژان بنووسم بەڵکو دەربارەی ئەو گەوجایەتییەی ئەو ژانە دروست دەکات و، دەربارەی ئەو شێتانەی کە چوون ئاژەڵی بزنیان کوشت و ئارەزووی کۆنەویستی خۆیان پاڵی پێوە دەنان. بۆیە لەو بڕوایەدا بووم کە نووسین لەبارەی ئەم رووداوەوە پتر واتا دەبەخشێت ئەگەر گیانی گاڵتەجاری تێدا بەکارهێنرا، کە بەهێزی خۆی لەگاڵتەجاڕی گەلەوە هەڵدەهێنجێت، ئەو گاڵتەجاڕییەی بەسانایی خۆی ئامانج دەپێکێت.

*** کۆشیعری(قرتاج)ت لایەنی سەیرو سەمەرەی پێوە دیارە، ئایا ویستووتە بەم کارە جۆرە تەبایەک لەنێوان چیرۆک و رۆمانە ریالیزمیەکانت و سەیرو سەمەرەیی نووسینەکانی شیعرت دا بەدی بهێنیت؟**

**ستارۆڤا:-** رێگەیەکی سەخت لەنێوان واقیع و خەیاڵدا هەیە، تێیدا گەڕان بەدوای رێڕەوی دروستدا دژوارە، بەڵام ژیان و ئەزموون دەتوانن بگەنە ئەو رێڕەوە. بۆ من قرتاج واتای توانا بوونی مرۆڤ بۆ بەرەنگاربوونەوەی پێ دەبەخشیم.

ماوەی چوار ساڵ وەک باڵیۆزی یۆگۆسلاڤیا لای فەلەستینیەکان ژیام. بەپێی کاردکەم و بەپێی دۆستیەتیم، پێوەندیم بە ژمارەیەک لەفەلەستینیەکانەوە هەبوو. هەروەها خانووەکەم چەند مەترێک لەبارەگای نیشتەجێی ئەبو جیهاددەوە دوور بوو کاتێک تیرۆر کرا. بۆیە لەناو ئەم چوار چێوەیەدا ژیام کە بۆیەکەم جارە لێی دەدوێم، چونکە وردەکارییەکانی لەقسە کردن بەهێزترن (لەم کاتەدا لۆران ستارۆڤا، لەئەنجامی کارتێکردنی رووداوەکاندا، داوای جگەرەیەکی لێ دەکات، دووپاتی دەکاتەوە کە یەکەمین جارە دەیکێشێت دوای ئەوەی بۆ دوو ساڵ دەچێت وازی لێ هێناوە). کەواتە لەناو ئەم خەونەدا ژیاوم و، بۆمن لەجۆرە پێوەندییەکی نێوان مێژووی دێرینی قرتاج و بەرەنگاربوونەوەی توندو نێوان هەبوونی فەلەستینیەکان لەتوونس دەگەیەنێت، ئەوانەی پێوەندییەکی هاریکاری گەورە پێوەیانم دەبەستێتەوە بەوەی باڵیۆزم لەلای دەوڵەتەکەیان کە هێشتە دانەمەزراوە. قرتاج بانگەوازێکی قووڵی بەردنگاربوونەوە بوو. دەبوو فەلەستین نیشتمانەکەی خۆم بێت. بەڵام قرتاجی تایبەت بەخۆمم بۆ خۆم هێشتەوە، ئەودی چاردنووسی لەچارەنووسی خێزان بچووکەکەم نزیک

دەبێـــتـــەوە، کـــە بەردەوام لەبەردەم هەڕەشـــەی لەناو چووندایە. بۆیە پەیوەندییـــەکی تایبـــەتیم لەگـــەڵ فـەلەسـتـینیـەکـاندا دروست کـرد. ئەویش بەپێی ژانی هاوبەشـمـان. بەڵام بەهۆی ئەوەوە کـە بەپرشنگی ئەم جیـهـانەوەم دەبەستێـتەوە کەلەسەر نەریتی هاریکاری دامەزراوە. بۆیە کۆشیعری (قرتاج)م جۆرە پێشوازییەک بوو بۆ هەموو ئەم وردەکاریانە هەروەها بۆ بەهای بەیەک گـەیشـتنی نێـوان تراژیدیای ژیانی تایبـەتی خـۆم و تراژیدیای شوێن.

*** وایێدەچێت سەرگوزشتەی خۆت بەمەدا تراژیدیەکەیەوە درێژەکێشانی سەربردەی خێزانەکەت بێت"**

**ستارۆڤا:-** بەڵێ سەربردەیەکە سێبەرەکەی بەرەو ڕەگەکانی سەرەتا درێژە دەکێشێت، بەوەیش ئەو سنوورانە تێدەپەڕێنێت کە بەڕاستی دەربڕینێکی تەسکە بۆچوونێکی مرۆڤ و ئازادی مرۆڤ پێکدێن.

*** سەربردەی تۆ لایەنێکی دیکەشی هەیە، مەبەستم سەرکەوتنی کارەکانتە کە پتر لەخەڵاتێکی نێو دەوڵەتییان بەرکەوتووە؟**

**ستارۆڤا:.** بەدوای ئەوەدا نەگەڕاوم، ڕەنگە لەسەردەمی لاویدا بەدەستهێنانی خەڵاتم بەلاوە گرنگ بووبێت، بەڵام لەگەڵ چوونە ناوتەمەنەوە بایەخ بەو بابەتە نادەم، ئێستە دەتوانم بڵێم پێشوازی کردنم لەهەر خەڵاتێک لەجۆرە فریودانێک دەچوو شادیم پێ ببەخشێت، کەچی پاڵەوانی ڕۆمانەکانم لەناو غەم و پەژارەدا دەژیان، بەتایبەتی مەبەستیشم ئاژەڵی بزنە. کەواتە خەڵات دەتوانێت نووسەرێک لەڕێگەی خۆی لابدات، زۆربەی ئەوانەی خەڵاتی (نۆبل)یان بەرکەوتووە ئەو ڕووداوەیان بەسەر هاتووە.

*** بەپێچەوانەی ئەم پێشوازییەوە، ناوت لەکۆمەڵێک لەو ئەنتۆلۆژیانەدا نییە کە شاعیرانی نەوەی حەفتاکانی مەکدۆنیا یان پێشکەشکردووە..**

**ستارۆڤا:-** ئەگەر خۆم بەشاعیرێکی تێپەڕبووی سنووری نەوەکان بزانم. هەروەها ڕەخنەگران لەمەکدۆنیا خۆیان لەوە دوورە پەرێز دەگرن لەچوارچێوەی نەوەیەکی دیاریکراودا دامبنێن، ئەویش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کەسەر بەدوونیشتمانم هۆکاری رامیاری کارێکی وایکردووە سەر بەم یان بەویان بم کارێکی دژوار بێت. شتی گرنگتر بۆ من کتێبەکانمە، هەرچی ئەنتۆلۆژیای تایبەتمەند بە نەوەکانە تەنیا لەجۆرە ڕێبەرنامەیەکی گەشت و گوزار دەچن...!

*** زۆرتر لەجارێک پێوەندی رامیاریت لەلا لەپێوەندی شیعری پێ باشتر بووە. وایێدەچێت نائومێد بووبێت لەوەی پێوەندییەکی هاوسان لەنێوانیاندا هەبێت..**

**ستارۆڤا:-** نەک بەشێوەیەکی ڕەها. من بڕوام بەپابەند بوون لەناوەوەی کاری وێژەییدا هەیە. کە پابەندبوونە بەرانبەر بەرەوتی داهێنان و جوانکاری (ئەستاتیکا).

ئاشکرایە، ئەویش هۆشمەندی رامیاری نووسەر ڕەت ناکاتەوە. چونکە لەبنەرەتدا کاری وشە دەکات. وشەیش زۆر مەترسیدارە چونکە دەتوانێت شەڕێک هەڵبگیرسێنێت.

*** ئایا نووسین هێشتا ئەو هێزەی لەنێوان چوارچێوەی جیهانگیری نوێدا ماوە؟**

**ستارۆڤا:-** بەڕاستی، ئەم ساتەی ئێستا ساتێکی وایە. لەچوارچێوەیدا هەرچی ئەلیکترۆنی هەیە دەتوانێت خەڵک لەیەکدی نزیک بکاتەوەو ماوەیش لەنێوانیاندا دروست بکات، لەبەر ڕێ تێنەچوونی قەرەبووکردنەوەی ڕەگەزی مرۆیی. بڕوام وایە جیهانگیری، کە خۆی وەک ئەڵتەرناتیڤێکی کەڵەبووەکانی ئەزموونی مرۆڤ دەخاتە روو، ڕەنگە لەیەک چرکە هەرەسی پێ بهێنێت، چونکە لۆژیکی جیهانگیری بڕوای بەجیاوازی مرۆیی نییە. پاشان نابێ کە جیهانگیری لەو مەتریالیزمیە دەچێت کە قۆناغی کۆمۆنیستی لەسەر دامەزراو ئەوە بوو لینین بانگەشەی بۆ ئەنتەرناسیۆناڵی جیهانی دەکرد لەسەر بنەمای ئابووری دامەزرابێت؟ جیهانگیری لەسەر بناغەی هەمان هزر دامەزراوە، جگە لەجیاوازییە تایبەتییەکانی.

بڕوایشم وایە ئەوەی ئێستا جیهان بەخۆوەی دەبینێت ئاکامی ئەو جیهانگیریەیە، چونکە دەوڵەمەندەکان سەرقاڵی دروستکردنی ئایدۆلۆژیای تایبەت بە خۆیانن کەلەسەر وێرانکردن و فەوتاندنی ئەوی دیکە دامەزراوە بۆئەوەی خۆیان بژین و بەردەوام بن. ئەوان هەوڵ دەدەن یەک دەنگ دروست بکەن فەرمانڕەوایی جیهان بکات.

**سەرچاوە:**

**گۆڤاری (الکرمل) ژمارە(٧٦-٧٧)ی ساڵی 1003 لاپەڕە(296 -301) لە سایتی (ئەنتەرنێت)ەوە.**

**هەڤپەیڤینەکە: حسن الوزانی سازیداوە.**
**وەرگێرانی: موکەرەم ڕەشید تاڵەبانی**

# سروتی شکاو



«کەریم دەشتی»

شەوبوو شەو
کەبینیم کەوتۆتە ناو گۆمی خەمگینی
لە پەنای شوشە جوانەکانی ئەستێران
هەر سەیری من دەکا
پارچەیەکی لەبۆن و بەرامەی درەختم
لە زەرفی گەڵاییێ بۆ هەنارد
کە نامەی ناردەوە ئەومانگی دڵشکاو
تەڕ تەڕبوو
کە باخچە هات سەرێ لە نەمامی نەخۆشی دڵ بدا
نامەکەم نیشان داو نایە ناو باخەڵی
لەو ڕۆژە هەرباخەو مانگێکی لە دڵی خۆی ناوە
هەر چڵەو خونچەییێ فرمێسکی
لە بەرۆکی تەڕو خەمگینی خۆی داوە..
نەدەبوو رازی خۆم بدەمە دەست یاران
تا ئاوا بیکاتە ئینجانەی شەوق و نوور
بیگێڕێ بەشاران
نەدەبوو من نامەی ئەو مانگی دڵشکاو
بدەمە دەست باخچەو
بیخاتە ناو تیشکی نارنجە جوانەکانی هەتاو
دەچمەوە دارستان شوشەییێ
لە عەتری بخورو
نەوارێ لەگمەی کۆترو
کاسەیێ لە ورشەی درەختی گێلاس و
جۆگەییێ لە خەونیی عاشقان
دەبەم بۆ جوانێ

کەبۆتە ئەفسانەی دارستان
جوانێ لەرێگەی وەرینی گەڵاوە
بەچاوی ئاوێنەی هێشوێ لە ئاقیقی
ئەو مانگی دڵشکاو کە ئێستا
لەتاقی ئاسمانا
وەک فەنەر وەستاوە
چاوێکی لا منەو
بەنیگای خەمگینی من بۆ خۆی بانگ دەکا
کەی بێ من بگەم بەو پەریە
بەباوەشێ درەختی گوڵاوی و
چەمەنێ گیاوە



# ڕۆژهەڵات .... کاتباش
# کاتباش.... ڕۆژئاوا



عەباس عەبدوڵلا یووسف

ڕۆژهەڵات ڕۆژ ئاوایەو ڕۆژ ئاواش ڕۆژ هەڵاتە
ڕۆژهەڵات باکوورە،
ڕۆژ ئاواش( هێواش بڵێ...) باشوورە.
لە وانەی جیهانناسیدا
بەسواری پشتی ماسییەکی سێپەڕ
بەدەوری تۆپە زەمینەی ناوپۆل
گەشت دەکەین
گرینش لەبیر دەکەین
بانگدانی کەڵەبابی سبحەینان، کاتژمێرمانە
باری حوشترمان خەنەیەو
بەڕەزمی تریفەی مانگەشەو هەنگاو دەنێ
لەدوڕیانێکدا

ناڵدارو باڵدار بەرێگای خمخۆرک دا دەڕۆن
هەر دەڕۆن وراناوەستن
بەس کەمکەم دەنوون تاخەوندار بن و
تێیدا بەمەسینەوە بفڕن
لەسێرِیانێکدا
توولەڕێ، بەگەڵای هەڵوەریوی زەیتوونان بشارنەوە
لەسەربانی ئوتێلەوە
سەلکە سابوونی ڕەقی لەڕێداران بگرن
ڕێگا درێژە
بەدرێژی قژی بیرەگێری ناو شەمەندەفەر
بەدرێژی نینۆکی سووری دامەنپیسێکی بەندەر
بەدرێژی حەقایەتێکی زستان
لەچوار ڕیانێکدا
گەر بتوانن
خوێ بەئەلفوبێی لاتینی وەرکەن،
ئەسپەکانتان بۆندارکەن
ڕۆژهەڵات، پێڵاوی ئاسنین دەپسێنێ
ڕۆژئاواشتان، لەخۆشیان جەرە دەشکێنێ
ئەگەر حەزت لێبوو
سەرت بەسەهۆڵاوی دوورگەی حووتی بابخۆکوژ بشۆ
بەدووربینێکی شووشە شکاو



چاودە ئیمپراتۆرێکی شێت
لەنیوەڕۆیەکی بیبەراویدا
پێکەنینی بەسێبەری خۆی دێت
گازاندە لەهەتاو دەکات، بۆ کورتە بالآی کرد
حەزت لێبوو من بکەی بەدۆستی خۆت
جانتای پڕکێکی سەفەریت، فڕە بدە ناو گۆمی بۆقان
زوو دەگەیتە سەر بیابان و
لەنامەی ئاسمان دەگەیت
کلیل بکە بەدروشمێکی سەر شەپقەکەت
زوو دەگەیتە سەر بورکان و
لنگە پێلاوی ئیمپادۆکلیس دەدۆزیەوە
قۆناغت ، سالۆنی زومروتان بێ
نەویَ ناوکە، گەر زەمیَن بەجەستە بشوبهێنن
لەهەزار ڕیانێکدا
چ بەزمێکە جوگرافیاکەی ون کردو
مێژووەکەی لەدەس ما!
کچی کافرۆش سواری کۆمبێلی دوا مۆدیل کرا
فڕاندنی هوما بەناو تەما
نیشانەی دان پیانانی دیمەنێکی لەجامگیراوە
١٩٧٩-٥-٧

* ردیارد کپلنگ دەڵێ(ڕۆژهەلات ڕۆژهەلاتەو ڕۆژئاواش ڕۆژئاوایە
قەتیش ناگەنە یەک، دەبوو بە(تارۆژی قیامەت) تەواوی بکردایە
* کاتباش= ئەم کاتەت باش.
* خمخۆرک= زەویێکە ژێرەکەی شاشەو لەبەر خاوی و کلۆرایی زوو ڕوو دەچێت.

# جل و بەرگی ئیمپراتۆر

بۆتان



سلاو لە وانەی ڕووناکی دەبەخشنە سەر زدوی لە بلـقی
ئاو سەرنجی دزینی- با-ی تەمەن درێژ بدە شەمەندەفەرە
هێڵ لارەکان وەک ئەوەی لە جیابوونەوەی بەردەکان تووڕە
ببووبن قژیان خستۆتە نێو کتێبی کلاسیکی مێژووی
حـەرف نوورانی ئەو چرکـانەی لە شـەمـەندەفـەرە
بەجێماوەکان لە دەستمان دەچن تێروانینی نەزۆکن لەژێر
پێستی نەهەنگدا ژەنگیان گرتووە لە دارێ دەچن. هیـوا
نابەخشن
جل و بەرگی ئیمپراتۆر
لە ڤایرۆسی ئاگری هەمیشە هەڵاسیاو سەوزبۆوە ئەو
ئاشتی یەی ڕێگی لەژێر سێبەری دار وشک هەڵاتوودکانە
هەورێکە ڕەنگ دوور لە تخوبی چاو بینین حەسرەت
بیارێنێ هێندەی ئادەم

هیچ بوەرێ بەرگەی مانەوەی لە زەویدا نەگرت
ئادەم دەیویست گوڵ لە دۆزەخ بڕوێنێ
لە فرمێسکی چاوان مەل خۆیان بشۆرن
جۆگەیەک بەقەد مێرولە
بەنێو شتە سەوزەکانی بن هەنگڵ و مووی سمێڵ دەڕوات
پرشکەی باران و بۆنی مـردوویێکی بێ مـراز لە ژیان
تەکانێکی لەسەرخۆی
بەرەو خۆر ئاوابوونی هاوکێشە نەمرەکەی بوون و نەبوونن
پیاو هەوەس لە بۆنی گەڵانی ژن دەکات
ژنیش حەز لە مێ بوونی پیاو دەکات
لەوەتەی ئاگر ڕقی لە ئاوە
پیاو و ژن دەستەمۆی تێکەڵاو بوونی قوڕ و بۆن و وەچەن
خانوویەک لە دارستان ساز دەکەن
چرایەک لەنێو ئاژوەکانیان دادەگیرسێنن
ئەو ماسکانەی دڵەڕاوکێ بۆ خەندەی سەر لێوی ئەستێرە
دروست دەکەن وەک دەنکی گوڵەبەڕۆژەی ئاوبی پووچەڵن
لەناو لەپی شەیتان سکیان پڕ بووە
بەدیار خوێندنەوەی کتێب هێندە نامێنێتەوە باویشکی



دێتێ

لە رامانی سێو خواردنی دەستی ژنێ

لەکاتی هەناسە بڕکێی شکانی شووشە

لە ئاهەنگی یەکەمی بەرەو هەراسانی هەوا، باوێشکی

دێتێ باوێشک پیرۆزە ئەگر ئامانج بێت

لە بۆنی جل و بەرگە کۆنەکانی رۆژهەڵات

خۆر وەک رەنگی شیر سپی هەڵگەڕا

شتێ وەک بێ دەنگ بوون لە دوورەوە دەبریسکێتەوە

وەختێ گژەبا شەڕ بە گیای کێڵگە دەفرۆشێ

مار سیحری خۆی دەداتە دەست بەرد

بەرد لە پیرۆزیی خۆی دەچێتەوەو وشک دادێت

وەرە ئەی مانگ

لە چۆپی خەنەبەندانی سەفەری مەرگە گەورەکان

پەرژینێکی دڕکاوی لە گوڵ و

پانتاییەک لە شتە وردە سەرسوڕهێنەرەکان

ئەوانەی لەگەڵ ماسی و باڵندە هاوسەرن، هەڵفڕێنین

تۆ لە ئاسمانا ئۆقرە ناگری

من ئەو خاکەم لێبۆتە دۆزەخ

من و تۆ وەرە

لە دڵێ بخەوین لە دڵی خوداوەندەکان میهرتر بێت

ئەی مانگ

کوا دڵێ هەیە لە دڵی بێ گەردی من و تریفەی زیوینی تۆ

ئاسوودەتر.. دڵەکانی تر ژەنگاوین ئەی مانگ..

**هەولێر**

**٢٠٠٣/٦/٩**

• فەرید مەخموری - تاران



# چەنگ!...

تۆ نەئەمرۆی و نەدوێنێی
نەگفتوگۆ ناسکەکانی
ژوانی عەشقی سبەینێی
نەئەفسونی
سروشتی پاکی وڵاتی
نەگەشبینی و نەئاواتی
تۆ ئاوێنەی باڵانومای ئیلهامم نیت
بەرامبەرت
قژی سپی
شیعرەکانم دابهێنم
تۆ سنورێکی دەستکردنیت
بەهیوابم
وێرانت کەم ... بتروخێنم
ئازدارێکی گوڵبەدەم نیت
کەپێکەوە بەفری حەزمان
لەگەرماوی خرۆشانێک تواندەوە
بەلافاوی خامۆشبوونیش
چیمەنی ئۆخە کردمان بوژاندەوە
کانیاوێک نیت
بێم و لەلات وچان بدەم
سنەوبەری وشکەڵاتووی ئاسوودەبیم
لەنزیکت برووێنمەوە
شیعرێک نیت لێت بێزارنەبم
رۆژێ چەندجار
بەتاسەوە بتخوێنمەوە
تۆ ئوتێلێکی لاچەپی
شاری دڵگیری عومان نیت
تۆباغێکی پرشۆرەبی
ئەسفەهان نیت

ئەویان شەوێک
بەهیواوە تێیدا خەوتم
ئەوی تریان
چەند هەفتەیەک خانەخوێم بوو
کەخراپ هات بەختی چەوتم
تۆ هەریەکێک لەوانەبیت
لەیاداشتی رۆژانەی خۆمدا دەتنووسم
دەبمەهاورێت
لێت نابمەوە
لەگەڵ تۆیە چارەنووسم!



# ل خاچ دان



قەچاخ

دەمێ جیهان
ل پێش دیروکێ
هاتی ل خاچ دان
بو هات ڤەگێران
خر زیان
وەرگرت
قەرالیەک گران
دەم دادەستی
چەرخ و سال و
هەیڤ و شەڤ و روژ و
دوران
مافێ هەر چار
ئیمپراتوریەتێت
سروشتێ
بوهات پیڤان
بەردەوامێ
بێت وەرگێران
بهار
هاڤین
پایز
زستان
* * *
دەمێ عیسا
ل خاچێ دای
ئەو روژ کرە
دیروکستان
ل ئەنجاما دوماهیێ
چار دەستهەلاتێت
سەرەکێ
مرۆڤ یێ بیە
سەرگەردان
چار ئوول
کو عەسمان
پشتەڤان
ریشالێت خو
کویر داهێلان
بون بەرنامە

زەبور
تەورات
ئینجیل
قورئان
ژبلی ڤێژێ
دەولەتەکا
چەند بهوستێ
هاتە دانان
یا پر دەستهەلات و
شیان
بناڤێ ولاتێ
ڤاتیکان
* * *
بەلێ دەمێ
چاخێ بێ بەختێ
بێ وژدان
ل بەر هەردوو
چاڤێت دیروکێ
ولاتێ من
ل خاچ دای
ل بازێرێ لوزان
ئێک ژ گەلێت
پر مەرجێت
نەتەوایەتێ
ئاخ و خەلک و
هەست و نەریت

دیروک و جلک و
ئەزمان
سەدێ بیستێ ژی
ب سەر ڤەچوو
سەر دەمێ
گلوبالیزمێ
دیموکراسیێ
پاراستنا
مافێ مروڤ
ل خرجهان
چل ملیون کورد
ل پێنج سەد هزار
کیلومەترێت
چار گوشەدا
کەڤنتر ژ گەلێت
هەڤ جیران
حەتا نوکە ژی
ئاخاوان
چار پارچەیە
پر بڤەیە
قەدەغەیە
پەیڤا کوردی و
ولاتەک بناڤێ
کوردستان.

٢٠٠٣/٦/٢٣
هەڤلێر

# پرشەکانی عەشق

کەژاڵ ئیبراهیم خدر- سلێمانی




«١»

کەناشنات بووم
بەبێ ئاگر گرم گرت و
لەبەر پێتا توامەوە
هەرزوو زانیم
کانگای عەشق و خۆشەویستیی
بەعەشقێکی زۆر شێتانە
لەناختدا گیرسامەوە.

«٢»

من بەرلەوەی تۆ بناسم
لەخەونی چاوەڕوانیدا
تۆم بینیبوو
من بەرلەوەی تۆ بناسم
تامەزرۆی سەمای پەنجەت و
عاشقی ڕوخساری گەش و
دووچاوی پڕ ئەوینت بووم

«٣»

کەتۆم ناسی
گردێک بووم و بووم بەچیا
کانیەک بووم و بووم بەدەریا
شەوێکی ئەنگوستە چاو بووم
بووم بەگزنگی بەیانی
باڵدارێکی ناو قەفەز بووم
گەڕامەوە بۆ سەر چڵی درەختەکان
بۆ نەغمەی خۆش، بۆ گۆرانی

«٤»

یەکەم دیدار
میوانێکی ناوەخت بووم
تۆش گلکۆی پیاو چاکێک بووی
هاتم تاکو
دووبەردبێنم، بینێم بەنێو چاوانی پیرۆزتەوە
چارەنووسی
ڕۆژانی ڕانەبردووی خۆم
لەنێو مەرقەدی بالاتدا
تاقی بکەمەوە

«٥»

لەو ڕۆژەوە دەستەکانی تۆم ناسیووە
دەستی هیچ شێخێک ماچ ناکەم
هەر بەتەنیا
تۆ دەروێشەکەی ڕۆحم بەو
منیش تەکیەی زکرو نزات

«٦»

لەیەکەم دیداری تۆوە
من قەرزاری هەورو زەویم
هەور هات ڕێگەی ژوانی تۆی
نیشان دام
زەوی بۆنی خۆڵی پێکانی تۆی
پێناساندم

«٧»

کاتێ وشەی ناوتم نووسی
هەموو وشەکان لێم زویر بوون
چونکە لەنێو هەموویاندا
بۆ پیرۆزترینیان گەڕام

«٨»

بەڵێنمدا
هەرگیز بۆنی گوڵێ نەکەم
بۆنی وەک هەناسەت نەبێ
لەهیچ ئاوێک نەخۆمەوە
وەک خوێنەکەت
شیرین نەبێ
پشوو نادەم
لەژێر سێبەری چنارێ
بەرزنەبێ بەقەد بالات
من تیشکی خۆرم هەرناوێ
ڕووناکیەکەی
نەگا بەجوانی چاوانت و
گەشی سیمات

«٩»

دەتۆش وەرەو جێم مەهێڵە
دەرگای دڵتم بۆ والاکە
بالەناختا بتوێمەوە
خۆت دەزانی کەوشکبووم
تەنیا بەعەتری هەناسەت
دەژێمەوە.

# بەرد ژنە ژنیەتی

بەهرە موفتی

چەندی دەستم لەبەر درزی دەرگاکان دانا
هەر پێ ڕانەگەشتم
ئەمانەتی سلاوەکانی
لەدەمی ترازان بگرمەوە
سەرنجەکان ئەسپەشێیانە لە بازنەکەم
ڕەتبوون
ئەفسووس هیچم لێ نەمایەوە
لە پەڕ پەڕەی هەیبەتم
وەلێ وەرزی دڵم غائیبە
داناگیرسێم
ئاه
تریفەییم کاتژمێرێکە ناوەستێ
موسیبەتی منە
دەستەکانم بوونە تەرازوو
لە عاتیفەی خۆمدا
چوارچێوەیەکم تەریبی نابم
وەلێ دڵم لەناو مێشکمدا چەقی
تاوەکو جادەکان بە خۆمەوە نووسام
داگیرسانم سانا نییە
قەد بە قەد بکرێمەوە
دەستم لەناو تۆڕی مێشکمدا چەقی و
بمبوورن وەڵامی پرسیارەکانتانم
پێ نەدرایەوە تا خاو خاو
لە هێڵی وێستگەکان بەجێمام
نازانم نا چۆن بتوانم
بەم هەموو جوانییەوە
بەتەنیا جێت بهێڵم
ئاخر من پرتەقاڵێکی گوشراوی دەستی تۆم

بۆ کوێم دەبەی درەختێکی عاشقی
بەپێوە سووتاوم
تۆ گوتت لە باخچەکەم دەترۆێنم
بە ئاوی وچاخت تەڕت دەکەم
کوانێ ماڵی دڵت بێ باخچەیە
ویستم لە دەمی ترازان هەڵناگیرێتەوە
چۆن بە دیار سەردەمێکەوە
قووڵبوونەوەکان نامخۆنەوە
نازانم چۆن ناشکێم و
دەستەکان لە توانا ناکەون
هاوار
جوانییەکانی ڕەزم بێ باخچەن
بێ تۆییم فەنایە
دڵێک لە باخچەکەما عاتیفەی نووری
لێ دەوەری
ئاخۆ زەنگی ئەم دەرگایە
تۆی هەگبە لە شان بی
ئاه بیرت لاپەڕە گەڵای
دەفتەرەکانم دەڕووشێنێ
دەڕۆم دەڕۆم ناگەمە تۆی وێستگەکەم
چیم گەرەکبێ کە درەختی سەفەرت
بەڕازەکانی من نەگا
چیم گەرەک بێ
چاوە دووربینەکانی پانۆراما
زیکە زیکی شکاندنە
بەددم نزگەرەوە دیالۆگەکانم
چەکەردیان دا
شەوم قژێکی تاری درێژە



هاو سەفەرەکەم
پۆستەی نێرگزییەکانیشت بەمن ناگا
پرتەقاڵی باخچەکەی ئەم دیوی
لەبەرخۆ وڕێنە دەکا
خەونە سپییەکان دەسکەنە ناکرێن
نازانم نا ئاخر من دارستانم بە چڵەکانتەوە
خۆشڕەوین دەترسم
لە هەژمەتی ژێر دەسکە گوڵەکانت
بەژاکانەوە پەلکێشم بکەن
زەمبیلەی دیارییەکانت بڕۆنزییە
خۆ پیشاندانی ئاویشت
بە هەناسە سوارییەوە
شەپۆلی خنکاند
هاوار
بۆ چلەی عاشقەکەم
ئاخر تازە لەڕووبارما ڕسکابوو
پێچاوپێچم
سەری خۆم بۆ هەڵناستێ
شانێکم باکوور
شانێکم باشوور
جوانییەکان بێ تەماشان
بنوارە فوارەی قەڵبەزەکان
لەناو شەقامەکانی دڵدا
چۆن دەلەرزن
کەس پێ نەزانێ
تەقەڵەکانی گومانم هەڵوەشێنەوە
بەقەد سەرە دەرزییەک ونم
کەسیش داینەگیرساندم
کە لە هێڵی وێستگەکانت بەجێمام
ئیتر پیاسەکان شەڕاوییەکی شێتانەبوون
لەناو تەزیندا هانا نییە
کەنارەکان بەقەد ڕێیەکانمان
چیرۆکی دوورو درێژیان هەیە
نەخشەی برۆکان
چیایانە هەڵمان دەدەن
بەچاوی لاریشەوە موگناتیسیانە
موتربە دەکرێن
لێوەکان کە دەبنەوە دەم
لەماڵیکردنی یەکتری ناکەون
پۆستەکان بەناوی تۆوە
وەرزی گوڵەکان دەچێنێ
تا وێنەی سەر فەخفوورییەکان
لە وەران بگرینەوە
تنۆکی ئارەقەکانی شەرمم
بە فێنکایی عەشقت سڕیەوە
تا دیدەی تیشکەکان پاسارییانە
هیوای باڵەکانیان بکەنەوە
کوچەو کۆڵان ڕەوە کۆتریان دەگمێنن
ئەمانەتی سڵاوەکان
گەڵا گەڵا بسپێرن
هاتنەوەکان گەڕانەوەیان نییە
درەختی سەفەرەکان
لقێکی مەرگن لەناو مندان
چوار گەڵام بیرناچێتەوە
دوو گەورە گەڵای ئازیزیشم ڕامدەچڵەکێنن
بروسکە بروسکە
هاودۆستانە
کڵاوەکان لەسەر دەکەین
بروسکە بروسکە شێتانەش
لەسەر یەکتریش دایدەکەنین
لەبەردەمم دانیشتنی و هەستای
ئاه
تا تەمەن بچەمێتەوە
ئاسەواری ماچەکانمان هەورەو
بەناوی عەشقەوە دەگرمێنن
تا لۆچەکان لەدەست وەشاندن دەبنەوە
دەبمە گۆچانی بەردە بازت
هەمیشە لە پاڵتەوە دەحیلێنم
ئەمجارە ناهێڵم سەرنجەکان
ئەسپە شێیانە ڕەت بن
پەڕ پەڕی هەیبەتم بە داگیرساندن
قەد بەقەد دەبنەوە
لێواو لێو دەبم
خەونەکان بەرگێکی نەگۆڕن
پیتی ناقڵیشێ
خەونەکان عەشقێکی ئیسفەنجین

هەرچی لەپۆستەکەتەوەبێ دەمێژێ
درەختەکانمان بەیەک ڕەگەوە
ڕژانە یەکتریو زمانی با دەشکێنن
هەگبەی خامەکان
ڕۆژنامەیەکە تادێ
ئیستێتیکیانە دەمەیێ
بۆ نەمریی سبەینێ
لەبەردەم درێژبوونەوەدا

لق و پۆپیان لەناو یەکتریدا جوان دەبنەوە
لەناو حەوزی ژیاندا
ماسییەکان زەماوەندی بووکێنی دەگێڕن
بڕیار وایە گرێیەکان بدوێن
چونکە کێڵگەم ناتوانم بەقەد
گوڵەگەنمەکانت هەستم
چونکە دەکێڵدرێم
بوومە پەیژەو بەسەرم هەڵدەگەڕێن
خۆزگە بەدەستێکی گران
وەرم سووڕاندبای
زەوی دەستی نەگرتبام
خۆزیا پۆستەکان بەناوی ژنەوە دادەگیرسان
بنووسرابا
سروشتی مکیاژی پێناوێ
قۆپچەی گەورەن داتاندەخەن و
دەتانکەنەوە
تا پۆستەکان پاسارییانە خۆیان بە ژوورەکەم
دا دا
بە بای ساردی ژنە دراوسێیەکانمان
ڕاگوازرانەوە
پۆستەکان بە میوانێکی بێ ناونیشانەوە
نووشتابوونەوە
تاو نا تاوێ لە بێزاری کە مانگ بزر دەبێ
دێنەوە
لە تاقی چاوەکەم دادەگیرسێن
پۆستەکان تەڕایی گوێزن
دەستم شاهیدە
من گەڕیدەی ناو ئەشکەوتی هەورازو
نشێوی بەرزەخم

لە دیارەوە بۆ نادیار
منداڵدانی جۆگەکانم
ئاوەڕۆی لێ ونبووە
تۆ بڵێی هیچم لێ نەدۆزنەوە
لە حیکمەتی بلوێریکەوە بوومە قامیش
جادەکان خۆڵاوین
بەم هەموو حیکمەتەوە
نام پەڕێننەوە
پەت پەتیی من بۆ ئەم عەشقەیە
هەر دەبووایە خۆشم ویستبای
پەت پەتیی من بۆ ئەستێرەیەکی ڕژاوە
بوونەکانی تەنیاییم تاڵە تاڵە
پەنجەی نۆتەم دەمی خۆزگەکانی نەبوو
سەری پێ دابکا
وەرزی دڵم غائیبە
لەگەڵ شکانی گۆزەکەت ڕۆیشتەوە
لە دیارەوە بۆنادیار
لە نادیارەوە بۆ دیار
بە کوڵێکی نیسانەوە مەرحەبام دەکا
پێ دەچێ کۆتایی نەبم لە دووبارەبوونەوە
هەرجارەی یەکێکی سەردەم پرمان دەکاتەوە
پەرجووە ژیان بەدوامەوەیە
کورسییەکان هەرجارەی یەکێک دەیانگرێتەوە
چەترەکان چەپکە گوڵێکی دەسکە
کراوی ڕەشن
وا دەجەنگێن لەگەڵ شۆڕشی ئاوەکان
چەند بەزەییم بەدرەختەکان دێتەوە
بێ ویستی خۆیان تەڕ دەبن
چەند بەزەییم بەم ئاگرە دێتەوە
چۆن ستەمێکە بەم هەموو ڕووناکییەوە
دەکوژێتەوە
چەند سەرەتایەکی تێنەگەیشتووین

بەدەم گەمەکانی منداڵیەوە
ئەوەندە هەژاین تا گەورەشبووین
لەناو دەستارەکان
دڵەکانمان کوترا
چاوەکانمان مودمین بوون بەشەوین

هەر زەمەنەو جێماوی بچووکی خۆیەتی
نا
گەورەی خۆیەتی
بەزەییم بە قەلای قەیرە کچ دێتەوە
ژنە ژنیەتی بێ ئەوەی کەس گوێی بۆ ڕاگرێ
دایکە حەوا بۆ کوێم دەبەی
وەکو تۆ تەنیام
تریفە بەرم نادا
بەچاوی خەوالووەوە بۆ کوێ دەچی
کەس گوێ شل ناکا مریەمە خەوتووە
قەناعەتم وایە
لەناو خۆماندا بنێژرابایەنەوە
وەکو کە دایکن
پردی سیراتی و ناشمان گرتەوە
ژیان لەناو ژندایە
قەپێلکی ونبووە
ژن دیواری ژیانە
ئەم سەرو ئەوسەرم دەکەم
ئاخۆ تۆی هەگبە لەشان بی
چۆن بەدیار سەردەمێکەوە
قولبوونەوەکان نامخۆنەوە
قەوزە دەمگری بە جگەرە
سەوزەکانی دادەگیرسێم
من عاشقم بە هەموو شتێک
کە جەستەی ئیسفەنجیم بیمژی
بروسکەم پێیە لە بیستن و بینیندا
پەیڤی گۆڕانییەکانم
درێژو ئەستوورە نایبیسن
دەڕۆم دەڕۆم دەڕۆم
سەوڵی تۆم دەوێ
هەورازەکان جمەیان دێ
دەترسم ژیان لەدەست قەدەردا بدۆڕێ
قسە لەقسەدا نەکرێ
لەنێوان خەزان و وەرانی قژم نیگەرانم
تۆ بڵێی دەمانچە بم لەسەر دەستە تەرازووەکانت
یان مۆسیقا بم لەسەر پردی سیراتت
نازانم نا
لە پەندەکان دڵۆپێک
ئاوم نەخواردەوە
ئەی ئەوانەی دەستم ناتانگاتێ
خۆتان خوای خۆتان
ئەی ئەوانەی لەناو مندا
خۆیان پەڕاندەوە
وەرزە حولحولییەکان بەرتان نادا
هەورازەکان جمەیان دێ
دەترسم دەستەکانم
بەردەوام بن لە کەوتن
چونکە پێچاوپێچی کوچەو کۆڵان
چاویلکەکانی سەردەمن
چەند ئەستەمە
درەختی سەفەر
لە دیوارەکان
بێ پەنجەرەن
قەپێلکی زەمین درۆزنە
دەستە سڕەکەم گەورە نەبوو نا
لەگەڵ دەنگی پێی سۆران بوورامەوە
زەوی دەستی گرتم
لەگەڵ دەنگی سۆران
چەمەکان وەرسووڕان
بەرد ژنە ژنیەتی
پۆستەکان گەیشتن
هەورازەکان بە ژوورکەوتن
درەختە هاو سەفەرەکەم
لەگەڵ زەنگی دەستت
منت داگیرساند
تریسکانە یەکترمان بڕی
لەناو حەوزی ژیاندا
بەدووی سەمای ساوایی
پەیمانەکان دران
لەگەڵ هەڵهەڵەی پاسارییەکان
باڵای شیعرەکان
بوونە دەسکەنە گوڵی سپی
پۆستەکانی ڕێ بوونەوە
قەدقەد داگیرسان
بخوری عەشقمان نەکوژایەوە نا
نا نەکوژایەوە نا ..

# تاڕمایی

لەیلا محەمەد



هاوارێک دێتە گوێم نازانم چیە
پێدەچێت ئەو چریکەیە بێ
کە لە منالیمەوە گوێم لێیەتی
ئێستاش زرینگەی دێت و پێم دەڵێت
نۆی ئەی تەنیاترین مەخلووق
ئەی ئەوکەسەی لە خودا تەنیاترو
لە شەیتان گوناهبارتر
لە ئاسمان بەرزترو
لە زەوی سەختتر
بچۆ جلێکی نەدیمانە لەبەرکە
چیتر چاوەڕوان مەبە جارێکی تر
لەسەرتا گوڵ بڕوێ و لەچاوتا مانگ
لێرە هەمیشە شەو هەیە
لە شەوە زەنگیشدا مانگ شەرمنە
من پاشۆڵێک خەمم پێیە
نە(با) دەیباو نە ئاگر دەیسوتێنێ
تەنیام....
هەر ئەو تەنیاییە خەریکە دەمخنکێنێ
دەرگای ژوورەکەی داخستووم و
کلیلەکەشی ون کردووم
پەنجەرەکانیش هیچیان ناکرێنەوە
ژەنگێکی زۆریان گرتووەو
خەریکن دەمخنکێنن
ئێی تەنیایی چەند لە ژوورەکەم ناشرین تری
ناشرینی هەر لەخێو دەچی

# ته‌م

سمکۆ جه‌باری

ئه‌یادا دڵم چاندوو له گۆڕستانی ژانا
بیره‌وه‌ریم به‌زامی رۆژگاره‌کان نووسیه‌وه
له خه‌ڵوه‌تگای ئه‌وینه زه‌رده‌کانا.. نووته‌کم داو
به‌های شکۆمه‌ندی خه‌ونم چنی
به‌بازووی مردووه‌کانا سه‌رکه‌وتم
ناونیشانێکم بۆ تۆو ئه‌وینت نه‌دۆزیه‌وه
ئه‌و ڕازانه‌ی له گه‌ڵا که‌سکه‌کان
په‌شیمانیان ده‌ژمارد
به‌ناوره‌نگ.. دانه‌ی فرمێسکیان کۆده‌کرده‌وه
له‌خه‌ونێکی شه‌وه ئاڵه‌کاندا
بوونه باران و
به‌سه‌ر سنگی دێره شێواوه‌کانا
دایان کرده‌وه
ڕه‌هێڵه‌ی شیعر.. له‌بارێزه‌ی خۆزگه‌یا دامرکاو
ئه‌لبوومی چاوه‌کانت.. تازی ئاسمانیان ماچ کردو
ده‌نگێک له بالووره‌ی شه‌وه‌کان دابڕا
زایه‌ڵه‌ی سۆفیه‌کانی به‌سه‌ر گڵا ده‌گریان
دووریانێک مردن و درووشمی برانه‌وه‌یه‌تی
به‌چڵی عومری خۆر داگیرسایه‌وه
له‌م مه‌ینه‌تیه‌دا.. کاروانسه‌رای شه‌یداکان
نیازیان سوارێکی ناواده‌ی بێ ناونیشان بوو
چاوه‌ڕوانیی گه‌ردنی گوڵی ده‌بڕیه‌وه
خاکی به‌ماچی په‌پووله قایل ده‌کرد
مه‌زاری عه‌شق..
تا ده‌هات سیاچه‌مانه‌ی ئاواره‌ی ده‌ووت
(نالی) له حاڵی زیکرا بوو
«مه‌ولانا خالید» دڵی کردبووه ده‌ف و
ده‌بووه ئاڵای جوانترین وڵات
مناڵه‌کان چنگیان له‌خۆڵ ئه‌دا
ئاماده‌بوون بۆ دواگۆڕانی ژیان و خه‌بات

دڵم شین بوو..
چرۆی رووحم خه‌راباتی شه‌هیدان بوو
به‌ڕێگای دووری کاکێشانا
حه‌زم به‌دیده‌نی ئه‌نفاله‌کان ده‌کرد
ڕادیۆکان سروودی ئه‌مریان ده‌ووته‌وه
له درزی په‌نجه‌ره‌ی ژووره‌که‌مه‌وه
چاوم به‌نیگای کزت که‌وته‌وه
ئه‌شک گه‌ردنتی ده‌ماڵی
دیده‌کانت دوو په‌پووله‌ی قشت بوون
له پڕێکا ده‌روازه‌کان داخران و
خه‌ونه‌کانم به‌دوای ته‌رمی بالآدا چوون

**تشرینی یه‌که‌می ٢٠٠١**



# سلێمانی، بەکەپیتاڵ ئێس



فەریق حەسەن

**بۆیادی چیرۆکنووس و ئینسانی خاوەن هەڵوێست و کوڕی شارەکەم، جوانە مەرگ (رەفیق فایەق) پێشکەش .. کاتی خۆی هەر خۆشی بیرۆکەی ئەم چیرۆکەی بۆ گێڕاومەتەوە. بەڵێنم دابوویە بیکەم بە چیرۆک.. یادی بەخێر.. م. ف**

قۆڵی دیزداشە خومینە سادەکەی تا بنهەنگڵ هەڵدابووەوە. جامەدانییەکی خەت شاشی چەند جارێک قەدکراوی بەسەر شانێکیدا دابوو. لەژێڵدا خۆی پێداکردو دەهاتە پێشەوە. بەدوو پێی پانی نێو جووتێ سۆلی پاژنە سواوەوە دەهات، هەر هات.. ئەو هەیتا هەیتا چاوە بەگومانەکانی دەگێڕا، هەر گێڕانی..

دەستی بەسمێڵە رەشە قەترانییەکەیدا دەهێنا، هەر هێنای. ئەمسەرو ئەوسەری سمێڵی بەرزدەکردەوە، هەر بەرزیکردنەوە. هەتا تەواو هەردوو سەریانی تەرازوو کرد دەستی پێیانەوە بوو، هەر پێیانەوەی بوو..

مینا بۆ ناسیارێک بگەڕێ، گلێنە خۆڵەمێشییەکانی ژێر سایەی ئەبرۆ تێکپەڕیوەکانی دەگێڕا، هەرگێڕانی..

ئەم قومێکی لێداو ئەویش رێک بەرامبەری وەستا . هەر وەستاو وتی:

- مساکم الله بالخیر.. ممکن اگعد؟(ئێوارەتان باش.. بۆم هەیە دانیشم؟)

ئەو چاوەڕوانی وەڵام بوو، ئەمیش لەکڵاوە سپییەکەی سەریەوە تا بە پەنجەکانی پێی دەگات، کە بەوێنەی پێنج جووت بۆرەمار لەسۆڵەکانییەوە سەرەتاتکێیان بوو، دایە بەر مەزندە. لەسەر قایشە رەشە پانە تەرەقە رێژکراوە بە ئاوزونە ستیلە بریقەدارەکەی کەمەری وەستا برێ زووم ئین و زووم ئاوتی لەسەر کردو بزەیەک لێوەکانی کشاند. دەیزانی داب و نەریتی بارەکانی پایتەخت لەهی شارەکەی خۆی جیاوازەو بۆی نییە دوو کورسی و مێزێک بۆ خۆی تەرخان بکات. بۆیە وەڵامی ئێوارە باشەکەی دایەوە و سەری ئەریێ بۆ لەقاندو وتی:

- تفضل اگعد؛(فەرموو دانیشە!)

*

پاڵێکی قایمی بەدەرگا ئەلەمنیۆمە شووشە بەندەکەوە ناو وەژووورکەوت . بە وەژوورکەوتنی گوژمە بایەکی فێنک بەیەخە داچەکاوەکەیدا هەڵیکردە نێو سینگە تووکنەکەی.. ئەو پێشتر دوو دوگمەی کراسە نیوقۆڵەکەی ترازاندبوو.

دەرگاکە دوای دووسێ جووڵە چووەوە سەرسەمتی جارانی و ئەمیش ملی نا، راڕەوێک بارەکەی دووکەرت دەکرد. بەهەردووبەردا مێزەکان بە رووەمێزی سەوز داپۆشرابوون. سوراحیی ستیل و ژێر سیگاری شووشەی کریستاڵیی سەهۆڵین- یان لەسەر جێگیر بوو. خاوی کردەوەو چاوی گێڕا.

ئەنجام لای مێزێک گیرسایەوە دوو کورسی لەدەور

مابوو. دوانەکەی دیکەی چووبووە پاڵ مێزە جەنجاڵەکەی سەروتر. بەرلەوەی دانیشێ ئاورێکی دواوەی دایەوەو لەدڵی خۆیدا وتی:«خراپ نییە. لێرەوە بەروونی راستە شەقامەکەم لێدیارە.» جانتاکەی لەشانی داماڵی و جێگیر بوو.

بۆ بابایەکی وەک ئەوی رێبواری چلەی هاوینی بەغدا، بایە فێنکەکە بایی هەمووی بوو.. ئەو کردبوویە نەریت، هەرجارێ بەنیازی کڕینی کەل و پەل بۆ دووکانەکەی رێی بکەوتایەتە ئەم شـــــارە، لەرێـوە لایـدەدایە یـەکێ لەبارەکانی(سەعدون) و لەوێ چند ساتێکی دەگوزەراند.

دیسان چاوی گێڕایەوە. تەواو لەوە دڵنیا بوو کە بارەکە ناسیاوی لێ نییە.

ئیدی کاسکێتەکەی داکەندو دمەونخون لەسەر مێزەکە دایناو چوار پێنج جـاران لەپی دەسـتی بەتەپڵی سـەرە ئارەقاوییەکەیدا هێناو هەر بەسەری پەنجەش، ئەو چەند تاڵە قژەی بەلاجانگ و پشت ملییەوە مابوون دایهێنان. هەناسـەیەکی پڕ بەسـیـیـەکـانی هەڵکێـشـاو بەرەبەرە ئارەقەکەی کزبووەوەو هەستی بەفێنکاییەک کرد.

سەرێکی دەستشۆرەکانی دا. بەچەند شڵـپـێک تەواو خۆی فـێنک کـردەوە. مـاوەیەک لەئاوێنەکـەدا لەبـیـچم و قەڵافەتی خۆی راما. سەرێکی رووتاوەی ساف وبەبریقەو سینگێکی تووکن و پاشماوەی زەردەخەنەیەک...

گـەرسـۆنەکـە بیـرەیەکی(لوئلوئە)ی بۆ هەڵپـچـڕی و سەرەکەی بۆ خسـتە نێـو ژێرسیگارەکەوە. دڵۆپە خوناوی دەوری شووشە مەیلەو قاوەییە تارەکە، تەزوویەکی ساردی بەنێـو لەپی گەیاند. تەزوو بووبە مـوچوڕک و بەگـیـانیـدا گەڕا. کەف تا لێـواری پێکەکە هەڵچوو. ئەمـیش لێـوی پێوەنا.

چاوێکیشی هەر لەلای جامخانەکە بوو. خێرا کاسکێتە بێجیبەکەی تەپاندە سەری کاتێ زەلامێکی رەشتاڵەی دی رۆژنامـــەیەکی لوولکراوی بەدەســـتـــەوە بوو. ئەو رۆژنامـەکـەی بەهەفـتـەنامـەی(هاوکـاری)و زەلامـەکـەی بەناسـیـاوێکی خـۆی چوواند. نەخـتێ قـەڵافـەتی خـۆی رێکخست و قنج پاڵی بە پشتی کورسییەکەوەداو چاوەڕێ بوو سـڵاوی لێـبکات. لێ نەرۆژنامـەکـە هاوکـاری و نەرەشتاڵەکە بەناسیار دەرچوو. کاسکێتەکەی داکەندەوەو دەمـەونخـون لەسـەر مـێـزەکـە دانیایەوە. چاوی گـێـڕا. هەسـتـیکرد سەرنجی کـەسی بۆ لای خـۆی رانەکـێـشـاوە. ئەوان سەرقـاڵ بوون بە دەست و دەم و چاو بۆیەک دەدوان و بارەکەش وردە وردە جەنجاڵ دەبوو.

*

هاونشـینی چاوەڕوان نەکراو جامەدانییـەکەی لەشـانی داگرت و بەهەمـوو هێـزییـەوە رایوەشـاند. شـەقـقـەیەکی لێـوەهات و بۆ هەناسـەیەک سـەرنجی مێزە جـەنجـاڵەکـەی تەنیـشـتی راکـێـشـا. ئەمـجـا دەسـتـووری پێـشـوو بە سەرشـانیـدا دایەوەو رێک بەرامـبـەری دانیـشت. بـانگی کردە گەرسۆنەکە:

– بیرتین و ماعون لبلبي!(دوو بیرەو قاپێ نۆکاو!)

چاوێکی خـێـرای بە سـەروپۆتەڵاکی بەرامـبـەرەکـەی و سەرمێزەکەدا گێڕاو وتی:

– إسمي فرهود!(ناوم فەرهودە!)

ئەمیش گاڤەک بێدەنگ ما، ئەمجا وشەی (فرهود)ی چەند جارێک پاتە کردەوەو وتی:

– وأنا رفيق فائق!(منیش رەفیق فایەق-م ناوە!)

– يا أهلا و سهلا بالرفيق فائق. موكلّنا رفاق الحمد للّه.(١)(سـەرچاو هاورێ فـایەق. سـوپاس بۆ خـوا هەموومان هاورێین.)

– رجاء لاتفهمني غلط، آني مو رفيق حزبي. بكل بساطة إسمي رفيق و والدي اسمه فائق! (تکایە بە هەڵە لێم تێمـەگـە. من رەفـیـق حیـزبی نیم. بەڵکو خۆم ناوم رەفیقەو باوکیشم فایەقی ناوە!)

رەفیق نەختێ بەدەمارگرژییەوە ئەمەی وت و فرهودیش وتی:

–افتهمت . مومشكله!(تێگەیشتم. کێشەیەک نییە.)

ئەمەی بەدەم زەردەخەنەیەکی دۆستانەوەو وت. ئەمجا پێکەکەی بەرزکردەوە:

- چریو، حتی الچعب!(نۆش ، تا بنی پیاڵە!)

فرهود ئەمەی وت و رەفیقیش(نۆش!)ی بۆ سەندەوەو زەردەخەنە گەڕایەوە سەرلێوی و قومێکی لێدا . لێ فرهود بینی پێوەنا. چۆڕێ کردو خێراش پێکەکەی پڕکردەوە، ئەمجا زرم، ئانیشکی دادایە سەرمێزەکەو بەجارێک چی لەسەر بوو زرنگانەوە. پۆزێکی بە ماسولکەکانی مەچەک و باڵی راستی لێداو وتی:

- فلنبدأ!(بادەستپێبکەین!)

بەم پۆزلێدانە کوت و پڕە، رەفیق ساکاو چاوەکانی زەق کرانەوە. دوای کەمێک پرسی:

- نبدأ بماذا؟(دەست بەچی بکەین؟)

بەحەپەساوییەوە ئەمەی پرسی. ئەویش هێشتا ئانیشکی لەسەر مێزەکە بوو وتی:

- لوي الذراع! (باڵ شکاندنەوە!)

رەفیق نەختێ تەکیدایە دواوەو نەیتوانی سەرسوڕمانی خۆی پەردە پۆش بکات. بۆیە بەگاڵتەجارییەوە وتی:

- هسة ما عندي وهس. تعال باچر!(ئێستا تاقەتم نییە. سبەی سەر بدەرەوە!)

لەبەر خۆشییەوە وتی:«لەو جۆرە کەسانەیە، هەر کە جوابی سڵاویت دایەوە یەکسەر پێتدەڵێ: بێ بازۆران بگرین!»

- آني كل وكت عندي وهس. من الوجهة الرياضية عدم قبولك بالمنازلة معناها القبول بالخسارة!»(من هەردەم ئامادەم. لەرووی وەرزشییەوە کە تۆ ئامادەی بەرەنگاربوونەوە نەبی مانای وایە بەدۆڕاندن قایلی!)

رەفیق بزەی هاتێ وتی:

- خسارة ماذا؟(دۆڕاندنی چی؟)

- بيرتين!(دووبیرە!)

- بس انت مومن وزني. انت من وزن الذبابة. آكيد تخسر! (بەڵام تۆ کێشی من نیت. تۆ کێشی مێشی و دڵنیام دەدۆڕێی!)

فرهود کە بەدانیشتنەوە هێندەی رەفیق دەبوو بەپێوە، تەواو پاڵی بەپشتی کورسییەکەوە دا. زیاتر قۆڵی بۆ بنهەنگڵ هەڵماڵی، سینگی دەرپەڕاندو بەدەم پۆزلێدانەوە دەمارەکانی مل و قۆڵ و بازووی بەوێنەی سوجەمار دەرپەڕین و پاشان بەرەفیقی وت:

- پۆز ، بللا پۆز. أحب اشوف عضلاتك! (پۆز لێدە، داپۆز لێدە. دەخوازم ماسولکەکانت ببینم!)

- ماكو داعي!(پێویست ناکات!)

رەفیق بەلووت هەڵبڕینەوە ئەم وەڵامەی دایەوە. هەر بەلووتیشی فنگە فنگێکی کرد، لەپێکەنین دەچوو.

فەرهود وتی:

- أنا بغدادي أباً عن جد. جنابك من يامحافظة؟ (من لە بابەلبابەوە بەغدایم، ئەدی بەرێزتان خەڵکی کام پارێزگان؟)

- من السليمانية.. سليمانية بكپيتال أس!(خەڵکی سلێمانیم.. سلێمانی بە ئێسی کەپیتاڵ!)

رەفیق وشەی(سلێمان)ی بەشانازییەوە وت و لەگەڵ گۆکردنیدا گەردنی بۆ هەڵبڕی.

- ياهلا بأهل السليمانية!

فرهود دەستی دایە سەری بیرەکان و لەنێو لەپیدا هێنانی و بردنی و لەسەری رۆیی.

- زمان كنت جندي بمنطقة بنجوين.. الشمال جنّة!(ماوەیەک لەناوچەی پێنجوێن سەرباز بووم.. باکوور بەهەشتە!)

- قل كردستان ولاتقل الشمال!(بڵێ کوردستان و مەڵێ باکوور!)

رەفیق بەمۆنێکەوە ئەمەی وت و فرهودیش دەستی بە پێکەنین کرد.

ذكرتني بالعالم اللغوي.. نسيت اسمه!(زانا زمانەوانەکەت بیر خستمەوە. ناوەکەیم لەیاد نەماوە!) ئەمجا لەسەری رۆیی:

- عـجـيـب غـريـب. مـن السـليـمـانيــة و مـاتقــبل بالتـحدي؟(سـەيرو سـەمـەرەيە . خـەڵكی سلێـمـانیت و كەچی ئامادەیی بەرەنگاریت تێدا نییە!)

سـەیرترین شـوێنی فـرهود سـمـێڵـەکـانی بوو. بەوێنەی سەعـاتێکی قەد دیواری میل رەش و پان و لەسـەر دەو دە دەقیقە بێ، ئاوا دەینواند.

رەفیق لەدڵی خۆیدا وتی«دەڵێن: هەن خورمای لێدەدەن تا سمێڵیان رەپ بوەستێ. رەنگە ئەمیش..»

فـرهود بەنـیـازی پـیـشـاندانی هـێـز، بەگـوشـارێـک سـەرە بیرەیەکی لەنێوان پەنجە کەڵەو پەنجەی شایەتمانیدا دووقەد کـرد. سـەرنجـێکی بەمـانـای گـرتە رەفـیـق و سـووکێ سـەرە سۆدە نوشـتاوەکەی هەڵدایە بەردەمی.رەفیق بزەی هاتێ و دوو جگەرەی سـۆمـەری درێـژی لە پاکـەتەکـەی دەرهێـناو یەکـێـکیـانی بۆ فـرهود درێـژ کـرد. ئەویش بەسـوپاسـەوە لێیـوەرگرت و خسـتـیـە نێوان لچ و لێـوی و چاوەڕوان بوو بۆی داگـیـرسـێنێ، ئەمـیش بە چەرخـە ڕۆنسـۆنەکەی بۆی ئاگـردا.. رەفـیق وەک جگـەرەکـێش نەفـەسـێکی سـووکی لێـداو ولووتە پانەکـەی بەرزکـردەوەو دووکـەڵەکـەی هەوراز بەباکـرد. فـرهود سـەرە سـۆدەی دووەمـیـشی خسـتـە نێـوان جووت پەنجەی وبە زەبرێکی کەم، بگرە هەر زەبریشی پێوە دیار نەبوو. ئەمـیـشیـانی نوشـتـانەوەو زەردەخەنەیەکی بۆ رەفیق کرد و سووکێ بۆی هەڵدا.

رەفـیق بیری لەلای مریشکی بەتەنوور برژاو بوو.پاشان تاوێک لەئوتێل نێـرگـز لەژێر دووشـێکدا خـۆی فـێنـک بکاتەوەو ئەمـجا لێیبـخەوێ. بۆیە هیچ پەرچەکرداریکی بۆئەم هێز پیشاندانەی فرهود نەبوو.

کڵافـەیەک دووکـەڵی بۆ ئاسـمـانی بارەکـە سـەرخـست و دیتی دوو فـیـلەتەن ئەمـدیو ئەو دیویان لەفـرهود گـرتووەو دەسـتووری فـرهود سـەروجـامـەدانـییـان بەسـەر شـاندا داوەو سـمـێـڵـیـان وەک چەور کـردبێ دەبریقـانەوە. ئەمـسـەرو ئەوسـەری سـمـێـڵـیـان بەوێنەی چزی دووپشـکە رەشـە، کەوانەیی روویان کردبووە روومەتەکانیان. هەردوولایان لە

فـەرهود کـەتەترو مـەچەک ئەسـتوورترو یەک لەیەکـیـتـر. بەتوێی دیزداشـەو سـۆل. کـەمـەریان بێ پشـتـوێن و لەدیزداشـەکـەیانەوە وەک ژن بن و مـانگی خـۆیان بێ، سکیـان هەڵـتـۆقـیـبـوو. ئەوان کـڵاوی پەلی سـپـیـیـان لەسەردابوو. فرهودی ئەوق بوو، گلێنەی چاوەکانی لەنێوان ئەو دوو فیلەزەلامەدا ناجێگیر دەهاتن و دەچوون. رەفیق لەدۆخەکە ناحاڵی بوو.لەپڕ ئەوەیان کە جامەدانیی سووری لەسـەرشـان بوو، زللەیەکی گـەیاندە تەخـتـی روومـەتی فرهود. زلەکە هێندە کـوتوپڕو کاریگەر بوو، یەکەو راست کڵاوەکەی فرهود فڕی. لایەکیش لە سمێڵی شۆڕبووەوە. ئەو سمێڵە کۆک و میقاتکراوەی تاوێ لەمەوبەری تاق و فـیق وەسـتـا.. بەشـوێنیـدا دووەمـیـان، کە کـانە خـورمـا، لایەکی روومەتی هێڵکاریی کردبوو، شاق بۆی سەندەوەو زللەیەکی سـرەواندە ئەولاکـەی و ئاگـری لە چاوی فـرهود کـردووەوە. جـامـەدانیـیـەکـەی سـەرشـانی پەڕی و کـەوتە سەرزەوی و ئەولاکەی تری سـمێڵـیشی داکەوت. سمێڵی ژمارە هەشتی دروست کرد.

شــەقــەقــەی ئەم زللە چاوەڕوان نەکــراوەیان ســەری بەدانیـشـتـوانی بارەکـە بەرز کـردەوە. رەفـیـق لەنێـوان نیگەرانی و گاڵتێندا تیاما. لەبەرخۆیەوە دەیمرتاند:

«ئای لەو سـمـێـڵـە..!! لەپڕ لەدەو دە دەقـیـقـەوە بوو بەهەشت و بیست!!»

ئەمـەی لەبەرخۆیەوە وت و پرمـاندی. لێ زوو دەسـتی بەزارییەوە گرت نەبادا بداتە قاقای پێکەنین.. چاوەڕوان بوو فرهود بەگژیاندا بچێتەوە. لێ مینا کەوی بەزیو چوو. روو بەکانە خورماکەیان پێیوت:

- نتشاوف!(یەکدی دەبینینەوە!)

زەلامە تەژە رموزەنەکان لێیاندا رۆیشتن. فرهود بەنگ و گـێـژ،رەنگکزو شـانکز، چووەوە قـاوغـەکـەی و ورتەی نەکرد.. هەر تەژەکـان پشت پێیـان هەڵکرد و گـەرسـۆنی تاین پەیدا بوو. پسـوولـەیەکی چکۆلەی لاکـێـشـەیی لەبەردەم فرهود دا داناو بەدیاریەوە روا. رەفیق لەمەشیان

نەگـیـشـت. لەپای چی بێـشـەوەی فـرهود خـۆی داوای حـسـابی کـردبێ ، گـەرسـۆن بەوێنەی هەڵۆ لەسـەری ئامادەبوو؟

رەفـیـق دەسـتی بۆ ژێر سیگارەکـە درێژکرد. هێـشـتـا چەند سـەرە بیـرەیەکی ساغـی تێـدا مـابوو. فـوویەکی لەیەکێکیان کردو لەسەرخۆ هەڵیدایە بەردەم فرهود.

رەفیق هیچی نەوت. بەسەرنجە گاڵتە ئامێزەکەیدا دیاربوو داوای لێدەکرد لەسەر نوشتاندنەوەی سەرە بیرە بەردەوام بێ. لێ ئەمجارەیان هەڵوێستی فرهود جیاواز بوو. نە ئەو کـەیف و رووخـسـارە زیـتـەی مـاو نە ئەو سـمێڵـە قنج و قـیـتـە. نە ئەو سـینگە قـۆقـزەی تاوێ لەمەوبەریشی مت.

ئەو زەلامـــە چەتەوڵەی تاوێ لەمـــەوبەر پڕ بە چنگێکی مـایەوە.. گـەرسـۆنەکـە هێـشـتـا بەژوور سـەریـیـەوە وەسـتـابوو، چاوەڕوانی حـسـاب بوو. لەو مـاوەیەدا رەفـیـق سـەرە بیـرەیەکی دیکەشی بۆ هەڵدا. سـەرە بیـرەکـە نەختێ خولایەوەو پاشان لەبەردەمـیـدا لەسـەر پـسـوولەکـە گـیـرسـایەوە. فـرهود لەنێـوان پسوولەکەو سەرە بیرەکان و سەرنجە گاڵتەجارانەکەی رەفیقدا تیا مابوو. لەگەڵ فێنکی جێیەکەشدا هێشتا هەر چەند دڵۆپە ئارەقـەیەک بەوێنەی خـونـاڤی قـەد شـووشـە بیـرەکـان لەچالایی نێـوان روومـەت وکـەپووە بەخـاڵەکـەیدا ریز ببـوون. ئەم دیمەنە بەزەیی رەفـیـقی جووڵاند.. گەرسۆنەکەش بە بێئوقرەییەوە وتی:

- بلا زحمة حساب!( بێئەرک حساب!)

فـرهود کـەوتە پشـکنینی گـیـرفـانە چکۆلەکـەی سـەردڵی. لەوێوە بۆ گـیـرفـانەکـانی خـوارەوە. دەسـتی گێڕایەوە. ئەمجارەیان بەپەلەو بەهەردوو دەست

گـیــرفــانەکــانی سـەنـگ و سـووژن داو مـیـقـری نەدۆزییـەوە . شـپـرزەبوونەکـەی فـرهود بووە مـایەی نیگەرانییەکی دیارو لەسەر رووی رەفیق پەرچ بووەوە. وەکی دی کاتێ دیقەتی سـمێڵـە شـۆڕەکەی دەدا بزەی دەهاتێ.

بە لووت پێدەکەنی و زگیشی لەگەڵیدا دەڵەرییەوە. لەپڕ رەفیق وتی:

- حسابه علي!( حسابەکەی لەسەر منە!)

بەم دوو وشـەیە کـۆتایی بەو دیمەنە هێنا. هەرچی فـرهود بوو زمـانی بەسـتـرابوو. نە وتی سـوپاس و نە خوافـیـزیشی کـرد. هەناسـەیەکی قـووڵی هەڵکێشـا. هەردوو دەستی دادایە سەر ئەژنۆکانی و هەڵسا . رێک رووی کـردە جـامـخـانەکـە. لێ بەرلەوەی ئەودیو ببێ رەفیق بەدەنگی بەرز هاواری لێکرد:

- استاذ فرهود!(مامۆستا فەرهود!)

ئەم بـانگکردنە نـاوەخـتـەی ، مـینـا تێـخـوڕینێک وەهابوو، ناوکی فرهودی خست و وێنەی قیـرو بنێشت سۆلەکانی بەکاشیی بارەکەوە لکاند. سۆلکانی هەر روویان لەدەرگـای بارەکـە بوو لەکـاتێکدا لەکـەمـەری بەرەو ژوور بە لای دەنگەکـەدا بایدابووەوە. رەفــیـق ئەگـــەر چی چوارشـــانەیەکی دەســـتـــە بـاڵا بوو، لەهەناسـەیەکدا لەروانینی فرهودەوە بوو بەحووجی نێو ئەفـسـانەکـان. ئەو کـڵاوەکـەیو جـامـەدانییـە خـەت شاشەکەی خۆی بەدەست رەفیقەوە بینی.

رەفـیـق تاهێزی تێدابوو. لەسـەر دەقـەکـەی پێـشـووی جامەدانییەکەی راوەشاند.

شـەقـەقـەیەکی وەها قـایمی لێـهـەڵسـاند، ئەو لەوێوە نەیتـوانی چاوە خەجاڵەتبارەکانی نەترووکێنێ. لەجێی خـۆی راوبوو. نە ئەم هیــچی وت و نە ئەو. ئەوەندە هەبوو رەفیق بەدەم رێوە بەدەستێکی جامەدانییەکەی بۆ دەهێنا و بەدەسـتـەکـەی دیکەیشی ئیـمـاژەی سـەرکـەوتنی(٧) بەرەو روو بەرز کـردبۆوە. چاوەکـانی پڕی دروشانەوەدو لێوەکانی تژیی زەردخەنەبوون.

**تەمووزی ٢٠٠٢**

**(١) لەوڵاتی عـێـراق، رفـیـق یان رفـیـق حـزبی، بەئەندامی حیزبی فەرمانڕەوا دەوترێ.**

# خانمی بەر پەنجەرە



سوور تەیفوری

## «من حیث لاتشعر نالی»

**(١)**

موبتەلایی شتێک وەک هەوا، دێتە سییەکانتەوە. وەک دەنگ، دەکرێیتەوە لە بەرامبەریا، هەر ئەوەندەی جارێک موبتەلا بیت، بەرت نادا. (ئێمە وامان خوێندنەوە ئەم وشانەو سیحرێک هات. لە دوورەوە، لە قەدیمەوەو گێڕایەوەو گێڕامانەوەو گێڕاین و گێڕامان و موبتەلایی سرێک بوو.و-ک)، ئێمە موبتەلا: بەشەڕ هاتن لەگەڵ پارچە زەیندا، دەنگدا، هورروژمی لەت و کوتی زەمەنەکان لە هەوادا و باداو مێشک بە هەموو یادەوەرییەکی خۆیەوە بێتە پەلە خوێنێک و هەڵبهێنێتەوە زەرد.

شەڕێکی هەمیشەیی لەگەڵ ئامادەیی لەتەکانی زەین کە زەمەن دیگێڕی و دەستەمۆی زەین نابن و زەین دەستەمۆ دەبێ و زەمەن دەیباتەوە (بەچەندین مانا) و تەسلیم کردنیان بەگێڕانەوە. بەترس و ئاگاییشەوە کە دەفتەر خۆی سەردتا دەڵێ و کە خۆت لەوانە بێ بەشێک بیت لەو گێڕانەوەو دواتر بەر لە دواتر دەزانی یان نازانی و کەچی ئەو هێرشە دەگێڕیتەوەو یان دەیکەیتە رابودوو یان ئەو بەسەرتدا زاڵ دەبێ و رابردوو و دەبێتە هەموو زەمەنت. شەڕێکی بەردەوام و تۆ بێهێزو یەک خوای مرۆڤ زەمەن بوو و زەینێکی هەڵواسراو بەهیچەوەو دانیشتوو لەسەر هیچ و بۆشایی و خوێنی لێدەچۆڕێ و وردە دەمارەکانی یەکە یەکە، یەکدووە، وەک فەنەر هەڵدەپچڕێن و دەپسێن. شەڕێک بۆ بەریا بوونەوەی دووبارەی زەین و دەسپێکردنی زەمەنی خۆت یا خۆت، زەمەنی ئەو زەینەی گوێیەو ناچار و چارو پێمل و دەبێ یان نابێ دەبێ بەپارچە پارچەییش بەردەوام بی بۆ ئەوەی رەنگە بێ تێبگات یان نەگات، بۆچی چی دەگێڕیتەوەو تێپەڕین و لەو پرسیارە سادەیە دەیە هەزارە، بۆ جلەوکردنی زەمەن، گوێگرتن لە چرکە بەچرکە زانی چرکە لە یەکتر کە چرکەی یەکەم وشەیەکە وەک لەعنەت یان غوربەت،وچمایەک چرکەیش گشت چرکەیەو دەڕووخێ و زەین وەحشەتی ئەو چرکەیەو دەنوارێ و رێ و هەتاویش دەگرێ ورێ و دەفتەرێکە:

**(٢)**

کرچە کرچی پچڕانی پێست، توێبوونی گۆشت، فیچقەی گەرم و هالاو، پەنجەکانت دەبێ تیژتر بن. توێەڵێکی گەرمەو دەجووڵێ، دەست دەبەی لە گەردنەوە، بەهەرچی دەمارو شادەمارەوە، هەر لەبنەوە، هەڵیدەکێشێ، هەر لەو کەنارانەشدا، بەردێک هەیە، رەش و پان، راکشاوە، بەهەردوو دەست هێشتا گرتووتەو ئەو دەزرکێنێ، خوێن دەچۆڕێ لە ئەنیشکتەوە، هەر دوو لاجانگی دەگری ئەمجارە، سەیرت دەکات، دەست هەڵدەبڕێ، وەحشەتە ئەو، چما پێشکەشی ئاسمانی بکەی، نایکەی، دا دێیتەوە. بەبەردەکەیدا دەکێشی، جارێکی ترو دەی دیسانیش، نرکەی دێت، هەرچی تێدایە بەخەبەر دێت، درز دەبات. لە ئاستی دزرەکەوە، هەر لەپشتەوە دیان بەبەردەکەیدا دەکێشی، کرچەی دێت، دەقڵەشێت، نەکەی بیر بکەیتەوە، بچووکترینیشیان قورسە، ئەو نەمێنێ و تۆ سووک بیت.

پەنجە دەبەیتە ژوورەوە، توێەڵێکی لینج و گەرم، دەگەڕێیتەوە. دەستی راستت رەنگە هەڵدەبڕی و بەبەرکەیدا دەکێشێتەوە، دەست دەردێنێ، سەختە، کەڵەمووست دەنێیتە هەر دوولای قەڵشەکە، دەستەکانت دژی یەکتر بسوورێن. هەڵدەپچڕێ. نەختێک پێست لەپشتەوە ناهێڵێ جوێ ببنەوە، دەست دەبەی، هەر دوو لەپ، لاوێچێک لینج و گەرم، هەنگاوێک چەند هەنگاو بچیتە پێشترەوە، بترازێی، داستانێک دەست پێدەکاتەوە، لە ماسی یان دەریا. بیابان یان لە گوێی

قەبرێکدا. ئاو دەڕوا و بۆ هیچ کوێش نا، تەنیا دەڕوا. هیچی تر، ئاوەکە چاڵ دەبێ، چاڵەکە پڕ دەبێ لە خوێن، لێوڕێژ ئەبێ و هێلکەیەکی بزۆزە، سەر دەکا و بن دەکا لە ئاوا. دوایین وردە دەمار دەپسێنێ، هەڵدەدرێ. دەیشۆیتەوە، سپی دەبێت. پاک دەبێت، کاسەکەش پڕ دەکەی. ئاویان تێرا دەدەی، پلووسک نەبەستێ لە کوێیەکانیەوە. دوایین دەنگەکانیش دەسڕێنەوە. جگە لەکاسە بهاوێژە و خاڵییەک بنێوە جێی هەمووی، بەبیرەوەری و خەون و تاڵ و شادەوە ئەگەر هیچ نەبێ تەنانەت مەترسی پڕبوونەوەی دروستبکات.

ئەمە ڕێگەیەکە بۆ خۆکوشتنی و تێدابردنی زەین، ئەگەر شتەکانی بۆ کۆ ناکرێتەوە چۆن شتەکانی بۆ کۆناکرێتەوە، بەلام وریابە نەترازێی ئەگین داستانێک دەست هەڵپێدەکاتەوە:

**(٣)**

لەو خوارەش کەسێک خەریکە بیر لە مردن دەکاتەوە. ئەوا دەزانێ کەسێک خەریکە بیر لەو دەکاتەوە لە کۆنەوە:

من ئەم بەهارە دەمرم. من پڕیشم لە بیرەوەری، من بەتونێلە تاریک و ساردەکانی زەمیندا ڕەت بووم. لە ژیان لە مردن گوزەرام. من دەبێ ئەم بەهارە بمرم. گەلێک ساڵ لەمەوبەر، نا، ئەوەی گرینگ نییە، گرینگ ئەوە کە دەیەوێ چیرۆکەکەی تەواو بکات.

- ئێمە تۆ بەجەسوورترین دەخولقێنین.

جەسووترین رەنگە وشەیەکی تەواو نییە، (بەلام یارییەکیان دەستپێکرد.و-ک)

- یارییەکی قورس. بارێکی گران لەسەر شان و ڕۆحی تۆ، وەئیمە تۆ وا دەخولقێنین کە شێتانە تێکەڵی یارییەکان بیت. یارییەکان سووکت دەکەن.

کە ئەویش شەیدای گێڕانەوەت دەبێ و دەیەوێ وەک خۆی بگێڕیتەوە، بۆ ئەوەی رەنگە ببێتە بەشێک لە خوی، تۆ و هەموو رازەکانت، زەین و هەموو خەونەکانی، رەنگە بۆ ئەوەی ببێتە بەشێک لە خۆی و ئەویش وا خۆی کەشف بکات. کەچما گەنجێکی نەناسراوەو لەبنی کۆڵەکەیەکدا یان لەژێرەوەی تاقە بەردێکدا، یان سەری گەردشی ئەستێرانە و تاوەو هۆی سەورێنی و هەڵزەردانی درەختان و لە خۆی تێبگات و ئێمەش هەبین وەک ئاشقی ئەو یان وردیلەیەک بۆ یاریی ئەو کە توانای خوێمان، رادەی خەیاڵ و خەونی خوێمان پێ تاقیبکاتەوەو دواییش نەینووکین (بەمانای ئاوێنەیە. رەگی ئەم وشەمان بۆ نەدەوزرایەوە.و-ک)و لە بەردماندەدات، ئێمەش دەگێڕینەوە کە ئەو خۆی بیت و ئێمەش تەنیا گەنجی خۆمان، کە لە خۆمان تێبگەین. کە نەقڤاش دەیەوێ لە خۆی و لە تۆ بکات خاتوو.

ئەو بیر دەکاتەوە، دەستی خستۆتە ژێر چەناگەی و بڕیار دەدات کە کەسایەتیی ئەم چیرۆکە ماندوو بکات. کەچی ئەگەر ماندوو بێن داستانی ئێمەو سەرگەردانییەکانمان دەسڕدرێنەوەو دەبنە بەشێک لە گێڕانەوەکانی ئەو. بەنەققاش و خانمیشەوەو بەناوی خۆیەوە تۆمارمان دەکات و هەرچی رەنجمانە، خەونمانە دەشاردرێنەوە.

ئەو دەیەوێ واز بێنێ رەنگە، کەواتە کەسایەتی دەبێ نەمێنێ. کەچی موچڕکەیەک بەگیانیدا دێت و دەست دەخاتە ژێر چەناگەی، جارێک ڕوومەت و ریشی هەزاران ساڵەی دەخورێنێ، رادەپەڕێ، دەستی رایەڵ دەکات و بەپەنجەی ئاماژەی بازنەیەک دەکێشێتەوە لە هەوادا. پاشان ئیشارەت (ئەم وشەمان وەرنەگێڕا.و-ک) بەچەقی بازنەکە دەدات. پاشان چاو دەگێڕێ بەدەورووپشتدا و هەموو شتێکی تێدەخات، جگە لە کەسایەتی، کە ئەوان بەردەوام بن و ئەم ببڕێتەوە، ئینجا ئەنگوست بەچەقی بازنەکەدا دەکات و دایدەگیرسێنێ. پەنجە دەکشێنێتەوە، دایدەگیرسێنێتەوە، پەنجەی دەچزێ بەچەقەکەدا، بزەیەک دەیگرێ و لە دڵی خۆیدا دەڵێ: ئای لەوەی لەم تیشکەی بەر نەکەوێ، کە داماوە.

ئەو ئیتر بێخەمە کە هەموو ڕێڕەوەکانی یارییەکەی دیاری کردووەو بەردەوامیش یارییەکە بەرپایە. کەچی رەنگە شتێک لەبیر دەکات، سێحرێک کە بەمرۆڤی بەخشی. گێڕانەوە. هێزێک کە پارچەیەکە لە هێزی خۆی. بۆ بەرەنگاری و غەدریش. ئێستەش ئەم دێڕانە دەگێڕینەوەو نازانین کاممان زیاتر تێیدا ئامادەین، کە ئێمەش شتێمکان هەبێ، کە تۆ هەموو باڵەکانمانت بەشکاوی ویست، تاشیمانەو و ئەگەرێکی دیکەی مەخلووقت (ئەم وشەمان وەرنەگێڕا.و-ک) تاقیبکەیتەوە. ئێمەش دەگێڕینەوە. ماندووی ماندوو، ماندووتر لە کەشتیەکانمان لەسفری یەکەمی کتێبێکەوە تا هەتا، ماندووتر لە تۆ لەو کەشتیە هەزاران ساڵەدا و ماندووی کەشتیەکانیش لە بارستایی تۆ. تەنیاتر لە تۆ ئەوکاتەی ئەم چیرۆکە بگاتە کۆتایی و غەریبتر لە تۆ ئەگەر لە شەقامەکانی شارێکی پڕ ئافرەت و رووتدا، یان لە چوارینەکانی خەییامدا پیاسە دەکەی، یان لە دوورەوە چاوت لە سرانەوەی رێگاکانتە ئەگەر مرۆڤ دەکەوێتە پێش هەرچی جادوە. توورەتر لە تۆ ئەو کاتەی ئەم قسانە درێژە دەدەم و زەخمیتر (وشەکە کوردی نییە.و-ک) لەوانەی لە یەکەم دێڕەوە ئەشکەنجەت دان و خۆشیانویستی، دوودڵ بوون و شاردیانەوەو تۆ نەتزانی

یان نەتنووسی ئەو بەشەیان، رەقتریش لە فەرمانەکانی بەرد کە بەپەنجەی نوورو هەتاو لە شەوێکدا و بۆ هەمیشە نووسیتەوەو نەخشیان بەست. دڵتەنگتریش لەو باوکەی [ئای چیت نەکرد] کوڕەکەیت بەدەم گورگەوەدا، زانیی و نەیدرکاند، نەرەنجێی، حەسرەتاویتریش لەو پیاوەی بەکێردێکەوە لەنێوان تۆو کوڕەکەیدا (ئابراهام.و ـ ک) بەدوای درێژەی چیرۆکەکەتدا هات. نەرەنجێی. دەیگێڕینەوە رەنگە تا لەت و پەتی زەین. لە جادەکان، ئەستێرەکان، و مانگ وەربگرینەوە. کەچی بازنەش بسووڕێ و هەموو شتێک بۆت بسووڕێ لە بازنەدا و بۆت بسووڕێین لە بازنەدا [وتۆ بیر دەکەیتەوە]:

(٤)

ئەو چرکەی باو باران، هەتاو و ئاسمان، هەر چوارمان ئامادەکردن، ئەو کاتەی ئاسمان و زەمین بەرەحمەتی خۆمان پێکەوە دەدوورێنین، کاتی سەرهەڵدانەوەیانە، زۆرمان حەشر کردوون و دەیانکەین. بەدرەخت و باڵندەو تەنانەت بەبەردەکانیش رادەگەیەنین، هەتاو لە دڵۆپە ئاوێکدا قەتس دەکەین و هەموو زەوی دەکەینە هەرچی بمانەوێ. نابێ زمان زاڵ بێ، دەبێ هەموو شتێک دەستەوەستان بوەستێ، تا حەکایەتی ئەمجارەش سەر بگرێ، ئەو جۆرەی کە هەیە، دەبێ زمانیش تەسلیم بێت، بەدەستیشەوە، هەموو حەرفێک وەکوو خۆی، ئەوەش وشە چییە تەنانەت تاقە حەرفێک لەم نووسراوە، بگۆڕێت، بگێڕێتەوە، بەڵام نووسراو و نەنووسراوەکانی ئەم پەڕانەی تووش بێت، دەبێت، کە گێڕانەوەش ئەمرو توانای ئێمەیە.

عەقداڵ، رەوتەنی، بزۆزو شەیدا، شەیدایان ئەکات ئەو شتەی بەجێمان هێشت لە گیانیاندا. سەغڵەتە کە تێبگەن. ئاگرن کاتێبکەن. یەکەم وەخت. چرکەیەک لە ئەوسامان، دوورمان، نۆشاندە ئەو گیانە بێقەرارەوە، نۆشاندمان ئەو چرکە، کە ئەو چرکە خۆی گوشراوی گشت شت بوو. ئەوی دواتر هەرچی فریشتە و نافریشتەیە، پشکنییان و لێی تێنەگەیشتن، دوا رێگە ئەو چرکە، حەیرەتی مەو مەشە، ئەو چرکە.

(٥)

لێرەدا گورگێک هەیە: نەتخوات، چەند دێڕی ئەم بەشە هی خۆمانەو زیادییە، ئەوانیتری هی دەفتەرەکەیە:

بێ وشەو پەسن، بێ ناو، ئەو کاتەی نەزەمین و نەئاسمان، هیچیان ناوێکیان نەبوو، جاری بوو زەڕڕەیەک بی ناو، جاری بوو و ئەوەندەی گەردێک، بەسەر هەموو شتێکدا رەت و ئاویتە بوو، ئاوێتە بوو و خۆی وەکوو خۆی گەڕایەوە، پڕ لەپێکی وەستاوە دەریا، چاڵاوێکە، تۆپەڵێکە خۆر بێ تین و هیچ گڕێک. گۆیەکی سەرگەردانە زەوی، وەستاو و چەقبەستوو لەسەر هیچ، کە زەڕڕە، تێکەڵی هەموو شت دەبێ، بەئاو و تاوو و هەواوە، بەخاکەوە، دێگەڕێنێ، هەموو شتێک تاکوو شێتی دەبزوێنێ، خۆی دەدلیە لە هەمیشەوە، تائێستا، تائێستای من و دەست و بەردی دواتر، ئێستای سەفەری دووری تۆ، باڵندە تاچەند باڵندە بێت، تاچەند بفڕێت، نەختێک لەو شتە لەگەڵ خۆ دەبات. فڕینیش بزوتنی زەڕڕەیەک لە دەمارەکانی باڵندەدا. بەرد هەرچی زیندوو بێ و بێوەی، لە دوورایی گیانیدا، لە قووڵ قووڵەوەی سەختاییدا، دژوارابیدا، بەردایدا، شتێک هەیە هەر کات بیەوێ لە دڵەوە هەڵیدەتەکێنێ.

ئاگای لە گەڕانی شتێکە لە وردو درشتی دەمارەکانیا، لەپەنجەردوە تاکوو چاو، تا کاسەسەر، تا دەنگ تا بنەبانی دڵی دەپشکنێ شتێک، خڕۆکەو سپیلکەکانی، سییەکانی، وردە دەماری سەر گۆنا و ژێرنەینووک و وردە دەماری گڵێنە پڕ دەکاتەوە شتێک، شتێک پڕی دەکاتەوە، خەونەکان، بیرەوەریەکان، خولیاکان پڕ دەکاتەوە، شتێک بەناخدا، بەئێسک و بڕبڕەی خەونیشدا دەبوورێ، لە هەوایدا بڵاو دەبێتەوە، پەرش ئەبێتەوە، هەم دەگەڕێتەوە سییەکانی شتێک (وریابە.و ـ ک) گورگ.

لەسەر تاتەبەردێکدا، شەوێکی مانگاوی و شنە، کە مانگ سەر خوێن کەوتووە (وەک پێشتر کە گورگەزێ بوو.و ـ ک) روو لە مانگ و روو لە هەرچی، چاوی پڕ مانگ، گەردن هەڵبڕیو بەرەو مانگ، دەلوورێنێ بەرد، هەڵدەقولێن لەگیانی گورگ بەردا شتێک هاوکات، دوور لەیەکتر لە دەرەوەو لە ناودوە، روو لە یەکتر. دەجۆشێ، جۆشانی سەرەتای گیرسانی زەوی کە هەر چییە، نییە، لە تاریکایی ئەو ساوە، لە ئاسمانی بێباڵندەی هەمیشەو لە فڕینی تۆقیوی دابەزیو تا شەو، تا هیچ قوڵت ئەدا، دەلوورێنێ بەرد، رایدەپسێنێ گورگ، روو لە مانگ هاوارە گورگ، تۆقینی ناسینی زەڕڕدیە گورگ، دەیەوێ دەریکات ئەم زەڕڕە، رایکێشاوە هەموو تەمەن، لە ئاگرو ئاوو و هەرچی گوزدراوە بەم زەڕڕەوە گورگ، روو لە مانگ و بۆ مانگ و هەرچی بەرەڵڵا ئەو زەڕڕە گورگ، بەڵکوو هەوا بیباتەوە، یاخود مانگ، دەلوورێنێ بەرد. تەشەنەیە زەڕڕەو دەیتەنێ، لە هەوایدا هەڵیدەمژێ، لە مانگا ئەیبینێ، ئەو زەڕڕە گورگ. دەسووتێ مانگ بەو زەڕڕەوە گورگ. دەیتەنێ هەموو بەردو هەموو گورگ، سەر هەڵئەدات تەواو زەڕڕە، دەتوقێ، دادەوەشێ، هەپروون هەپروون ئەبێ دڵی گورگ، تەسلیم ئەبێ گورگ.

وەهاش بەردێکی تر قـەڵش ئەبات و دەبێتـە وردو وردتر، دەوەستێ دەست. وەها خـەونی من دەبینێ، وەها دەمـبینێ، وەها دەتبـینم، لە پەنجـەرەوە هاواری زەڕڕەت کـردبوو، کـە غـەدرە، قـەدەری نووسـراوە، کـە زانیـبـووت پەپوولەکـانت و باویلکەت و تاوو پەنجـەرەت لەنێـوانی زەڕڕەو نەبوونی زەڕڕەدا سـەرگـەردانن. کـە مـەجـبـوورین شتەکان، رایدەکێشن هەموو تەمەن.

(٦)

ئەم دەنگە هەمـوو قـسـەکـانی هەروان، گـشـتـیـمـان نەنووسـیـیـەوە، یان هەڕەشـەیەیان من من، پێـشـتـریش دووجـار هاتووە، پیـرەو شـۆخیش نازانێ، ئامرازێکیش بەهەڵە بەکاردێنێ:

وەئێمەین هەموو شتێک دەگەڕێنین، هەرچی دەسووڕێ خۆمـانین، لە خشـەی مـارو مێروەوە تاکوو هەڵسـووڕانی هەتاو، ئێـمـەین بەسـیـحـر خـەیاڵـمـان کـرد بەبزێوترین ئەستـێرەو زەمـینمـان دایە دەستی دایرێژێ. ئەو جۆرەی دەیەوێ، هەرچی ئاوەکـە بسـووڕێ، کـە بوەسـتێ، سەرچاوەی لە ئێمەمس، لەمەیە لەنجەی باڵندەو شەکری فرین، لەمـەیە بەخشینی کەلەش (ئەو بەحورمـەتە، ناڵێ کەلاک.و.ک)و بەستنەوەی. نۆشاندنی عەزرەتی رزگاری، لە ئێمەن ئەوانەی ئەینۆشن و بێدەنگن، لەمەیە سەوزێتی درەختـو دابڕانی رەگـشی لە کـشت شت، ئێـمـە وامـان ویستێ: تاک. ویستمـانن غەوارەکـانی خۆمـان و تەرا لە هەرچی جگە مـە، لەوانی لەمـە تەرەبوون، رایان دەگـرین غـەریبانمان، قـورسایی کێوەکـانیان پێدەبەخشین. رازی هەڵـچـوون و داچوونی ئاو و رازی سـەفـەریان دەدەینێ، بیگرنە لەپ و بیخۆنەوە. دەهێڵن، بەخەیاڵ بمانخوێننەوە، ئەو جـۆرەش بمانەوێ زەین رادێنین، ئەو جـۆرەش بمانەوێ خـۆیان لەلا دەنوێنین، بۆیان دەدوێین، لە هەرچی و هەر کـوێ بمانەوێ، بەداسـتـانی خـۆیانەوەو داسـتـانی پاش و پێش خۆیان. بۆیان دەگێڕینەوە. ئەمـەیە سیـحر، ئەمـەیە رازی ئێمەو تەراکان سەیرکەرانی هەتاو و بێ ئاسمان تێ ناگەن، نایانگەیەنین، ئەوانەش بەقورسایی زەمینمانەوە رێیـان کـرد. نۆشـیـان بێت، شەربەتی رازی مـە، شـیلەو ئاوبارەی نەجات، لە ئێمەن و لای ئێمەن خۆ و رازیشیان، یەک بەیەکـتریان دەسپێرین رازەکـانیان، دەبێ لەبەردەوە گوزەرکا نیگا، دەبێ شەپۆلی شلوێ بوونی ئاو لە مشت و کـانیدا ببیستێ گـوێگرتن، (ئەمـە یەکەم جـار رەت بێت وشـتـر لە کـونی دەرزییـەوە بوو.و.ک) تا نۆشـیـکات شەهدی رازیان، جگەرگۆشەو ئابڕوومانن، هۆی بووغانن، کۆڵەگـای عـەرزو ئاسـمـانن (لە بڕوای کۆنی رۆژهەڵاتدا زەوی لە سەرپشتی گایەک راوەستاوە.و.ک) بەکەسمان نەوت و نایڵـێین، ئەنجـامـیـان، بەخـۆیانی دەڵێـینەوە حەکـایەتیـان، تێناگـەن دوور لە ئەسـتـێرەو نا رەنگین خـەیاڵان، لە رازی تینوێتی و دەریاش بوون، لە رازی هەتاو و بێدەنگبـوون، لەمـەیە هەر بزووتن و بەرەو مـەیە هەر ئەنجامێک عەزرەتی تاکە کەناری دەریاو جێهێشتنی، بەتینوێتی. پەنجە هەڵپێکراو لە ئاوو دڵ حەوت قوفەڵی بیـابان، سـیـحـری ئێـمـەن تینوێتی لە لێـوار ئاوداو کۆکردنەوەی هەموو ئاوێک لە قووڵاییـەکانی خۆماندا، بەفرمێسک و خوێنیانەوە غەریبان.

(٧)

رەنگە ئەم تابلۆکەی کێشابێتەوە یان ئەم چیرۆکەی نووسیبێ، حەز دەکەم ئەم بم:

دەگیـرسێ دڵ بەم شاخەوە، دەمرێ دڵ بەم شـاخەوە لە تەمایەربدا رەنگە، دەست دەسوێ بەئاسنەوە، دەست ئاسن عـاسی دەکـات، دەست شـاخیش، دەست بەردیش عـاسی دەکات، هەڵدەکەنێ داستانی خۆی دەنووسێتەوە لەسەر بەردا بۆ هیچ کـەس ناو تەنیـا بۆ خۆی نا، (ئەم جێناوە کەسیـیانەم بۆ نەخوێنرایەوە.و.ک) بۆ خـاتوو کە لەبیر نەچێت، کـە باو هەتاو، کـە ئاسـمـان و هەورو باران و برووسکە، کە باڵندە بەبەربدا رەت بن و ئاگـادار بن، کە زەمین خـۆی لەبیـری نەکـات، خـاتوو یان رەنگە دڵی نەققاش، کە نەققاش دواییش سینگی هەڵپچڕێ کرچە کرچ و وەک دەفـتـەرێک بیکاتەوەو هیـچیش نەڵێ، کە بەردتاش وەک دوایین وشـە، دڵی سـووری خـۆی لەسـەر دەسـتـە، دەیگووشێ و خوێن لە ئەنیشکیەوە دەچۆڕێ و دەچێتە دواترەوە، سەیر شاخ و سەیری سیماکە دەکات و ورد دەبێتەوەو هەنگاوێک دەچێتە پێشترەوە و ئینجا دێتە دواترەوە هەنگاوێک و هەنیـەی چەند لۆچی تێدەکەوێ و وردتر ئەبێتەوەو ئەمجارەیان وەک دوایین حەرف کە وتمان دڵی لەسـەر دەسـتـە دڵی دەکوتێ بەقـەد شاخدا کە دڵی دەتەقێ و گیانی شتەکان وە خەبەر دێنێ و هەر لەوێدا ئەو شەوە دەبێتـە بەردێک یان لە شاخەوە رەنگە خۆی (وریا بە) بەر دەداتەوەو دوای ئەوەی پەرش پەرش بووە.

زەین سـەقـامنـەگرتوو، لەسـەر هیچ و بۆشـایی، دەسـوێ لەنێو ئەم دێڕانەدا، دەتوێتەوە لەم وشانەدا، دەبێتە هەندێ وشەو جێدەمێنێ، زەمین دەیەوێ خۆی هەڵپچڕێ ئەمجارە. دەیەوێ دەمـار بەدەمـاری خۆی تاڵـکێش کـات و درێژترین دەمار بەبنمیـچێکەوە ببەستێ دواتر و دەشیـەوێ رەنگە بمێنێتـەوە، ببینێ ببیـستێ، لەو بۆشـاییـەدا، قـەتاری ناهاوکات و هەمە لایەنی دەنگەکان، داستانەکان، زەمەنی

مەرگ و گشت زەمەنەکان بەڕابوردووو رانەبوردووشەوە (ئەمە پێشنیاری مامۆستا مەسعوود محەممەدە بەرامبەر ئایندەو مستقبل لە فارسی و عەرەبیدا.وـ ک) ببیستێ و تێبگات، بەرگە ناگرێ زەین، دەردەپەڕن یەک بەیەک دەمارەکانی وەک فەننەر، خوێناوی لێدەچۆڕێتەوە زەین، شەکەت دەبێ، رەنگە خۆی تێدا دەبات، قاتڵی خۆی بەم باوەشـە ئاوەڵاوە رەنگە زەین، یان دەمـارەکـانی وازی لێدێنن، یان خۆی دەتۆقێنێتەوە زەین.

کە بەردتاش ئەمجارە زەینی لەسەر دەستەو یەکە یەکە هەڵدەپچڕێن دەمارەکانی وەک فەنەر، کە زەین دەست دەردێنێ و دەرەیدکێشێ هەر لە بنەوەو کە دەتوێتەوە زەینی نەقـقاش لەسەر جاددەیەکدا کەرستەیەکی رەشەو تەواو نابێ و نەقـقـاش (یان رەنگە نووسـەر.وـ ک) دەبڕێتەوەو کە نامێنێ لەم ناوەدا دڵ، کە دڵمان لەچی [خۆشە] کە دڵ ناگێرسێتەوە بەهیچەوە کە نەبێ (خانم).

**(٨)**

ئەم خانمە گلێنەمانە، من زۆر لێیدەترسم:

دوا ئەمـانەتت لە مـجـری سەندبۆوە، داتخـستـبـوو، نەیهێشتبوو، زیاتری ویستبوو دەستەکانت، ویستبووی نەوازشی کەی، بیـلاوێنێ، غـەریبی کـردبوویت، لەسـەر چرپاکـە راکـشـابووی. ئاوێنەکـەت نەدیـبـوو، بۆی روانیـبوویت، لەرزابوو، راکشـا بووی و بۆ باویلکە دوا بووی، بۆنی جـیـهـان و باڵندەت، بۆنی [گـورگت] بەباویلکەوە نابوو، بەدوو پەنجـە گـرتبـووت، فـووت لێکردبوو، لە لەپتـا گـیـرسابۆوە باویلکە، تەسلیم ببوو باویلکە، بەلا جـانگتـدابوو، گـەورەت کـردبوو، هەست بووی، هەردوو باسکت کـردبۆوە، شـەپۆلت دابوو لە ژوورەکەدا، گۆرانیت وتبوو، راست و چەپ شەپۆلت دابوو و شـتەکان لە دەورت گەڕابوون، گۆرانییان بۆ وتبووی، وەکـوو جـاران نەتدواندبوون، سـەمـات کـردبوو، سـووڕابوویەوە، نەرم نەرم، چەرخت دابوو هیـلاک ببـووی رەنگە، داتگرتبـوو، سـەیرت کـردبوو لە لەپتـا، بۆی گریابووی، بیـرت لە هەڵقرچانی کردبۆوەو تۆقـیـبـووی، فـووت لێکردبوو، لە پەنجەرەدا، دڵی پێهەڵنەکەنرا بوو، هەڵقرچا بوو لە لەپتا باویلکە، ئەمانەمان دواتر لە ئاوێنە بیست و کەچی نامێنێ ئەم گورگە بتلورێنێ(رەنگە).

**(٩)**

لێرەشدا دیسان گورگە، مەترسە ناتخوات، گورگەکان وەک ئێمەیەک ناخۆن، ئەوان تەنیا بەزستانایەک ئەخۆن: جارێکیشان لەوێ مردم کە زستان بوو، شەوێکی ترە، بەفر کولو کولو (شیعرێکی کوردی وا دەست پێدەکات.وـ ک) بەسـەرتدا بۆت دەبارێ، لە ئاڵقـەدام. گـورگن ئەوانیش، چاومـان لە یەکـتـر بڕیوە، بەفـر توشی دەبێ و کۆمەڵ تووشتر، ئاسمان دەڕوانێ، سیمات و نەخاتوو، ناتبینم، نازانم دەبێ بکەوم و ببمە خۆراک، یان راوەستم و سەیریان بکەم، ئەوی جاو داخات یەکەمجار هەموو چاوان ڕوویتێدەکەن، ئەوی رووتێکرا یەکەم کەسەو رەنگە ئەو شەوەش ئاخر شەو، تاکوو بەفرێکی تر دەنێریت خاتوو، یان تاو و باران نازڵ دەکەیت. دوودڵ بووم بەفرەکە تۆ ناردووتە لە دووم یان نەء. رەنگت کردبوو ئەو شەوە، شـەوت رەنگکردبوو، زەوی، بەرد، ئاسـمـان، بەفـرت رەنگکردبوو بەرەنگی خۆت، گشت شت سیمای خۆتی ئەدا. بەفـر ئەباری و ئەوان رەش بوون، تەنیـا منت دەگرتەوە، بێگومان بووم ئەمجارەیان، کە هەر خۆتی هاتوویەوە بمبەیتەوە. منیشت رەنگ نەکرد وەک ئەمشەو دواتر مـانگیش هاتە گۆلە سوورەکەوە. منیشت رەنگ نەکـرد. تەنیـا من، چاوم هەڵبـڕی. بۆت گـەڕام، هەمـوو چاوان، بۆیان روانیم، هاتنە نێـو چاومـەوە، لە شـەوی چاویداندا دیلیان کردبووی، جار و بار تۆو ناو بەناو شەو لە چاویاندا دیاریدەدا. بۆنم دەکردیت، هەستم دەکردیت، پەنجەکانم هەستیان دەکردی، نووشتامەوە، شکامەوە: ئەژنۆم، ئەنیشکم، چەناگەم، سینگم، تەوێڵم، گشت گیانم هەستیان دەکردیت. گەرماوی خوێن کە فوارەی دەبەست، سووک دەبووم. کرچەی شکانی ئێسک کە دەهات سووک دەبووم. نێزیک، نێزیکتر دەبوویتەوە. بەکەڵبەیاندا، بەزمان و لمۆزیاندا. دادەچۆڕام و سووک دەبووم، دوودڵ نەبووم: خۆت خواستوومت، دەبارای رەنگ بووی، بزر ئەبووی، ئەهاتیەوە. بەگیانما دەبووڕای، هەوا بووی، بەپێست و بەگۆشتما دەنووسای، سارد بووی. گەرم بووی کاتێ خوێن تیکەڵی بەرد دەبوو و دەتواوە. گەرم بووی کە لە خوێن هەڵدەستای، ئاسمان بووی رەنگت ئەکرد بەو شەوە، هەمـوو رەنگت، بیـرت دێم؟ من دەبوا یەکـەم کـەس چۆک دابدەم [خـاتوو] چون هەڵت بژاردبووم. (لە عیرفانی ئیسلامیدا بابەتێک هەیە بەناوی وحدة الوجود کە تێیدا هەموو شتێک لە (هو)دا کۆدەبێتەوە. نووسەر هیچ شتێکی لەم بارەوە بۆ روون نەکردووینەتەوە.وـ ک).

**(١٠)**

دەست شتێکە وەک درەخت، مرۆڤ شتێکە وەک درەخت کە ئاو پەلێکی ببا یان خۆی لێرە بێ و دڵ یان دەستی لە دەروێشان جێمابێ و دەروێشانیش لە هیچ کوێ نەبێ. تۆش وریای دەستت بە. یانی خۆت وا بنوێنە چما

له گیرفانتدا بۆ شتێک دەگەڕێی و ئەگەریش گیرفانت نییە. له پشتتایان لەسەرتا بیشارەوە، ئەوسا دەرێژەبدە،ئەم بەشە لەتێکی داکەوتووە:

که دواتر نازانم جووتێ دەست جێ بمێنێ له لێوارتا، له کەنارتا، سبەینێ چی بدۆزرێتەوە. جەستەیەک که دەستی جێهێشتووە و رۆشتووە رەنگه له شوێنێکی دوور بمرێتەوەو تەمایەر هەزار ساڵی تر یان چیرۆکنووس دەزانێ یان نازانێ کەی و له کوێ دەستی لێبرێتەوەو (له زمانی کوردیدا له جێگەی دەست پەلیش بەکار دەهێنرێ که بۆ درەختیش دەوترێ وەک چواریەل.و-ک) دواتر زەمەن دابمێنێ بەرانبەربێ کەسێ(بێ خاوەندیی) ئەم دەستا(خاوەن وخواوەند لەیەک رەگ گیراون.و.ک) که جارێکیتر سەوز بوونەوە له بەردێکداو ئەمجارەش دەتوێنەوە له مەزارتا خاتوو. ئەو دەستانەن سۆراغێ له هەموو زەمین و زەمانێکدا، جێدەمێنێ، جێبمێنێ [بمێنم] له لێوارتا (ئەم بەشە بەتەواوی داکەوتبوو جگه له چەند وشەی وەکوو: هات، شەو، جار، وە، چەند جێناوی نەلکاوی وەک:م.ی.و.ان.و-ک)

چ شیرین خاک سیمای گرتووی، بلا دواروانێ نۆشتەکەم (بلا یەکەمجار لەلایەن لییەوە بەکارهێنراوە.و-ک) گوزەران له هەواوەکە دەنگ بەدەنگی کورپ ئەکات. دەبەستێ، گوزەران له شەوەوە، له چڕی و تاریکایی خەستییەوە، خۆ دزینەوە له چاوی مەرگ که رەش دەچنەوەو دەڕوانن، گوزەران له دەست و پەنجە، ئەو کاتەی وا جورئەت ناکەن، گوزەران له دەنگ ئەو کاتەی هەر شەپۆلی زرینگانەوەی دەبێتە بەند، راتدەکێشێ: تێپەڕین لەبەرد، که بەرت نادا، که گشت گیانی دەبێتە دڵێک و لێدەدا، غیرەت دەیگرێ، جگه له خۆی هەر کەسێک بتبینێ، نەرم کردنی دڵی له سەختی، بەتەمەنناو بەنەرمی، رەنگیان کردووی خاتوو، هەواو درەخت و باڵندەو ئاوێنەو بەردیان رەنگ کردووی. بەستوویانەوە که تیشک کوێریان دەکات. لەتیشک ناگەن، تاریکن وان، نەشەو لەلایان رازەو نەرۆژ ئاشکرا دەبێ چ شت لایان. دەشکێم له شکانی ئەم نیشانانەدا که بۆیان کردووی، شکاندنی خۆ، تاڵکێشی رۆحی خۆشی، تا بەری بوون له هەرچی رەنگ بمێنێ لەپاش تۆ، سمینی روانین تا پاک بوونەوەی له غەوارەو غەیر، تەهارەتی دەست بەئارەقە رێژیی رۆح، شۆردنەوەی له هەواو رەنگتا، له بۆنتا، له شەوتا، تا قابیلی گەیشتن بێت، راهێنانی گیانی دەست و پەنجە بەسەبرو بەرگەی راز، رێگه بدە خاتوو بتبینم، لەسایەتا چەند بارەو تەواو دەبم ئەمجارە.

(١١)

کورسییەک لەسەر سەرەوە وێنا بکه، کەسێک لەسەری دانیشتووە، تاقانەیە، ئەم کەسە تائێستا چەندین کتێبی نووسیوەو یەک حەرفیشی نەگۆڕاوە. مەگەر خۆی بیەوێ:

بەسەر مەو لەگەڵ مەدا بوو، هەرچی بری، لەمە بوو هەرچی وترا و وتی و هەرچی بوترێ. مەبووین باوەشمان بۆ کردەوە، هەر چۆن بەخواردماندا، کۆشمان کردەوە، هەرواش هێنامانەوە ئێرە، مه عەکسی یەکترین، له کوێ بێ فەرق نییە، هەر هێندە که هەبێن، بەخاکمان دەیگرین. پەزێرایی دەبێن، تێکەڵی خۆمانی دەکەین، دەسی دەگرین و هەموو شتێکی داوا دەکەین، له خۆمانەوە بۆ خۆمان، دەستیمان گرت، بەئاگرو ئاو و ئەشکەوتمان، بەبەفرو تاو و هەوامانەوە، تا هەمیشە، وێنەیەکی گشتی تا هەمیشە، هەمان داستانەکە که وان نازانن، که هەمیشە ئیرادەی ئێمەیە، دەستیمان گرتووە، دەوەرێن پەنجەکانی له چرکەدا، تا رۆحیش تێکەڵمان دەبێ وەها دەتوێنەوە غەریبان، رایدەکێشێن ئاشقانە، ئەو ئەشقەی بۆی هاتینە دی، پەنجەمان تێدەخات، پەنجەی دەسپێرێ، جاری بوونی ئاو جاریان دەبێت، گەڕانەوەی نییە که دەستگیری بووین، دواییین و تەنیا رێگەین مه، هەر خۆ تا ئێرەمان گێڕاوە، یان دەبێ ئەوەی سپاردوویە جێی بێڵێ [یان زەمینیمان چما تۆوێک بیترووکێنێ و توێکڵەکەی بەفوو فڕێ بات که دواتر سەوز بێتەوە یان نا، دەشێ وەها شتێکیشی وەتبێ.و-ک] یان دەبێ تاکۆتایی تێکەڵ بێ، که دەستەکانی ئێمەن دەستەکانی، تێکەڵیش رازی ئێمەیەو لای ئێمەیە، راز ئێمەین.

(١٢)

کەسێک لێرەدا گیری کردووە، دەمێکەیە، خۆ کوێر نیت، سەیریکە:

جۆرێک له عەقدالی هەیە، دەتپارێزێ، بەئاو و بەبەردا، خۆت دەکێشی، خۆت له بڕەنی هەرچی جاددەو هەرچی خەون و هەرچی بارانە دەسوی، خۆت له ئەڵماسی هەرچی چاو و هەرچی سەعات و رۆژنامەو جانتایە دەدەی، سووک بیت، رەهابیت، (شاعیرێکی هاوڕێم، جانتایەکی هەیە کتێبە، ناوی رەزایە، رەزایەکی تریشمان هەیە، دواتر باسی دەکەین) بەرگە نەگریت، کەچی ئەو هەڵت دەگرێت، خۆی راتدەگرێت، بەرتنادات، بۆ خۆیت ئەگرێت، بەخۆیت ئەگرێت، بەخواردت ئەدا له گشت لایەک، دواتر خۆی کۆتدەکاتەوە، داتدەرێژێتەوە، کەولاو کەوڵ، تا یەکسەر دەبیە خۆی، بەدرەختێک دەگەی له پارکێک، له باخێک [ئەم شوێنە دواتر باسی ئەکەین] بۆ

تاوێک جۆلانەو بۆ تاوێک گەردنی پێوە هەڵدەواسی، ئەو دەرناچێ و ساردبییەوە، بەئاو دەگەی، ناهێڵی بن کەویت، وەک پوشێک دەتبات، تا [پێشتریش] لە لێوارێکدا بەسەبەتەی شاژن یا تۆڕی ماسیگرێکدا، یان تاتەبەردێکدا، دەتکێشێ، یان لە کەناری فریشتەکاندا، فڕێت دەدات یان دەتکاتە دوورگەیەک بۆ هەرچی باڵندەو خەونی بێباڵە، بەرزت ئەکات لە هیچ کێوێکەوە بەرنابیتەوە، تلت ئەدات تانبارو خڕت ئەکات، ساخت ئەکات و ئامادەی سەفەری درێژتر، لە هەموو شوێنێکەوە هەڵدەستێ، لەو خاکەدایە تەیت ئەکات، دەتبا تا لاپ ڕەنگی دەگری، بۆنی دەگری، کێشت ئەکات، تا لای خۆی، تا لای خۆت، جاری وایە ئەو شەیداییە جانتایەکە گرنگ نییە لەکوێ بێ بیری شتێک دەکەی(جانتاکەی من هی هەڕاجییە نازانم بەر لەمن چەندە گەڕاوە دایکم ئەڵێ چانتاش قسمەتە.و ـ ک) هەمووان جانتان، جانتا دەلیل، جانتا ڕێگە، جانتا جاددە، جانتا بڕست، جانتا مۆڵەتی ڕۆشتنە، جانتا ئاردزووی بینینە، ئارەزووی بینینی غەریبێکت، لە شوێنێکی دووری نێزیکی جیهان بۆ هەر کوێ بچی ڕەنگە لەوێ تەمایەر بێ لەبەردەم ویترینی جانتاکاندا دەوەستی، دەست دەبەی لە ئاستی گیرفانی چەپی کراسەکەتەوە دەستت درێژ کردۆتەوە دەستت پڕە لە دەنگی تەپە تەپ دەتۆقێن جانتاکان زەحمەت نەبێ ئەوە دڵم بڵێی بەجانتایەک بشێ[بەبزەیەکەوە] ناشێ، ناشێ بەجانتایەک ناشێ دڵی نەقاش، ناشێ بەجانتایەک ناشێ.

(١٣)

مەرگی ئازیزتان، گیانی دایکتان، وریای ئەم خانمە بن، دەترسم پەندێک بەخۆی بدات:

کە کۆمەڵێک پەپوولە، شەوانە، ڕادەبن لە ژووردا، دەبارێن لە ژووردا، لە دیوارو پەنجەرەوە. لە هەواوە، لە تاریکاییەوە دەزێن، خەیاڵەکانت هەڵدەفڕن، شین شین، دەتنۆشن، قوم قوم، شیرین شیرین، دەتوێنەوە، دەبریسێکنەوە، گەرا دەکەن لە دەنگ بەدەنگی هەوادا، ئاوێنەدا، دەزێن لە لەچکەوە خاڵێکی سپی دووباڵ و هیچ نەخش بەلەچکەوە، لەشەوی لەچکا جارێکیان ئەینۆشێ گریانت، دەترسێ پەل دەکا فراژ ئەبێ پەپوولە، گەرا دەکا بەلەچکەوە، گەرای زووخاو (زووخ+ ئاو. وشەیەکی لێکدراوە کە لەدوو ناو پێکهاتووە. زووخاو وشەیەکی زۆر قەدیمیە، شتێکە لەولای خەم و خەفەت و پەژارەو دیکەی هاوواتاکانیەوە. واتە ئەبێ خەمێک زۆر بمێنێتەوە تا ئاو بێنێ وەک چاو، کە ئاو دێنێ و ئاویش نییە، زووخاویش ئاو نییە، بەڵام دایکم دەڵێ: کە مردم زووخاوم هەڵدێنمەوە ئەگەر بمخەن بەلادا، ڕەنگە ئەمەیش جۆرێکی تری بێت لە قامووسەکاندا نەیاننوسیوە)، خەفەتە پەپوولە، بورجی عەقرەب (هەمان دووپشکی کوردیە.و ـ ک) نزیکی مانگ بۆتەوە. هەڵپڕووکاوە مانگ، تۆقانە پەپوولە، گیانی لەچک دەتەنێ، هەڵدەستێ باڵاکەت دەتەنێتەوە، یەکسەر دەبییە پەپوولە، هەڵ دەگرێت، دەتفڕێنێ، بتڕفێنێ، پەپوولە. بورجی عەقرەب نێزیکی مانگ بۆتەوە، ئان و ساتە پێوەی بدات، هەراسان، سەرگەردان ئەبێ، لە ئاسمان و پەنجەرە، دەگەڕێیتەوە، حەیرانە پەپوولە، دەتشارێتەوە. بەڵا گەردانە پەپوولە ئەوشەوە. مانگ سەر خوێن کەوتووە داگیرساوی دایدەگرێ لەسەرت پەپوولە. ڕاست و چەپ چاو دەگێڕێ، دەیکەیتە مجرییەکەوە، سەیری ئەکەی، هەڵی ئەگریتەوە، ئاوێنە باوەشت بۆ دەکاتەوە، بەخۆت و لەچکەوە. لە ئاوێنەش گەڕابوویەوە. سەیری دەردوەت کردبوو، چی شت نەبوو بیگرێتە خۆ، وەستا بووی لەبەردەم پەنجەرەدا، ڕامابووی، دەست بەداوێنت ببو پەپوولە. کردبووتەوە لەبەردەم پەنجەرەدا، بەهەر دوو دەست گرتبووت، تەکاندبووت، شەکاندبووتەوە، دڵی بەرنەدا بوو، تا ئاخر گوڵی سەرت بوو، سەرگەردانت بوو پەپوولە، دەسپێ دوا فەننەرو کەچی نامێنێ ئەم گورگە [حەتمەن] بتلوورێنم خاتوو.

(١٤)

ئەوان پێش ئێمە تەنیا چەند وشەیان لەم بەشە ساخ کردبۆوە، حەمیدەش چەند ئامرازی پێوەندی و چەند کارو چاوگی پێ زیاد کردن و دواتریش وتی ڕێگە هەر ئەمەیە [و زۆر شتی تریش]:

چما تووما[ر]، کە هەر شار سەرەتا، چما توومارێکە ڕێگا، تەواوکە بوو سەیر ئەکەی نووسراوە، بگەڕێوە بۆ سەرەتا، کەس لە ڕێگە وەکوو خۆی نایەتەوە، کەسیش دووجار توومارێک ناکاتەوە، چون کەس دووجار بەرێگایەکدا ناڕوات، نەڕۆشتووە.

(١٥)

ئەها باسی وشترێکان کرد، ڕەنگە ئەمە درێژەکەی بێ:

وەئێمە تۆ لە تەقینەوەی ئەقیانووس (لەگەڵ نووسینی کوردی جیاوازە، نووس لە کوردیدا بەمانای خەویشە.و ـ ک)و هێرشی بەردو هەرچی ڕەوەزە دەگوزەرێنین. وەئێمە تۆ لە تەسکایی دەرزی (وە. ئامرازی پێوەندیی زمانی عەربیەو نەهاتۆتە کوردییەوە.و ـ ک) و هەرچی ئەڵماس و تیژە، تۆ لە توانەوەو ڕسکان و هەرچی بەردە عوبور

دەدەین. ئێمە تۆمان هەڵبژارد شکستمان بات یان شکستی بدەین، تۆ بەگژ هەرچی درەختا دەچیت و سەوزیش. بەگژ هەرچی حەزیاو پێغەمبەرماندا دەچێت، تۆ خۆشەویستی ئێمەت و دوژمنیش، یەکەم دەنگ و یەکەم وەخت، ئێمە تۆ، تەنیا تۆ عوبور دەدەین.

(١٦)

لە خوارەوە کەسێک چاوی نووقاندووە و بیر لە جادە دەکاتەوە. ئەو مێشکی لە هەموو ماناکانی پێشتری جادە داتەکاندووە. ئەو ڕێگەی بەدەمەوەیە، رەنگە نووسەری دووهەمی ئەم دەفتەرەیە، تۆش ئەگەر فڕێ درای وای:

بۆی هەیە سێ گۆش، تیژ بۆ مەرگ و کەوتن و کۆتایی، بۆی هەیە چوار گۆش و هێنایەتی، رەنگەش هەر بازنە ئەرێ بازنە کەچی تەسک و تیژ برینگ و سارد وەک ڕێگا کە هەموو ئەندامت جێدەمێنێ جێدەمێنم نامێنم ئەرێ بازنە کەچی کەس ناگەڕێتەوە سەرەتا چون لە ڕێگەدا دەسووتێت دەسوێت دەبڕێتەوەو ڕێگە نابڕێتەوە ڕێبوار دەبڕێتەوەو ڕێگا نابڕێتەوە چون لە ڕێگادا دەسوتێت دەبڕێتەوەو ڕێگە نابڕێتەوە چون لە ڕێگادا دەسوتێت نەپێڵاو لەو سەرەوە بە ساغ دێتەوەو نە باڵندەو نەجانتاکەش نەداستانەکەش دەگاتەوە زەین و نەزەین دەمێنێتەوەو کۆی دەکاتەوەو نەدەست وەکوو خۆی دێتەوەو دەبڕێتەوە و ڕێگا نابڕێتەوەو ڕێبوار دەبڕێتەوە و تا ڕێبوار کۆدەبێتەوە لەسەر ڕێگاو دەبڕێتەوە (وە لە زمانی کوردیدا نیشانەی دووپات بوونەوەشە- گۆڤاری کوڕی زانیاری کورد. بەغدا،١٩٧٢، مەسعوود محەممەد،ل؟،و-ک) و نابڕێتەوەو ڕێبوار دەبڕێتەوەدو تا ڕێبوار بڕوا ڕێگەیەو کە ڕێبواریش نەڕوا هەر ڕێگەیەو ڕێگایە[یان ڕێ گایە].

(١٧)

لە فیزیای قەدیمدا دەست گرنگترین بەشە لە مرۆڤ و وشە گرنگترین بەشە لە هەستی و دەست هەر دەستێکە وەک جیهان کە وشەیەکە:(ڕێبوار سیوەیلی، دنیای شتەبچووکەکان، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.چ٢):

ئەمەش هەر ئەو دەستانەن گرتمانن، جارێکیان ئەو کاتەی مانگمان بەئاماژەیەکیان سپاردبوو و هەڵمانکێشابوون تالای خۆ، گرتمانن ئەوجارەی کە دڵتەنگ بوون و بێبەڵگە، مانگمان پێبەخشین، ویستمانن و نەمانویستن، کەدوای وان مانگمان هەر مانگ بوو، ئەو ڕۆژە هەر دەستگیری بیابانییەک بووین کە لەدڵێەوە بەندیوار بوو، کە تاومان نایە بندەست(لەفۆلکلۆری کوردیدا ئەم دێرە بەشێوەی شووتی، شامی، زەبەشیش هاتووە.و.س)ویستمان لەدەستیەوە تاومان بەدەستی دەرخەین، دەستی هێناو ئێمە تاومان نایە لەپی (رەنگە ئەوسا هەتاو سووکتر بوو. و-ک) هەرچۆن بەتاویش جارێکیان چارەی گشت کەسمان نووسییەوە، لەئەزەل تا ئەبەدمان بۆ گێڕایەوە، بەڵام لەویشمان ستاندەوە، کە هەتاوی مەیان پێهەڵناگیرێ، کە بچووکە، بچووکە مرۆڤ، کە هیچ نییە جگە لەو زەڕڕەی کە ڕۆژێک ئیشارەتمان دایێ و وشەمان لەسەر جاریکرد، ئەو زەڕڕەی کە سەرگەردانمان بوو بەرلەوەی هیچ شت ناوی بێ، کە خۆش وشە بووین و وێناشمانە جارێکی تر رایانکەینەوە، بیانشەکێنینەوە دەستەکانمان. دەستی نازەنین، ئەمجارە تا دڵی زەمینمان، ئەمجارە هەستیکەن دەستەکان رازمان و بوەستێ، بچنرێ نەفەسیان و سڕی خاکمانیان دەدەینێ بیلاوێنێ و منداڵ بێتەوە سڕی دەدەینێ، و ئەمجارەش دیسان دەستە کە پێی نابڕێ، کە وشەمان نانێرینە پاڵی، کە فورسەتی وشەی نادەینێ، کە وشە خۆمان و موڵکی خۆمانەو رازمان و ناوی وانیش وشە و رازمان، وشە خۆمانە. ئەمجارە لەبەردەمانەوەیە دەبێ، دەستی تاو ناو دەستی هەردەست - گەرچی ئەم دەستانە هەر ئەو دەستانەن کە بوون - رازەکانی ئێمە بخوێننەوە، رازی تاونووس کە بەباو ئاوو ئاسمان و تاومان نووسیمان، هەموویان شایەت بوون، بەمەرەکەبی رەنج هەڵمانکۆڵین لە گشت لایەک، کە بچووکە، بچووکە مرۆڤ. (ئاس + مان . واتە ئەوەی لەبەردی ئاسیاو دەچێ، لێرەدا چەشنە بێزاریەکیش بەرامبەر بەقورسایی هەیە، کە واتە هەستی قورسیشە بەقەد بەردی ئاسیاوێک. و٠ ک).

(١٨)

ئێمە خراپمان کرد دەستمان دایە ئەم یارییە، وشەی یەکەممان بەجیددی وەرنەگرت، تۆش بڕۆ بەژیانی خۆتدا بگە، بخەوە، جگەرەیەک داگیرسێنە، حەز دەکەی بڕۆ بمرە، بەڵام وەک ئێمە نا، وا بۆ خۆشت باشترە:

بارۆحە، با رۆحی ئێمەیە، ئاوارەی گشت لایەک، دەبزوێین، جەگەیەک تەواو دەبێ، دوو جمگە، پەنجەکان دەسوێن، [ئێمەش دەستین] با ناوەکەت دەڵێتەوە. بەئێمەو بەشاخ، سەوز ئەبینەوە. زیندوو دەبینەوە کە جارێکی تر٠وەکوو ئەو جارە کە دواتر مردین٠ سیمات لەشاخ بخوازینەوە، هەڵدەکۆڵین ئێمەی دەست و ناودەکەت لەبەر خۆوە دەڵێینەوە، شاخیش، باش،

گەوهەری شاراوەی شتەکانی تۆ، بەسالآن خەریک بوون، سووتان، بارین، هەلسووڕان، توانەوە، هەلدەکولین و شاخ دلی زەمینەو نەرم نابێ، شاخ هەموو گیانی غیرەتە، دەستەکان کە نەختێک دەسوێن، هێلێکی هاو ئاسۆی با دەردەکەوێ. ناوەکەت هاوار دەکەینەوە، هێندە بلندو دادێینەوە هەلتکولین لەشاخا، شاخ دەبزوێ، شاخ دەسووتێ، گەلایەک لە سینگی دەکاتەوەو دایدەنێ لە بناردا، گەلای چەندەمە و چەندەمین جارەکە شاخ دلی دەکاتەوە، پەنجەرەیەک تاکوو هەر کوێ ئەکاتەوە، سەما دەکەین، شوکر دەکەین و پەنجەرە دەلاوێنین، کول دەبین و کول دەبین، دەتوێینەوە، پەنجەکان نیوە بوون و هەر نەهاتی، تواینەوەو هەر نەهاتی، دێی، هەلدێی جووتی دەست، وەک دوو بالی بالندەیەک بەئاسمانەوە لە مەچەکەوە یەکبگرن و یەک جمگەیان هەبێت، ڕەنگە بۆ ئەوەی زەمەن و ئاسمان و هەوا دربەدن گەر پێچەوانەی یەک بگەڕێن، ڕەنگە بۆ وەی (وەی کوورت کراوەی ئەوەیە، هەروەها وەی بەمانای باشی هاتووە وەک لە وشەی وەیشوومەدا هەیە کە بەمانای بای شووم هاتووەکە واتە بای چاکیشمان هەیە.و.ک) پەردەبێت جیهان و لایدەن لەبەرچاو، یان جیهان هەلبدرن و دلی دەربخەن. جمگە گەییشتە مەچەک و تەمایەرین، تواینەوەو نەهاتیە پەنجەرە،ئەونە هاتین و نەهاتی، کەس بەدەردی ئێمە نەچێت، وەک مەنەبێ تووشی نەهات (بۆ ساخ کردنەوەی ئەم دێڕە کەلک لە بەیتێکی مەحوی شاعیر وەرگیراوە.و.ک) کەچی نەهاتیە پەنجەرە، خۆر نایەوێ داچێت ئەم نێوارە ڕەنگە، مانگ بێقەراری هەلهاتن، (هەلهاتن بەهەر دوو مانای راکردن و دەرکەوتنیش وەربگرن). دەستێن و پشتێک بەرد، پالمان بەیەکترەوە داوە، دەمارێکی سووری تێدایە مانگ، دەسووتێ مانگ، دەجوولێ شاخ، سەر خوێن کەوتوە مانگ، دەنگێک ناوەکەت دەلێتەوە، شتەکان ناوەکەت دەلێنەوە، پڕ دەبن لەپەکان، دەتبینین ئێمەی بەرد، هەلدێی وا لە پەنجەرەدا، نامانزانی، کە دوورن، دوورن روانینت، چی لەو دوورە دەستەدایە، چی دلتەنگت دەکات خاتوو لەو دوورە، رادەبین لە بەردەوە، بەردیش دەشکێ، سەیری چاوەکانت دەکەین، دەسووڕێنەوە لە چاوەکانتدا، نوقم نەبین لەو روانینەدا و نابینین، تا لە کوێ بەخەبەر بێیت و بەخەبەر بێین لە بیابان، شار، شەقام، غەریبی، یان لە کام لاپەڕەدا، تاکێ قەرەی راز بکەوێ و بەخەبەر بێین لە زەینێکدا کە دەستەوەستانی زەمەنە و شەیدایی پشکنینی رازت خاتوو. (ئەمانە ئەگەر کەسێک نەختێک خولی قەبری بکردایەت بەسەریانا، رزگار دەبوون، دەلێن خاک مەیل برە.و.ک).

(١٩)

لە مۆزەخانەی سلێمانی تابلۆیەکی کەونینە هەیە، وێنەی کچێکی تێدایە کە سیمای خستۆتە نێو هەردوو لەپی و سەیری دوورێک دەکات، ئەو کەونینەناسەی یەکەم جار ئەم پارچەیەی بینی وایزانی خۆی دایهێناوە، ناوی نا خانمی بەر پەنجەرە، کەچی هیچیش وانەبوو، ئێواران پڕە لە پەنجەرە کە غەریب بوویت یان دلتەنگ، ئەمجارە زیاتر لە ئێوارە ورد بەرەوە. لێرەدا دوو کەس کە یەکەم جار ئەم پارچەیان لەسەر ئەم دەفتەرە گێڕایەوە قسە دەکەن، نەختێکیش فەیلەسووفن:

شوێن: کەناری ئاوێک

کەسەکان:ئێمە

کات:نیوەڕۆ

دۆخ:بەدزییەوە

بابەت:دلتەنگی

- بەقەتارێک دەچێت، دەلێم.

- کەچی کەس تا سەر هەلناگرێت، کەس نەگەشتۆتە جێگە، یان کەس ناتوانێ داستانی سەفەرەکەی بگێڕێتەوە، کەس نەگەشتووە، یان لە ڕێگەدا دەبێ دابەزی یان بەددەم خەونەوە دەبێ بڕۆیت، نابڕێتەوە.

بەردێک هەلدەگرێ، سەیرێکی دوورەوە دەکات.

- ئاخری چی؟ تا کوێ؟ بمژانەوە، بەئێشەوە دەسپێکردن، یان لە ئەزەل بمژانەوە، لە هەنیەیان کەندووین و نازانین بەردەکە ئەمبارو ئەوبار دەکات. ورد دەبێتەوە. دەیەوێ بیخوێنێتەوە.

- کێ لە دلی ئەم بەردە دەگات، کێ دەزانێ چی بینیوە، گریمان ئەمە لەتێک بووە لە هەتاو، کە هەتاو نەبێ، کە هەتاو نییە، بەچی دەچێ خۆماتل کردن، بەچی دەچێ سواربوونی ئەو قەتارە لەعنەتییە.

- تۆ خۆت بەسیت بۆ ئەوەی هەموویان بودستێن، بۆ ئەوەی هەرچی بەخەونووچکەوە لەگەلیان، دابەزن، رابنەوە، نالێم.

- بلێی مەبەستی چی بێ خانم، لە بەردەکەدا وتوویەتی: بەکەسم مەسپێرە کە گەشتمە دەستی تۆ ئەمانەتدار نین، دەنگێکی دیکەش هاوکاتی ئەو باسی حەرف و گۆڕین و شتی وا دەکات. سەیری رووبارەکە دەکاتەوە، بەردەکە دەهاوێ و دەلێ: سوێرە تال سوێرە، پڕە لە فرمێسکی ئێمە، دەڕوات هاواری خۆی دەکات و کەڕ، تەنیا دەنگی خۆی خۆش دەوێ.

ئەورەسێک سپی و دوور، شەپۆل ئەدا مینای خودی رووبار، دادەبەزێ، خۆی بەسینگەوە پێدا دەکێشێ و هەڵدەستێتەوە چنگ پڕ.

– ئەوەش چارەی ڕێبواران. ئەوانی خۆیان بەرەوتی پڕ ئاژاوەی سپاردووە. ساف و بێخەوش، دڵتەنگ مەبە بۆ هیچ کوێی نەدەبردی، شەپۆلانی حەیرەت هێنەری، بریسکە بریسکی سرۆکی هەر لە جێگەیەکدا ئاقیبەت بەمە دەگەشتی، کەواتە چ دڕەنگ و چ زوو (قسەکانی ئەم کچە جۆرێکن، شتێکی بەدەمەوەیە.)

بەختەوەرن ئەژنۆ لە باوەشدا، بەختەوەرن دەست و پەنجەو لەپ روومەتی پێیان سپاردووە، گۆمی بێکۆتا چاوەکان، تک تکی ئاو دەخوێننەوە، من وەها دوا وێنەت هەڵدەگرم. بەدڵتەنگی خولقا مرۆڤ، کەنێ تەنیا خڵەتاندن بوو، بریسکەیەک لە سەرەوەی رووبار کەچی بنەوان پڕە لە تەرمی ئاشقان و وادەبێ وەبیربێنمەوە وەبیرت بێنمەوە، کە دواتر ئێمەش دەچینە بنەوان وەک دیکەی ڕێبواران، ئەوانی بەکۆچ و دڵتەنگییەوە دانران، لە ئەزەلەوە دڵتەنگی و تاهەمیشە، لە خانمەوە تاکوو خۆتبەسیت بۆ ئەوەی خانمیش بکەنێ، دیتم بۆ خۆت پێدەکەنێ، وەک دوو خوشک کە هەزاران ساڵ یەکیان نەدیبێ، سینگ بکەوە بۆ جیهان ئارام بگرێ ،رازی دانێت، ئەو رازەی ساڵانێکە قورس هەڵیگرتووە.

تۆ دەڵێی: مرۆڤ هەر لە ئەزەلەوە پەنجەرەو دڵتەنگی ناسیوە، هەر خاک خۆی ئاوس بووە بەم چەشنە، خاک دڵتەنگیەو پەنجەرەشە، رەنگە زەمین گیرسانی دڵتەنگیەنی خواکان بوو، کە خاکیان کرد، هەموو شتێکی مرۆڤ گۆڕاوە، چرکەکان تەنیایی نەبێ، ئەو هەموو شەڕو گۆڕانەو کەچی دڵتەنگی چما جەوهەرێک، بمێنێتەوە لە زەمیندا، هەموو شتێک بگۆڕێت کەچی خانم بمێنێتەوە لەبەردەم پەنجەرەیەکدا دڵتەنگ، (وریا پەنجەرە بەسەرچاوەی شێوەکانی تر دەزانێ، ئەو پەنجەرەکەمانی لەگەڵ خۆی برد، وریا کورە.و ـ ک) رەنگە خانم ئاسنامەی خودی زەمینە، دڵتەنگییەکانی خانم شتێکە خواکان دەیکەن و دواتر هەرچی لە تەشقی ئاسمان و توتی جەنگەڵ و دڵی بەردو لوتکەی کێوا کۆدەبنەوە، بۆیان ناشکێ، هەرچی پاڵەوان و خوا گچکە خەلق دەکەن بۆیان ناشکێ، کەچی قەتیش دڵتەنگان بۆیان نەکرا سەربوردەی خۆیان بنووسنەوە.

ئەڵێم: رەنگە خانم خۆی پەنجەرەکەی نووسیبێ، رەنگەش دوای خانم ئاشقێکی، غەریبێکی، یان کەسێک کە خانم هەمیشەو تا ئەبەد چاودێری دەکات نووسیبێتی، رەنگە نووسەر یان بەردتاش یان نەقاشێکی پاش خانم کردبێتی و خانم تەنیا دڵتەنگییەکانی کەسێک، ئاشقێک یان دڵتەنگییەکانی نەقاشێکی ئەوسا نەبووبێت کە بۆ ئەوەی لێی رزگار بێت. یان ئەوەی فوو بەگیانی دڵتەنگییەکانی خۆیدا بکات، زیندووی کردبێتەوە.

(٢٠)

کە شتێکی سەیر روو دەدات، دایکم دەڵێ نیشانەیە، لەوانەیە ئەو هەمیشە بەدوای خەزردا بگەڕێ و بەناوی کڕینەوە بچێتە بازاڕ، ئەو هەموو شتێک بەنیشانە دەزانێ، ئەو ئەم تابلۆ ببینێ دەڵێ: رۆڵە نیشانەیە.

قورس چما رازی بوونی هەڵگرتبێ. کپ چما دەریایەکی لە رواڵەتدا ئارام و لە بنەوە پڕ لە شەپۆلانی بێئۆقرە، بەرگێکی رەش، دەیبینم لە مۆزەخانە دێتە دەر.

– وێنەی خانم و دەستنووسەکانم هەڵگرتووە، دەبێ کەسێک یەکەمجار بیخوێنێتەوە، ناشێ خانم ئەم ماوە درێژە چاوەڕێی هیچی نەکردبێ، دەشکرێ خانم بەتەنیا خەریکی بیرکردنەوە بووبێت و ئێستەش دەستی لەبەر چەناگەی حەیرەت لانەبردبێ بەچەند تاڵ زوڵفی شێواو بەهەنیەوە، مرۆڤ پێشکەوتووە، کەچی کەس دەستەکانی خانمی پێنەبزواوە، رەنگە ئەم دەستانە بەناخی کارەساتێکی کۆندا رۆچون و بەردەوام دەبینن، یان هەمیشەو زەمەن کارەساتێکەو خانم هێشتا نیگەرانە، خانم رووی لە ئایندەیە و لەبنی قەدیمەوە کارەساتێکی بەردەوام دەبینێ کە دەکشێ.

ئەو رۆژە تازەترین بەشی دەستنووسەکە دەڵێتەوە: وریا بە مویتەلامان نەبێت، کە گرانە ئەگەر تێبگەی، دڵی بەچی خۆشە ئەوی لەژێر تیشکی هەتاوماندا رێدەکات، هەموویان مویتەلامانن (ئەم بەشەمان لە رووی وتەیەکی تەوراتەوە ساخ کردەوە.و ـ ک) تێگەیشتن، پشکنینی رازی بەرد، سڕی گەردشی ئەستێران و تاو، ناڵەی ئاو و دەنگەبریندارەکانی شەو. دۆزینەوەی مەودای نێوان حەرف و دەست بەرزکردنەوەکانی نەقاش، راهێنانی دەست و پەنجە، ئەو کاتەی دەست ببێتە چاو، ببێتە گوێ و ببێتە دەلیل، هەستکردنی رۆحی بەرد بەپەنجە، بەلاواندان و ئاشق بوون بەقەد بەرد بەخانم، هەڵمژینی هەوای تاسەو حەزو بیستنی دەنگی هەنسکی لە بەردەوە، کاتێک خاتوو نییە، سمینی رۆح بۆ بیستن، بوێری بۆ بەرگە گرتنی راز، جورئەتی تێگەیشتن و داخستنی درگا لە گشت شت، لە گشت رەنگ، پێکەوە نووساندنی حەرفەکان و دەرکی وشە ئەو کاتەی لە حەرف شلوێ دەبێ، جوێکردنەوەی وشەکان لە یەکتر.

(٢١)

کاتێک هەموو شت خەریکە لە یادەوەریدا هەڵدەقرچێ.

ئەو سەرەی لەم دەفتەرەدا نەبێ بۆ نەبێ باشە لەم چیرۆکەدا کەس نەیبردەوە وەک رێگا کە کەس بەبراوەیی لێی نایەتەوە. چون لەو سەرەوە کەسێکی تر دێتەوە، لێرەدا زۆر کەس بەجێمان، بەڵام لەو سەردوە کەسێکی تری:

بێ ئاگا و ئاوشیار، خۆسپاردوو بەدەست هەندێ وشەو پیتەوە و هەوڵ بۆ دەرخستنی دێر، شتەکان دووپات بنەوە، یەکتر رابکێشن، چرکەکان یەکترو زەمەنەکان یەکتر، بزێن لە دڵی یەکترەوە بۆ ئەوەی یەکبگرن و بەرامبەر بەتۆو گێڕانەوەت گشتێک دروست بکەن، کە تۆو زمان و گێڕانەوەشت سنووردار بکەن. هەر چۆن نەققاش یان خانم. بزێن لە دڵی یەکترەوە وشەکان و هەمان وشەکان بن، زەمەن لە کۆنەوە تا هەمیشە بکەنە یەک زەمەن و گێڕانەوەکان وەها تێکەڵ بکەن سەرەداوەکانی تەنیا خودی شتەکان بن، هەندێ جارهەموو زەمەن لە وشەیەکدا بگوشرێ و کەچی وشەیەکیش بێت ئاسایی لە پاڵ وشەکانی دیکەدا، چون خانم کە داستانەکەی و رەنجەکانی ببنە وشەیەک و بەگێڕانەوە غەدر لە چاردنووسی بکرێت[ دەبینن چۆنە، ئەگەر ئێوە شتی وەهاتان دۆزییەوە بیفروشن، مەیخوێننەوە. پەندی بێشینان] هەر چۆن نەققاش کە هەموو رەنجەکانی، تەنیا دەبێتە چەند وشە و لەسەر بەردێک جێدەمێنێ و دواتر کەسێک یان کەسانێک دەیخوێننەوە (و تەواویش نابێ.و۔ ک) یان ئاو یان مرۆڤ لە رێکەوتێکدا و لە سەردەمێکیتردا بیدۆزنەوەیان نا دەرکەوێت و کەچی هەمان چەند وشە بەداستانەکەی وەربگێڕێ چون زەین کە ناتوانێ و دادەمێنێ لەنێو ئەم هەموو رەنگەدا و دەبێ خۆ هەڵوەشێنێتەوە لەخۆ یاخی ببێ و خوێنی لێبچۆڕێ و هەڵوەشێن هەرچی دەمارە چون ئێمە کە بێت و رێبوارێک بماندۆزێتەوە و لە توێی ئەم پەڕانەدا یان هەڵودرێین لەم پەڕانەدا و تێدا بچین یان نا بمانپارێزێ و سەردەمێک کەسێکی وەک ئەوەی یەکەم جار ددماندۆزێتەوە کەسێک خەریکە چیرۆک دەنووسێ دەگێڕێتەوە بەشکاوی و لەتەکانی بۆ کۆناکرێنەوە زیندوومان دەکاتەوە لەم پەڕانەدا.گرانە کە تێبگەی کۆتایی ئەم چیرۆکە، کۆتایی خۆشتەو بێئاگا بەلەززەتێکەوە دادەنیشی و داستانێک لە پەڕە پچڕاوەکان و پەڕەدڕاوەکان و زەینێکی پارچە پارچە، لەپیت و دەنگە بەجێماوەکان ساز دەکەیتەوە، زیندوو دەکەیتەوە، کەچی نازانی چۆن و کەی خودی داستان بەسەر خۆشتا زاڵ دەبێت و لە راستیدا بێ ئاگا خەریکی گێڕانەوەی خۆتی و بەم شێوە دەبیتە شەیداو هاوکات یەخسیری ئەو داستانە و بیردەکەیتەوە کە رەنگە هاتووین تەنیا بۆ ئەوەی چیرۆکی رووخان و دڵداروکەو دڵتەنگین ئەزلی تا ئەبەد تەواوی بکەین و ئەوی دەتگێڕێتەوەو دەتناسێ خاتوو ئەوی دەیگەیتێ تەنیا دەبێتە چرکەیەک لەم داستانە ئەبەدییە داستانی دڵتەنگی داستانی مرۆڤی چاوەڕوان تا هەمیشە داستانی خانمی بەر پەنجەرە.

بەدرەختێک دەگەی لە پارکێک بۆ تاوێک

(٢٢)

جولانەو بۆ تاوێک گەردنی [تیشکی هەتاو بەجێبهێڵە، ئەگەر ژوورێکت بۆ خۆت هەیە دەچیتەوە بۆ ژوورەکە ئەگەر نییتە لەشار بچۆ دەرەوە کەلاوەیەک یان شتێکی وا دەدۆزیتەوە، ئەگەر دەردوەی شار بوو بەڵکو لە پاڵ ئاوا بێت، ئەم دەفتەرە بدە بەدەمیەوە، ئەگەر قسەیەکیشت مابوو بۆی بکە، پاشان درگای ژوورەکە دابخە یان بچۆ کەلاوەکەوە، ئەگەر ژوورەکەت بنمیچەکەی دار بێت باشترە ئەگەر نەیبوو پەلێکت لێ بکەرەوە، رایەڵی بکە بەبنمیچەکەدا، ئەگەر لە ژوورەوەش بوویت و دار نەبوو دەتوانی لە قەسابەکەی گەڕەکتان دارەکەی بەقەرز وەربگری، دەست ببە، هەر لە گەردنەوە، ئەستوورترین دەمار هەڵبژێرە، تاکوو بەندی دڵت چووە ئەو دەمارە، بیپسێنە، چەند جارێک بەدەستتەوە هەڵدەپەڕێ دەمارەکە، ماتڵ بەتا سارد ئەبێتەوە، دوو دەور لە ڕایەڵ، پەل، یان داری قەسابیەکەی شەتەکدە، پاشان گرێیەکی حەوت قوفڵەی لێبدە، یەک دوو جاریتر رایکێشە، ئینجا ئەو سەریتری دەمارەکە، کە ئێستا ئاوێزان بووەو ساردیشە لە دەوری ملت بئالێنەو شەتەکی دە، بەدوو پەنجە شوێنەکانی ئەندازە بگرە، ئێستە دوو شوێنەکە گرێبدە، بازنەیەک لدوست ئەبێ، ئەگەر لە ژوورەکەی خۆتی، کورسیەک بهێنە، ئەگەر نا بەچەند بەرد کورسیەک دروست بکە، بچۆ سەری، هەناسەیەکی قووڵ هەڵکێشە، گەردنت بخە نێو بازنەکەوە، ئەگەر لەسەر کورسی بوویت شەقێک بەپاژنەی پێت لە کورسیەکە هەڵدە، ئەگەریش لەسەر بەردیت بەردەکان بڕوخێنە، من کە ئەم وەرگێڕانەم سپاردە ڕەزا وا دەکەم، تۆش ئەم ددفتەرە دابخە. یان...

*** لەسەر داوای نووسەر، ئێمە وەک گۆڤاری کاروان هیچ دەستکارییەکمان نەکردووە،تەنیا ئەو وشانەی هەڵەی چاپیوون.**

# چارەنووسی مرۆیەکی نەگبەت



ئەحمەد سەلام

کاروان دوورو نزیک هەقی بەسەر کەسەوە نەبوو، وەکو دەڵێن دەروێشی ماڵی خۆی بوو، کەچی سەرەڕای ئەوەیش کەم و زۆر بەر پریشکی هەموو ئەو ئاگرانە دەکەوت کە لە شارەکەدا هەڵدەگیرسان.

ئێستاش هەموومان ئەو رۆژەمان لەبیرە کە چۆن شار تووشی رەشبگیری هات، یەکەم کەس لە گەڕەکەکەمان قۆڵ بەست کرا ئەوبوو، دوو سەرباز یەکێکیان رەشتاڵەیەکی لاواز، ئەویتریان تەنگ ئەستورێکی سوور فل بوو، بەدوو قۆڵی تا گەیاندیانە ناو زیلەکەی ئەوسەری کۆڵانەوە بەئارەزووی خۆیان شەق شەقێنیان پێکرد!.

ئەوجا هەر بە پاڵەپەستۆ فڕێیاندایە ناو زیلەکەوە، بۆ خۆیشیان گەڕانەوە تا فریای چەند نیچیرێکی دی بکەون.

ئەو رۆژە تا دەمەو عەسرانێکی درەنگ پەیتا پەیتا خەڵکیان قۆڵبەست دەکردو تۆڕیان هەڵدەدانە ناو زیلەکانەوە.

ئەوەتا بە (کاروان)ەوە نزیکەی شەست حەفتایەکی دیان راپێچ کردوە.

کاروانی زیلەکان هێشتا بەڕێوەبوون لەپڕ بێ سێ و دوو لەناو ئەم شەست، حەفتاکەسە کەوتنە وێزەی ئەو بەستەزمانە، ئەویش هەر سوێندی دەخوارد و دەپاڕایەوە کە هیچی لە هیچ دا نییە کەچی سەربازەکان زیاتر شێلگیر دەبوون و زیاتر شلکوتیان دەکرد!

زۆری نەخایاند زیلەکان روویان کردە سەربازگەیەک لەوێ بەئاماژەکردنی سەربازێک هەر هەموو وەستان و یەکە یەکە گرتووەکانیان لە زیلەکان دابەزاند، ئەوجا یەکە یەکە ریزیان کردن و بەرەو هۆڵێک راپێچیان کردن، هۆڵی چی من ناوی هۆڵی لێدەنێم ئەگینا تەویلەخانەیە بوو بۆ خۆی ئەگەر کەمێ دوربوویتایەتەوە لە پانتایی ئەو شوێنە بۆت دەردەکەوت کە هێشتاکە پاشماوەو بۆن و بەرامەی تەرسەقول و پیسایی ئاژەڵ بەشوێنەواری ئەو شوێنەوە هەرماوە!.

زۆری نەبرد لەوێیشا هەر دیسانەوە گڕگڕ بەربوونەوە وێزەی کاروانی نەگبەت تا نیوە مردویان نەکرد دەستبەرداری نەبوون، خۆ چ قۆرەتیش بوو یەکێ لە ئێمە شەفاعەتی بۆ بکردایە، ئەگەر بهاتایە یەکێ بەجۆرێ نارەحەتیەکی نیشانبدایە ئەوە بەشە خۆراکی لە تێهەڵدان ئەگەر لە کاروان زیاتر نەبوایە ئەوا هیچی لەو کەمتر نەدەبوو.

کەمێ باری کش و ماتی باڵی بەسەر هۆڵەکەدا کێشا، ئێمەیش دوو دوو، سێ سێ سەرمان نا بەیەکەوە، هەر یەکەو بەجۆرێک لە رازو نیازی گرتنەکەی خۆی دەکۆڵیەوە!.

لەولایشەوە کاروان خەو بردیەوە، پرخەی خەوی لەناو هۆڵەکەدا دەنگی دەدایەوە.

جارجارە لە ورتە ورت و هات و هاواری کاروان هەر هەموو ملمان قووت دەکردەوەو لەگەڵ هێوربوونەوەیشیدا ئێمەیش دەکەوتینەوە سەر رازو نیازەکانی خۆمان، نەخێر

زۆری نەبرد لەپڕ قیژەو هاوارێک لە کاروانەوە بەرز بۆوە، هەمـوو هۆڵەکـەی بەجـارێ شـڵـەژاند، هەر هەمـوومـان لە دەوری کۆبووینەوە، جۆرە گەشکەیەک گرتبووی بە ئامان و زامـان نەدەهاتەوە سـەر خـۆی، یەکێ ئاوی دەکـرد بە دەمیەوە، یەکێکی تر کەوتبووە شێلانی، یەک دوانێکی دیش پەیتا پەیتا ئارەقەی ناوچەوانیان دەسڕیەوە، وردە وردە هاتەوە هۆشی جـارانی ئەوجـا ئێـمـەیش بـارانی پرسیـارمـان بەسەریا باراند. حەمە یەکەم کەس بوو لێی پرسی:

- ئەرێ ئەوە کاکە کاروان چی بوو بۆ وات لێهات؟

کـاروان پاش ئەوەی قـومـێکی لە ئاوەکـەی بەردەمی هەڵقوڕاند ئەوجا تەڵەی دەمی تەقییەوە:

- کورینە لەوە دەچێ من بۆنەگبەتی خولقابم و بەهەڵە هاتمە ئەم دنیایەوە!

ئەوجا ئازاد پرسی:

- چۆن و بۆچی کاکە کاروان؟

کـاروان وەک چاوێکی کـامـێـرا ئاسـا چاوێکی بە سـەروسیـمـای هەمـوومـان داگـێـڕاو ئینجـا رووی دەمی تێکردنەوەو گوتی:

- ئێـوە جـارێ جگەرەیەکم بدەنێ، جگەرەیەکـیـان بۆ داگـیـرساند، مـژێکی قـووڵی لێـداو دیسـانەوە کـەوتەوە قسەو گوتی:

- لە من وایە ئەگـەر لەم دەردو بەڵایەی ئەم دنیـایە قـوتارم بێ ئەوا لەو دنیـا خـودا شـتێ پاداشت و میهرەبانیم پێدەبەخشێ.

ئێسـتاکە وا دەبیسـتێ بۆ خۆیشم سەرم سوڕماوە چۆن لەدەست فـەلاکـەتی ئەو دنیـایەش رزگـارم بوودو هاتومەتەوە ناوتان.

خۆ هەموو دیتـان ئەو تۆزە سەرخەوەی بەناخێری گیـانم شکانم، لەچاوتروکاندنێکا ئەو خەوە بووە مایەی مەرگ و لە گیانم ئالا، کاتێ بەخۆم زانی دوو زرتە بۆزم بۆ هاتن هەر پەلێکم بەدەست یەکێکیانەوە زەلالەتی بوو، ئەوەندە ئەمـسـەرو ئەوسـەریان پێکردم ئەوندەم بەخـۆم زانی وام لەناو ئاگرێکا ئەتووت هەرچی فڕن و ئاگردانی ئەم دنیایە هەیە هەمـووی لەو ئاگرسـتـانەدا کـاردەکـات، هەر لەم خەوەدا خـۆم بە قـەرەبرووتی بینیەوە، پاشـان دوو کـەسی دی هاتن دەسـتـیـان دایە بن هەنگڵم تا هێـزیان تیـابوو توریان دامە ناو شلەمەنیەکەوە، لەمن وایە ئاوە توومەزە تێـزاب بوو، لەوێیـشـا قـرچ و هوڕ ئەوەندەی دی پروکـانیـانم، چەند لالامـەوەو چەندی دی پاڕامـەوە بێسـوود بوو. مـاوەیەکـیش ئەو دەردەم چێشت ئەوجـا لەوێیش دەریانهێنام و فڕێیاندامە بەردەمی دوو گورگی بۆرەوە، نەخێر ئەوانیش درێغیان لێنەکردم تا تێر نەبوون لێم وازیان لێنەهێنام، ئیـتر تا نەرمەی لەشییان بەسەر ئێسقانمەوە نەهێشت دەستیان لێ هەڵنەگرتم، کە زانییان کەڵکم پێوە نەماوە ئەوجا پاشماوەی جەستەیان بۆ دوو سەگ بەجێ هێشتم. لەپڕ نازانم لەکوێوە دەنگێک هات و گوتی:

- نەکەن ئەمە ئەو زەلامە نییـە ئێمە بۆی دەگـەڕێین، دەنگەکە رووی کـردە کـیـژۆڵەیەک و پێی راگـەیاند هەر ئێستا بیبەن تیماری کەن و لەکوێیشەوە هێنراوە بیبەنەوە شوێنی خۆی!.

کـاتێ کـچەکـە بردمی بۆ تیـمـارکـردن و کـەمێ هۆشم هاتەوە بەر خۆم لێم پرسی:

- خـوشکی باش بۆچی بەم دەردەیان بردم و ئێـسـتـا نیازیان چییە. چیم لێدەکەن.

کیژۆڵەکە بزەیەک گرتی و گوتی:

- تۆ ئەوەندەی لەسـەر دنیـای خـۆتدا بۆت نووسـراوە جـارێ ئەوەندەت بەسـە، هێشـتـا وادەی ئێرەت مـاوە، با لای خۆتان تێـر بن لێت ئەوسـا راپێـچی ئێـرەت دەکـەین لێرەیش هاوبەشی ئەم زەماوەندە دەبیت!.

بەدڵ ئاواتم دەخواست دەقەیەک زووتر بێمەوە ناوتان، ئێـسـتـا خـۆیشم نازانم چۆن گـەڕاومـەتەوەو نازانم بۆ لەمەودوا چیم بەسەر دێ.

کاروان لە گەرمەی سەرگوزەشتەکەی دابوو لەپڕ دەرگای هۆڵەکە کرایەوەو دوو زرتە بۆز هاتن لەناو هەمووان پەلی کاروانیان گرت و بردیان، ئەو بردنەی بردیان جارێکی دی نەمانبینیەوە.

(مەلا) یەکمان لەگەڵ دابوو گوتی:

- نسـیبی ئەم پیاوە لە دنیـاو قـیامـەتدا ئەمـەیە و لە چارەی نووسراوە دەبێ وابژی و وەهایش بمرێ.

# سینەمای گەڕەک

ئاهەوان عەلی حەمەد

لەگەڕەکەکەماندا، تەنها عەزە دوکانی کولێرە بەڕوونی هەبوو.. هێشتا ئەو چەند دوکانە تازە نەکرابوو، خەڵکێکی بێشومار روویان تێدەکرد. وەلێ شای بە سەپان نەدەزانی و زەوق و ئارەزووی خۆی دەجوولاوە.. یەکێک دوو کولێرەی بویستایە، راینە دەگرت، خۆ ئەگەر سەرەی دانانی پارە ئەوەندە دوورو درێژ بوایە و مەبەستیبوایە یەکێ بەرێبکا، لەجێوە دەستێکی لێ دەشەقاند یاسەری بۆ بادەدا«دەی برا وەرگەرێ و بەولایەدا بسوورێوە».

کە دەنگی نارەزایی بەرز دەبۆوە:«کاکە ئەمە کەی ویژدانە؟! چ خوا هەڵدەگرێ ئێمە یەک دوو سەعات بەپێوە بوەستین، کەچی بەکەیف و ماشای خۆت ئەوەی حەزتپێکرد، لەچاوتروو کاتێکدا بەرێیدەکەی؟!» وەلێ وەکو تەقەی سەربێ و مێشیشی میوان نەبێ، پرتەو بۆڵە بۆڵێکی لێوە دەهات و رووی وەردەگێڕا.. خۆ ئەو تێکگیربوونە بگەیشتایەتە شەڕە جنێوو چاو لێک سوورکردنەوە، بە دەگمەن قوتاری دەبوو، ئەگینا سەرو گوێلاکیان چادەکردەوە و سەرەتا تەوژمی گریانێک لەقورگیدا قوڵپی دەداو چۆڕاوگەی فرمێسک بەکپی، بەبێ لرفە لرف و هەنسکدان دادەڕژایە سەر جل و بەرگەکەی، لەو بێنەو بەردەدا، ژمارەیەک دەبووە تەماشاکەر.. ژمارەیەک بۆ ناوبژیوانی و ژمارەکەی تر بە ئەسپایی پارەی خۆی لەسرەکە هەڵدەگرت و بەدەستی بەتاڵەوە، بەرەو ماڵ هەیپێیان لێدەکرد.

عەزە سەر تۆپی هەموو ئەوانە، عاری نەدێناو بە دەروونێکی پڕ لە ژەنگ و ژارو بە تەوسێکی تێکەڵ لە بێزاری و دڵتەنگی، دەیوت: (ئەوەی بە من رازیە باشە، دنا روو دەکاتە کوێ و بۆ کوێ دەچێ، ئەوە گرفت و کێشەی خۆیەتی) باوکم لە بێتاقەتی و چوونە ساڵەوە، زۆربەی بەیانییان، لەگەڵ تاریک و رووندا هەڵیدەستاندم:( کوڕە شیرینەکەم هەڵسە، تا زووەو نانەواخانە نەبۆتە سینەما، برۆ بایی ئەو پێنج پەنجاییە کولێرە بە روون بێنە).

قسەکەی وابوو، زۆر جار لە گەڕەکەکەماندا، کاتێک دوو ژن یا دوو پیاو بەشەڕ دەهات و شەڕەکە گەرم بووایە، هەرچی دەرو دراوسێ و خەڵکی بوو، لێیان کۆدەبۆوەو ژمارەیەکی زۆریان لە دوورەوە سەیریان دەکرد... ئەوەی دەچووە بەینەوە، دەیوت( بەڕاستی زۆر عەیبە بۆ ئێوە لەسەر شتێکی بچووک، بە رۆژی رووناک و لە پێش چاوی ئەو خەڵکە، خۆتان کردۆتە سینەما).

من و ئێوەو هەموومان، ئەو کاتانەی رۆژیان تێدا درێژو شەویان تێدا کورتە، وەکو پێویست چێژ لە خەوتن وەرناگرین، ئەو شەوانەی تا درەنگە وەخت بەدیار فلیمێکی خۆشەوە دادەنیشتم، بەیانیەکەی خەو بە زۆر یەخەی بەردەدام و لە کۆڵم دەبۆوە، کە ئەگەر ناچاری ماڵەوەو بژێوی ژیان نەبوایە، تا دەمە دەمی نیوەرۆ لەخەو هەڵنەدەستام.

دوێنێ شەو لە پیشاندانی فلیمێکی میسری نەمزانی ناونیشانەکەی چی بوو؟!

فلیمەکە باسی ئەشق و بەیەکگەیشتنی کوڕو کچێکی دەکرد کەتا تەواوبوونی فلیمەکە لەجێی خۆم نەبزوام، ئەوجا بە لەشێکی شل و خاو و شلۆقەوە هەڵسامە سەرپێ و بە ئەسپایی دەستم گەیاندە دوگمەی تەلەفزیۆنەکەو کوژاندمەوە.. باوکم هێشتا بە خەبەر بوو، بە دەنگێکی قرخنی نووساوەوە بانگیدام:( کوڕە شیرینەکەم لەگەڵ دەستی خۆت گڵۆپەکە بکوژێنەوە).

مانگ هێدی هێدی بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا.. بەرقەوە چنگم بە دەوری سەرم گێراو چەقاندمە نێو قژمەوە... سەراپای لەشم نیشتبووە سەر ئارەقێکی گەرمی لینج، بیرو ئەندێشەم دوور فری، بیرکردنەوە لە (تاقگە) ئەو

تاقگەیەی چەند رۆژێک بوو باوکی بۆ خۆی بە شوویداو خەو و خۆراکی لێ هەڵگرتم.. ژیانی فلیمە میسریەکەو ئاوێتە بوون بەو ژیانە وەک تەمێکی خەستی پڕ لە خەم، دەروونی تەنیم، هەزارو یەک تف و نەعلەتم بۆ باوکی تاقگە نارد.. سێ جار خزمانم ناردە خوازبێنی، هەر جارەی بە قسەیەک بە رێیدەکردن.. جاری یەکەم پێیانی وت: من کچی خۆم لەو کوڕە پیاوتر نادەم، بەڵام کچەکەم هێشتا منالە، نیازم نییە تا چوار پێنج سالێتر بە شوویدەم.. جاری دووەم بەم شێوەیە وەڵامی دانەوە: کەی کچەکەم قسمەتی هەڵسایەک دەقە رایناگرم و یەکسەر بە مێردی دەدەم، دیارە تا ئێستا قسمەت نەبووە.. دواجاریش پێیانی وت: من ئەو کچەم بەهەزار دەردە سەری گەورە کردووە، ناهێڵم وا سووک و سانا لەو مالە بڕوا، لەبەر ئەوەی هیچ کوڕم نییە بۆی بکەمە بنپشک، ناچارم بۆ خۆمی بە ژن دەدەم.

ئەفسووس گەورە بەگچکەی پێکردو دایە پیاوێک بە باوکی دەشیا.

موچڕکەیەکم بەلەش داگەڕا.. سەرم هەڵبڕی، مانگ تەختی ئاسمانی جێ هێشتبوو، رووەو ئاوابوون بەرەو دامێن دادەخزا.. مەیلم بەلای خەوتن بزوا، پێڵووەکانم گران داهاتن و نیشتنە سەر یەک، بەمە داخزامە باوەشی خەوێکی ئەرخەوانی خۆش.. بۆ گەیشتن بە مەرامەکان، بەهەشتی هەژاران خەوەکانیانە.. یەک لەو کڵۆڵ و داماوانە منم، بەختۆ دایک و باوک و پێنج خوشک لەنێو دوو ژووری بەرتەسک و تروسک و هەیوانێکی بچووک، ٠حەوشەکەی چوار بە دوو بوو، هاوینان لەسەربانێکی پان و پۆڕو بەرین، کێشەی بێ جێیمان نەبوو بەڵام لە زستاندا گەر میوانمان بهاتایەو لە پێنج کەس زیاتر بوایە، دەبوو من و یەک دوویەک لە خوشکەکانم لەبەر هەیوانەکە بنووین.. پێچەوانەی ئەو واقیعە، لە خەونەکەما خانوویەکم هەبوو دوو نهۆم، ئەوەی پێداویستە تیایدا دابینکرابوو زۆر شادو بەختەوەر بووم بەوەی هەر لەو خەوەدا (تاقگە) بووەتە خێزانم، لەسەر سیسەمێکی نەرم و گەرم بەیەکەوە راکشابووین.. کەیفساز، تریقەی پێکەنین و خنانەوە، گەمەو دەستبازی بۆ تاوێک بەو چەشنە ماینەوە.. پڕ تاو لە ترنترنی مۆبایلەکە راست بوومەوە، بۆ خۆشیەکی بێ سنوور گەمارۆم نەدا لە جیاتی تەلەفۆن، مۆبایلم هەبێ؟!

یەک لە دوگمەکانم داگرت و بەدەم بزەیەکی تێکەڵ بە سۆزەوە، کەوتمە قسە: ( ئەلۆ.. ها، کاکە عومەر ئەوە تۆی؟! ئەحوالت؟! باوک و دایکت چۆنن؟! مالەوەتان؟! بەڵێ... بەڵێ، ئێستا.. باشە هەر خۆشم حەزدەکەم.. ئێ ئەو سینەمایەی دەوروبەری پارێزگا... باشە، ئێستا دەگەمە لات چاوەڕوانمبە.. باشە... باشە خواحافیز).

مۆبایلەکەم داخست.. بۆ چەند چرکەیەک دەمم نایە نێو دەمی تاقگەو بە ئیشتیاوە لێوە ناسکەکەیم مژی.. دەستم بۆ ژێر سوتیانەکەی درێژ کرد ئەو سوتیانەی سویچی سەیارەکەم لەنێوانی هەردوو مەمکیدا جێ هێشتبوو، سویچەکەم دەرکردو بە هێواشی راست بوومەوە.. خۆم گۆڕی و بەرەو پێش خانووەکە هەنگاومنا لەوێش تازەترین جۆری ئۆتۆمبێلم لەژێر دابوو، مایەی سەرسوڕمانە، بۆ واقم وڕنەمێنێ؟! لەوەتەی هەم، نازانم لێخوڕینی سەیارە چۆنە؟! لەبەر بێ دەرامەتی تا ئێستا دوو جار بە تەکسی نەچوومەتە مەیدانی کرێکاران، هەر وتوومە با ئەو پارەیەی دەیدەمە تەکسی، کەلێنێکی بچووکی مالەوەی پێ پڕبکەمەوەو رۆژانە زیاتر لە (٤) کیلۆمەتر بە پێ دەبڕم.. کەچی ئێستا شۆفێرێکم، شارەزا، دەڵێی بیست سالە ئەوەیە پیشەم.. سولفێکم لێدا پێم بە بەنزینەوە نا، کە لەبەر مالی عومەر وەستام، ئەو لە چاوەڕوانیمدا بوو.. سەرکەوت، گێڕەکەم دایە یەک و لە گەرمەی رۆیشتندا بەرەو سینەما دەچووین.

دەنگی باوکم بە ئاگای هێنام.. دەستی راستی هەڵبڕی و بە ناوچەوانیدا هێنا: ( دەی کوڕە شیرینەکەم هەڵسە تا دەرنگ دانەهاتووە؟!) کە هەندێ وردەی خستە ناو لەپی دەستم، درێژەی بە قسەکانیدا: (کوڕم بچۆرە ئەو سینەمایەو بایی ئەو پێنج پەنجاییە کولێرە بەڕوون بێنە).

باوشکێکی قووڵم دا... خۆر بەدەردەوە نەبوو، هەور بەری ئاسمانی گرتبوو، هەستم کرد ئازارێک لە بڕبڕەی پشتمدا سەرو و کلێنچەم بروسکە دەدا، پشتم بۆ چەند جارێک بەملاو بەولادا هێناو بردو راستم کردەوە، کە رووم وەرچەرخاندێ، بەبزەیەکەوە لە وەرامیدا بەسەرو زمانێکی شیرینەوە وتم: ( بابە گیان پێش ئەوەی پێم بڵێی بچۆرە سینەما، هەر خۆم لە خەوەکەشدا بەرەو سینەما دەچووم).

**رۆژهەلاتی کوردستان/ پیرانشار ۱۹۹۱**

# گرانخۆسی ڕاوچی

## فرانز کافکا

نزران عومەر حەمە

دوو منداڵ لەسەر دیواری بەندەرەکە دانیشتبوون زارزارێنیان دەکرد، چەند هەنگاوێک بەولاوە، پیاوێک لە سێبەری پەیکەری پاڵەوانە شمشێر بازەکەدا خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامە بوو کچێک گۆزەکەی لەکانی پڕ دەکرد، میوەفرۆشێک لە تەنیشت تەرازووەکەیەوە قیت وەستابوو سەیری ئەمبەرەو بەری دەریاچەکەی دەکرد، لە دەرگاو پەنجەرە خامۆش و والاکانی (خان)ەکەوە دوو پیاو دەبینران، لەوپەڕی هەوای خۆیاندا شەرابیان دەخواردەوە، خاوەن خانەکە لە حەوشەکەدا لەسەر مێزێک خەوەدەبیردەوە، بە تەختە بەلەمێک، وەک ئەوەی ئاوەکە لەگەڵ خۆیدا هەڵیگرتبێ و هێنابێتی، وردە وردە بەرەو بەندەرەکە دەکشا، پیاوێکی شینپۆش لە بەلەمەکەوە خۆی بە دیواری بەندەرەکەدا هەڵواسی و خەریک بوو گوریسێکی بە ئەڵقەیەکدا دەکرد، دوو پیاوی دی بە چاکەتە ڕەشە دوگمە زیوینەکانیانەوە تابوتێکیان هەڵگرت، کە بە پارچە قوماشێکی ئاوریشمینی گەورەی گوڵ گوڵێن داپۆشرابوو، لەوە دەچو کەسێکی لەناودا ڕاکشابێت. لەو سەکۆی بەندەرەدا کەس باکی بە تازە هاتووەکان نەبو، تا تابوتەکەیان لەسەر شانیشیان داگرت و چاوەڕێی بەلەمەوانەکەیان کرد کە هێشتا سەرقاڵی بەستنی گوریسەکە بوو، نە کەس لێیان نزیک بویەوە و، نە کەس پرسیاری لێکردن، بگرە کەس هەر سەیریشی نەکردن.

ژنێک بە پرچێکی ئاڵۆزکاوو بەرەڵاوە، منداڵێکی لەباوەش گرتبوو، کە ئەویش ئێستا لەناو بەلەمەکەدا دەرکەوت، کەمێک زیاتر بەلەمەوانەکەی دواخست، پاشان هاتە سەرەوە و ئیشارەتی بۆ خانویەکی کۆنی زەردباوی دوو نهۆمی کرد لای چەپی دەریاچەکەوە، تابوت هەڵگرەکان تابوتەکەیان تا بەر دەرگای ماڵەکە هەڵگرت، کە دەرگایەکی نزمی هەبوو، بەڵام کۆڵەکەکانی قەشەنگ و ئەستوربون. لەو کاتەدا منداڵێکی بچووک پەنجەرەکەی کردەوە- تا ئەوانە ببینێت کە لەخانوەکە بزر دەبون، پاشان بەخێرایی پەنجەرەکەی داخستەوە. ئێستا دەرگاکەش، کە لە داربەڕوو، بەڵام زۆر قایم دروستکرابوو، داخرا. پۆلێک کۆتر کە بەدەوری زەنگی بورجی کەنیسەکەدا باڵە فڕێیان بوو لەبەردەم خانوەکەدا، وەک ئەوەی بلێی دانەکەیان لەوێدا ئەنبار کرابێت، نیشتنەوە، یەکێکیان تا قاتی یەکەم فڕی و دەنوکێکی لەشوشەی پەنجەرەکەدا. کۆترەکان هەموو ڕەنگکراوەو گۆشتن و جوان بوون. ژنێ ناو بەلەمەکە کەمێک دانی بۆ ڕوکردن و ئەوانیش کەوتنەخواردنی و بەسەر ژنەکەدا هەڵفڕین.

پیاوێکی پیر، بە کڵاوێکی ڕەشی درێژەوە، کە شریتێکی پێوە بەستبوو بە کۆڵانێکی باریکدا هاتە خوارێ، بەوردی سەیرێکی ئەملاولای خۆیکرد، هەموو شتێکی ئەو ناوە بێزاریان دەکرد، بە دیمەنی هەندێ زبڵی ڕژاو لە سوچێکدا دەموچاوی دابەیەکدا، هەندێ توێکڵە میوە لەسەر پلیکانەکان فڕێدرابون بە دارەکەی دەستی گسکی دان، تەقەی دا لە دەرگای خانوەکەو بەدەستی ڕاستیشی کە لە دەستکێشێکی ڕەش دابو کڵاوەکەی لەسەر هێنایەخوار.

دەرگاکە کرایەوە نزیکەی پەنجا منداڵێک لە داڵانێکی درێژدا لەشێوەی ڕاڕەودا ڕیزیان بەستبوو، لەبەردەمیا سەریان دانەواند.

بەلەمەوانەکە لەسەر پلیکانەکان هاتە خوارێ و سڵاوی لە پیاوە خانەدانەکە کرد.. پاش ئەوە لە ڕێڕەوە ڕوناکەکەی حەوشەکەدا ڕێنوێنی کرد بۆ ژورەوە- لەم کاتەدا منداڵەکان وەک ڕیزێک چەند هەنگاوێک لە دوایانەوە وەستابون.. ئەمان هەردوکیان خۆیان کرد بەژورێکی ئارامدا لەدیوی ئەودیوی خانوەکەوە... لەوێوە هیچ خانویەکی دی دیار نەبوو جگە لە دیوارێکی سادەی ڕەنگ خۆڵەمێشی

بەردین. تابوت هەڵگرەکان سەرقاڵی پێکردنی چەند مۆمێکی درێژ بون بەسەر تابوتەکەوە، ئەو مۆمانە چ روناکییەکیان بۆ ئەو ناوە نەبوو جگە لەوەش چەند سێبەرێکیان دەخستە سەر دیوارەکە پاشان سێبەرەکان کەوتنە لەرزین؛ پارچە قوماشی سەر تابوتەکە لابرابوو، پیاوێکی سەرو ریش درێژو شێواو، پێستی خۆر سوتاندبوی... لە راوچی دەچوو.. بێ جوڵەو بێ چرپە بەچاوی نوقاوەوە، لەناویدا راکشابوو، تەنها بەو ئاماژانەی دەوروبەریدا پێدەچوو مردووبێت.

پیاوە خانەدانەکە بەرەو لای تابوتەکە هەنگاوی هەڵبڕی، رۆشتە راسەری و دەستی خستە سەر تەوێڵی پیاوەکە، ئینجا کەوتە سەر ئەژنۆو دەستی کرد بە دوعا خوێندن. بەلەمەوانەکە ئاماژەی بۆ تابوت هەڵگرەکان کرد تا بچنە دەرەوە.. ئەوان چونە دەرەوە، منداڵەکان کە لەدەرەوە وەستابوون دوریان خستنەوەو دەرگاکەیان داخست، بەڵام هێشتا پیاوە خانەدانەکە تەواو ئاسایی نەبوو، سەیرێکی بەلەمەوانەکەی کرد، ئەویش لەنیگاکەی تێگەشت و لە ژوورێکی تردا ون بوو.

یەکسەر پیاوی ناو تابوتەکە سەری هەڵبڕی، روی کردە پیاوەخانەدانەکەو بەخەندەیەکی برینداروە وتی: «تۆ کێیت؟».

بێنەوەی شڵەژانی پێوە دیاربێت، پیاوە خانەدانەکە هەستایە سەر پێ و وتی: «سەرۆک شارەوانی ریڤا»

پیاوەکە سەرێکی راوەشاند، بە ئاستەم دەستی هەڵێناو نیشانەی بۆ کورسیەک کرد تا دانیشێ، و دوای ئەوەی پیاوە خانەدانەکە دانیشت وتی: «من باش ئەوە دەزانم، جەنابی سەرۆک شارەوانی، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت لەسەرەتادا وام هەست دەکرد هەموو شتێکم بیرچووەتەوە، هەموو شتێک لە جێگۆرکێ و سورانەوەدایە، بۆیە وام پێباشە و پرسیاری هەموو شتێک بکەم، تەنانەت ئەوانەش وەڵامەکەی دەزانم، لەوانەیە بزانیت کە من گراخۆسی راوچیم»

«بێگومان» سەرۆک شارەوانی وتی: «هەر ئەمشەو هەواڵی گەشتنی تۆیان پێدام، دەمێک بوو نووستبوین پاشان نزیکی نیوەشەو، خێزانەکەم بانگی لێکردم (سلڤادۆر- ئەمە ناوی خۆمە- تەماشای ئەو کۆترەی پشت پەنجەرەکە بکە)، کۆتر بوو، بەڵام هێندەی کەڵەشێرێک دەبوو هاتە پەناگوێم و پێی وتم: سبەینێ گراخۆسی راوچی مردوو دێت بۆ ئێرە، بەناوی شارۆچکەوە پێشوازی لێبکە».

راوچی سەری لەقاندو زمانی بەلێوەکاندا هێناو وتی: «وایە، کۆترەکان لای منەوە دەفرن.. ئەرێ جەنابی سەرۆک شارەوانی پێتوایە من دەتوانم لێرە بمێنمەوە؟»

«جارێ ناتوانم ئەوە بڵێم،.... تۆ مردویت؟»

«بەڵێ من مردوم، تۆش ئەوە دەزانیت، چەند ساڵێک لەمەوبەر راستییەکەی ساڵەهای ساڵ لەمەوپێش، کاتێک خەریکی راوکردنی بزنە کێوییەکە بوم، لە (دارستانی رەش- لە ئەڵمانیا)، هەڵدێرام و کەوتمە ناو بەردەڵانێکەوە.. لەوکاتەوە من مردوم»

سەرۆک شارەوانی وتی: «بەڵام تۆ زیندوشی»

«تا رادەیەک، لە هەندێ لایەنەوە بگریت وایە... من زیندوشم. کەشتی مەرگی من رێگای وێڵ کرد.. چەرخەکەی بەهەڵە سورا... یان بەلەمەوانەکە بۆ ساتێک هۆشی بەخۆی نەما... یان حەزی بینینی باو و باپیرانم بوو ناتوانم بڵێم کامەیان بوو، تەنها ئەوەندە دەزانم لەسەر زەوی ماومەتەوە و بەلەمەکەم بەسەر ئاوەکانی دنیای ئێرەدا دێت و دەروات. جگە لەوەی دەمەویست لەنێو کێوەکاندا بژیم هیچی ترم نەویستوە، بۆیە من دوای مردنم بەهەموو سەرزەمیندا سەفەر دەکەم»

سەرۆک شارەوانی ئەبرۆکانی هەڵبڕی و وتی:

«تۆ لە دنیاکەی دی چ کارێکت نییە؟»

«نەء.. هەرگیز... من بۆ هەمیشە بەسەر ئەو پلیکانە بەرزانەوەم، لەسەر ئەو پلیکانە ئێجگار بەرین و کراوانە بە هەموو لایەکدا دێم و دەچم، تاوێک بۆ سەرەوە، تاوێک بۆ خوارەوە، تاوێک بۆلای راست، تاوێک بۆ لای چەپ.... بە هەموو لایەکدا، هەمیشە لەسەفەردام... دەجوڵێم، بەڵام کاتێک دەفرم.. فرینی زۆر بەرز- کاتێک بە هەموو هێزی باڵ دەفرم دەروازە دەبینم بەرامبەرم دەبرسکێتەوە، لەبەلەمە کۆنەکەمەوە سەربەرز دەکەمەوە، کە هێشتا بینەوا بینەوا لەروبارەکانی دنیادا بەجێماوە. گوناحی ئەم مردنەم ئێستا بە پێکەنینەوە سەر لە کۆخەکەم دەدا. ژولیای ژنی بەلەمەوانەکە بەیانیان لەدەرگا دەداو خواردنەوەم بۆ دەهێنێ بۆ ناو تابوتەکەم، خواردنەوەیەک لەوڵاتێکەوە دێت، کە بەرێکەوت بەکەنارەکانیدا گوزەرمان کردووە»

قەدەرێکی بەدەر ئەوەی وت و، سەرۆک شارەوانی

دەستەکانی بەرزکردەوە «خۆشت بە بەرپرسیار نازانیت؟»

«نەء، من ڕاوچی بوم، دەبێت لەمە بەرپرسیاربم؟ من لە دارستانی ڕەش بۆ خۆم ڕاوم دەکرد.. ئەوکات هێشتا پڕبوو لە گورگ لەکەمین دا خۆم مەلاس دەدا... نیشانم لە نێچیرەکان دەگرت... کەولم دەکردن....، تاوانی ئەمە چییە؟ ئەمانەم بە میهرەبانییەوە دەکرد وەک گەورە ڕاوچی دارستانی ڕەش ناسراوم، چ تاوانێک لەمەدا هەیە؟»

«منیش نەهاتووم بڕیار لەسەر ئەوە بدەم، بەلای منیشەوە ئەمانە تاوان نین، بەلام ئەی کێ لەمە بەرپرسیارە؟»

«بەلەمەوانەکە»

«ئەی ئێستا بەتەمایت لێرە- لەرێڤا- لەگەڵ ئێمەدا بمێنیتەوە؟»

«جارێ نازانم... بەتەمانیم» ڕاوچی بە بزەیەکەوە ئەمەی وت و دەستی خستە سەر ئەژنۆی سەرۆک شارەوانی و ئینجا وتی: من لێرەم لەوەزیاتر نازانم، لەوە زیاترم پێناکرێت، بەلەمەکەم ستێرنی نییە و بەو بایە دەجولێت کە لە قولایی هەرێمی مەرگەوە هەڵدەکات..

* * *

ئەوەی من لێرە دەینوسم هیچ کەس نایخوێنێتەوە، کەسێک بۆ کۆمەکی من نایەت، هەتا ئەگەر ڕاسپاردەیەکیش کرابێت، دەشێت دەرگای هەموو ماڵەکان قوفڵ درابن... گشت پەنجەرەکان داخرابن، خەڵکی هەموو لەسەر جێگاکانیان نوستون... بەتانیەکیان داوە بەسەریاندا.. زەمین مەنزڵگایەکی گەورەی شەوانەیە. شتێ لەمەدا هەیە، کە کەس من ناناسێت، ئەگەر کەسێکیش هەبێت بمناسێت، نازانێت لەکوێدام... لەکوێ بمدۆزێتەوە، گەر بشزانێت لەکوێدام نازانێت چۆن یارمەتیم بدات، بیری یارمەتیدانی من نەخۆشییەکە، چارەسەری لەناو جێگادایە.

ئەمانە بەتەواوی دەزانم، بۆ ئەوە نانوسم تا داوای کۆمەکێ بکەم لەوکاتەش توانام بەسەرخۆمدا ناشکێ، چەند دەقیقەیەکم بۆ خۆم هەر هەیە وەک ئەوەی ئێستا دەیکەم، بەلام لەوانەشە بەشی ئەوە ماوەم مابێت، هێزم هەبێت ئەو بڕوایانە فڕێدەم و چاوێک بە چواردەوری خۆمدا بگێڕم و بەخۆم بڵێم.. من لەکوێم؟! چەند سەدەیەکە لەکوێ ژیاوم؟..

کاتێک کە ئەمە دەنوسم لەنا بەلەمێکی تەختەدا ڕاکشاوم.. بەرگێکی سپیم پۆشیوە- چ لەززەتێک لە سەیرکردنم دا نییە- سەرو ڕیشم ماش و برنجی بوە، قاچم بە شاڵێکی ئاوریشمی گوڵدار داپۆشراوە.. لە ژوور سەرم مۆمێکی پیرۆز دەگرێ. لەو دیوارەی بەرامبەرمە وێنەیەکی بچوک دەبینم.. دیارە کە ئەوە (جەنگەڵی)یەکە بەدزییەوە، لەپشت پەردەیەکی ڕەنگکراوی جوانەوە نیشانی لەمن گرتوە، لەسەر کەشتیەکە کەسێک دەبینم دێت و چەند وێنەیەکی دەبەنگ و ناشیرین بەجێدێڵێ، بەلام خۆی یەکێکە لە دەبەنگترینیان، جگە لەوانە ئیدی قەفەسەکەم خاڵییە، لەو سوچەوە، لە کونێکەوە هەوای گەرمی شەوی باشووری کزە دەکات....، ئێستاش گوێم لە شلپە شلپی ئاوە خۆی دەدا بەڕوی پیرە کەشتیدا.

لەوکاتەوەی کەوتمە دوای ئەو بزنە کێوییە و خلۆربومەوە ئالێرەدا ڕاکشاوم (هێشتا گراخوسی ڕاوچی زیندو لەماڵییە- لە دارستانی ڕەش) شتەکان بەرێکی ڕویاندا، بەدوی بزنە کێوی کەوتم، هەڵدێرام، لەو دۆڵە باریکەدا هەر خوێنم لەبەر دەڕۆشت. وای بۆ دەچوم ئەم کۆتکە دارە بمبات بۆ ئەو دنیا، لەبیرمە یەکەمجار بە چ کەیفێکەوە لێرەدا پاڵکەوتم، هەرگیز چیاکان وەک ئەم چوار دیوارە ستەبەرییانە گوێیان بۆ ئاوازەکانم نەگرتبوو. خۆشحاڵ بووم بەوەی بژیم خۆشحاڵیش بوم بەوەی کە مردم، بەرلەوەی پێبخەمە ناو ئەم بەلەمە، هەموو شتە قەڵبەکانم فڕێدا، کۆڵەپشتەکەم... تفەنگەکەم.. بەرگی ڕاوەکەم (کە هەمو جارێ بە فیزێکەوە لەبەرم دەکرد)، چۆن کچێک خۆی دەخزێنێتە جلی بوکێنییەوە، ئاوا خۆم خزاندە چەرچەفە چنراوەکەمەوە لەوێدا ڕاکشام و چاوەڕێ بوم.

ئیدی ئەمە بو... ڕویدا....

لەو بەندەرە بچوکەدا دوو پاپۆڕی هەڵمی لەسەریەک هێڵ دەڕۆشتن، چەند بەلەمێکیان لەدەور بون کە بۆ ڕاوە ماسی بەکاریان دەهێنان، ئێستا، جگە لەوانە تەختە بەلەمێکی غەریب دەبینرێت، بەلەمێکی سەرلێشێواو، تارادەیەک نزم و کەمێک بەرین، هێندە چڵکن دیاربوو، دەتوت لەناو قوڕولیتەی کەشتییەکی تردا مەلە دەکات.

دارئالاکانی تەواو بەرزبون... دار ئالا سەرەکییەکەی لەناکاو دەنگێکی لێ بەرزبویەوەو، پارچەیەک لە چارۆکەکەی کە ڕەنگێکی قاوەیی. زەردباوی هەبوو بە لۆچ و پێچ خواردوییەوە کەوتە سەر تەختەی بەلەمەکە وەهاداکەوتە خوارەوە، بە چەندجارە پینەکردنیش هێندەی

پێوە نەمابووەوە بەرگەی سوکترین زریانیش بگرێت، ماوەیەکی باش لێی وردبومەوە.. چاوەڕێم دەکرد کەسێکی لێوە دەرکەوێت، بەڵام کەسم نەدی، پیاوێک لەولامەوە لەسەر دیواری بەندەرەکە دانیشت... پێم وت (ئەو کەشتییە هی کێیە؟) پیاوەکە وتی: (ئەمە یەکەمجارە من دەیبینم، دەڵێن هەر دوو سێ ساڵ جارێک دەردەکەوێت... ئەوە هی گراخوسی ڕاوچییە...)

«تۆ دەڵێی چی گراخوسی ڕاوچی، سەدەها ساڵە لەم بەلەمەدا خەریکی سەوڵ لێدانیت و گەشت دەکەیت؟»

«ئەوە پانزە سەدەیە»

«بەردەوام هەر لەم کەشتییەشدا؟»

«بەردەوام لەم کۆتکەدارەدا... کۆتکەدار... پێم وایە ئەمە دەربڕینێکی ڕاست بێت. تۆ شارەزای مەسەلە دەریاییەکان نیت؟»

«نەخێر تائێستا بیرم بەلایاندا نەڕۆشتوە، تا شتانێکم دەربارەی تۆش بیست تا ئێستاش کە سواری کەشتیەکەی تۆ بوم»

«ئەمە عەیب و عار نیە، منیش لەناوجەرگەی وشکانییەوە هاتووم، من نەسەفیری دەریابوم، نەویستیشم ببمە ئەوە، چیاو دارستانەکان هاوڕێم بون، ئێستاش زۆربەی دەریاوانە کۆنەکان، گراخۆسی ڕاوچی، شاهەنشای بەلەمەوانەکان هاوڕێمن لەگەڵ خزمەتکارەکەی ناوکەشتیەکە، ئەو خەریکی پەنجە تەقاندنە و منیش (وەک باڵندەیەک لەناو هێلانەکەیدا) چیچکەم کردوە، پێکەوە دوعا دەخوێنین.... پێم پێمەکەنە...»

«من پێکەنیم؟... نەخێر پێنەکەنیم، بە دوودڵیەکەوە لەبەر دەرگای کوخەکەتدا ڕاوەستام.. بە دڵە کوتێوە خۆم بەژوردا کرد، میهرەبانی تۆ بوو کەمێک ئارامی کردمەوە، بەڵام هەرگیز بیرم ناچێت کە من میوانی کێم».

«- ڕاست دەکەیت... وایە.. پێدەچێ من گراخوسی ڕاوچی بم... هەندێ شەراب ناخۆیتەوە؟ نازانم جۆرەکەی چیە، بەڵام زۆر قورس و بەتامە... پیاوە گەورەکە بە باشی ئاگای لێمە».

«نا سوپاس... ئێستا زۆر شپرزەم، دوایی لەوانەیە بخۆمەوە، ئەگەر بتوانیت ماوەیەکی تر لەگەڵم دانیشی.... ئەو پیاوە گەورەیە کێیە؟».

«خاوەنی ئەم تەختەدارەیە. ئەوانە، ئەو پیاوە گەورانە بەڕاستی لێهاتون، لێشیان تێناگەم.... مەبەستم زمانەکەیان نییە، هەرچەندە هەندێ جار لەزمانەکەشیان ناگەم.... هەر جارەو لەشتێکیان تێناگەم. من سەرانسەری دنیاگەڕاوم، زمانی زۆر لە گەلانی دنیا فێربوومە، هەندێ جار لەنێوانیاندا قسەکانیانم بۆ یەکتر وەردەگێڕا هی باوپیرانیان و هی ئێستاشیان، بەڵام هێشتا لە ڕێگەی بیرکردنەوەی گەورەکان تێناگەم، لەوانەیە تۆ بتوانی بۆم ڕون بکەیتەوە».

«بڕوا ناکە بتوانم، چیت بۆ ڕون بکەمەوە، ئاخر من لە منداڵێکی بەزیرو هوڕ زیاتر هیچ نیم».

«ئەوها نا... نامەوێ ئاوا بدوێی، ئەگەر کەمێک زیاتر وەک ئینسان بیت و بڕوات بەخۆت هەبێت، یارمەتیەکی من دەدیت، من لەگەڵ سێبەرێکی ڕوت و قوتی ئاوادا چیم پێدەکرێ؟.. لە پەنجەرەی کەشتییەکەوە فڕێیدەدەمە دەریاچەکەوە. هەندێ شت هەیە دەبێ ڕون ببنەوە تۆ کە زۆر شوێنان گەڕاویت دەتوانیت پێم بڵێی، بەڵام ئەگەر وەک ئێستا لەسەر مێزەکەم بلەرزیت و خۆت بخەڵەتێنی بەوەی ئەوشتە کەمەی کە دەتزانی بیرت چوەتەوە، ئەوا لێرە نامێنیت و دوردەکەویتەوە، دەمەوێ ئاشکراو بێترس بدوێی».

«شتانێک لەم قسانەی تۆدا هەن، دەزانم لە چەند ڕویەکەوە، کەڵکی باش لەتۆ وەردەگرم، لەبەر ئەوە هەوڵدەدەم بەسەرخۆما زاڵ بم.. فەرموو پرسیار بکە».

«پرسیارەکەم مەودایەکی دووری هەیە، ئەم مەودایە بۆ تۆ زۆر باشە، تا بەو ئاراستەیە بڕۆیت، دەبێ باشیش من بناسیت، من وەکو تۆ مرۆڤم، بەڵام هی چەند سەدەیەک پێشتر لە ئێستا، چەند سەدەیەک زیاتر لە نائارامی، باشە لێرە بەدواوە لە گەورەکان دەدوێین، ئاگات لێبێت، وەک پێم وتی بڕێک شەرابیش بخۆوە تا زیرەکیت وەبەربێتەوە، شەرم مەکە بە باشی بخۆرەوە، یەک بار شەرابی ترمان هەیە».

«گراخۆس، شەرابێکی زۆر بەتامە گرتینی گەورەکان لەمەوەیە»

«- فەقیرە.... ئەمڕۆ مرد، پیاوێکی چاک بوو، بێ گێرەو کێشەو کۆچی کرد، منداڵێک لە ژوورسەریەوە لای جێگەی مردنەکەیەوە وەستابوو، ژنەکەی لای قاچی قەرەوێڵەکەوە بێهۆش کەوتبوو.. دوا سەرنجی لای من بوو- پیاوێکی بە ئەمەک...هامبورگەر».

«ئاه- خوای بانی سەر! هامبورگەر: ئەوەش دەزانی کە

لە باشور مرد».

«- باشـە دەبێ نەزانم گـەورەکـەم لەکـوێ دەمـرێت؟ بەراستی ساویلکەیت».

«دەڵێی ئیهانەم دەکەیت؟».

«نا، بەهیچ شێوەیەک... مەبەستم ئەوە نەبو... هەر لە خـۆڕا ئەوەم وت.. هەندێ شـەرابی تر بخـۆرەوە. لای گەورەکان ئاوایە: (لە بنەمادا کەس خاوەنی ئەم کۆتکە دارە نییە).

«گـراخـوس، یەک داوام هەیە، بە کـورتی و بێ پێچ و پەنا پێم بڵێ تۆ چۆن لە شـتـەکـان دەڕوانیت، من بەم سـاویلکەییـەمـەوە نازانم چۆن چۆنێ وەک ئەوەی هەمـوو جیهان وای لێدەگات، تۆ هەموو ئەم شتانە لە بەخشین و وەرگرتندا دەبینیت، کامەیە ڕێگەی تۆ؟ مرۆڤ لەم ژیانە کـورتەیدا- لە راسـتـیـدا ژیان لە چرکـەیەکی کـورتە، گراخۆس، دەبێ پڕی بدەیێ- لەم لەچرکە کورتەدا کەسێک تەنهـا دەستی بەخۆی و خێزانەکەیدا رادەگا. گراخوسی ڕاوچی جێی بایەخە- ئەمە مامە حەمەیی نییـە- کەس کـاتی ئەوەی نیە بیـری لێبکاتەوە... بەدوایدا بگەڕێ و پرسـیـار بکا، با بە تەنهـا مـن بەم دودڵـیـەوە بەدوایدا بگەڕێم. من هیچم لە بارەی تۆوە نەزانیبوو هەندێ ئیش و کاری خۆم گەیاندمیە ئەم بەندەرە، ڕێڕەوی کەشتیەکە بۆ ئێرەی هێنام، ئێـسـتـاش دەمەوێ هەندێ شتی بێ پێچ و پەنا لەسەرتۆ ببیستم».

«ئاه- بێپێچ و پەنا... زۆر کـۆنە ئەم چیرۆکـە، هەموو کتێبەکانی لێپڕن، لە هەموو قوتابخانەکان دا مامۆستاکان لەسەر تەختەڕەشەکان دەینوسن، دایک لەگەڵ لاواندنەوەی منداڵەکـەیدا خـەوی پێـوە دەبینێ، تۆش هاوڕێکەم... تۆش، دانیشـە و بپرسە، پارچەکـانی ئەم چیرۆکـە چۆن پێکەوە گـرێدراون. تۆ وادیارە گـەنجـێـتـیـیـەکی بەرەڵاو جـیـاواز لەوانی تر ژیاویت. «دەشێ وابێت. وا هەست دەکەم لای تۆ چاوگێڕانێکی خێرا بەدەوری جیهان بەسە یان جـیـهـان لای تۆ گـاڵتـەیەک بێت، ئەوەتا منیش بەم شـێـوە دانیـشـتـنەی تۆ لێـرەدا تەواو سـەرسـامم، بەڵام ڕاستـیەک لەوەدایە کە تۆ باس لە شارێکیش ناکەیت کە لەناویدا نەژیابیت،... جیـهان هەروا لەسەر ڕێگەی خۆی بەردەوامـە و تۆش بەدوای گـەڕانەکـانی خـۆتەوەیت، تا ئەمڕۆش کەسم نەدیوە بەم ڕێگەیەی تۆدا ڕۆشتبێت».

«- ئەوە تۆی وا دەڵێیت، هاوڕێ ئازیزەکەم، خەڵکانی دی جـیـاوازتر دەڕوانن. ئێـسـتـا دووشت هەیە دەکـرێت بەتۆی بڵـێـم، یەکـێـکیـان ئەوەیە کـە ئەوەی دەربارەی من بیـسـتـوتە ئەیشـارێتـەوە، ئەم ڕەفـتـارانەشت لەگـەڵ مندا پاڵنەرێکی ئاشکرایان هەیە. ئێـستـا بڕوات بەوە نیە کـە ناتوانی منت وەبیـربێـتـەوە؟ چونکە چیـرۆکی من لەگـەڵ ئەوانی تردا تێکەڵ دەکـەیت، ئالەم حاڵەدا تەنهـا دەتوانم ئەوەت پێـبـڵـێـم کـە من،... نا... نەخێـر... ناتوانم... هەمـوو کـەسـێـک ئەمـە دەزانێت.. لەناو ئەو هەمـوو عـالـەمـەدا واتزانیـوە من دەتوانم پێت بڵـێـم، ئەمـە چیـرۆکـێکی زۆر لە مێژە، بڕۆ پرسـیـار لە مێژونوسـەکان بکە، واقت وردەمـێنی لەحـەیبـەت کـارەکـانیـان هەرچی ڕویداوە لە ڕابـردودا نوسـیـویـانەو بەردەوامـیـش پێیداهاتونەتەوە بڕۆ بۆ لای ئەوان.. کێ دەڵێ من دەتوانم ئەو هەموو شتە لەم مێشکە جەنجاڵەدا هەڵگرم؟، بڕۆ بۆ لای ئەوان.. پاشان بگەڕێوە بۆ ئێرە».

«ئارام بگرە... گـراخـوس.. پرسـیـارەکـەم ئاسـانتـر دەکەمەوە، تۆ لە کوێوە هاتویت؟».

«- لە دارستانی ڕەشەوە، هەموو کەس ئەوە دەزانێت؟»

وایە لە دارسـتـانی ڕەشـەوە، لەوێش لە دەوروبەری سەدەی چوارەمەوە خەریکی ڕاوکردن بویت».

«دەڵێم.... تۆ دەزانی دارستانی ڕەش لە کوێیە؟»

«نەخێر».

«تۆ هەر هیچ نازانیت، منداڵە بچـوکـەکـەی ناو کـەشـتـیـیـەکـە زۆر لەتۆ زیاتر دەزانێت... زیاتر لەوەی دەیزانیت و ئەیکەیت. کێ تۆی بەم ناوەدا بەرەڵا کـرد؟ ئەمە کارەساتە! تۆ تەنیا هیچێک بویت من پڕم کردی لە شـەراب... کـەواتە تۆ ئێـسـتـا دارسـتـانی ڕەش پێ نازانیت... منیش لەوێ لە دایک بووم تا بیست و پێنج سـاڵی هەر لەوێ خـەریکی ڕاوکـردن بووم، ئەگـەر بزنەکێویەکە نەیهێنامایە بۆ ئێرە هەر لەوێ دەبووم. ئێستا ئەوەت لا روونە کـە من ژیانێکی ڕاوچیـانەی درێژ و کەیفسازانە ژیاوم، بەڵام بزنە کـێویەک هەڵـیخـەڵەتاندم، کـەوتمە خـوارەوە و لەژێر گـا بەردەکـەدا مـردم. لەوە زیاتر پرسـیـارم لێـمەکە، ئەوەمنم لێـرە.. مردووم.. مردووم... مردوو نازانیت بۆچی لێرەم من لە کەشتی مەرگ بارکرام، لاشەیەکی بیمار... سێ و چوار خێرخوا لە ژوور سەرمەوە بوون، هەر وەک چۆن بۆ هەموو کەسێک ئەمە دەکرێت... بۆ، دەبێت شتێکی جیاواز بۆ گراخوسی ڕاوچی بکرێت؟ هەمـــوو شـــتــێک بەرێک و پێکی ڕویدا من لەناو بەلەمەکەدا ڕاکشام و پاڵم لێدایەوە..

# «ئەو ڕوخسارەی کە لەناو دووکەڵدا بزربوو»

نووسینی: عبدالباقی یوسف- کوردستانی سوریا

هاشم تحسین علی

دوو مانگ لەمەوبەر بە تەلەفۆن قسەی لەگەڵ کردووم. کات پاش نیوەی شەو بوو. سوور بوو لەسەر ئەوەی کەیەکدی ببینن. ترسێک وام لێدەکات لەو چاوپێکەوتنە تایبەتیە ڕاکەم. ئەوەشی پێگوتم کە تەڵاق دراوە. ئەگەرچی مێردەکەی تەڵاقی دابوو، بەڵام هەمیشە هەواڵی دەزانی و بەردەوام لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی سۆراخی دەکرد.

هەندێ جار باسی ئەوە دەکات کە هۆگری چیرۆکەکانمە و هەستی خۆی بەرامبەرم دەردەبڕێ هەمیشە خەون بەوەوە دەبینێ کەوا ڕۆژێ لە ڕۆژان چیرۆکێکی لەسەر بنووسم، یاخود لە یەکێک لە جیرۆکەکانمدا بێت ئەگەرچی بەشێوەی ڕەمزییش بێت.

دوای دوو مانگ پەیوەندی کردن توانی ترسەکە لە ناخمدا نەهێڵێ و توانی ڕازیم بکات کە لە شوێنێکی دوور لە خەڵکی ببینم، بەو مەرجەش ڕازیی بوو کە ئۆتومبێلی یەکێک لە هاوڕێکانم بێنم وبچین لە دەرەوەی شار یەکدی ببینین.

ڕۆیشتین و لە لێژاییەکدا دانیشتین. شوێنەکە وەها بوو کەس ئۆتومبێلەکەمانی نەدەدی. نیو سەعاتێکی پێچوو لەناکاو ئۆتومبێلێک هات و لە تەنیشتمان وەستا، سێ پیاوی لێ هاتە دەرەوەو داوایان لێمان کرد کە لە شوێنەکەمان بێینە خوارەوە. دەمانچەیان خستە سەر سەرمان. هەرچەندە مەترسی و ناڕەحەتی و هەست کردن بەناخۆشیەک لەلام ڕوویدا، بەڵام هەستم بەئارامیەک کرد کاتێ کە تێگەیشتم ئەوان مەفرەزەیەکن و بەدووی خەڵکی دیدا دەگەڕێن و هەقیان بەسەر ئێمەوە نیە. کە ئەمەم زانی بەدەنگی بەرز وتم. من نووسەرم و ئەمیش هۆگری منە، هاتووینەتە ئێرە تاچاومان بەیەکدی بکەوێ بۆ ئەوەی لەڕاوبۆچوونی یەکدی تێبگەین و باسی هۆگربوونی خۆیم بۆ بکات.

یەکێکیان وتی: فیلمێکی تازەیە کەس بەر لە تۆشتی وای نەکردووە. ئەوی دیکەیان پێکەنی و وتی: کاکی نووسەر.. نووسەرە. سێیەمیش هاتە قسەو وتی: ئەی ئەو کچەی لەگەڵتە نووسەر نیە؟

بەهەندێ نیگەرانییەوە وتم: پێتان دەڵێم من نووسەرم و ئەمیش هۆگری نووسینەکانمە و بڕایەوە. بردمانیانە ناو ئۆتومبێلەکەیان و بەکێشیان کردین بۆ (بەشی سوێند) خواردن. لەوێ وتم کێ لەم بەشەدا بەرپرسە و پێم وتن کە لێم تێبگەن من چی دەڵێم. ڕاستە من ئەو شوێنەم هەڵبژارد ئەوەش بۆ ئەوە بوو کە کەسمان شەرمەزار نەبین. بردینیانە لای کەسێک کە لەپشتی مێزێکەوە دانیشتبوو قاوەی دەخواردەوەو جگەرەی لەگەڵدا دەکێشا هەر کە بینیمانی بەتووڕەییەوە هاواری کرد: هەی بێ ڕەوشتینە، گرفتی ئێوە دڵی ئێمە بحەوێنێنەوە.

منیش وتم: حەتمەن هەڵەیەک ڕووی داوە.. من ئاسایم. من نووسەرم و ئەویش هۆگری نوسیەکانمە لە ترسی خەڵک ئەو شوێنەمان هەڵبژارد کە یەکدی تێدا ببینین.

پیاوەکە وتی: بۆم باس کە چۆن بوو؟

وتم: من چیرۆکنووسم و ئەمیش چیرۆکەکانم دەخوێنێتەوەو حەزی دەکرد بمبینێ.

توند دای بەمێزەکەداو دوای تاوێ بەڕوومدا تەقییەوە: بەچکەمارینە. فەرمانی دا بەوکەسەی کەلای ڕاست دانیشتبوو بۆ ئەوەی لەسەرم بنووسێ. پاشان داوای ناسنامەی لێکردم. منیش وتم لە ماڵەوەیە، پێم نییە، پیاوەکە گومانی زیاتری لێ پەیداکردم، ئەوەی لە دەمم

دەرچوو لە دەفتەریکی. رەشی گەورە دانووسی و خستیە ناو دۆلابەکەی بەردەمی....

جنێوەکەی لەرزاندمی و بێزارییەکی گەورەی بەبالا برییم. تەماشای هۆگرەکەی خۆمم کرد دیتم ئەویش هەستی بەشەرمەزاریی جنێوەکەی کرد. بۆ ئەوەی لەو حالە ناخۆشە دەرچم کە کەوتبوومە ناوی بەبێ ویستی خۆم بیرێک هات بەمێشکمدا و هەندێ لە بێزاریەکەی لابردم. وتم:

– ناوی سیانیم(عباس محمود العقار)ە. کە ئەمەم وت هۆگرەکەم دایە قاقای پێکەنین. پیاوەکە بێدەنگی کردو وتی: داوەشێی بێ نامووس.

دووبارە رووی کردەوەمن و بەلەهجەیەکی تیژە وتی: ئەی دایکت ناوی چیە زانیم کەوا قسەکەم زالە، ئەویش کەمێ خاوی کردەوەو منیش وتم:

– دایکم ناوی (مي زيادە)یە. جاریکی دیش هۆگرەکەم نەیتوانی خۆی بگرێ و پێکەنییەوە پیاوەکە ئاوی ناو پەرداخەکەی بەردەمی پژران بەرووی هۆگرەکەمداو ئەویش بێدەنگ بوو دووبارە سەیری منی کردەوەو وتی:

– ناوی براو خوشکەکانتم پێ بلێ. لە گەورەوە دەست پی بکە.

پێکەنینم هات و دەرم نەبری. وتم: گرفتێک هەیە.

وتی: گرفتی چی؟

وتم: باوکم بەناوی دووانی ناوی ناون.

وتی: ناوی دووانی هەموویان بلێ.

پێم وت:(ذکریا تامر). ئایا ئەم ناوەت بیستووە؟ ئەوە برای گەورەمە.

لێوی خوارەوەی جولاندو وتی: ئایا جەنابی کتێبە تابیستبێتم؟.

وتم. خۆی توورفرۆشە لە بازاڕی سەوزە.

وتی: باشە شەرەفمان پێ بەخشرا. ئەوی دی؟

وتم (طه حسين) ئایا ئەم ناوەشت گوێ لێ نەبووە؟.

وتی: ئایا چ ئیشێ دەکات؟

وتم: راوچی ماسییە.

وتی: پێخۆشحالین. خێرا ئەوی دیکەیان بلێ. خۆ ئێمە مووچە لە باوکت وەرناگرین.

وتم (بدر شاكر السياب)، وابزانم بیستووتە.

وتی: ئەی ئەم ئیشی چی دەکات؟.

وتم: پزیشکی تەندروستی ئاژەلانە.

وتی: شەرەفمان پێ بەخشرا . ئایا تەواو نەبوون؟

وتم: یەکێکیان ماوە لەوانەیە بیناسی.

وتی: کێیە؟.

وتم:(ابراهيم اليوسف) حەتمەن بیستووتە.

وتی: لە چ شوێنێ کاردەکات؟.

وتم. بەرگ درووی ئافرەتانە.

وتی: خوشکەکانت بلێ.. خێرا.. خێرا.

وتم: گەورەکەیان (نازك الملائكة) وابزانم بیستووتە.

وتی: ئەم خاتوونە کێیە تاناویم بیستبێ؟

وتم: بەناوبانگترین ئارایشکارە لەم شاردا.

وتی: ناوێکی سەیرە. لە ژیانا ناوی وەهام نەبیستووە. دووەمیان بلێ.

وتم(غادة السمان) نەلێی ناوی غادة السمانی خوشکتم نەبیستبێ.

پێش ئەوەی وەلام بداتەوە، هۆگرەکەم ئەم جارەش نەیتوانی خۆی بگرێ و پێکەنی. پیاوەکە تەپلەکی جگەرەکەی تێ گرت و پێی وت: بێدەنگ بە هەی بێ نامووس.

دیسان ئاوڕی بەلای مندا دایەوە. وتی: تەواوی کە.. ئەو ئیشی چیە؟.

وتم: ئەستێرە ناسە. ئیتر دوا ناو ماوە نەلێی نەم بیستووە.

وتی: کێیە؟.

وتم:(جميلة بوحيرد).

وتی: کاری چیە؟

وتم: موەجیهەی پەروەردەییە.

ئایا ئێستە روخسەتم دەدەی کەوا پرسیارێکت لێبکەم؟

بەسەرسوڕمانەوە سەیری کردم و وتی:روخسەتت دەدەم بلێ.

وتم: ئایا زانکۆت تەواو کردووە؟.

بۆ یەکەمجار دەستی کرد بەپێکەنین، جگەرەیەکی داگیرساندو وتی.

– چۆن من لێرە دەبم بێ ئەوەی زانکۆم تەواو نەکردبێ؟

سەیری روخساریم کرد، بەلام هەموو روخساری لەناو دووکەلدا بزربوو.

**سەرچاوە**

**گولان العربي. العدد/٥٤/ت٢/٢٠٠٠**

# داگیرساندنەوەی ئاگر

نووسینی: جاک لەندەن ١٩١٦ ١٨٧٦
ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە فارسییەوە: حوسێن مەردانی

بەیانی بەسەرما و تاریکایی، سەرماو تاریکایی لەرادەبەدەر، خۆرهەڵنەهاتبوو کە لە ڕێگەی ئەسڵی «یۆکۆن» بای داوەو خۆی گەیاندە لێواری رووبارەکە.

لەو لێوارەوە، ڕێگەیەکی تاریک و مێشەمڕ، لە ناو دارەکانی چڕی سنۆبەر، بۆ لای ڕۆژهەڵات دەچوو. لێواری رووبارەکە، لێژێکی توندی هەبوو، بەبیانوی چاولێکردن لە کات ژمێر، ساتێک راوەستا هەتا هەناسەیەک هەڵکێشێ. کات ژمێر نۆبوو. هەر چەند کە هەور بە ئاسمانەوە نەبوو، بەڵام ڕۆژ یان تاپۆیەکیش لە هەتاویش نەدەدیترا، ڕۆژێکی رووناک بوو. بەو حاڵەش، شتێکی رەش و نادیار کەوتبووە سەر رووبەرەکە، رەشاییەکی سەیر کە ڕۆژی تاریک کردبوو و ئەو تاریکاییە بەهۆی نەبوونی هەتاوەوەبوو. ئەوە ئەوی نارەحەت نەدەکرد. ئەو بە نەبوونی هەتاو، خووی گرتبوو. دوایین کەرەت کە هەتاوی دیتبوو چەند ڕۆژێک تێپەڕ ببوو، دەیزانی کە هێشتا دەبێ چەند ڕۆژێکی دیکەش تێپەڕ ببێ، هەتاکوو ئەو بازنە زیندوویە لە ئاسۆی باشوورییەوە خۆیان نیشان بداو دەسبەجێ لەبەرچاو ون بێ.

ئاوڕێکی دایەوە پاش، سەیری ئەو ڕێگەیەی کرد کە پێواوبووی. «یۆکۆن» بەقەدیەک «مایل» راخرابوو، لەژێر سەهۆڵ بەندانێک بەئەستوورایی سێ پێ شاردرا بۆوە.

سەرەوەی ئەم سەهۆڵەش بە بەفرێکی قورس داپۆشرابوو. لە هەر شوێنێک کە کۆمەی بەفر قەبارەی بەستبوو، سپیایی دەداوەو شەپۆلێکی نەرم و جوانی هەبوو. لە باکوور هەتا باشوور، هەتا ئەو جێیەی کە چاو هەتەری دەکرد، سپی بوو، جگە لە هێڵێکی باریک و رەش کە لە سنووری دورگەیەکی داپۆشراو بە سنۆبەر بۆ لای باشوور کێشرابوو، بەرەو خواری و چەم و پێچەکانی لای باکووریش درێژەی هەبوو، لە پاش دورگەیەکی دیکە لە سنۆبەر لە پێش چاوان ون دەبوو. ئەو هێڵە باریک و رەشە ڕێگە بوو، ڕێگەی ئەسڵی کە بۆ لای باشوور هەتا پێنسەد میل بەردەوام بوو. لە زنجیرە چیای «چیلکوت» و«دیا» تێپەڕدەبوو و دەگەیشتە زەریای خێ، لەلای باکوورەوە هەتا «دۆسن» هەفتا میل دەڕۆیشت، هەروا درێژەی هەبوو، هەتا لە هەزار میلی بۆ «نۆلاتۆ» دەگەیی و هەزار و پێنسەد میلی دیکەش بەردەوام بوو، لە «سەن میشێل» رەت دەبوو لە زەریای «برینگ» کۆتایی پێدەهات.

بەڵام تەواوی ئەمانە، ڕێگەی باریک، رەش، درێژو خەیاڵاوی، نەبوونی ڕۆژ لە ئاسمان، سەرمای مەترسی هێنەر، نائاسایی و سەیربوونی هەمووی ئەوان کاریان تێنەکرد. ئەو بێ شوێنییە لەبەر ئەوە نەبوو کە پێشتر بەو شتانە خووی گرتبوو.

لەو مەڵبەندانە شارەزا نەبوو، خەڵکی «چکاکۆ» بوو و ئەمە هەوەڵ زستانێک بوو کە لەو وڵاتەی بەسەردەبرد. گرفتی کارەکەی لەوەدابوو کە هێزی بیرکردنەوەی نەبوو. لەبارەی بابەتەکانی پێوەندیدار بەژیان وریا و زیرەک بوو، بەڵام تەنیا لە مەڕ بابەتەکان، نە لە ناوەرۆکییان، پەنجا پلە لەژێر خاڵ یانی هەشتاو وردەیەک پلە خوارتر لە سەهۆڵبەندان. ئەو راستییە، هەتا ئەو رادەیە کە ساردو نارەحەت بوو، دەی خستە ژێر گوشار. هەر ئەوە. ئەو سەرمایە وای لێنەدەکرد کە لەبارەی خۆی بە بەواتەی بوونەوەرێکی زەعیف لە بەرامبەر گۆڕانی پلەی گەرما، لەمەڕ بێ دەسەڵاتی مرۆڤ بەگشتی کە تەنیا دەتوانێ لە سنوورێکی دیاری کراو و بەر تەسکی گەرماو سەرمادا بژی، پەنجا پلە لە ژێر خاڵ سەرمایەکی ئێش هێنەرو نارەحەت کەرەو لە بەرامبەر ئەودا، دەبێ تەیار بەدەستەوانەو کڵاوی گوێچکەدار، کاڵەی گەرمی سازکراو لە پێستی شوورو گورەو یەکانی جۆراوجۆر بێ. بەرای ئەو پەنجا پلە لەژێر خاڵ تەنیا، پەنجا پلە لەژێر سیفرە. ئەمە کە دەبێ مەسەلەی سەرما پتر لەمە بۆی بایەخدار

بێ، شتێک بوو کە بیری لێنەدەکردەوە. کاتێ گەڕایەوە کە وەڕێ بکەوێ، هەر بەو چەشنە کە نوقمی خەیاڵات بوو، تفی هەڵاویشت. دەنگی تەقەیەکی بیست کە بوو بە واق ورماوی ئەو. دەیزانی کە لە سەرمای پەنجا پلە لەژێر سیفر، تفی بێتوو هەڵاوێژن، وەها وەزعێک پەیدا دەکا، بەڵام ئەمجارە تفەکە لەهەوادا بەستبووی، مسۆگەر بوو هەوا لە پەنجا پلەی ژێر سیفریش ساردترە- چەندە ساردترە، نەیدەزانی- بەڵام پلەی گەرما بایەخ دار نەبوو. بەپێی ئەو بڕیارە کە لەبەری رووباری چەپی «ئاندێرسۆن» لەگەڵ هەڤاڵەکانی گرتبووی، رەوانەی شوێنێک بوو کە ئێستا لەوێ بوون. هەڤاڵەکانی هەر لەو شوێنە تێپەڕیبوون و لە مەڵبەندێک کە خڕێکی ناوچەیی لێبوو، لایان دابوو لە حاڵێکدا، ڕێگەکەی دەور لێدابوو کە بزانێ ئاخۆ دەتوانێ بە وەرزی بەهار بە دورگەکانی «یۆکۆن» ئاوردوو وەدەست بهێنێ؟ دەبێ هەتا سەعات شەش بگا بە خێوەتەکەی، دروستە کە سەعات شەش کەمێک دوای ڕۆژئاوابوونە، بەڵام هەڤاڵەکانی لەوێن، ئاگرێک خۆش کراوەو شیوی گەرمیش ئامادەیە.

دەستیدا لە هەگبەی فراوێنەکەی کە لەژێر بلووزەکەی دابوو، فراوێنەکەی لە دەسڕەیەکدا پێچرابوو، لەژێر کراسەکەی و لە تەنیشت پێستی لەشی بوو. ئەوە تەنیا ڕێگەیەک بوو کە دەیتوانی بەرگری لە سەهۆڵ بەستنی «بیسکویت»ەکان بکا. کاتێ بیری لە «بیسکویت»ەکان کردەوە، بزەیەکی رەزامەندانەی هاتە سەر لێو.

هەتا ناو چڕەدارەکانی سنۆبەر. ڕێگەکە بەباشی دیار نەبوو. لە پاش دوایین کەڕەت کە خێشک لە ڕێگەکە تێ پەڕ ببوو، بەفرێک بە ئەستوورایی یەک «پێ» لەسەر عەرزباریبوو، رازی بوو لەوەی کە خێشکی نییە و دەتوانێ بەسەڵتی ڕێگا ببڕێ. لە راستیدا جگە لە فراوێنەکەی ناو دەسڕەکەی، هیچ بارێکی پێنەبوو. بەو حاڵەش لە سەرمان سەری سووڕمابوو. کاتێ بەدەستی کە لە دەستەوانەکەدا بوو، کەپۆو گۆنای بێ هەستی راماڵی بەو ئاکامە گەیشت کە هەوا زۆر ساردە.ڕدێنێکی پڕوگەرمی هەبوو، بەڵام قژی نەیدەتوانی گۆنای بڵندو کەپۆی لەرزۆکی، کە بە دوایین هێزەوە لە هەوای سەهۆڵ بەنداندا، دەچووە پێش، لە سەرمان بپارێزێ. بەدوای ئەودا، سەگێکی ئیسکیمۆی شین و گەورە لە رەگەزی سەگورگی تۆر هەڵدەهات کە هیچ چەشنە جیاوازییەکی بەرواڵەت یان نێوەرۆک لەگەڵ برای هاوخوێنی، یانی گورگ نەبوو. ئەو گیاندارە، لەو سەرما تاقەت پڕوکێنەیەدا، ڕەنجی دەکێشا.

دەیزانی کە وەها هەوایەک بۆ سەفەر کردن نابێ. سروشتی حەیوان بوونی، باشتر لە هێزی لێکجیاکردنەوەی پیاوەکە، لە چەندو چۆنی ئەو رووداوە، ئاگاداری دەکرد. لەڕاستیدا، هەوا نەک لە پەنجا پلە ژێر سیفر ساردتر بوو، بەڵکوو لە شێست پلەی ژێر سیفرو تەنانەت لە هەفتا پلەی ژێر سیفریش ساردتر بوو، پلەی گەرما هەفتاوپێنج پلە لەژێر سیفردابوو. چۆن خاڵی سەهۆڵ بەستن (بە هەڵسەنگاندنی فارنهایت) سی و دوو پلە سەرەوەی سیفرە، سەرمای هەفتاوپێنج پلەی ژێر سیفر، ماناکەی سەدوحەوت پلەی سانتیگراد خوارەوەی سەهۆڵ بەستنە.

سەگ لەمەڕ گەرما پێوەکە هیچی نەدەزانی. تەنانەت ئەو زانیارییە وردەی کە پیاو سەبارەت بەوەها سەرمایەک هەیبوو، بەخەیاڵی سەگەکەدا نەدەهات. بەڵام حەیوانەکە بەپێی سروشت هەندێ شتی دەزانی. لێ حاڵیبوونێکی تەپ و مەترسی هێنەر بەسەر سروشتەکەی دا زاڵ ببوو،و هەر ئەو تێگەیشتنە ناچاری دەکرد لە پاش سەری پیاوەکە بەمات مات هەڵێ، هەر چەشنە ڕاپەڕێکی نائاسایی لە ئەو بە نیگەرانییەوە چاو لێ بکاو چاوەنواڕ بێ کە پیاوەکە، ئێورگەیەک بدۆزێتەوەو ئاگرێک داگیرسێنێ.

سەگەکە مانای ئاگری دەزانی، پێی خۆش بوو کە ئاگرێکی لە دەوروبەر بێ، یان ئەوەی کە لەژێر بەفر داچاڵێک هەڵبکەنێ و لە پەنای دا، گەرمای لەشی لە هەوای سارد بپارێزێ. تەڕاییەک کە بەهۆی هەناسەکێشانی پێک دەهات، بەدیمەنی وردە سەهۆڵ دەنیشتە سەرمووی چەنەو دم و لەوس و پێڵۆکانی کە بەتایبەت هەر لەو وردە سەهۆڵانە دروست ببوو، ڕدێن و سمێڵەسورەکەی هەر بەم جۆرە بە خێراییەکی پتر بەستبوویان. ئەو دڵۆپانەی کە لەسەریان نیشتبوون، ببوون بە سەهۆڵ و بەهەر هەناسەیەکی گەرم و شێدار کە هەڵی دەکێشا، سەهۆڵەکان زۆرتر دەبوون. ئەم پیاوە، تووتنیشی دەجووت.

سمێڵ و ڕدێنی بەجۆرێک سەهۆڵاوی ببوو کە تەواوی لێوی داگرتبوو، بەکاتی هاتنەدەری شیلەی تووتن نەیدەتوانی لە کەوتنیان بۆ سەر چەنەگەی بەرگری بکات. لە ئاکامدا، ڕدێنێکی سەهۆڵین، بە ڕەنگ و پتەوی کارەبا لەسەر چەنەی پێک هاتبوو کە سات بەسات درێژتر دەبوو. بێتوو کەوتبایە عەرزی، هەر لە خۆوە دەشکاو دەبوو بە

وردەشووشە. بەڵام کەمتەرخەمی نەدەکرد. ئەوە تاوانێک بوو کە هەر کەس لەو مەڵبەندانەوە، تووتنی جووتبایە، دەبا بیدابا، پێشتر لەمە، دووجار تووشی سەرما ببوو. دەیزانی کە ئەو دووجارە، سەرما ئەوەندە بەهێز نەبوو، بەڵام لەبیری بوو کە ئەو دووجارە لە «سیکستی مایل» گەرما پێوێک پەنجاو پێنج پلەی ژێر سیفری نیشان داوە. هەتاکوو چەند میل لەناو دارستانێکی پاندا، درێژەی بەرێگادا، لە گۆڕاییەکی بەربلاوی تووتن لای داو لە بەرزاییەک هاتە سەر، راخەرێکی بەستووی جۆگەیەکی باریک. ئەو جۆگەیە، خری ئاندێرسۆن بوو و دەشیزانی کە هەتا شوێنی لق و پۆی دارەکان، دە میلی دیکەی رێگە ماوە، چاوی لە کات ژمێرەکەی کرد. کات ژمێر دە بوو. هەر سەعات چوار میلی رێگە دەبڕی.

حیسابی کرد کە سەعات دوازدەونیو دەگاتە شوێنی لق و پۆپەکان. هەروەستی کە پاش برینی ئەو مەودایە بەخواردنی فراوێن، جێژنێک پێک بهێنێ. کاتێک کە رێگاکەی لە درێژایی بەستێنی خڕەکە گرتەبەر، سەگەکە کە لە ناهومێدییەوە کلکی لە گەڵۆز گرتبوو، سەر لە نوێ وەدوای کەوت. شوێنی کۆنی رێگای خێشکەکە بەباشی دەدیترا، کەچی لەسەر شوێنی دوایین خێشکەکان کە لێی تێپەڕیبوون، دەدوازدە «ئینچ» بەفر باریبوو. لەماوەی مانگی رابردوودا هیچ مرۆڤێک لەو جۆگە بێدەنگە لای نەدابوو، پیاوەکە، بەخێرایی دەستی بەرێگا رۆیشتن کرد. زۆری بیر لێنەدەکردەوە. لەو کاتە گرینگەدا، شتێکی وای پێ نەبوو کە بیری لێبکاتەوە، جگە لەمە کە فراوێنەکەی لە شوێنی لقەکان دەخواو سەعات شەش وێرای هەڤاڵەکانی لەناو خێوەتدا دەبێ. هیچ کەس دیار نەبوو کە قسەی لەگەڵ بکا، بێتوو کەسێکیش پەیدا بووبا، لەبەر روومەتی سەهۆڵین، برستی قسەکردنی نەبوو. هەر بۆیە بەشێوەیەکی نەگۆڕو بەردەوام خەریکی جووتنی تووتن و درێژکردنی ردێنی کارەبایی بوو. جارناجار ئەو بیرە دەهاتە ناو مێشکی کە هەوا زۆر ساردەو قەت لەگەڵ وەها سەرمایەک بەرەنگار نەبووە. هەر بەو جۆرە کەلە رێگا دەڕۆیشت پشتی دەستی کە لەناو دەستەوانەکەی دابوو، دەیکێشایە سەر کەپۆو گۆنای، دەستی بەنۆرە دەگۆڕی و ئەو کارەی لەخۆوە دووپات دەکردەوە. بەڵام بەو هەموویە کە رای دەماڵی، هەتا دەستی لادەبرد، دەسبەجێ گۆنای، ساتێکی تر نووکی لوتی سڕ دەبوو. متمانەی هەبوو کە گۆنای دەیبەستێ، ئەوەشی دەزانی بەداخ بوو کە بۆچی لوت بەندێک لەوانەی کە «بەد» لەکاتی سەرمای سەختدا بەکاری دەهێنا، ئامادەی نەکردووە. ئەو لوت بەندە، گۆنای دادەپۆشاندو لە سەرمان دەی پاراست. بەڵام ئەوەش گرینگ نییە. بەستنی گۆناکان چ بایەخیان هەیە؟ تەنیا کەمێک ئێشی هەیە، هەر ئەوە، ئەو مەسەلەیە بە هیچ جۆرێک بایەخی بنەڕەتی نییە. لەم حاڵەشدا کە مێشکی لە هەر چەشنە ئەندێشەیەک بەتاڵ بوو، سەرنجێکی وردی دەدایە دەوروبەری خۆی و ئەو ئاڵوگۆڕانەی کە لە جۆگەدا بەدی هاتبوو، چەم و خەم و کۆگاکانی داروەدوەن، سەرنجی ئەویان راکێشاو ئاگای لەژێر پێی بوو. کەرەتێک، کە لە قۆرتێک لای دەدا، وەک ئەسپێکی رەم کراو خۆی کشاندەوە دواوە، لەو جێیەی کە دەی هەویست، دەورێک سووڕاو چەند هەنگاوێک گەڕایەوە بۆ دواوە. دەیزانی کە جۆگەکە هەتا تەختی بنی سەهۆڵ بەستوویەتی. لەو زستانە قوتبییەدا، هیچ جۆگەیەک ئاوی تیا نەبوو. بەڵام ئاگاداری لەسەر ئەمەش هەبوو کە ئەو کانیاوانەی کە لە پەنا تەپۆڵکەکان هەڵ دەقووڵێن و ئاوەکەیان لەژێر بەفر دەکەوێ و دەکەوێتە سەر سەهۆڵی جۆگە. دەشیزانی کە لە ساردترین ساتەکانیشدا، ئەو کانیاوانە، نای بەستێ و لە مەترسییەکانی ئەو مەسەلەیە ئاگاداربوو. ئەو ئاوانە وەک تەڵەکە وابوون. ئەو چاڵە پڕ ئاوانە بە قووڵایی سێ «ئینچ» و جاری واشە، سێ پێ لەژێر بەفرەکاندا شاراوەن. هێندێ جار، توێ یەکی ناسک لە سەهۆڵ بە ئەستوورایی نیو «ئینچ» دایاندەپۆشێ، و سەرووی توێ ناسکەکەش بەفر دای دەگرێ، جاری واشە کە تەبەقەکانی جۆراوجۆری ئاو و توێناسکی سەهۆڵ پێک دێن، بەچەشنێک بێتوو لاقی کەسێک بەو پێستە بکەوێت رۆدەچێ و لەوانەیە هەتاکوو نێوقەدی لە ئاودا بخووسێ. بۆیە، بەوەها سامێک خۆی کشاندبۆوە دواوە. هەستی بەنەرمایی ژێر پێی کردبوو، دەنگی شکاندنی توێیەکی ناسکی سەهۆڵ، کە لەژێر بەفرەکەدا شاردراوەبوو، بەگوێ گەیشت. لە وەها پلەیەک لە گەرمادا، تەڕبوونی لاق، ماناکەی ناڕەحەتی و مەترسی بوو. بەلانی کەمەوە، ماناکەی درەنگ کردنبوو لە کاردا، چونکە لەو حاڵەدا ناچار دەبوو کە رابوەستێ، ئاگرێک داگیرسێنێ و هەتا ئیشک بوونەوەی گۆرەوەی و کاڵە شوورەکەی، لاقە رووتەکانی لە نیزیک ئاگر رابگرێت، راوەستا، راخەری جۆگە و لێوارەکانی ئەوێی دایە ژێر چاوەدێری و بەو ئاکامە گەیشت کە گەڕیانی ئاوەکە بۆ لای

راستە. نەختێک بیری کردەوە، لەو حاڵەدا، کەپۆو گۆنای
راماڵی و دوایە بۆ لای چەپ سووڕاوە، بە ئەسپایی
هەنگاوی هەڵدێناوەو لە هەر هەنگاوێدا ئاگای لەژێر پێی
بوو. کاتێ کە مەترسییەکە لاچوو، هێندێ تووتنی دیکەی
بۆ جووتن لە زاری هاویشت و هەر بەخێرایی یانی چوار
میل لە سەعات دا، دێژەی بەرێگەکەی دا.

لە ماوەی دوو سەعاتی دیکە لە رێگادا، تووشی چەند
داوێکی لەو چەشنە بوو. بەفری سەر ئەو چاڵە شاردراوانە
زۆرجار نارێک و بریقەداربوون و جێگەی مەترسی بوون.
بەو حاڵەش بۆ دوایین جار نیزیک بوو لە داوبکەوێ
جارێکی دیکەش بەهۆی هەست پێکردن بەمەترسی،
سەگەکەی ناچار کرد کە وەپێشی کەوێ. سەگەکە، ئەمەی
نەدەویست، ئەوەندە خۆی هێنایە دواوە کە پیاوەکە پاڵی
پێوەنا بۆ پێشەوە، لە پاشان سەگەکە، لەسەر رووبەرە سپی
و پانەکە، بەخێرایی وەڕێ کەوت. لە پڕ کەوتە ناو چاڵێ،
بەپەلەقاژە خۆی هێناوەدەرو لەو لایەوە کە ژێر لاقی رەق
بوو رۆیشت. دەست و لاقی زۆرتەڕ ببوون، و ئەو ئاوەی کە
لە لەشی دەچۆڕاو دەسبەجێ بوو بە سەهۆڵ. خێرا
وەپەلەقاژە کەوت کە سەهۆڵی لاقەکانی بسڕێتەوە، لە
پاشان کەوتە ناو بەفر و بەددانی خەریکی هەڵکەندنی ئەو
سەهۆڵانە بوو کە لە نێوان قامکەکانی دروست ببوون. ئەوە
شتێکی سروشتی بوو. بێتوو هێشتبای کە سەهۆڵەکان لە
ناو قامکیدا سەقامگیربن. لاقی بریندار دەبوون. سەگەکە
ئەوەی نەدەزانی، تەنیا لەو هەستە سەیرە کە لەناخی
دڵییەوە سەرچاوەی دەگرت، مل کەچی دەکرد. بەڵام
پیاوەکە، بەهۆی دارابوونی هێزی لێکدانەوە لەو بوارەدا،
لەشتەکە حاڵی بوو، دەستەوانەکەی لە دەستی دەرهێناو بۆ
جیاکردنەوەی لەتکە سەهۆڵەکان لەلاقی سەگەکە بەفریای
گەیشت. قامکەکانی پتر لە دەقەیەک لە دەستەوانەکە
دەرنەهێنا، و لەسست بوونی خێرایان تووشی سەرسووڕمان
بوو. هەوا لە راستیدا ساردبوو. بەپەلە دەستەوانەی لە
دەستی کردو دەستی بەتوندی بەسنگیدا راماڵی. لە
سەعاتی دوازدە، رۆژ لەوپەڕی رووناکایی دابوو. بەو
حاڵەش هەتاو لە رێبازی زستانی خۆیدا لەمەڕ
ڕووناککردنی ئاسۆ لە ئاخری باکووری دابووە بەرزایی
زەوی لە نێوان هەتاو و جۆگەی ئاندێرسۆن هەڵکەوتبوو و
کەسێک کە لە هەوای ڕووناکی نیوەڕۆدا لەو شوێنە
تێپەڕبوبا سێبەرێکی دروست نەدەکردو لە سەعات
دوازدەونیو گەیشتە شوێنی لقەکان. لەو خێراییەی کە
لەڕێپیوان کەڵکی لێ وەرگرتبوو شادبوو، بێتوو هەر بەو
جۆرە درێژەی دابا سەری سەعات شەش لەلای هەڤاڵەکانی
دەبوو. قۆپچەی بلووزو کراسەکەی کردەوەو فراوێنەکەی
دەرهێنا.

ئەو کارە پتر لە یەک چوارەمی دەقەیەکی نەخایاند. بەو
حاڵەش هەر لەو وەختە کەمەدا قامکەکانی کە کەوتبوونە
دەرێ سڕببوون. دەستەوانەی لە دەستی نەکردو لەجیاتی
ئەو کارە قامکەکانی دەدوازدەجار بەتوندی کوتایە لاقی. بۆ
خواردنی فراوێن لەسەر کۆلکە دارێکی بەفراوی دانیشت.
ئەو ئێشەی کە بەهۆی کوتانی قامکەکانی بەلاقی
هاتبۆوەدی ئەوەندە بەخێرایی سەری سووڕما. بۆ خواردنی
لەتێک «بیسکویت» دەرفەتی نەقۆزتەوە. قامکەکانی
بێوچان کوتایە لاقی و خستییە ناو دەستی و دەستەکەی
دی بۆ خواردن لە دەستەوانەکە دەرهێنا. ویستی پاروویەک
بخاتە زاری، بەڵام رووگەتی سەهۆڵینی نەی هێشت.
لەبیری چووبووە کە ئاگرێک داگیرسێنێ و بیتوێنێتەوە.
پێکەنینی بەبێ ئەقڵی خۆی هات، وکاتی پێکەنین زانی
کە قامکەڕووتەکانی سڕدەبن و هەروەها زانی کە ئەو
ئێشەی کە بەکاتی دانیشتن لە قامکی پێک هاتبوو، لەناو
دەچێ. نەی دەزانی کە قامکی گەرمن یا سڕن. هەر بۆیە
قامکەکانی ناو کاڵە شوورەکەی بزواندو بەو ئاکامە
گەیشت کە سڕبوون. بە پەلە دەستەوانەی لە دەستی کردو
لە جێیەکەی هەستا. کەمێک ترسابوو، ئەوەندە لاقەکانی
لە عەرزی کوتا هەتا وەژان کەوتن و شتێک کە لەو کاتەدا
هاتە ناو مێشکی ئەوەبوو کە هەوا لە راستیدا ساردە.
پیاوەکەی خەڵکی ناوچەی جۆگەی گۆگرد، هەقی بوو کە
دەیگوت، جارجار هەوا لەو مەڵبەندە زۆر سارد دەبێ. ئەو
کات بەو قسەیە پێکەنیبوو و ئەوە نیشانی دەدا کە مرۆڤ
نابێ زۆریش متمانەی بەخۆی هەبێ. لەوەدا کە هەوا
ساردە، جێگەی هیچ گومانێک نییە، چەند جاران چوو بۆ
پاش و پێشەوە، لاقی لە عەرزی دا، چەند زەبریشی لە
باسکی وەشاند هەتاکوو گەرمایەک هاتە ناو لەشی و
خەیاڵی راحەت بوو. دوایە شەمچەی دەرهێناو بۆ ئاگر
کردنەوەی دەست بەکاربوو. و لەناو لق و پۆپی ژێردارەکان
کە لافاوی بەهاری پارەکە، نەختێک وشکەداری لێی بەجێ
هێشتبوون، ئاوردووی دروست کرد. سەرەتا زۆ بەئەسپایی،
ئاگرێکی سازکردو وردە وردە کردی بە ئاگرێکی گەش، و
بەتیشکەکەی سەهۆڵی رووگەتی تواندەوەو
«بیسکویت»ەکەی خوارد. بۆ ماوەیەک سوپای تووشی

پاشەکشە بوو. سەگەکەش، هەتا ئەو جێیەی کە دەیتوانی لە ئاگرەکە کەڵکی وەرگرت، بەچەشنێک لە ئاگرەکە نیزیک بووە کە گەرمای بێ، و هەروەها ئەوەندەش مەودای هەبێ کە نەسووتێ.

پاش ئەوەی کە چێشتەکەی تەواوکرد، قەڵنەی تێکردو دەمەوساتێک بەخەیاڵی راحەت خەریکی قەڵنەکێشان و دووکەڵ سازکردن بوو، لە پاشان دەستەوانەکەی لە دەستی کرد، کڵاوە گوێچکەدارەکەی بەتوندی کشاندە سەر گوێچکەی و لە ڕێگەی لێواری چەپی جۆگەکەوە درێژەی بەرۆیشتنەکەی دا. سەگەکە لە کارەکەی نارەحەت بوو و لە پەنا ئاگرەکە هەڵ نەدەستا. ئەو پیاوە، سەرمای نەدەناسی. بەڵکوو باب و باپیرانی لەبارەی سەرماوە، سەرمای راستەقینە، سەرمای سەدوحەوت پلە لەژێر سەهۆڵ بەندان، بێ زانیاری بوون. بەڵام، سەگەکە فامی دەکرد، تەواوی رەگەزەکەی فامیان دەکرد، سەگەکە ئەو فام کردن و ئاگادارییەی لەوان بەمیرات بردبوو. سەگەکە دەیزانی کە لەو سەرمایەدا، ڕێگەڕۆیشتن کارێکی باش نییە. ئێستا وەختی ئەوەیە کە دەبێ لە چاڵێکدا لەژێر بەفر بەراحەتی بخەوێ و چاوەنوارِ بمێنێتەوە هەتا ئەو پەڵە هەورەی فەزای دەرەوە، کە سەرما لەوێدا رادەهات، بڕوات. لەلایەکی تر، پێوەندییەکی خۆمانەش لەنێوان سەگ و پیاوەکەدا نەبوو. هەوەڵی کۆیلەی زەحمەتکێشی دووهەمی بوو، تەنیا مێرەبانێک کە تا بە ئێستا دیتبووی، لاواندنەوەی قامچی و هاواری بن قرقرۆچکە بوو کە هەڕەشەی قامچی لێدانی لەگەڵ خۆیان پێ بوو. بەو هۆیە، سەگەکە، هەواڵێکی بۆ راگوێزتنەوەی زانیاری خۆی بۆ پیاوەکە بەجێ نەهێنا.

سەگەکە، هۆگری بەخێرو بەرژەوەندی مرۆڤەکەوە نەبوو، تەنیا بەخاتری خۆی بوو کە دڵی لە ئاگرەکە نەدەبووە. بەڵام مرۆڤەکە فیتوی لێدەدا، لەگەڵ سەگەکە بەدەنگێک کە هەڕەشەی قامچی لێدانی لەگەڵ بێ قسەی کرد. سەگەکەش بڵند بووەو بە دوایدا وەڕێ کەوت. مرۆڤەکە، هێندێ تووتنی لەزاری هاویشت و خەریکی سازکردنی ردێنی کارەبایی بوو. هەروەها هەناسەی تەڕی وەک تۆزێکی سپی بەخێرایی نیشتە سەر سمێڵ و برۆو پێڵووەکانی. وانەدەهاتە بەرچاو کە کانیاوی زۆر لە لێواری چەپی ئاندێرسۆن هەبن، و هەتا نیوسەعات تووشی کانیاوێک نەبوو و دوایە رووداوەکە قەوما. لە شوێنێکدا کە هیچ عەلامەتێک نەبوو، و بەفری نەرم و ڕێک لە رواڵەتدا نیشانەی رەقایی ژێر پێ بوو، لاقی رۆچوو. چاڵەکە زۆر قووڵ نەبوو، پێش ئەوەی کە بە هەوڵدان و پەلەقاژە لاقی بێنێتەدەر، جنێوی دایە بەخت و شانسەکەی. ئاواتە خواز بوو کە سەری سەعات شەش لەگەڵ هەڤاڵەکانی لەناو خێوەت دابێ و ئەو رووداوە سەعاتێک کارەکەی دەخستە دواوە، چونکە ناچار بوو ئاگرێک ساز بکاو کاڵەشوورو گۆرەوییەکەی ئیشک بکاتەوە. لەو هەوا ساردەدا ئەو کارە پێویست بوو. هەتا ئەوەندەی دەزانی، بۆ لای لێواری جۆگەکە بای داوەو لەوێ چووە سەر بەرەوژووری لێوارەکە، هێندێ ئاوردووی ئیشک لە دەوروبەری قەدی چەند دارە سنۆبەرو لق و پۆپەکانی ژێر ئەوان، کۆببوونەوە کە لە لافاوی رووبار بەجێ مابوون. زۆربەیان دارو شولک بوون رادەیەکی زۆریش لقی ئیشک و گژوگیای نەرمی ساڵی رابردوو لەواندا دەدیترا، چەند لەتکی گەورەی هاویشتە سەر بەفر، ئەوانە ددیانتوانی بەجێی بناغەدانان کەڵکیان لێوەربگیرێ. تەڵاشێکی پێستی «قان»ی لە گیرفانی دەرهێنا. بە شەمچە ئاگری پێوەناو بەیاریدەی ئەو، گڕێکی سازکرد. پێستی «قان» لە کاغەزیش زووتر ئاگر دەگرێ.

ئاگرەکەی لەسەر ئەو دارانە کە بۆ بناغەدانان دای نابوو، دامەزراند، و کۆگاکانی گژوگیای ئیشک و لق و پۆپەکانی وردی ئیشکی خستە سەریان.

بەئەسپایی و وردی کاری دەکرد، چونکە لە مەترسی یەکانی ئاگاداربوو. هەر کە گڕەکە بەرز دەبووە، زۆرتر داری پێوەدەنا. لەسەر بەفرەکە هەڵتروشکا. ئەو دارانەی کە لەناو گەڵاو پۆپی ژێر درەخت پێچرابوونەوە، دەری دەهێنان و خێرا دەیخستنە ناو ئاگرەکە. دەیزانی کە بەو کارە نابێ لەگەڵ شکست بەرەورِوو بێ. کاتێک سەرما هەفتاوپێنج پلە لەژێر سیفر بێ، مرۆڤ نابێ لە هەوەڵ هەوڵی خۆی بۆ سازکردنی ئاگر تووشی شکست ببێ، یانی لاقی تەڕ نەبێ چونکە بێتوو لاقی تەڕ نەبا، و لەو کارەدا سەرکەوتبا، دەتوانێ لەژێر ڕێگا هەتا نیو میل هەڵێ و سووڕانی خوێنی بپارێزێ. بەڵام کاتێک سەرما، هەفتاوپێنج پلە لەژێر سیفرە، سووڕانی خوێن ناکرێ لەلاقە بەستراوەکانیدا، بپارێزرێ. لەو حاڵەدا مرۆڤ هەر ئەندازە توندتر هەڵێ لاقە سەرما بردووەکانی خێراتر دەی بەستێ.

مرۆڤ تەواوی ئەوانە دەزانێ، پیرەپیاوی جۆگەی گۆگرد لەبارەیدا، شت گەلێکی پێ گوتبوو و ئێستا بایەخی قسەکانی بۆ وەدەرکەوتبوو. لاقی ئیتر، هەستیان لێ بڕابوو، بۆ داگیرساندنەوەی ئاگرەکە ناچار بوو کە دەستەوانەکەی دەربهێنێ و قامکی زۆر سڕببوون. خێرایی

چوار میل له سەعات دا، بوو بەهۆی ئەوە کە دڵی خوێن بگەیەنێ بۆ تەواوی لەش و هەروەها دەست و لاقی. بەڵام ساتێک کە راوەستابوو، ئیتر گەیاندنی خوێن لە جووڵەکەوت. سەرمای رووبەر دوایین مەڵبەندی بێ پارێزی تۆیی زەوی وەبەر پەلاماردابوو، چونکە ئەویش لەو مەڵبەندە بێ پارێزە دابوو، تەواوی گوشاری زەبرەکە لەسەر ئەو بوو. خوێنی لەشی لە بەرامبەر هێرشی سەرمادا پاشەکشەی کردبوو. خوێنیش وەک سەگ زیندوو بوو و دەیهەویست خۆی بپارێزێ و لەو سەرمایە رزگاری بێ، هەتاکوو کاتێکی مرۆڤ بەخێرایی چوار میل لە سەعات دا رێگا دەبڕێ، خوێنەکە ویستبای یا نەیویستبا هەتاکوو ئاستی لەشی دەهاتە سەرێ، بەڵام ئێستا ئیتر دامرکابوو و لە قوژبنەکانی خەڵوەتی لەشی سەقامگیر ببوو. دەست و لاقی، هەوەڵ جێیەک بوون کە هەستیان بەنەبوونی خوێن کرد. لاقی زۆر زوو بەستبووی، قامکەکانیشی هەرچەند کە لە هەوادا نەیانبەستبوو، بەڵام خێرا سڕببوون. کەپۆو گۆنای هەتاکوو ئێستا بەستوویانەو پێستی لەشی بەهۆی لەدەست چوونی خوێنەوە زۆر سارد ببوو، بەڵام مێشکی راحەت بوو، ئاگر خۆش دایبیسا. لە ئاکامدا لاقی و کەپۆو گۆنای زۆریان سەردەمەندیت ئێستاکە هەندێ لێ کە بە بارتەقای قامکی بوون بۆ ناو ئاگرەکە برد. ساتێکی تر دەیتوانی کە ئاگرەکە بەکەمێک لێ و بەئەستوورایی مەچەکی دەستی بەهێز بکا. ئەوسا دەیتوانی کاڵەشوورو گۆرەوییە تەڕەکەی دەرهێنێ و لەهەمان کاتیشدا ئیشک دەبوونەوەو لاقەرووتەکانی لە نیزیک ئاگر رابگرێ. دەبوو سەرەتای کار لاقی بە بەفر رامالیبا، داگیرساندنەوەی ئاگرەکە سەرکەوتنێ بوو، کە خەیاڵی راحەت کرد. ئامۆژگاری پیرەپیاوی جۆگەی گۆگردی وەبیر هاتەوەو بزەی هاتێ. ئەو پیرەپیاوەش زۆری سەخت گرتبوو کە بەچەشنی وەحی ناردراو قسەی دەکرد، کەس نابێ لە سەرمای خوارتر لە پەنجا پلەی سیفر بەتەنیا لە «کلۆندایک» سەفەر بکا. باشە بۆ خۆی لێرەیە رووداویشی بۆ هاتۆتە پێش، بەتاقی تەنیایە رزگاریشی بووە.

لەلای خۆی بیری کردەوە کە تاقمێک لەو پیرەپیاوانە وەک ژن دەچن. گرینگترین شت کە پیاوێک پێویستی پێی هەیە، ئەوەیە کە هێمنی خۆی راگرێ و بۆ خۆی لەم بارەوە سەرکەوتوو بوو. مرۆڤ ئەگەر پیاو بێ دەتوانێ بەتەنێ سەفەر بکا، بەڵام لوت و گۆنای بەچەشنێکی سەرسووڕهێنەرەوە دەیانبەست، هیچ بیری لێنەدەکردەوە کە قامکی لەوەها ماوەیەکی کورتدا سڕبێن، بێ هێزو تەزیو بێن، چونکە بەزەحمەت وای لێدەکردن کە بۆ گرتنی لەتکەدارێک پێکەوە بجوولێنەوە، وەک ئەوەکە لەشی خۆی لێک جیابوون. کاتێک کە دەستی لەسەر دارێک دادەنا ناچار بوو چاو لێ بکا هەتا بزانێ درووستی گرتووە یان نا. لەو ناوەدا پێوەندییەکەی لاواز ببوو، شتەکە زۆر بایەخ دار نەبوو لە پێش چاوی ئاگرێک بوو کە چزەچزی لێدەهات و بەسەمای گڕەکان مزگێنی بووژانەوەی دەدا، دەستی کرد بە کرانەوەی بەندی کاڵەشوورەکەی کە بەفریان لەسەر نیشتبوو گۆرەوییە ئەستوورە ئەڵمانییەکەی وەک کایلانی ئاسن هەتا ژێر ئەژنۆی هاتبوو. بەنی کاڵەشوورەکە وەک میلەیەکی پۆلایینی لێهاتبوو کە لەبەر گەرمای زۆرێک گووشرابێ و گرێ درابێ. چەند ساتێک بەقامکە سڕبووەکانی بەنی کەوشەکەی کێشا و دوایی کە زانی ئەو کارە بێ ئاکامە کێردەکەی لە کایلانی دەرهێنا کەچی پێش ئەوەی کە بتوانێ بەنی کاڵەشوورەکەی ببەستێ شتێک رووی دا. خەتای خۆی بوو یان باشتر بڵێین هەڵە لە خۆی بوو، نەدەبوایە ئاگری لەژێر داری سنۆبەردا سازبکردایە. ئەوە دەبا لە رووبەرێکی ئاوەڵا بەرێوەچووبا بەڵام لەو جێگەیە هێنانی لق و ورتکەدارو لە ئاگر هاویشتنیان رەحەت تر بوو. ئەو دارەی کە ئاگری پێ خۆش کردبوو، هێندێک بەفر لەسەر لقەکانی بوو. چەند حەوتوویەک بوو کەشنەی با هەڵی نەکردبوو، لە ئاکامی باریندا بەفرێکی زۆر لەسەر تەواوی لقەکان نیشتبوو، هەر جارەی کە ورتکەدارێکی دەکێشا لەوانە بوو کارەساتێک بخولقێنێ. بەفری سەر یەکێک لە لقەکانی درەختەکە شۆڕبۆوەو کەوتە سەر لقەکانی دیکەی درەختەکە و بەفری ئەوانیشی خستەخوار، ئەو کارە درێژەی هەبوو، پەرەی ئەستاندو تەواوی لقەکانی گرتەوە. بەفرەکان بەچەشنی رنوویەک دەرهاتن و لەپڕ کەوتنە سەر پیاوەکە و ئاگرەکەو ئاگر کوژایەوە. ئەو جێیە کە ئاگری تێدا سازکرابوو هێندێ بەفری تازەو بێ شکڵی هاتە سەر. پیاوەکە حەپەسا. وەک ئەوەی بوو کە حوکمی ئیعدامیان پێ راگەیاندبێ. ساتێک دانیشت و رامایە ئەو شوێنەکە ئاگرەکەی لێ سازببوو. پاشان بەسەر دەمارەکانی زاڵ بوو. وادیار بوو کە پیرەپیاوی جۆگەی گۆگرد راستی گوتبوو. بێتوو تەنیا هەڤاڵێکی هاوسەفەری هەبوایە، ئێستاکە مەترسی هەرەشەی لێنەدەکردو دەیتوانی ئاگرێک هەڵبکا. ئیتر لەسەر ئەستۆی خۆیەتی کە ئاگرێک ساز بکاو ئەمجارە

نابێ شکست بخوا. تازە لەکاتی سەرکەوتنیشدا، بۆی هەیە چەند قامکی لاقی لە دەست بچێ. هەتاکوو ئێستا دەبێ لاقەکانی بەچەشنێکی خراپ سەدەمەیان دیتبێ هەتاکوو بیهەوێ ئاگرەکە سەر لەنوێ خۆش بکاتەوە ماوەیەک دەخایەنێ. ئەندێشەو خەیالاتی وەها بە مێشکیدا تێپەڕ دەبوون، خەریکی کار بوو. بیرێکی نوێی بۆ ئاگر داڕشت، ئەمجارە کارەکەی لە رووبەرێکی ئاوەڵادا کرد کە هیچ دارێک نەتوانێ بەخەیانەتەوە ئاگرەکە بکوژێنێتەوە. لە پاشان لەناو کۆمایەک دار کە لە لافاوی رووبارەکە بەجێ مابوون، گژوگیای ئیشک و لقی بچووکی کۆکردەوە. بۆ هەڵگرتنی دارەکان نەیدەتوانی قامکەکانی خڕبکاتەوە بەڵام دەیتوانی کە بە دەست هەڵیانگرێ. بەو جۆرە رادەیەکی زۆری لەو لقە خراپ و خەنتیلکە سەوزانەی کە بەکار نەدەهاتن کۆکردەوەو ئەوە تەنیا کارێک بوو کە لەدەستی دەهات. بەپێی نەخشە دەجوولایەوە، هەندێ لقی گەورەی خڕکردەوە کە دوایە لە پاش ئەوەی ئاگرەکە گەش بوو توانی کەڵکیان لێ وەربگرێ. لەو ماوەیەدا سەگەکە دانیشتبوو هۆشی لە پیاوەکە بوو، نیگەرانییێکی ئاواتخوازانە لە چاوەکانیدا بەدی دەکرا، چونکە بەچاوی خولقێنەری ئاگر چاوی لە پیاوەکە دەکرد، رەوتی داگیرساندنەوەی ئاگریش بەئەسپایی پەرەی دەستاند. کاتێک کە هەموو شتێک ئامادە بوو، دەستی لە گیرفانیکرد کە تەڵاشێکی تر لە پێستی (قان)ی دەرهێنا. دەیزانی کە پێستەکە لەناو گیرفانی دایە، هەر چەند نەیدەتوانی بە قامکەکانی هەستیان پێ بکا، ئەو کات دەنگی خشەخشی دەسرەیەکی بیست. هەرچی هەوڵی دا نەیتوانی دەری هێنێ. لەو ماوەیەدا ئەو هەستە لە ناخی مێشکی دابوو کە لاقەکانی وردە وردە پتر دەیبەستێ. ئەم بیرە دەیهەویست خووداری بکا، بەڵام بەربەرەکانی لەگەڵ کردو هێمنایەتییەکەی لە دەست نەچوو. دەستەوانەکەی بەیارمەتی ددانی کردە دەستی، باسکەکانی چەند جار بۆ پاش و پێشەوە بردو دەستەکانی بەتەواوی هێزەوە کوتایە سەر قەپرغەی. بە دانیشتنەوە ئەو کارەی کردو بۆ درێژەپێدانی هەستایەوە. لەم بەینەدا، سەگەکە لەسەر بەفرەکە هەڵتروشکابوو. ئاگای لەپیاوەکە بوو. کلکی کولکن و گەرمی لە گەڵۆزی گرت و گوێچکە تیژەکانی بە پەشۆکاوییەوە بۆ پێشەوە هەڵخستبوو، پیاوەکە لە حاڵێکدا باسکی رادەوەشاندو دەستەکانی دەکوتایە قەبرغەی، چاوی لە سەگەکە دەکرد کە لەژێر لەشی سروشتی خۆیدا گەرم و راحەت بوو و شەپۆلێکی گەورە لە رق و ئێرەیی لەوا پێک دەهات. پاش ماوەیەک، نیشانەکانی هەست پێکردن بەدوری لە قامکە کفت و کوتراوەکانی هاتە دی. ژانێکی بچووک سات بە سات پتر دەبوو و بوو بەژانێک کە ئازاری دەدا، بەڵام ئەو بەخۆشییەوە پێشوازی لەو ئەزابە دەکرد. دەستی راستی لە دەستەوانەکە هێنایەدەرو پێستی «قان»ی دەرهێنا. قامکە رووتەکانی خێرا دەیانهەویست بیبەستێ. دوایە بەستەیەکی شەمچەی گۆگردی دەرهێنا. بەڵام سەرمای لەرادەبەدەر قامکەکانی لەکارخست. کاتێ بۆ جیاکردنەوەی دەنکە شەمچەیەک هەوڵی دەدا، تەواوی شەمچەکە کەوتە ناو بەفرەکە. ویستی کە هەڵیانگرێتەوە، قامکە مردووەکانی نەیاندەتوانی هەست بەشەمچە بکەن و هەڵیانبگرن. زۆر وشیار بوو. بەخڕکردنەوەی تەواوی بیروهۆشی بۆ شەمچەکە، فکری بەستنی لاق و لوت و گۆنای لە مێشکی وەدەرنا. هەستی بینینی لەجیاتی هەستی وێ کەوتن بەکاردەهێنا، ئاگاداربوو کاتێ دەیدی کە قامکەکانی بۆ لایەکی شەمچەکە گەیشتوون، دەستی وێک دەنا واتە دەیهەویست دەستی پێکەوەنێ، چونکە پێوەندی لەگەڵ دەستی بڕدرابوو و قامکەکانی مل کەچیان لێنەدەکرد، دەستی راستی خستە ناو دەستەوانەکەی و مەحکەم کوتایە سەر ئەژنۆکانی. لە پاشان بەهەر دوو دەستی کە لەناو دەستەوانەکە دابوون، دەستەی شەمچەکانی بەهێندێ بەفرەوە لەناو دامێنی خڕکردەوە. بەو حاڵەش هێشتا ئاکامێکی بەرچاوی لەو کارە وەرنەگرتبوو. پاش ماوەیەک هەوڵدان توانی کە دەستەی شەمچەکە لە نێوان لەپی هەردوو دەستی رابگرێ، هەر بەو جۆرە شەمچەکەی بۆ لای زاری برد. کاتێک کە بە هەوڵدانی بێوچانی زاری لێک ئاوەڵا دەکردەوە، سەهۆڵەکانی روومەتی بەقرچە قرچ دەشکاند.

چەنەگەی کشاندەوە دواوە. لێوی سەرەوەی هێنایە پێش و ددانەکانی سەرووی خۆی کشاندە دەستەی شەمچەکە کە بتوانێ دەنکێک لەو شەمچە جیابکاتەوە. بەو جۆرە توانی کە دانەیەک لە شەمچەکە بکاتەوەو بیهاوێتە ناو دامێنی. ئاکامێکی باشی وەدەست نەهێنابوو. نەیدەتوانی شەمچەکە هەڵگرێتەوە.

دوایی نەخشەیەکی دی کێشا. شەمچەکەی بە ددانی هەڵگرت و لە لاقی خشاند. بیست جار ئەو کارەی دووپات کردەوە تاکوو بتوانێ هەڵی بکا، وەختێ کە

شەمچەکە هەڵبوو بە ددانی گرتیە بەر پێستی «قان»ەکە، بەڵام گۆگردی داگیرساو، چووە ناو لووت و سییەکانی و تووشی کۆخین و پژمینی کرد، شەمچەکە، کەوتە ناو بەفرەکە و کووژایەوە.

بەدوای ئەو رووداوەدا ساتێک کە توانی بەسەر دڵە کوتەکەیدا زاڵ بێ، لای خۆی بیری کردەوە، کە پیرەپیاوی جۆگەی گۆگرد هەقی بوو: لە سەرمای پتر لە پەنجا پلەی ژێر سیفر، مرۆڤ دەبێ لەگەڵ هەڤاڵێکی هاوسەفەر بێ. دەستی لێکدان، بەڵام نەیتوانی کە بیانهێنێتە سەر هەست. لەپڕ دەستەوانەکانی بەددانی دەرهێناو هەردوو دەستی رووت کرد. تەواوی دەستەی شەمچەکەی گرتەناو لەپی دەستی. لەبەر ئەوە کە ماسوولکەکانی باسکی نەیانبەستبوو، دەیتوانی کە لەپی دەستەکانی بە توندی بخشێنێتە هەردوو دەستەی شەمچەکە، لە پاشان دەستەی شەمچەکەی لە لاقی خشاند. هەفتادەنک شەمچە لەناکاو، گڕیان گرت و بەوێنەی شاگڕێک بڵێسەیان دا. شنەی با نەدەهات کە گڕەکە بکوژێنێتەوە. بۆوەی کە لە دووکەڵی خنکێنەر لە ئەماندابێ، سەری شۆڕکردەوەو دەستەی شەمچەی گرتە بەر پێستی «قان»ەکە. وەختێ کە شەمچەکەی لە وەها وەزعێکدا راگرتبوو، لەپێک هاتنی هەستێک لە دەستیدا، ئاگادار بوو. گۆشتی لەشی دەسووتا. بۆنی بۆ دەهات و هەستی بەسۆزێک لەناخیدا دەکرد. ئەو هەستە بوو بەژانێک کە سات بەسات زۆرتر دەبوو، ئەو هێشتا ژانەکەی دەچێشت، گڕەکەی بەنەزانی یەوە بەردابوویە پێستی «قان»ەکە کە ئەویش بەزوویی ئاگری نەدەگرت. چونکە دەستی لەسەر رێگە بوو و زۆربەی گڕەکەی بۆ لای خۆی دەکێشا. لە دواییدا کاتێ کە نەیتوانی ئیشەکە ئەنجام بدات، دەستەکانی بەراوەشاندن لێک جیابوونەوە. شەمچەکانی ئاگرین بەچزەچزەوە کەوتنە سەر بەفرەکە، بەڵام پێستی «قان»ەکە ئاگری گرتبوو. دەستی کرد بەدانانی گژوگیاو لقی نیشک بەسەر گڕەکەوە. نەیدەتوانی کە دارەکان هەڵبژێرێ، چونکە ناچار بوو کە بە لەپی دەستی هەڵیانگرێ. ورتکەدارە رزیو و خەنتیلکە سەوزەکان بە لقەکانەوە نووسابوون و هەتا ئەو جێیەی کە دەیتوانی بەددانی ئەوانی لە لقەکان هەڵدەکەند. بەئەسپایی و گرفتێکی زۆر گڕەکەی دەپاراست. مانای ئەو ئاگرە بووژانەوە بوو و نەدەبوایە لەناوچووبا. پاشە کشەی خوێن لە ئاستی لەشیدا وەلەرزینی خستبوو زیاتر لەوە نارەحەتی دەکرد.

لەتێکی گەورە لە خەنتیلکەی سەوز کەوتە سەر بڵێسە بچووکەکە. ویستی بەقامکی لەسەر بڵێسەکە لای بەرێ. بەڵام لەرزینی بوو بەهۆی ئەوە کە دەستی بۆ ئەولاتر بەرێ و ناوەندی بچووکی ئاگر لەناو بچێ و گژوگیاو لقی ورتکە کە گڕیان گرتبوو، لە یەکتر جیابنەوەو پەرش و بڵاوبێ. ویستی لە سەرڕاوە خڕیان بکاتەوە، بەڵام چونکە لەرزین شوێنی لەسەر دانابوو، سەرەڕای ئەمە کە زۆری هەوڵدا، کەچی لقەکان بەچەشنێکی ناهومێدانە پەرش و بڵاوبوونەوە. هەر لقەی نەختێک دووکەڵی دەکردو دەکووژایەوە. ئەو ناوەندەی کە بڕیار وابوو ئاگری پێ هەڵبێ، لەناوچوو. وەختێ کە بەبێ ئامانجەوە، چاوی لە دەوروبەر کرد، لەپڕ چاوی بەسەگەکە کەوت کە لەو لای ئاگرە پرژاوەکان لەناو بەفردا، هەڵتروشکابوو و بەنارەحەتییەوە پشتی کووڕکردبوو. دەستی بەهێواشی و بەنۆرە بەرز دەکردەوەو دای دەناوە سەر عەرزو بەپەرۆشێکی تامەزرۆیانە تینی لەشی بۆ هەر یەکیان دەهێنا. بەدیتنی قەڵافەتی سەگەکە بیرێکی وەحشییانە لەودا پێک هات. چیرۆکی مرۆڤێکی وەبیرهاتەوە کە گیرۆدەی سۆزو بەفر ببوو ئەسپەکەی کووشتبوو و پەنای بردبوویە ناو کەلاکی حەیوانەکەو بەو جۆرە رزگاری هاتبوو.

سەگەکەی دەکوژێ، دەستی دەباتە ناو لەشی گەرمی سەگەکە هەتا بەو چەشنە کۆتایی بەتەزاندنییان بهێنێ. ئەو کات دەتوانێ ئاگرێکی دیکە ساز بکا. قسەی لەگەڵ سەگەکە کرد. بانگی کردە لای خۆی بەڵام لە دەنگیدا نیشانەیەکی سەیر لە ترسدا هەبوو کە سەگەکە سامی لێ نیشت. چونکە قەت نەیدیتبوو کە مرۆڤ ئاوا قسە بکات. ئەو کارە مسۆگەر بوو کە هۆیەکی هەیە. و سروشتی گومانی سەگەکە هەستی بە مەترسی کرد- ناوەرۆکی هەرەشەی نەدەزانی بەڵام لە شوێنێک لە مێشکیدا ئەوە هەبوو کە لە مرۆڤەکە ترسابوو. گوێچکەکانی بۆ لای دەنگی پیاوەکە شۆڕ کردەوە، جم و جووڵە بێ ئۆقرەیانەکەی، کووڕبوونەوە، بەرزکردن و راوەشاندنی دەستی بەرچاوتر بوون، کەچی بۆ لای پیاوەکە نەدەهات. پیاوەکە بەگاگۆڵکە بۆ لای سەگەکە چوو. ئەو رەوشتە نائاساییە گومانی سەگەکەی زۆرتر کردو لە ئاکامدا بەنازو خۆپارێزییەوە چوو بۆ دواوە... پیاوەکە، ساتێک لەسەر بەفرەکە دانیشت و هەوڵی دا کە ئارام بێتەوە. لە پاشان دەستەوانەکانی بەیاریدەیی ددانی لە دەستی کردو بڵند بۆوە، سەرەتا روانییە خواردوەی کە بزانێ لە راستیدا

ڕاوەستاوە یان نا، چونکە سڕبوونی لاقەکانی پێوەندییان لەگەڵ عەرز هەڵ دابڕیبوو. بەڕژنی بەرزی پیاوەکە لە خۆوە پەردەی گومانی لە بیری سەگەکە سڕییەوەو کاتێ کە پیاوەکە بە توندی و بەزمانی قامچی قسەی دەکرد، سەگەکە وەک وەفادارێکی جاران بۆ لای هات. هەر کە سەگەکە هاتە نیزیکی لە خۆبۆوە.

دەستی بە خێرایی کارەبا بۆ لای سەگەکە درێژ بوو. کە زانی دەستەکانی بڕستی ئەوەیان نەماوە کە شتێک بگرن، و قامکەکانی ڕێک نایەنەوەو بێ هەستن، تووشی واق وڕماوی ڕاستەقینە بوو. لەو ساتە گرینگەدا لەبیری چوو بۆوە کە قامکەکانی بەستوویانە و سات بەسات پتر دەیبەستن. تەواوی ئەو ڕوداوانە لەنەکاو قەومان و پێش ئەوەی کە سەگەکە بتوانێ ڕابکا بەهۆی باسک و پیلی پیاوەکە گەمارۆدرا. لەسەر بەفرەکە دانیشت و سەگەکە دەینالاندو دەیقڕووسکاندو پەلەقاژەی دەکرد، هەر بەو وەزعە ڕاگیرا. بەڵام تەنیا کارێک کە لە دەستی دەهات، هەر ئەوە بوو کە لەشی سەگەکە بەباسک و شانی خۆی گەمارۆبدات و لەوێ دابنیشێ. دەیزانی کە ناتوانێ سەگەکە بکوژێ. بۆ ئەو کارە ئامێرێکی نەبوو. بەدەستە کزو لاوازەکانی نەی توانی کێردەکەی دەرهێنێ و لەدەستی دا ڕابیگرێ، سەگەکەی پێ نەدەخنکێندرا. دەستی لە سەگەکە هەڵگرت، ئەویش خێرا دوور بۆوە، کلکی خستبووە ناو لاقی و هەر خڕپەخڕپی دەهات. چل «پێ» لەو لای پیاوەکەوە ڕاوەستاو بەنیگایەکی دۆزەوەرانە چاوی تێبڕی، گوێچکەکانی بۆ پێشەوە هەڵخستبوو.

پیاوەکە چاوی لە دەستەکانی کرد هەتاکوو بزانێ کە لە کوێن و زانی کە لە باسکەکانی هەڵواسراون ئەوە دەسبەجێ بوو بەمایەی سەرسووڕمانی ئەو کە پیاوەکە بۆ تێگەیشتن بەباروودۆخی دەستەکانی خۆی ناچاربوو کە یارمەتی چاوەکانی بوێ، باسکی بەتوندی بۆ پاش و پێشەوە بردو دەستەکانی کە لەناو دەستەوانەکەدا بوون لە قەپرغەی کوتا. ئەو کارەی هەتا پێنج دەقە درێژە پێدا، هەتا دڵی خوێن بگەیەنێ بۆ ئاستی لەشی و لەرزینەکەی ڕاوەستا. بەڵام هیچ هەستێک لە دەستیدا بەدی نەدەهات. ئەو هەستە لەودابوو کە دەستەکانی وەک بەرد لە باسکی هەڵواسراون بەڵام وەختێک ویستی کە هەستەکەی بۆ خوارەوەی ڕابگوێزێ نەیدەدۆزییەوە. سامێکی کوشندە لە مردنی قورس و لەناکاو بەسەریدا زاڵ بوو. کاتێ بۆی دەرکەوت کە ئیتر تەنیا باسی سەهۆڵ بەستنی قامکەکانی

دەست و پێ و یان تەنانەت لە دەست چوونی دەست و لاق لە ئارادانییە، بەڵکوو مەسەلەی مەرگ و بووژانەوە لە گۆڕێدایەو هۆکارەکانیش دژ بە ئەو هەستاون، ترس و سامەکەی زیاتر بوو. ئەو ناکامە وڕوکاسی کرد، گەڕایەوەو لە بەستێنی جۆگەکە بە درێژایی ڕێگا کۆن و تاریکەکە هەنگاوی هەڵێنا. سەگەکەیش وەدوای کەوت. پیاوەکە کوێرانەو بێ ئامانج هەڵ دەهات، تووشی وەها سامێک ببوو کە لە تەمەنیدا نەیدیتبوو لە حاڵێک دا کە بە هەوڵدان و پەلەقاژە لەناو بەفردا ڕای دەکرد، وردە وردە وێنەی شتەکانی هاتە بەرچاو. لێواری جۆگەکە، کۆگاکانی دار، سنۆبەرەکانی ڕووت و ئاسمان. بەهۆی هەڵاتن حاڵی باشتر بوو. ئیتر نەدەلەرزی.ڕەنگە بێتوو هەڵێ سڕبوونی لاقی لەناو بچێ، هەر چۆنێک بێ، ئەگەر پتر هەڵێ دەگاتە خێوەتی هەڤاڵەکانی، بێگومان چەند قامکی دەست و لاقی و بەشێک لە ڕوومەتی لەناو دەچێ، کەچی بێتوو بگاتە وێ، دۆستەکانی یاریدەی دەدەن و باقی وجودی ڕزگار دەکەن و هەر لەو حاڵەش دا بیرێکی دیکەی هەبوو کە نیشانی دەدا قەت ناگاتە خێوەتی هەڤاڵەکانی چونکە هەتا خێوەت مەودایەکی زۆرەو سەهۆڵبەندان زۆر خراپتر بووەو بەزوویی تەواوی لەشی دەیبەستێ و دەمرێ. ئەو بیرەی ڕادەداو لە ئەندیشەکردنی خۆی دەپاراست. جاری وایە ئەو بیرەی وەپێش خۆی دەخست و دەیهەویست کە حیسابی بکا، بەڵام ئەو پاڵی پێوەدەنا کە بیر لە مەسەلەکانی دیکە بکاتەوە. لەوەی کە لەجێدا دەیتوانی بەلاقە بەستوویەکانی هەڵێ سەری سووڕمابوو چونکە بەکاتی مەڵاس بوون لەگەڵ عەرزو تاقەت هێنانی قورسایی لەشی نەیدەتوانی هەستیان پێ بکا. وای دەهاتە بەرچاو کە لەسەر بەرزایی ڕووبەری هەردەکە هەڵدەخلیسکێ و پێوەندی بەزەوییەوە نامێنێ، جارێک لە جێگایەک مەلێکی پەیامنێری دیتبوو نەیدەزانی کە داخۆ ئەویش وەها هەستێکی کە بەخۆی وەختی هەڵخلیسکان لەسەر بەرزایی تۆپی زەوی هەیەتی هەیبووە یان نا.

ئەوە کە دەبێ هەتا گەیشتن بەخێوەت و هەڤاڵەکانی هەڵێ عەیبێکی هەبوو و ئەویش تاقەتی ئەمەی نەبوو. چەند کەڕەت لاقی هەڵخلیسکاو لە دواییدا بەلاداهات، داهاتەوەو کەوتە سەر زەوی. هەر کە ویستی بەرزبێتەوە نەیتوانی. بەو ئاکامە گەیشت کە دەبێ دانیشێ و وچان بدات و جارێکی دیکە تەنیا دەبێ بەڕێ پێوانی ئاسایی درێژە بەسەفەرەکەی بدا. کاتێک کە دانیشتبوو و هەناسەی

باشتر دەبۆوەزانی کە هەست بەگەرما و راحەتی دەکا. نەدەلەرزی و تەنانەت وادەهاتە بەرچاو کە گزینگێکی گەرم هاتووەتە ناو سینگ و لەشی. سەرەڕای ئەوە وەختێک کە دەستی کێشایە سەر لووت و گۆنای زانی کە سڕبوون. بە هەڵاتن ئێشیان سارێژ نەدەبوو، لەپاشان بۆی دەرکەوت کە بەشەکانی بەستراوی لەشی روو لەزیادبوون دەدا. هەوڵیدا کە پێش بەو خەیاڵە بگرێ، لەبیری بەرێتەوەو بیر لە شتێکی دیکە بکاتەوە، لەو هەستە ناخۆشە کە بیری پێکی دەهێنا ئاگاداربوو و لە سام گرتوویی دەترسا. بەڵام ئەو بیرە ئەوەندە خۆی نواند،پێی داکوتا هەتا ئەوەی کە لە ئاکامدا لە سەرڕاوە خێرا بە درێژایی رێگاکە بڕوا. جارێکیش هەڵاتنەکەی کرد بەرێ پێوانی ئاسایی، بەڵام بیری ئەوە کە سەهۆڵ بەستنی لەشی پتر دەبێ سەر لە نوێ ناچار بەهەڵاتنی کرد. لەو ماوەیەدا سەگەکە وێڕای پیاوەکە هەڵدەکات. کاتێ پیاوەکە کەوتە زەوی سەگەکە کلکی لەناو گەڵۆزی گرت و لەپێشی دانیشت. بە چەشنێکی سەیر لە بۆسەی دابوو. گەرما و ساغی سەگەکە تووڕەی دەکرد. وەبەر جنێوی دا هەتا ئەوە کە سەگەکە گوێچکەکانی بەجۆرێکی ئارام هێنەر خەواند.ئەو جارە لەشی پیاوەکە تووشی لەرزبوونێکی بەهێزتر بوو. لە بەربەرەکانی لەگەڵ سەرمادا شکستی دەخوارد، بەڵام ئەو جارە هێشتا سەت «پێ» هەڵنەهاتبوو کە بەلادا هات و بەدەم کەوتە زەوی. ئەوە دوایین سەر لێ شێواوییەکەی بوو. کە هاتەوە سەرخۆ دانیشت و هۆش و زەینی دایە بەرەنگاری شەرافەتمەندانە لەگەڵ مەرگ. ئەو بیرەش بەم جۆرە نەهاتە ناو مێشکی. ئەندێشەکەی لە بارەی مردندا ئاوا بوو کە بۆ ئەم لاو ئەولا هەڵاتن وەک جووچکەیەک کە سەریان هەڵکەندبێ خۆی فریو دەداو وەها وێچوونێک هاتبۆوە ناو مێشکی. باشە هەر چۆن بێت سەهۆڵ بەستنیش شتێکە، واباشە کە لەو مەسەلەیە بەسینگ فراوانی تەواوەوە پێشوازی بکا. و نیشانەکانی شەل بوون و زەعیفی لە بارودۆخێکدا پێک دەهات کە هێمنایەتییەکەی تازە دەستی پێدەکرد. لای خۆی بیری کردەوە هەتا مەرگ دێت خەوتن کارێکی باشە. دروست وەک ئەوەی کە ئینسان دەرمانی بێهۆشی خواردبێ.

سەهۆڵ بەستنیش بەو جۆرەی کە خەڵک بیری لێ دەکەنەوە خراپ نییە. و مردن رێگەی خراپتریشی هەیە. وێنەی دۆزینەوەی تەرمی خۆی بە هۆی هەڤاڵەکانی لەزەینیدا پێک دەهات. لەپڕ خۆی دیت کە لەگەڵیان بۆ دۆزینەوەی خۆی بەرێگەدا دەڕوا. بەو چەشنە وێڕای ئەوان لە قۆرتی رێگا تێپەڕبوون و خۆی کە لەسەر بەفرەکە کەوتبوو دۆزییەوە. لەو ساتەدا هۆشی بە خۆیەوە نەبوو چونکە تەنانەت ئەو کاتیش کە لەگەڵ هەڤاڵەکانی راوەستابوو چاوی لە خۆی دەکرد کە لەناو بەفردا کەوتووە، و بۆ خۆی نەبوو. ئەو بیرەی کە هاتە مێشکی ئەوە بوو کە هەوا لە راستیدا زۆر ساردە. وەختێک بگەرێتەوە دەتوانێ باسی سەرمای راستەقینەیان بۆ بکا. بیرەکانی لەپڕ ئاوڕیان لەیادی بیرە خەوی پیرە پیاوەکەی جۆگەی گۆگرد دایەوە. دەیتوانی بەباشی ببینێ کە گەرمیەتی و بەراحەت خەریکی قەڵنەکێشانە لای خۆیەوە بەپیرەپیاوی گوت:«پیرەپیاو ئەتۆ راستت دەگوت، هەق بەتۆ بوو». لە پاشان دەخەوێک چوو کە بەڕای ئەو بە راحەت ترین و خۆشترین خەوێک بوو کە لە تەمەنیدا دیتبووی. سەگەکە لەپێشەوەی خۆی هەڵخستبوو. رۆژی کورت خایەن بەرەو زەردەپەڕو ئاوابوون دەچوو. لەو ئاگرەی کە دەبوایە سازکرابێ هیچ شوێنێک نەبوو و جگە لەمە سەگەکە لە عومری خۆیدا قەت نەیدیتبوو کە کەسێک ئاوا لەناو بەفر دابنیشێ و ئاگر سازنەکا. لە کاتێکدا هەوا هەروا بوومەلێڵ بوو، ئارەزووی بەشەوقی ئاگر لەسەر تەواوی لەشی سەگەکەدا زاڵ ببوو، دەستی بەخێرایی دەگۆڕی و بەهێواشی دەینالاند. لە پاشان بەخەیاڵی ئەوەکە نەکا وەبەر لۆمەی خاوەنەکەی بکەوێ گوێچکەکانی خەواند. بەڵام ئەو بێ دەنگ بوو. ئینجا سەگەکە بە توندی قرووسکاندی. لەسەرڕاوە، لە پاشان خزایە پەنا خاوەنی و بۆنی مردنی بۆ هات. ئەوە تووکی سەگەکەی وەک نەشتەر لێکردو ناچار پاشەکشەی کرد. ماوەیەک کە لەژێر ئەستێرەکان کە لە ئاسمانی سارد tرووسکەیان دەهات و دەبریسکانەوەو رووناکاییان دروست دەکرد، قرووسکاندی و چاوەنواڕ مایەوە، دوایی بە درێژی رێگاکە گەڕایەوە بۆ لای خێوەتەکە کە دەیزانی هێندێ کەس لەوێن، وەرێ کەوت هەتا خواردەمەنی و ئاگری بدەنێ.

**سەرچاوە**

**درتلاش اتش، مجموعە داستان- انتشارات تیر، چاپ دوم، ١٣٧٦.**

# بۆچی ترس...؟

عەزیز نەسین

و: مسەدەق توفی

کێ ..؟ .. ئەز..؟ ها .. تە چ گوت.؟ ئەز ترسنوکم؟ ها .. وکێ گوتە تە ئەز د ترسم؟؟ هەمی؟.. وچاوان؟ و کەنگی؟ کێ دیتیە ئەز بترسم؟؟ د رەوین هەی دەروینێ مەزن، ئەز چ جاران ناترسم.. بۆچی دێ ترسم..؟ هەما د بنیاتدا مرۆڤ بۆچی دێ ژ خەلکەکێ دێ ترسیت..؟

ئەرێ دێ بۆچی ژ خەلکەکی ترسم..؟؟!!

بەلێ ترسا خودێ..؟ ئەڤە تشتەکێ دی یە .. ئەڤە کارەکێ ئاسایی یە.. ئەرێ ماتە گوهـ لێ نەبوویە دەمێ دبێژن ژوی بترسەیێ ژ خودێ نەترسیت..؟ مانەوەیە..؟ بەلێ مرۆڤ ژوی د ترسیت یێ ژ خودێ نەترسیت.. تو تێگەهشتی ئەز چ دبێژم؟ ژبلی خودێ مەزن ئەز ژ کەسێ ناترسم... هەما ئەز نزانم ترس چ یە.. مانە هەر کەسەک وەکی من مرۆڤە.. پادێ بۆچی ترسین..؟ چاوان..؟ ژ دایک و بابان ..؟ ئاهـ.. ئەڤە ددەمێ خوەدابوو هێژ ئەز یێ بچویک بووم... تشتەکێ ئاسایی یە بچویک ژ دایک و بابێن خوە دترسیت... هەتا چەند سالەکان؟

مرۆڤ ل بەر چاڤێن دایک و بابێن خوە چەندیێ مەزن بیت هێژیێ بچویکە.. هەتا ئەز گەهشتیمە ٤٦ سالێن ئەز ژی بێ هوسان بووم.. بەلێ پشتی هنگی ئەو مرن.. خودێ رەحمێ ب وان دا ببەت.. نەء ئەواتە گوتی راست نینە، ئەز ژوان ناترسم.. ب باوەریڤە ئەز ڤێ چەندێ دبێژم .. چنکو ئەو یێن مرین..

بەلێ ئەزبەنی..؟ ئەز ژ مریان دترسم ...؟ هێ ... هێ .. ئەڤە نەتشتەکێ بەر عەقلە مری مرۆڤی بترسین...!! ئەرێ مائەڤ ترسە بۆچ یە..؟ دێ مری چ ل مرۆڤی کەن ..؟ مانە بەسی وی یە ئەو یێ مری..؟ کورت و کرمانجی ئەز نزانم ترس چ یە... دبیت ئەڤەوەسان بایەهەکە ئەو نە مربا.. بەلێ پشتی کو مری و بوویە گیانەکێ رەق و هشک .. ئەو نەشێت کەسەکی بترسینیت .. چاوان...؟ دەمێ خالەتا من مری ..؟ ئاخ تو نزانی چ شەڤەکارەش بوو، ژبلی من کەسەک ل مال نەبوو ... نیڤاشەڤێ من گوهـ ل دەنگێ وێ بوو، ئەز بەزیمە ژووراوێ... بەلێ ... روح تێدانەمابوو.. مادوی دەمیرا دا چ ژ دەستێن من دهێت ..؟ ئەز وێ شەڤێ چوومە ئوتێلێ.. بەلێ نە ژ ترسادا چاوان ..؟ ئەز ژوی کورێ هەڤسویێن مالا مەدترسم ...؟؟ نەء ... قەت ئەڤە وە نینە ... ئەز چ جاران ژوی نەترسیایمە... بەلێ وەکی مەزنان گوتی خوە ژ بەلا بدەپاش ... دێ د پەنجەرێدا بەرێ خوە دەمە کولانێ هەکە ئەو ل وێرێ ببیت ئەز ژمال دەرناکەڤم.. دەمێ ئەو ل وارانە بیت دێ د کولانێ راچم!!..

هەوە چ گوت... ژ مامۆستایێن خوە...؟ نەء .. قەت ئەڤە وە نینە .. ئەز چ جاران ژ مامۆستایێن خوە نەترسیایمە.. ئەوا تو دبێژیێ ترسن نیشانا هەستا منە بەرامبەر مامۆستایێن من و قەدرو رێزگرتنە ئەز بۆ وان دگرم.. بینە بەرچاڤێن خوە دەمێ ئەو من دقوتن ژی ئەز رێزێ ل وان دگرم... چاوان ژ ترسادا ئەز ژبەر سەیدایێ دیرۆکێ رەڤیم دەمێ ئەز قوتایم ...؟؟ .. نەء ئەز ژ ترسێن وی دا نارەڤم... بەلێ ئەڤە ژبەر هندێ یە ئەز رێزێ ل وی دگرم... ئەڤە چ ئاخڤتنێن بێ سەروبەرن تو دبێژی ...؟؟ ئەرێ عەقل باوەر دکەت مرۆڤ ژ مامۆستایێ خوە بترسیت.؟؟ هەوە چ گوت ئەز ژ تاقیکرنان دترسم..؟ تە باوەری هەبیت ئەڤە د بنیاتداوە نینە... دەمێ ئەز دچمە د هۆلا تاقیکرناندا ئەز ڤە لەرزم.. بەلێ نە ژ ترساندا ... بەلکی ژ ئەنجامێ ئالوزیێ یە... چاوان..؟ ل بەر دەرێ هۆلا تاقیکرنان من میزتیە ب خوەڤە ..؟!! ئەڤە چ د رەوا ب شاخە..؟؟ ئەڤە ئەنجامێ ئالوزیانێ بوو... ئەڤە دشێ ب سەرێ هەرکەسەکی هێت دەمێ ب خوەرا نەگەهیت و نەگەهیتە

سەر ناڤێ .... بەلێ ئەزبەنی .. ئەز ژ سەرنەکەفتنێ ژی ناترسم.. دێژ دەرنەچوونێ د تاقیکرنێدا ترسم..؟؟ چاڤێ خودێ لێ بیت درەوین چەند د مشەنە.. هەکە ڤێ جارێ ژی.. دەرنەچووم.. مادەم ئەز یێ ساخم و ئەز نەمریە دەلیڤێن دەرچوونێ یێن ل بەرمن هەین.. مانە وەسایە؟ بەلێ.. ئەز ژ ژنکا خوە د ترسم..کێ ئەڤ درەوە کریە؟ دێ هەوە ب خودێ سوێندەم کەسەک هەیە، هەر زەلامەکێ بێت ژ ژنکاخوە بترسیت؟ ... کێ دبێژیت ئەڤە ترسە..؟؟دا سەر ئێشان نەکەڤیتە د مالا مرۆڤیدا و تەناهی د مالێدا هەبیت و دەرو جیران بە نەکەنەکەنی و زارۆکێن مرۆڤی بێ خودان نەبن و پەروەردا وان تێک نەچیت، دڤێت ب ئەزمانێ خوش دگەل وێ باخڤی ... یێ نەرم و حەلیم بی... هەکە وەسا د نەبیت دێ بوچی ژ ژنکا خوە ترسم ... د هەمی ژیێ خوەدا ئەز ژ کەسێ نەترسیایە هەتا ژ ژنکێ بترسم ... ها .. ها... ها.

چاوان... دەمێ ئەز سەرباز..؟ ئێ چ دی؟ ئەز ژ سەردەستەی دترسیام ..؟ ئەز ژ فەرماندێ بەتالیونێ ب هەمی مەزناتی و وشیانێن وی ڤە نەترسیایە هەتا ژ سەر دەستەی بترسم، عەزیزێ من دەمێ ئەز جلکێن سەربازیێ دکەمە بەرخو ئەز ژ کەسەکی ناترسم چنکو ئەزێ خزمەتا وەلاتی دکەم... مانێ ئەو ژی وەکی من و تە مرۆڤە، پادێ بوچی ژێ ترسم..؟؟ چاوان ..؟ دەمێ فەرماندێ بەتالیونێ زلەهەک لمن دای...؟ نەء ... ئەڤە تشتەکێ دی یە.. ئەو فەرماندێ بەتالیونێ یەو هەی و نەیێن د دەستێن وی دا... ئەو بریارێ ددەت ... ئەو خەلکەکی د قوتیت... هەر ئەوژی خەلکەکێ خەلات دکەت... ئەڤە کارێ وی یەو نابیت کەسەک مایێ خوە تێ بکەت.. دگەل ڤێ چەندێ ژی ئەز ژوی ناترسم.

ب درێژیا ژیێ خوە ئەز ژ کەسێ نەترسیایە و ناترسم ژی... تو بخودێ کەی .. تو چ دبێژی .. ب بچویکی، ئەز نەترسیایە..چنکو نەکو تشتەک رویبدەت من خوە ژبەر چاڤان بەرزە دکر.

ژ تاریێ..؟ ماتاری ژی خەلکەکی د ترسینیت...؟ چ جودا دناڤبەرا تاری و رۆناهیێ دا هەیە..؟ هەردوو وەکی ئێکن ... ئەز ژ هاتن و چوونا رەخ گورستانان ب شەڤێ ناترسم... چنکو دبیناتدا ئەز دوێرێ راناچم... من چ شول ب گورستانان هەیە هەتا دوێرێ رابچم.. تەراستی دڤێت ب رۆژێ ژی ئەز دوێرێ راناچم هەتا ب شەڤێ تێرا بچم.

چاوان ...؟ بخودێ کە مە ئەز ب شەڤێ نەفیتکا لێ ددەم و نە ژی ستران دبێژم.... بەلێ ئەڤە راستە .. بەلێ نە ژترسادا یە .. بەلکی ئەز بخوە ب رۆژێ ستران دبێژم و فیتکا ڤەددەم ... ئەڤە عەدەتێ منە.. ها.. بەلێ ئەز بخوە و دگەل خو و بۆ خو ڤێ چەندێ دکەم... کەسێ ژی گوهـ لمن نینە... تە چ گوت ئەز ژ خەونان دترسم ...؟ چاوان ... ئەڤە چ بێ بەختیە..؟ ئەو ڤێرێن دەمێ ئەزێ نڤستی رادهێلم نە ژ ترساندانە ... دەمێ ئەزێ نڤست ئەز دکە مە ڤێری چنکو دەمێ ئەزێ هشیار ناکە مە ڤێری..

چاوان ...؟ ئەز ژ پولیس و نوبەداروێن وەکی وان دترسم....؟ ئەز ژ خزمە تچیێن ئوتێلان و شوفێرێن ترومبێلان دترسم....؟!! کێ ئەڤ هەمی بێ بەختیە ب من ڤەنایە...؟ هەما دبیناتدا جهێ پولیس و مولیس و زیندان و میندان لێ هەبن ئەز دوێرێ رانابوورم... شورتە و مورتە چ نەهەتا ئەز ژێ بترسم ... ئەڤ هەمی ناخفتن و گوت گوتکەتنێ درەو و بوختانن ... نەخوش و شێتان ئەڤە یامای هەوە ب من ڤەنەکری... خودێ شاهد بیت ئەڤە درەوە... چ...؟ ئەز نەوێرم بچمە ناڤ نڤینکێن خوە دانێزیکی ژنکا خوە نەبم...؟ ئەز ناچمە ناڤ نڤینێن خوە ژ ترسادا ...؟ نەء .. بەلێ ئەڤە ژ بەر هندێ یە چنکو دەمێ ئەز ژکاری دزڤر مەڤە ئەزێ ماندی مە... ئێ چ دی..؟ ژبەر بەژنکورتیێ ئەز ژ ژنان دترسم....؟ گەلی عەبدێن خودێ ئەڤە چ بێ بەختینە...؟ کێ یە ڤان هەمی درەوان دیڤ مەڤە دنیت ...؟ ئەڤ هەمی گوت گوتکە درەون .. دەرون.

چاوان ...؟ ئەز نەوێرم ب تنێ بمینمە د ژوورڤە...؟ دەمێ دیوان دشاریێت ئەز دترسم ...؟ ئەز نەوێرم شەڤێ ب مینمە ل دەر ڤە...؟ ئەز ژ هەڤالێن خوەیێن شولی دترسم...؟؟ چ دی.. ئەز ژ رێڤەبەرێن خوە دترسم...؟ ئەز ژ مرنێ د ئەنجامێ رویدانێن ترومبێلان دترسم..؟ دێ تا بێژن ئەز ژ چ دی دترسم..؟ دێ ... چ دی مایە هەوە نەگوتی ...؟؟

نەء سەیدایێ من نەء... ئەز ناترسم ... چ جاران ژی

ئەز نە ترسـيـامـە... دێ چاوان ترسم من ناڤێ كـورێ خوەيێ مەزن يێ كريە قارەمان ... يێ بچووک ژی من يێ كـريە هۆڤ.... ئەز ژنە سـاخـيـێ دترسم..؟ چ پێنەڤـێت قەت ئەڤە وەسان نينە... قەت ئەز د خەمانە ساخبوو نێدا نەبوويمە ... بۆچی؟ تەگـوت بۆچی؟ ئاه من ژبيـركر تە چ گـوت، ئەڤـە دەمـەكێ درێژە ئەزێ هوسـامـە... دەمێ ڤـان رەنگە پرسياران ژ من دكەن ئەز ژبيردكەم .. نەء.. نە ئەز ژنە خەساخيێ دترسم و نەژ د خەما مرنێدامە..

مـا فـەيلەسوفی نەگـوتيـە «ئەم چاوانيـا مـرنێ ترانين چنكو ئەم دزيندينە، دەمێ ئەم دمـرين ژی ئەم چاوانيـا مـرنێ نزانين..» ڤـێـجـا دێ بۆچی ژ مـرنێ ترسين..؟ رەحمەت ل گۆڕاوی تنێ وێ راستی يا گوتی.

چاوان ئەز ژ سـوبەهی دترسم..؟ مـەرەمـاتە ب ڤێ چەندێ چيـە..؟ سوبەهی چوار شـەمـبـە.. نە ئەز ژ چوار شـەمـبێ دترسم و نەژی ژ پێنج شـەمـبێ.. ژ سـوبەهيـا خوە...؟ ئاه ... تەدڤـێت بێژی دێ مينمەبێ شول ... خـودێ د زانيت .. پادێ بوچی ژ سـوبەهی ترسم.. هەتا سوبەهی خودێ كـەريە.. بەلێ ئەز دترسم نەكـو مـەرەمـا هەوە ئەوبيت ئاخفتنێ ژ من چێكەن.

ئەز ژ تشتێ قەدەغە دترسم..؟ نەء .. هەمی قەدەغە بۆ بەرژەوەنديا مەيێن هاتينە دانان ... مالا مـەزنێن مـە ئاڤا بيت هندە خەمخۆرێن مەنە، ژبۆ خێرامە نەڤ بريارە يێن داين.. نە ئەز پشت گـوهڤـەدهاڤـێـژم و نە ژی زێدەگـاڤـيێ ل سـەر دكـەم.. پا بوچی دێ ژێ ترسم...؟ هندی ئەز ل مـال ب بەردەوامی دبێـژم و دبێـژمـەڤـە ... «خودێ خێـركەت» ، «ب هيـڤـيـا خودێ دێ چێـبيت» ، «سوپاس بۆ خودێ ئەم گەهشتينە ڤێ رۆژێ» ..

ژبەر هندێ ئەم نە ژ بروبسيا دترسين و نەژی ژ عەوران ... ئەرێ عـەقل باوەر دكـەت..؟ مـا ئەڤ دياروكـێن سـروشت ژی مـرۆڤ ژێ دترسـيـت..؟ برايێ من ئەز ناترسم... باش بزانە هەكە ئێک ژوان د خا فلەتدا بێتە بەرچاڤێن من ئەز ناترسم..

تە چ گـوت...؟ ئەز ژ هندێ دترسم ئێک ژوان من ببينيت دەمێ ئەز تبلا خوە دكەمە ددفنا خوەدا... ئاخ و جارەكا دی ئاخ... نەڤ پريێژە چەند د مشـەنە. دەمێ بۆ شـەهدە يێن گـازی من دكـەن ئەز دترسم..؟ ئەڤـەكێ گوتيـە..؟ هەماژبن وە نينە .. نە من چ جاران شاهدەيی دايە.. نە كـەسێ ژی چ جاران بۆ شاهدەدانێ دهەمی ژێ من دا ئەز گازی كريە .. هەمی دەمان دەمێ پرسيار ژمن دكەن ب ئەز نزانم... من نەديتی يە ئەز بەرسڤێ ددەم..

دەمێ دەرگـەهی دقـوتن ئەز ژ هندێ دترسم نەكـو مێڤانەكێ نەخوشتڤی بيت...؟ ئەرێ ب ڤێ رەنگی ...؟ دێ بێژە ... دێ ئەز ژنامەو نڤيسـارێن رەسمی دترسم..؟ ژ وەرگـرتنا داخـازنامـێن دادگەهان..؟ يان ژ ڤـەكـولينان ئەرێ ئەز ژ ڤی تشـتی ويێ هەدترسم؟ چونكو تكتا داخاز نامێ بۆ دانا قـەرزێن بانكێ يە..؟ ئەزبۆتە سـويند دخـوم ئەڤە درەوە، درەوەكا سورو سور.

ئەز ژ ئيمزا كرنێ دترسم..؟ نەء خوشتڤيێ من ئەز وی تشت ناخوم يێ زكێ من لێ بكەتە ئێش.. هندەک دبێژن ئەز ژ ئيمزاكرنا ليستا مووچەی دترسم دەمێ ئەز وەردگرم ... نەء عەزيزێ من نەء ... ئەڤە هەمی درەوو بوختانن.

تە دڤێت بێژی ئەز ژ پێزانين و ياسايان دترسم... ئەز خـوە ژ تە لە فـونێ ددەمـە پاش ...؟ چاوان ... كی زێرەڤـانە..؟ هەما بلا زێرەڤـانيێ بكەت... مـا من چ ژێ يە..؟

هەما د بنياتدا ئەز وەسان نا ئاخڤم ترسەک ژێ هەبيت ... گاڤا من هەست پێكرنێكی گوهدارێ ل ئاخفتنێن مە دكـەت دەملدەست ئەز تەلەفونێ دادنم ... نەكو بێـژيەڤێ ژی ترس...!؟

چاوان ... ئەز ژ بولبلێ دناڤ قـەفە سێدادترسم...؟ ئەڤـە چ بێ وێژدانيـە..؟ ئەز ژ قـافكاو گـولدانكان دترسم...؟ ژ دوگما كە هربێ..؟ نەء .. نەء.. دكتور ئەز ناترسم ب ڤێ چەندێ تو من ناترسێن .. چاوان.. دكـتـور...؟ من گـوتە تە ئەز ژ كـەسێ ناترسم ... بەلێ دكتور تنێ ئەز ژ خوە بخوە دترسم ،.. ژخوە بخوە .. نەء ئەز ناترسم ... و بۆچی دێ ترسم..؟

بەلێ دكتور سەهما ترسێ ددلێ مرۆڤيدا ناڤەمريت... ما نەوەيە..؟

بەلێ ئەز ژ هندێ دترسم نەكو تەبڤێت و رڤان پرسيارو بگرو ڤەكێشان ئاخفتنێ ژمن چێكەی ....!!

**ژێدەر**

عزيزنسين، يسلم الوطن، وەرگێرانی ژ توركی: جمال دورمش.

# کۆمیدیای هەڵەکان

## ولیەم شکسپیر

و- لە ئینگلیزییەوە: فوئاد یونس مەلا

**کەسایەتیەکان**

**- ئەنتیفۆڵس**
**- ئەنتیفۆڵس دووبرای جمکن**
**- درومیۆ دووبرای جمکن هەریەکیشیان هاوڕێیە**
**- درۆمیۆ لەگەڵ (ئەنتیفۆڵس)ەکان**
**-ئاگیۆن باوکی(ئەنتیفۆڵس)ەکان**
**- ئەمیلیا دایکی (ئەنتیفۆڵس)ەکان**
**- ئەنگیلۆ دوو هاوڕێن**
**- بەلتەزار**

**شوێنەکان:-**

**ئەفسۆس، سیراکیوس، ئێپیدامیۆم، پۆرپێنتین**
**ڕووداوەکان لەشاری (ئەفسۆس)ن**

ئەفسۆس وسیراکیۆس دووشاری گەورەی بازرگانین بەردەوام لە ناخۆشی و ململانێی یەکتریدان. دۆقی شاری ئەفسۆس یاسایەکی دەرهێنا کە هەرکەسێک خەڵکی سیراکیۆس بێت و لەشاری ئەفسۆس ببینرێت، ئەوا پێویستە لەسەری پارەیەکی دیاریکراو بدات بەدادگا بۆ رزگارکردنی و کڕینەوەی گیانی خۆی و مانەوەی لەم شارە.

ئاکیۆن بازرگانێکی(سیراکیۆس)یە، ئێستا کەوتۆتە ژێر باڵی ئەم یاسایەو پارەیەکی وای لەبەردەستدانییە بیبەخشێت، بۆئەوەی گیانی خۆی لەمردن رزگاربکات، بەڵام لە رابردوودا ژیانێکی واناخۆشی بەسەردا هاتووە کە هەمیشە خۆزگەی مردنی بۆ ئەم ژیانە ددخواست.

دۆقی ئەم شارە سەردانێکی ئاگیونی کرد لە بەندیخانەکەی پێی وت: کەوا هیچ توانایەکی بۆ رزگارکردنی لەبەردەستدانییە، تەنها لە چەسپاندنی یاساکە نەبێت، لێیپرسی، چی وای لێکردی شاری سیراکیۆس جێبێڵی و رووبکەیتە ئەم شارە؟ لەکاتی وڵامدانەوەیدا، ئاکیۆن چیرۆکێکی درێژو خەماوی بۆ دۆقی گێڕایەوە.

من لەسیراکیۆس لەدایک بوومەو گەورەبوومەو هەر لەوێش ژنم هێناوە، جارجار گەشتی دەریاییم دەکرد بۆ ئێپیدامیۆم، بەم شێوەیە ماوەیەکی درێژ بەردەوام بووم و سامانێکی زۆرم لەم رێگایەدا کۆکردەوە، بەڵام بازرگانیەکەم زۆرجار لەماڵ و خێزانەکەم دووری دەخستمەوە. رۆژێکیان یەکێک لە گەشتەکانم زۆر دواکەوتم، بۆ چەندین رۆژ بۆماڵەوە نەگەڕامەوە. خێزانەکەشم بەدواکەوتنی من زۆر دڵتەنگ بوو، بۆیە بڕیاریدا بەشوێنم دابێت بۆ ئێپیدامیۆم. لەوکاتەشدا سکی پڕبوو چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرا منداڵی ببێت.

هەرچۆنێک بێت توانی بۆ ماوەیەکی کەم بگاتە لام، دەست بەجێ جمکێکی کوڕی کتومت وەک یەکی بوو، کەهەرگیز نەتدەتوانی بەئاسانی لێکیان جوداکەیتەوە.

ئەوەی جێی سەرسوڕمانە لێرە ئەوەیە، ژنێکی هەژاری داماو، لەهەمان لەو میوانخانەیەی کە ئێمەی تیا جێگیربووین، لەهەمان کاتوساتدا منداڵی بوو، ئەویش جمکێکی کوڕی کتومت وەک یەکی بوو، بەڵام ژنەکە هیچ رێگایەکی بەخێوکردنی ئەم منداڵانەی نەبوو، زۆر بێهۆش و دڵتەنگ بوو بە بوونیان، بۆیە هەردوو کوڕە جمکەکەییم لێ کڕییەوەو بەخێوم کردن بۆ ئەوەی ببنە هاوڕێی کوڕەکانم و لەهەمان کاتیشدا وەک خزمەتکارێک بەردەوام لەگەڵ یەکدابن؛

دوای مانەوەیەکی زۆر لە ئێپیدامیۆم، خێزانەکەم هەستی بە بێزاربوونێک دەکرد زۆریش بە پەرۆش بوو بۆ گەڕانەوە. ناچار خۆمان ئامادەکرد لە رێگای دەریاوە بگەڕێینەوە. لەکەناری دەریاکە زۆر دوورنەکەوتبووینەوە لەوکاتەی گەردەلوولەیەکی ئاوی بەهێز لەنێو دەریاکە هەڵی کرد، بایەکی زۆر بەهێزو بەتین دەهات، هەروەها شەپۆلە ئاوییەکانیش بەرزونزم دەبوونەوە لەگەڵ خۆیاندا هەڕەشەیان لە نقووم بوونی کەشتییەکە دەکرد، ترس و دڵەڕاوکێیەکی لە رادەبەدەر بەسەرماندا زاڵ ببوو، مەرگی خۆمان بەئاشکرا دەبینی. دەرباوانەکان تاکە بەلەمی بچووک و رزگارکەرەکەیان هێنایە خواردوە ئێمەیان

بەتەنها بەبێ هیچ یارمەتی دەرێک لەسەر کەشتییەکە بەجێهێشت. خێزانەکەم خۆیی و یەکێک لە کوڕەکانم و هاوڕێکەی، بەیەکێک لەدارئالاکان باش قایم کردن و منیش کوڕەکەی دیکەم و هاوڕێکەی بەدارئالاکەی دیکەوە خۆمان تێدا سوراندبوو؛

کاتێک گەردەلولەکە هێمن بۆوە. لەدوورەوە روناکییەک بەرەو لامان دەهات، لەکاتی نزیکبوونەوەی روناکییەکە بینیمان دوو بەلەمە بۆ پێشبڕکێ لەکەنارە دوورەکانەوە بەرەو روومان دێن. پێش ئەوەی ئەوان بگەنە ئێمە کەشتییەکەمان خۆی بە کۆمەڵە بەردێکی دەرهاتووی نێو دەریاکە داداو بووبەدوو پارچەو تێکشکا. یەکێک لەدوو بەلەمەکە بەخێراییەکی زۆر زوو گەیشتە سەر خێزانەکەم و دوو کوڕەکەی لە نقووم بوون رزگار کرد گواستیانەوە بۆ کەناری دەریا، بەڵەمەکەی دیکە زۆر لەسەرخۆ رێی دەکرد گەیشتە لای ئێمەو هەڵیگرتین لەسیراکیۆس دایبەزاندین. لەوڕۆژەوە چاوم نەبەخێزانەکەم و نەکوڕەکەم و هاوڕێیەکەی نەکەوتۆتەوە.،،، ئاکیۆن بۆ چەند ساتێک بێدەنگی نواند لەگێڕانەوەی چیرۆکە خەمۆکییەکەی، نەیتوانی چیتر بەرگەی ناخۆشییەکان بگرێت:

ئەوکاتەی کوڕەکەم (ئەنتیفۆلس) تەمەنی هەر هەژدە ساڵان دەبوو، سوێندی خوارد کەدەبێ دایکی و برا جمکەکەی و هاوڕێکەی بدۆزێتەوە. سوریش بوو لەسەر بەدوا گەڕانیان. بۆیە ناچابووم رێگا بەهەردووکیان(ئەنتیفۆلس و درۆمیۆی هاوڕێی) بدەم، بۆئەوەی بچن بەدوای براکانی خۆیاندا بگەڕێن، سوێندوبەڵێنەکەی خۆیان بگەیەننەجێ، هەرچەندە زۆر لەوە دەترسام کە ئەوانیش لەدەست بدەم، بەڵام نەمدەتوانی رێگایان لێبگرم؛

هەربەخۆم ئەم پێنج ساڵەی رابردوو زۆربەی سنورەکانی ئاسیا بەدوای خێزانەکەمدا گەڕام، بەڵام بێ سوود بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کوڕەکەی دیکەو هاوڕێکەیشم لێ جیابوونەوە. لەکۆتاییدا هاتوومەتە ئەفسۆس، کەچی لێرەش مردن واچاوەڕێمە؛

دۆق وتی:

خۆزگە بمتوانیایە یاساکە بشکێنم کە تۆی بەمردن سزا دەدا. تۆ ژیانێکی پڕ لە کارەساتت بەڕێ کردووە، بەڵام هەرچۆنێک بێت ناتوانم ئەم کارە بکەم. ئەوەی دەتوانم تەنها ئەوەیە بۆ ماوەی رۆژێک ئازادت بکەم بۆئەوەی بتوانیت هەندێ پارە لەلای ئەو هاوڕێیانەت بەقەرز وەربگریت کە لەم شارە دەیانناسیت، بۆ کڕینەوەی ئازادی و گیانی خۆت؛

لەم کاتەدا دوو لە میوانەکانی ئەم شارە(شاری ئەفسۆس) کەوتبوونە نێو مشتومڕێکەوە لە یەکێک لە گۆڕەپانەکانی نێو بازاڕدا. بازرگانێک، کە لەگەڵ ئەم دووانەدا بوو، ئامۆژگارییان دەکرد کە باشترە داواکانیان لە ئێپیدامیۆم بکەن لەوەی لە سیراکیۆس. بەردەوام بوو لەقسەکردن وتی: گوایە بازرگانێکی سیراکیۆس خەریکە راپێچی مردنی دەکەن بەوەی کە ناتوانێ ئەم بڕەپارەیە بدات بۆئەوەی خۆی ئازاد بکات.

ئەم دوو میوانەش ئەنتیفۆلس و درۆمیۆیێکی دیکەبوون کە لەسیراکیۆسەوە بەسەردان هاتبوونە ئەم شارە(جیا لەو ئەنتیفۆلس و درۆمیۆییەی لە منداڵییەوە کە لەشاری ئەفۆسەوە نیشتە جێ بووینە) ئەنتیفۆلس هاوڕێیەکەی خۆی نارد بۆ ئەم مێوانخانەیەی کە تیایدا جێگیربوون ئەوە هەندێ پارەشی دایەدەستی و پێی وت: بڕۆ، منیش دوای کەمێکی دیکە کاتی نان خواردن پەیوەندی بەتۆو بازرگانەکە دەکەم لەهەمان شوێن. ئەنتیفۆلس بەتەنها مایەوە، نیازی هەبوو هەندێ لە دیمەنەکانی ئەم شارە ببینێ، لەهەمان کاتیشدا هەرگیز ئەوەی لەبیرنەدەکرد کە ئەو بەدوای دایک و براکەیدا دەگەڕێت، بەڵام زۆر بێهومێد ببوو لە دۆزینەوەیان. لەم کاتەدا درۆمیۆی ئەفسۆس بەدیار دەکەوێت کە ئەم دووبرایە لە رووخساردا زۆر بەیەکتر دەچن. ئەنتیفۆلس هەڵە دەکات لەگەڵ درۆمیۆی هاوڕێ خۆی. هەروەها درۆمیۆش هەڵە دەکات لە ئەنتیفۆلس سیراکیۆس، وادەزانێ ئەمە ئەنتیفۆلسی ئەفسۆسە گەورەکەی خۆیەتی.

ئەنتیفۆلس لێی دەپرسێ

ها! بۆچی وازوو گەڕایتەوە؟

درۆمیۆی ئەفسۆس(بالێرە بەدواوە ئەم درۆمیۆیە بە درۆمیۆی(A) بانگ بکەین)

- درۆمۆ(A)=(A) یەکەم پیتی ناوی ئەفسۆسە، چونکە ئەم درۆمیۆیە دانیشتووی شاری ئەفسۆسە بۆئەوەی لەگەڵ درۆمیۆکەی دیکەی شاری سیراکیۆس جودا بکەینەوە وەڵامی دایەوە.

زووگەڕاییەوە!؟ گەورەم دەترسم زۆر درەنگم بەسەر هاتبێ، خواردنەکەت واخەریکە سارد دەبێتەوە، خانمەکەم لە بێزاری خۆیەوە ئازاریدام بەهۆی دواکەوتنی تۆوە.

ئەنتیفۆلسس سیراکیۆس(با لێرە بەدواوە ئەم ئەنتیفۆلسە بە ئەنتیفۆلس(S) بانگ بکەین)، بەسەرسوڕمانەوە وتی:

ئەوە لە بارەی چییەوە قسە دەکەی؟ کوا چیت لەو

پارانەکرد کە بەتۆمدابوو؟

پارە؟ پارەی چی؟

باش دەزانی لەگەڵ کام پارەمە. ئێستا کاتی گاڵتەکردن نییە.

درۆمیۆ (A) نکولی دەکرد، من هیچ دەربارەی ئەم پارەیە نازانم کەتۆ دەیڵێی گەورەم. تەنها ئەمەی دەیزانم، منیان ناردۆتە بازاڕ بۆئەوەی تۆ بانگ بکەمە ماڵەوە بۆ نان خواردن، خانمەکەم و خوشکەکەی تا ئەوکاتەی هاتوومەتە ئێرە هەر لەچاوەڕوانیت دابوون؛

ئەنتیفۆلس(S) ئێستاکە تەواو لە تووڕەبووندایە هاواری کرد.

ئەنتیفۆلس(S)=(S) یەکەم پیتی ناوی سیراکیۆسە، چونکە ئەم ئەنتیفۆلسە دانیشتووی شاری سیراکیۆسە بۆئەوەی لەگەڵ ئەنتیفۆلسی شاری ئەمستوس جوویێ بکەینەوە.

خانمی چی؟ ئەم خانمە کێیە تۆ باسی دەکەی؟ من دەمەوێ بزانم چیت لەپارەکان کردووە؟

خانمی چی! بۆ تۆ بەکێی تێدەگەی؟ مەبەستم خێزانەکەی تۆیە ئەدریانا،

کەئێستا لەماڵ چاوەڕێی گەڕانەوەتە،

ئەنتیفۆلس نەیتوانی چیتر بەرامبەر ئەم هەموو قسە بێ سەروبەرانە بوەستێ. بەخۆیشی جارجار حەزی بەگاڵتە دەکرد لەگەڵ درۆمیۆ، بەڵام نەک بەم شێوە بێ ڕێزییەوە. دەستی لە خزمەتکارەکە بەرزکردەوە بەمەبەستی لێدانی، بەڵام درۆمیۆ(A) بەرلەوەی بهێڵێ هیچ زیانێکی پێبگات لەبەردەستی رایکرد. درۆجۆ (A)ی خەمباری گەڕایەوە ماڵەوە، چاوی بەخێزانە گەورەکەی ئەدریاناو خوشکەکەی لۆشیانا کەوت، کە لەچاوەڕوانیدا زۆر بێزار ببوون، لەم کات ئەدریانا هیچ وشەیەکی باشی بۆ وتن نەبوو دەربارەی پیاوان، لەبەر ئەم کارانەی کە بەرامبەر بە ئافرەتەوە دەیانکەن تەنها بەمەبەستی بێزاری و تۆڕەبوونیانە دەیانکەن. خوشکەکەشی ئاگادار کردەوە لە فێڵ و تەڵەکەی پیاوان. پێی وت دژی شووکردن بە بەمجۆرە پیاوانە.

کاتێک درۆمیۆ (A) هاتە ژورەوە ئەدریانا لێی پرسی، کوا گەورەکەت؟ درۆمیۆ وەڵامی دایەوە:

بەداخەوە، خانمەکەم- گەورەکەم شێت بووە، پێم وت، کە خانمەکەم لەماڵەوە چاوەڕێت دەکات بۆئەوەی بگەڕێیتەوە بۆ نانخواردن.

لێی پرسیم. خانمی چی؟ کوا چیت لەپارەکان کردووە کە بەتۆم دابوو؟و هەندێ قسەی تر کە تا ئەوکات لەزاری ئەوم گوێ لێ نەببو. زۆر هەوڵمدا رازی بکەم لەگەڵ خۆمی بهێنمەوە؛ بەڵام ئەو هەر سووربوو لەسەر داواکردنی پارەکانی و تەنانەت بەرەو رووشم هات لێم بدات،

چی؟ نەگەڕاوەتەوە؟ من ئەو قسانە نازانم، ئێستا نەگەڕێتەوە لای و لەگەڵ خۆت نەهێنیەوە ماڵەوە، من یەکەم کەس دەبم بۆ لێدانت؛ هەر ئەوکات ئەدریانا دەستی بەرز کردەوە لە درۆمیۆ(A) بدات، بەڵام درۆمیۆ خێراتر لەبەردەستی هەڵات.

ئەدریانا لە خوشکەکەی لۆشیانای پرسی، ئایا بۆچی ناگەڕێتەوە ماڵێ؟ دەبێ لەمن بێزار بوبێت؟ دەبێ هیچ ژنێکی دیکە لەمن جوانترو لاوتر هەبێت؟

ئەگەر نیگەرانی و گومان کردنەکەی ئەدریانا تەنها لە مێردەکەی بێت، ئەوا نیگەرانی و گومانییەکەی ئەنتیفۆلس تەنها لە پارەکاندایە. ئێستا ئەنتیفۆلس(S) لە نزیک میوانخانەکەدا دانیشتووە. بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن خزمەتکارەکەی پارەکەی هەمووی بۆخۆی خەرج کردووە، نکۆڵیشی لێدەکات. بەڵام ئەوەی کە هێشتا سەری لێ دەرناچێ ئەوەیە، بۆچی درۆمیۆ وا بەمشێوەیە لەگفتۆگۆیەکەیاندا قسەی دەکرد، لەوکاتەی ئەنتیفۆلس(S) لەبیرکردنەوەو لێکدانەوەدابوو درۆمیۆ(S)ی هاوڕێی بەدیارکەوتەوە. ئەنتیفۆلس(S) لەدەرەوەی میوانخانەکە بانگی کرد، درۆمیۆ! هاتووی دیسان پێم بڵێی خواردنەکە ئامادەیەو خێزانەکەشم چاوەڕێمە؟ یان هاتووی گاڵتەی ترم پێبکەی؟

– کەی من ئەو قسانەم کردووە گەورەم؟

* هەرتازە پانزە خولەک پێش ئێستا، تۆ نەتووت خانمەکەم رەوانەی ئێرەی کردووم.

– بەڵام تۆ لەوەتەی رەوانەی میوانخانەکەت کردوومە لەگەڵ پارەکە تۆم نەدیتیتەوە!

*ئەوە چیت بەسەرهاتووە. ئاگات لەخۆیە چ دەڵێی؟ یاخود دەتەوەێ بۆ جاری دووەم ناچارم بکەی لێت بدەم- جارێک لەبەر گاڵتەکانت ئەمجارەشیان لەبەر نکۆڵی کردنت. درۆمیۆ پێویستە بزانیت کەی کاتی گاڵتەو پێکەنینەو کەی کاتی نییە.

لێم بدە بەهەموو توانایەکت، ئەگەر تۆم بێزارکرد، بەڵام لەم قسەو تۆمەتیانەت لێم خۆشبە، کاتێک کە هەموو داواکانتم ئەنجامداوە کە پێت راسپاردبووم. هەردوو پیاوەکە(میوانەکە) بەچاوێکی تێبینی کردنەوە دیقەتی یەکدییان دەکردوو سەریان لێ شێوابوو، بەڵام ئەوکاتە شێواو سەرسامتر بوون کە ئەدریاناو لۆشیانا بەخێرایی

هاتنە نێو گۆڕەپانەکە، کاتێک ئەدریانا چاوی بە ئەنتیفۆلس(S) کەوت (بەهەڵەمانان وایزانی مێردی خۆیەتی) بەدەنگێکی بەرز کردی بەهات و هاوار پێش ئەوەی بگاتە لایان، لێی پرسی: بۆچی وا سەیرم دەکەی؟ لەبیرت کردووە من کێم؟ ئایا هیچ ژنێکی دیکە هەیە بێجگە لەمن لەژیاندا؟ باش دەزانی کە تۆ تاکە پیاوێکی لەژیاندا تاکو ئێستا خۆشم ویستبێت. مەمخەرە گومانەوە. خۆت باش دەزانی خەمبارو خەمگین دەبی ئەگەر من بۆ پیاوێکی تر بەجێت بهێڵم. بێنە بەرچاوت وا هەست دەکەم تۆ ئێستا خیانەت لەگەڵ مندا دەکەیت و حەز بەکەسێکی دیکە دەکەی؟ ئەنتیفۆلس وەڵامی دایەوە.

ببورە خاتوون، نازانم ئەوە لەبارەی چییەوە قسە دەکەی، منی چی و تۆی چی و گومان!- بەجێهێشتن!- خۆشەویستی-! ئەوە تۆ دەڵێی چی. من کەی باسی ئەوشتانەم کردووە. من هەرگیز چاوم بە ئەفسوس نەکەوتووە تەنها ئەم ١٠دە سەعاتە نەبێت کەتێیداین، ئەم شارە وەک قسەکانی تۆ بەلامەوە- نامۆو غەریبە؛

لۆشیانا هاتە نێو گفتۆگۆ(مشتومڕەکە) وتی:

مەبەستت چییە لەقسەکانی خوشکەکەم، پێتوایە راست نین؟ زۆرباش دەزانی کە ئەدریانای خوشکم درۆمیۆی بەشوێن تۆدا نارد بۆئەوەی بگەڕێتەوەماڵەوە بۆ نان خواردن؛

ئەنتیفۆلس:

ئەدریانا، درۆمیۆی ناردەوە؟

درۆمیۆ بەسەرسامیەوە وتی:

چی؟ ئەدریانا رەوانەی ئێرەی کردوومە!؟

ئەدریانا:

بەڵێ، تۆ! وتت گوایا گەورەکەت هەڕەشەی لێدانی لێ کردوویت و رەتی گەڕانەوەشی کردووە.

– ئەنتیفۆلس لە درۆمیۆی پرسی:

ئایا قسەت لەگەڵ ئەم خاتوونە کردووە؟

– من؟ نەخێر! هەرگیز ئەمم لەپێشدا نەبینیبوو، تەنها ئەوکاتە نەبێت؛

– تۆ درۆ دەکەیت، بۆخۆت کەمێک بەرلەئێستا پێت وتم، کە خواردنەکەم واخەریکە سارد دەبێتەوەو خانمەکەشم لەماڵەوە چاوەڕێت دەکات. ئەمانە هەمووی قسەی تۆن بۆمن؛

درۆمیۆ نینکاری دەکرد، پێت دەڵێم گەورەم، باوەڕم پێبکە، هەرگیز قسەم لەگەڵ نەکردووە.

– دەباشە پێم بڵێ، چۆن ناوی تۆ دەزانێ؟

ئەدریانا وتی: خزمەتکارەکەت سەرزەنشت مەکە، لەکاتێکدا کەخۆت هەڵەی، بەڵام من ئێستا لێتدەبوورم، کەتۆم دۆزییەوە، رێگات پێنادەم لەبەرچاوم ون بیت. دەی ئێستا بابچینەوە ماڵێ، هیوادارم رەفتارەکانیشت بەرامبەرم بگۆڕێت چیتر لە چاوەڕوانیدا ئازارم نەدەیت. ئەنتیفۆلس ئێستا سەری لێ شێواوە. نازانێ کە ئایا خەون دەبینێ و لەخەونەکەیدا ئەم ژنەی هێناوە، یاخود نووستووەو خەون دەبینێ، واخەیاڵ دەکات هەموو شت والەڕوودااندایە. بڕیاریدا باشترین شت بۆئەوەی بیکات، لەکاتێکدا کە خۆیشی دڵنیا نییە، ئەوەیە بەدوای قسەکانی خاتوونەکە بکەوێت هەرچییەکی وت، هەتا وەکو خاتوونەکە لەبەرچاو ون دەبێت، یاخود تا خۆی لەخەوەکەی هەڵدەستێت و دێتەوە سەرخۆی؛ لۆشیانا فەرمانی بە درۆمیۆ کرد، بۆئەوەی بچێتە ماڵەوە بەخزمەتکارەکان بڵێت خواردنەکە ئامادە بکەن، هەرچەندە کاتەکەش بەسەرچووە درۆمیۆ رووی کردە ئەنتیفۆلس و لێی پرسی:

– ئایا ئەوە زەویە ئەفسانەکەیە کەئێستا ئێمەی لەسەر جێگیر بووە؟ دونیا هەموو شێتن، یان تەنها من؟ گەورەم هیچ گۆڕانێکم بەسەر دانەهاتووە، واهەست دەکەم بۆ کەسێکی دیکە گۆڕدراوم؟

ئەنتیفۆلس:

نەخێر، بەتەواوی بەخۆتی.

لۆشیانا:

خێراکە دەی هەر وەک پێم وتی.

ئەدریانا وتی:

درۆمیۆ هەروەها دەبێت پاسەوانی دەرگاکەش بکەیت، من ئەم ئێوارەیە بەتەنها لەگەڵ مێردەکەم نان دەخۆم. ئەگەر یەکێک لە ئێمەی پرسی بڵێ لەماڵ نییە، چوویتەدەرەوە. وەرە مێردە خۆشەویستەکەم، دەبێ ببمە ژنێکی وا بۆت کە هەرگیز نەتوانی جارێکی دیکە گاڵتەم پێبکەیت ئەنتیفۆلس بەچارێکی گەش و روویەکی بەخەندەوە بەدرۆمیۆی وت:

چاودێرییەکی باشی دەرگاکە بکە درۆمیۆ ئێمە پێکەوە، لەگەڵیاندا دەڕۆین ئەوەی بەسەرمان داهات بەرگەی دەگرین. تا لەکۆتاییدا هەلێک دەدۆزینەوەو دەڕۆین.

کاتێک ئەنتیفۆلس و درۆمیۆی سیراکیۆسی و ئەدریاناو خوشکەکەی لۆشینا گەڕانەوە ماڵەوە، دوای چەند خولەکێک لە چوونەژوورەوەیان بۆ نان خواردن بەتەنها ئەنتیفۆلس و ئەدریانا مانەوە، درۆمیۆ دەرگاکەی

لەسەریان داخستن. لەوکاتەش ئەنتیفۆلس و درۆمیۆ ئەفسۆس گەیشتنەوە ماڵ کەمێک لەکاتی نانخواردنەکە دواکەوتبوون. هەروەها دوو لەهاوڕێکانیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابۆوە، (ئەنگیلۆ و بەلتەزار).

ئەنتیفۆلس(A) وتی:

دەترسم خێزانەکەم هەستی بەبێزاربوونێک کردبێت بەهۆی دواکەوتنمان. لەوانەیە هیچ شتێکی وا لەسەر مێزەکە نەمابێتەوە بۆ خواردن، هەرچۆنێک بێت بەخێرهاتنێکی گەرمتان دەکەم و بەشداریش دەبین لەهەر شتێک کە بۆمان هەڵگیرابێت؛

ئەنگیلۆ و بەلتەزار بەخۆشحاڵییەوە رازی بوونی خۆیان بەم داوەتە نیشاندا. کاتێک ئەنتیفۆلس(A) ویستی دەرگاکە بکاتەوە، بینی دەرگاکە لە ژوورەوە قوفڵ دراوە. بە درۆمیۆ(A) هاوڕێی وت، بۆئەوەی یەکێک لە خزمەتکارەکان بانگ بکات و دەرگاکە بکاتەوە بەخۆی و میوانەکانی بچینە ژوورەوە.

درۆمیۆ(A) لەدیوی دەرەوەی دەرگاکە دەنگی هەڵبڕی بۆئەوەی خزمەتکارەکانی ژوورەوە گوێیان لێببێت و بێن دەرگاکە بکەنەوە، بەڵام لەدیوی ژوورەوەی دەرگاکە درۆمیۆ(S) وەڵامی دایەوە.

بڕۆن کەس لێرە نییە، فەرمانم پێدراوە نەهێڵم کەس بێتە ژوورەوە.

درۆمیۆ(A):

دەڵێم ئەو دەرگایە بکەرەوە، گەورەکەم هاتۆتەوە بۆ نانخواردن، میوانمان لەگەڵە.

درۆمیۆ(S):

ئەمشەو گەورەکەت لێرە هیچی دەست ناکەوێت.

ئەنتیفۆلس(A) بەتوڕەییەوە هاواری کرد:

تۆ کێیت وابەم شێوەیە قسە دەکەیت و دەرگات لەسەر داخستووین؟

درۆمیۆ(S):

من دەرگاوانێکی کاتیم و ناویشم درۆمیۆیە؛

درۆمیۆ(A):

چی! ئەوە ناوی من و کارەکەی دزیوە؟

- لۆشیانا، کە ئەوکات گوێی لەهەموو ئەو هات و هاوارە بوو لەژوورەکەی هاتەدەرەوە پیاوەکانی جارێکی دی داوایان کرد رێگایان پێبدرێ بێنە ژوورەوە، بەڵام لۆشیانا لەسەر بان قیژاندی داوای لێکردن بەردەرگاکەیان بۆ چۆڵ کەن و بەتەنیا جێیان بێڵن. دەرگاکە قوفڵ دراوە، بەقوفڵ داریش مایەوە.

ئەنتیفلس(A) بەجارێک بەرچاوی تاریک بوو، ئارامی خۆی لەدەستدا. بەرامبەر بەمیوانەکانی هەستی بەشەرمەزارییەکی زۆر دەکرد. داوای لە درۆمیۆ(A) کرد، بۆئەوەی بچێت کاریتە(ستون)ێکی بۆ بێنێت، دەیوت، ئەگەر ئەوان نیازیان رێگەگرتن بێت لەچوونەژوورەوەی خانووی خۆم، ئەوا دەبێت من بەهێزی خۆم بچمە ژوورەوە.

هاوڕێیەکەی بەلتەزار وتی:

نا، نا، بوەستە، من ئێستا ئامۆژگاریت دەکەم کەچی بکەیت، باشە ئەگەر تۆ ئەم کارە بکەیت، ئەوا هەموو دراوسێکان دێنە دەرەوەو گوێیان لەم ژاوەژاوە رادەگرن و گاڵتەو پێکەنینیان بەنێوە دێت. بۆیە دەڵێم لەجیاتی ئەوەی لێرە نانەکە بخۆین، بابڕۆینە ئەم مێوانخانەیەی ناو بازاڕ. لەپاشان تۆ دەتوانیت بەتەنها بگەڕێیتەوە، و دڵنیام لەوەی خێزانەکەشت ئەوکات بێزاری و تووڕە بوونەکەی دەڕەوێتەوە و نابینێت بەخۆشی رێگای چوونە ژوورەوەت دەدات.

ئەنتیفۆلس(A) وتی:

بەڵێ راستدەکەیت، ئەو میوانخانەیە تاکە شوێنە کەمن پێی بزانم و بۆی بچین ژنە خاوەندارەکەی پۆڕپێنتین، ئافرەتێکی زۆر جوان و رووخۆشە. خێزانەکەی زۆرجار من بەوە تۆمەتبار دەکات، کە گوایا من زۆربەی کاتەکانم لەگەڵ ئەم ئافرەتە بەسەر دەبەم لەوەی لەگەڵ ئەو باشە ئەمەش رێگایەکە بۆ تۆڵەسەندنەوەی خۆم بەرامبەر بە خێزانەکەم کە دەرگای لەسەر داخستوم و ئەو ملوانکەیەی کە لەتۆم داواکردبوو ئەنگیلۆ، دابنابوو بیدەم بەخێزانەکەم، بەڵام لەجیاتی ئەو دەیکەم بەخەڵات بۆ ئەم ژنە خاوەندارەی پۆڕپێنتین؛

لەلایەکی دیکەوە، لەناو خانووەکەدا، ئەنتیفۆلس(S) بەهەمان ئەو شێوەیە هەڵسوکەوت ناکات بەرامبەر ئەدریانا کە پێویستە مێردێک بکات. ئەو هەرگیز واڕووخۆش و هاوڕێ نەبووە لەگەڵ خێزانەکەی لەسەر مێزی نانخواردن لەوەی کە پێویستە ئێستابێت.

کاتی نووستن لە نزیکبوونەوەدایە، ئەنتیفۆلس(S) هەرگیز ئامادە نییە خۆی وەک مێردێک لەگەڵ ئەدریانا ببینێتەوە لەجێبەجیکردنی ئەرکێکی هاوسەرێتی وەک رەگەزی نێر. لۆشیانا بەچاوێکی لێ وردبوونەوە سەیری هەموو ئەو شتانەی دەکرد کە روودەدەن، لە دواییدا ئەنتیفۆلی بەتەنیا لەلایەک جیا کردەوە و پرسی. ئەنتیفۆلس، دەڵێی لەبیرت کردووە مێرد دەبێ چ ئەرکێکی سەرشانی جێبەجێ بکات؟ بەدڵنیاییەوە، تەنانەت ئەگەر خوشکەکەمیشت خۆش ناوێت، بەڵام دەبێ هەر لەگەڵی بخەویت و واخۆتی پێنیشان بدەی کەتۆ هەمیشە ئامادەی

جێبەجێ کردنی ئەرکی هاوسەریەتیت وەک مێردێک لەکاتی نووستندا. ئێمەی ژن تەنها پێویستیمان بەدڵنیایی کردنەوە هەیە. پێویستیمان بە کەمێک پیاهەڵدانی زێدەڕۆیی و لاواندنەوە هەیە. ئایا وشەیەکی میهرەبان و رووێکی گەش داوایەکی زەحمەتە؟

ئەنتیفۆلس:

نازانم تۆ بەچ هەقێک ئەو هێزە دەخەیتە سەرمن وەک مێردێک جموجۆڵی لەگەڵدا بکەم، بەڵام راستییەکەی ئەوەیە من مێردی خوشکت نیم. من ناتوانم خۆم واپیشان بدەم کەتۆ هەوڵی رازی کردنی دەدەی، بەڵام تۆ والەو دەکەیت منی خۆش بوێت، ئایا ئاسانتر نییە والەخۆت بکەیت!؟؟ خاتوون- ببورە- ناویشت نازانم، هەرچەندە تۆ بە مۆجیزە واپێدەچێ ناوی من بزانیت. ئەوە تۆی کەمن خۆشم دەوێیت؟ من؟ لۆشیانا بەسەرسامییەوە وەڵامی دایەوە. تۆ شێتیت؟

- نا، نەخێر، من شێت نیم، بەڵام هەست دەکەم ئێستا جادوویم لەسەر دەکرێ.

- تۆ ناتوانی منت خۆش بوێت! ئەرکی تۆ تەنها ئەوەیە کە خوشکەکەمت خۆش بوێت.

- بەڵام خۆزگەی من تەنها تۆیە. من ئێستا لەژێر چاودێری تۆدا دەجولێمەوە. نەتۆ مێردت هەیەو نەمنیش ژنم هەیە. بۆیە داوات لێدەکەم شووم پێبکەیت!

- ئۆ، گەورەم، بوەستە! پێویست ناکات وابەمجۆرە قسەم لەگەڵدا بکەیت! وادەچم خوشکەکەمت بۆ ئامادە دەکەم!

زۆری نەخایاند لە بەجێهێشتنی لۆشینا، درۆمیۆ بەپەلە خۆی کرد بەژوورەکەدا.

ئەنتیفۆلس(S) لێی پرسی.

- درۆمیۆ، بۆچی واپەشۆکاوی؟

- ئای، من درۆمیۆم؟ نەگۆڕاوم؟ منم هاوڕێی ئەنتیفۆلس؟ بێگومان تۆ ئەوی، بۆچی دەپرسی؟

- تازە خزمەتکارێک لێرە لە چێشتخانەکە بەدرۆمیۆ بانگی کردم، پێی وتم، کە گوایە من پەیمانم بەو داوە بیخوازم. گەورەم ئەوە بەتۆ دەڵێم، من هەرگیز ئامادە نیم ئەو بخوازم، مەگەر بێتو تاکە کچ بێت لەدنیادا مابێتەوە. ئەو ژنەچەندە باڵابەرزە ئەوەندەش قەڵەوە، هەروەک شەیتان ناشیرین و قەبەیە. کاتێک پێم وت کەمن پەیمانی وام پێنەداوە. لەلایەن خۆیەوە بۆ راستی قسەکانی بەتەواوی دەستنیشانی مۆری لەدایکبوونی لەسەر شانم داکردو ئەو نیشانەیەی کە لەسەر پشتمدا نەخشێنراوە. وتی: گوایە هەموو شتێک دەربارەی من دەزانێ، وای لێکردم کە پەیمانەکەم بپارێزم، بیخوازم!

ئەنتیفۆلس:

درۆمیۆ، ئەوەی بەسەرتۆ داهات بەهەمان شێوە لێرەش بەسەر مندا هات. ئەدریانا بەمێردی خۆی بانگم دەکات کەچی، هەرگیز خواستنی ئەوم بەخەیاڵیش دانەهاتووە. خوشکەکەشی بەناوی خۆم بانگم دەکات، زۆرم لێدەکات وەک مێرد لەگەڵ خوشکەکەیدا بجوولێمەوە درۆمیۆ ئەم بەسەرهاتانە هەمووی شاردراوەو پڕ لەنهێنین- تا رادەیەک ترسناکیشن. برۆ بەنهێنییەوە لەدەرگاکە بچۆ دەرەوە ئەگەر هیچ کەشتییەک ئەم ئێوارەیە بەنیازە ئەفسوس بەجێ بێڵێ، لەگەڵیدا دەڕۆین ئێرە جێ دێڵین. گرنگ نییە ئاراستەی بەرەو کوێ دەبێت و بۆکوێ دەچێ. تۆ لەپێشدا برۆ بۆ بازارەکە، لەوێ یەکتر دەبینینەوەو ئەو شوێنە جێدێڵین کە تیایدا هەمووکەس ئێمە دەناسێت، کەچی ئێمەش کەسیان ناناسین ئێرە ئەم شوێنە نییە کە لەپێشدا دەمانویست.

درۆمیۆ(S) بەرەو دەرگاکە رایکرد، قوفڵەکەی کردەوەو چووە دەرەوە. ئەنتیفۆلس لەدواییەوە بەهەنگاوی هێمنتر بۆی دەرچوو لەوکاتەی دەرگاکەی لەدوای خۆیدا داخست، ئەنگیلۆ بەدیارکەوت وتی:

ئاه، ئەنتیفۆلس، لە کۆتاییدا توانیت بچیتە ژوورەوە. ئەو ملوانکەیەی کە داوات لێکردبووم ئەوەتا هێناومە دەمویست لەگەڵ خۆم بیهێنمەپۆرپێنتین لەوێوە پێت بدەم!

- ئەوە پێشنیاری چیم بۆدەکەی؟

- ئەوەی تۆ حەزت پێ دەکرد، ملوانکە زێڕەکە، دەشتوانیت پارەکەم دواتر بدەیتێ.

- نەخێر، ئێستا پارەکە وەربگرە، ئەگەرنا دواتر چاوت نە بەملوانکەکەو نە بەپارەکەش ناکەوێت.

* بەڕاستی هەر بە هۆی ئەم قسە خۆشانەتەوەیە بۆیە شانازیت پێوە دەکەم، بەڵام بێگاڵتەمە، دەتوانی پارەکە دوابخەیت، ئێستا بڕۆ خواردنەکەت بخۆ، دەزانم ماندوو دیاری.

ئا بەمشێوە نەزانی و سەرلێشێواوییەوە ئەنگیلۆ رۆیشت و ئەنتیفۆلس(S)ی لەگەڵ ملوانکەیەکی زێڕینی بریقەدار جێهێشت. هەرچەندە ئەنتیفۆلس(S) خۆیشی زۆر بەزەحمەت بڕوای باشی بە بەختی خۆی دەکرد بە پێدانی دیارییەکی وا بەنرخ، بەڵام زۆر نەوەستا بیر لەو سەربوردەیە بکاتەوە، چونکە درۆمیۆ نیگەران و دوودڵ بوو بەدواکەوتنی گەورەکەی، لەوانەیە بپرسێ ئێستا گەورەکەی دەڵێ لەکوێوە گیری خواردبێ.

ئەنگیلۆی داماو دوای بەجێهێشتنی ئەنتیفۆلس(S)

لەگـەڵ ملوانکە زێڕەکـەی بە نەزانینەوە، لەرێگادا دەرۆیشت و بیری دەکردەوە خۆزگەی دەخواست پارەکەی وەربگرتایە لەوکاتەی کە ملوانکەکەی بەخشی. لەناکاو بازرگانێک لێیەوە نزیک بۆوە، کە ئەنگیلۆ پارەی بەقەرز لێ وەرگرتبوو بازرگانەکە ئەفسەرێکی یاساییشی لەگەڵ خۆی هێنابوو. وتی:

* ئەنگیلۆ- ئێستا پێویستیم بەو پارەیە هەیە کە ماوەیەک بەرلەئێستا بەقەرز داومە بەتۆ. نیازی گەشتێکی دەریاییم هەیە،ئێستاش هیچ پارەیەکی وام لەبەردەستدا نییە بیدەمە کرێی گەشتەکەم، بۆیە هاتووم داوای ئەو قەرزە بکەمەوە کە ماوەیەک بەر لەئێستا دابووم بەتۆ.

ئەنگیلۆ.

- زۆرباشە، ئێستا پارەکەت بۆ دەگەڕێنمەوە. کەمێک پێش ئێستا ملوانکەیەکی زێڕم بۆ ئەنتیفۆلس بەخشی، زۆریشی لێکردم پارەکە وەربگرم، بەڵام خۆم دوامخست. پارەکەش هەمان ئەو برە پارەیەیە کە بەقەرزم لەتۆم وەرگرتبوو. دەتوانم ئێستا لەگەڵ خۆمت ببەمە ماڵی ئەنتیفۆلس، نیوسەعات بەرلەئێستا پێکەوە لەبەر دەرگایان وەستابووین.

ئەفسەرەکە وتی، پێویست ناکات ئێمە بچینە ماڵیان، ئەوە خۆی وابەرەو ئێرە دێت.

ئەنتیفۆلس(A) بێ ئاگا لە ڕووداوەکان، بەرەو سێ پیاوەکە نزیک دەبۆوە، بەڵام ئەمەیان ئەنتیفۆلسی شاری ئەفسۆسە. دیمەنێکی ڕەش لە ڕوخسارییەوە بەدیدەکرا. وتی:

- ئەنگیلۆ- زۆر چاوەڕوانم کردیت لەپۆرپێنتین، بەڵام هەر دەرنەکەوتیت. تۆ چ جۆرە هاورێیەکی. منت بەتەنها لەو شوێنە لەچاوەڕوانیدا ڕاگرتبوو؟ کوا ملوانکەکەی لێتم داواکردبوو، وتت لەگەڵ خۆم هێناومە؟

ئەنگیلۆ- ڕووی کردە بازرگانەکەو ئەفسەرەکە، بەزەردەخەنەیەکی بێ ڕەونەقەوە وتی:

- هاورێیان، ئەنتیفۆلس لەم چەشنە پیاوانەیە(کەسانەیە) کە زۆرحەز بەگاڵتەو ڕابواردن دەکات. ئەنتیفۆلس ئەگەر پارەی ملوانکەکەت ئێستا لەلایە حەزدەکەم بمدەیتێ بۆئەوەی منیش بیدەم بەم پیاوە کە نیازی گەشتکردنی هەیە.

ئەنتیفۆلس(A):

- تۆ هێشتا هیچ پارەیەکت لەلای من نییە، بەڵام دەتبینێت، ئەگەر تۆش ملوانکەکەم بدەیتێ، ئێستاش لەگەڵم وەرە بچینەوە ماڵێ.

ئەنگیلۆ.

- بەڵام من بەرلەنیوسەعات ملوانکەکەم پێدایت لەبەر دەرگای ماڵتان، تکات لێدەکەم ئەنتیفۆلس، پارەکەیم ئێستا بدەرێ بۆئەوەی ئەم بەرێزەش لەگەشتەکەی دوانەکەوێت.

ئەنتیفۆلس(A).

- تۆ دەتەوێت زۆرم لێبکەیت، لەپێش ئەم پیاوانەدا درۆم پیا هەڵدادەیی و بەناهەق پارەم بەزۆر لێ بسەنی .

ئەنگیلۆ-

نەخێر، تۆ دەتەوێت زۆرداریم لێبکەیت، لەوەی کە نکۆلی لە وەرگرتنی ملوانکەکەم دەکەیت. نیازت وایە پارەکەم بخۆیت و نەمدەیتێ.

بازرگانەکە وتی:

- ناتوانم زیاتر بەرامبەر ئەم مشتومڕە بێ سەروبەرەیە بوەستم. کەشتییەکەم چاوەڕێم ناکات و بەجێم دێڵێ، ئەفسەر ئەم پیاوە دەستگیر بکە!

بەڵام کام پیاو، ئەمە پرسیارێکەو دەکرێت وەڵامەکەش تاوەکو ئێستا نادیارە. لەکاتێکدا هەردووکیان لەسەر هەقێ بەکردەوەو بەقسەکردنو لەهەمان کاتیشدا هەریەکەیان هەقی خۆیەتی بەنەزانی ئەویتر تاوانبار بکات.

ئەفسەرەکە ئەنتیفۆلس(A) دەستنیشانکردو دەستگیری کرد. ئەنتیفۆلس بەدەنگێکی بەرز هاواری لەبێ دادوەری دەکرد، ئێوە بەچ تاوانێک دەتانەوێت من دەستگیر بکەن. ئەفسەرەکە خەریک بوو ئەنتیفۆلس بەرەو بەندیخانە ڕاپێچبکا لەناکاو درۆمیۆ(S) بەدیارکەوت ڕووی کردە ئەنتیفۆلس(A)(هەڵەی کرد وایزانی هاورێیەکەی خۆیەتی).

ئەنتیفۆلس(S) وتی:

-گەورەم، کەشتییەک بەنیازە بەرەو ئێپتیدامیۆم بەرێ بکەوێت خێراکە تا ئەم شوێنە بەجێبێڵین.

ئەنتیفۆلس(A) وتی:

- تۆ شێت بوویت؟ کێ وتویەتی من دەچمە ئێپتیدامیۆم؟

- تەنها گەرەکمە بچمە ماڵەوە، کەچی لێرە ئەم ئەفسەرە بەناهەق دەستگیری کردوومە. هەر خودا دەزانێ کێ تاوانبارە درۆمیۆ لەجیاتی من بڕۆوە ماڵێ، ئەم کلیلە بدەرە ئەدریاناو پێی بڵێ سندوقەکەم بکاتەوە جزدانێک پارەی لەناودایە، هەرئەوەندە پارەی تێدایە کەبتوانم خۆمی پێ ئازاد بکەم. دەی خێراکە پیاو!

ئەدریانا! درۆمیۆ حەزناکات جارێکی دیکە بگەڕێتەوە

خانووەکە کە کەمێک پێش ئێستا تیایدا هەڵاتووەو لەلایەن خزمەتکارە قەڵەوەکەی نێو چێشتخانەکەدا راونراوە، بەڵام هیچ رێگایەکی دیکە لەبەردەمدا نییە، خزمەتکار دەبێ گوێڕایەڵی گەورەکەی بێت.

درۆمیۆ(S) بەسەر گفتوگۆی نێوان ئەدریاناو لۆشینادا هاتەوە، لەکاتێکدا لۆشینا رەفتارە سەیرەکانی ئەنتیفۆلسی بەرامبەر بەئەو بۆ خوشکەکەی دەگێڕایەوە. ئەدریانا بەبیستنی قسەکانی خوشکی زۆر تووڕەو نائومێدی بەو پیاوەی کە لەلایەن خۆیەوە باوەڕی وابوو مێردەکەی بێت، سوێندو بەڵێنی داوەتە خوشکەکەی کە خۆشی دەوێت، بەڵام ئەدریانا لەلایەن خۆشییەوە، سوێندی خوارد کەچیتر مێردەکەی وەک جاران نەدوێنێت و قسەی لەگەڵدا نەکات.

کەچی ئێستا بەڕاستی هەستی بەترس و دڵەڕاوکێ کرد کاتێک گوێی لە درۆمیۆ(S) بوو، کە ئەنتیفۆلس(A) لەلایەن ئەفسەرەوە دەستگیرکراوە ئەدریانا بەهەڵە دامانەوە کۆمەڵێ پرسیاری لە درۆمیۆ(S) کرد کەی گیراوە؟ بۆچی -؟ لەسەرچی گیراوە-؟ کوا، لەکوێیە-؟ کێ دەستگیری کردووە؟ داوای چی دەکرد........؟ بەڵام درۆمیۆ نەیدەتوانی وەڵامێکی راست و دروستی بداتەوە، کە خۆیشی سەری لێ شێواوبوو،

ئەدریانا وتی: هەرگیز بیرم بۆ ئەوە ناچێ کە مێردەکەم قەرزاری خەڵکی بێت، بەڵام ها ئەم پارەیە وەربگرە خێراکە لەگەڵ خۆتی ببە بۆ ئەنگیلۆ، هەر ئێستاش گەورەکەت لەگەڵ خۆت بهێنەوە ماڵێ. درۆمیۆ بەخێرایی گەڕایەوە بازاڕەکەی نێوشار، لەرێگادا چاوی بەگەورەکەی خۆی کەوت ئەنتیفۆلسی سیراکسۆس(S)، بەهەناسە بڕکێیەوە وتی: گەورەم ها ئەوەتا پارەکەی داوات کردبوو. ئێستا دەتوانیت لەبری خۆت بیبەخشی و ئەفسەرەکەش ئازادت دەکات.

ئەنتیفۆلس(S) وتی:

- پارە!؟ پارەی چی؟ ئەفسەری چی؟ ئێرە چییە؟ من لێرە پیاسە دەکەم هەمووکەس سەلامم لێدەکات و بەئەنتیفۆلس بانگم دەکەن دیارییم پێدەبەخشن، سەیرکە چ ملوانکەیەکی بەنرخیان پێ بەخشیووم، بۆ نانخواردن داوەتم دەکەن. ئەوە زۆر لەوە گەورەترو شاراوەترە کە بتوانم بەئاسانی لێکیان جوێ بکەمەوە، خۆشم نازانم ئەمە چییە روودەدات. تۆ پێم بڵێ، هیچ کەشتییەک ئامادەیە بۆ رۆیشتن، بتوانین لەگەڵی بەڕێ کەوین- بۆ شوێنێک- هەرشوێنێک بێت! ئەمەیان لەژێر کاریگەری جادووی رەشدا نییە؟

درۆمیۆ وتی:

- ئەی گەورەم پێش نیو سەعات پێم نەوتێت، کە کەشتییەک خەریکە بەڕێ بکەوێت بۆ ئێپێتیدامیۆم، بەڵام لەبەر دەستگیرکردنی تۆوە نەمانتوانی لەگەڵی بچین. دەترسم ئێستا کەشتییەکە جێی هێشتبین.ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ ئاگات لەخۆیە ئەم قسانە دەکەی؟ دەترسم تۆش کەوتبیە ژێر کاریگەری جادووییەکە؟

ئەوان بەردەوام بوون لەگفتوگۆیە لێک نەگەیشتووەکانیان، لەوکاتەدا ژنێک لێیانەوە نزیک بۆوە، بانگی ئەنتیفۆلس(S) کرد بەناوی خۆی، سەرباری ئەوەی ژنەکە غەریب بوو لەلایەن ئەنتیفۆلسەوە، تەنانەت لای درۆمیۆشەوە. ئەم ژنە(ژنە خاوەنداریەکەی پێپینتین)ە،(کە ئەنتیفیلس(A) بەڵێنی ملوانکەیەکی زێڕی پێدابوو)

وتی:

- ئای، ئەوە تۆی ئەنتیفۆلس، هەی تەڵەکەباز! کوا ئەو ملوانکەیەی بەڵێنت پێدابووم؟

ئەنتیفۆلس(S):

- من هەرگیز بەڵێنی ئەم شتانەم بەتۆ نەداوە(بەخێرایی دەستێکی بۆ گیرفانی بردو بۆ پاراستنی ئەو ملوانکەیەی کە تازە پێیان بەخشی بوو). تەنانەت ناشت ناسم، تۆکێیت؟ لەسەر چ ئەساسێک ئەم بەڵێنەم بەتۆ داوە؟

درۆمیۆ وتی:

- گەورەم، سەیرکە ئەوە شەیتانە لەنێو بەرگی ئافرەتێکەوە خۆی نیشانداوە. بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم هیچ شتێکی لەگەڵدا نەکەیت.

ژنەکە وتی:

- ئۆو، ئەنتیفۆلس، ئەوە ئەوگاڵتەیەیە کە بەنیازبووی لەدژی من بیکەیت، بەڵام ژنەکە تەنها قسەی لەگەڵ خۆیدا دەکرد، لەوکاتەی ئەنتیفۆلس و درۆمیۆی سیراکسۆس هەردووکیان لەم شوێنەدا هەڵاتن. ژنەکە بەهاوارەوە بەدوایاندا دەیقیژاند: ئەنتیفۆلس هەرگیز بیر لەراکردن مەکەوە، بەئاسانی ناتوانیت لەبەر دەستم رزگارتبێت! ئێستا دەچم بەخێزانەکەت دەڵێم کەچ جۆرە پیاوێکی فێڵبازی!

دوای ئەوەی ژنە خاوەنداریەکە گۆڕەپانی ناوبازاڕی بەجێهێشت. ئەنتیفۆلس(A) بەدیارکەوت، کە هێشتا لەژێر دەستی ئەفسەرەکەدا دەستگیرکراوە.

درۆمیۆ(A) بەهەناسە بڕکێوە بەدوایاندا دەکەوت و هاواری وەستاندنیانی دەکرد.

ئەنتیفۆلس(A) وتی:

- ئا! ئێستا کاتی ئازادبوونم هاتووە! درۆمیۆ کوا

چوویتەوە ماڵەوە، پارەکەت لەگەڵ خۆت هێناوە؟

- پارە، گەورەم؟ کام پارە؟

ئەنتیفۆلسی داما! کە تائەوکات لەناخۆشترین کاتەکانی ژیاندابوو، وای هەست دەکرد کە درۆمیۆ بەهۆی قسە راستییەکانییەوە گاڵتەی پێدەکات. دەستی بەرزکردەوە شەپازللەیەکی لە درۆمیۆدا، وەک ئەوەی کە زۆر تووڕە بووبێت بەسەرییەوە هاواری کرد. درۆمیۆی بێناز ئاگای لەهیچ لەم کێشەو دەردەسەریانە نییە، ئا بەمجۆرە لەلایەن گەورەکەیەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

خۆشبەختانە، ئەدریانا هەریەک لە(لۆشیاناو ژنە خاوەنداریەکەی پۆرپێنتین و دکتۆر پینک و دوو لەیارمەتیدەرەکانی) بانگکرد بوو، بۆئەوەی بەرەو بازاڕی شار بکەونەڕێ بۆ زانینی راستییەکانی ئەنتیفۆلس، کە ئایا شێت بووە یاخود گۆڕاوە؟

ژنەکە بە پەنجە ئاماژەی بۆ ئەدریانا دەکرد دەیوت:

- سەیرکە، خاتوون پێمنەوتی مێردەکەت شێت بوو ها،ئەوەتا لەلایەن ئەم ئەفسەرە دەستگیرکراوە.

ئەدریانا روویکردە دکتۆر پینک وتی:

- دکتۆر سەیرکە ئێستا مێردەکەم وەک جاران نایەتە بەرچاوم. بڵێ چی بکرێ باشە بۆی؟

دکتۆر خۆی لە ئەنتیفۆلس(A) نزیک کردەوە پێی وت: گەورەم رێگام بدە تەنها هەست بە ژمارەی لێدانەکانی دڵت بکەم.

ئەنتیفۆلس(A) بەتوڕەییەوە دکتۆرەکەی ئاگادارکردەوە.

- ئەگەر تەنانەت سەری پەنجەشت لەسەر سنگم دانێیت، ئەوا هەرەشەی لێدانت لێدەکەم! ئەی تۆ ئەدریانا، بۆچی ئەم ئێوارەیە دەرگات لەدەرەوە لەسەر داخستبووم؟

ئەدریانا وتی:

- مێردەکەم، خۆت دەیزانی ئەمە راست نییە، ئەی تۆ خۆت ئەم ئێوارەیە نانت لەگەڵم نەخواردووە داوای لە درۆمیۆ(A) کرد بۆ گێڕانەوەی راستییەکانی ئەم ئێوارەیە.

درۆمیۆ پاڵپشتی لە قسەکانی گەورەکەی دەکرد.

ئەدریانا بەردەوام بوو لەقسەکردنی و بەدەستێکی نیشانەی بۆ درۆمیۆ کرد: ئای تۆ تازە نەهاتیتەوە ماڵەوە، جزدانێک پارەم پێدایت و وتت، گەورەکەم پێویستی پێیەتی!

درۆمیۆ(A) بەچاوێکی تووڕەبوونەوە سەیرێکی ئەدریانای کرد لەدوواوەی خۆی لەدژی راستی قسەکانی ئەدریانا وەستاو پێی وت: تۆ دەتەوێت ئەم شەرمەزارییەی خۆت بشارێتەوە، کە ئێمەت لەبەرامبەر ئەم دوو میوانەدا. ئەنگێلۆ و بەلتەزار) بێنرخ کردو دەرگات لێ نەکردینەوە.

ئەدریانا بە زەردەخەنەیەکی دەستکردەوە.

- ئەوە چیتان بەسەرهاتووە، هەردووکتان شێت بوونە.

ئەنتیفۆلس(A) بەدەنگێکی گڕ نەڕاندی.

- تۆ بەئێمە دەڵێی شێت، تۆ نەبوویت فەرمانت بە دەرگاوانەکە دابوو، دەرگامان لێنەکاتەوەو وەدەرت ناین؟ کەچی ئێستا هاتووی درۆمان پێهەڵدەبەستی؛ رووبەرووی خێزانەکەی هەنگاوینا بۆ ئەوەی بچێت لێی بدات، بەڵام دکتۆر و یارمەتیدەرەکانی بازیانداو کەوتنە نێوانیان دەستیان لەپشتەوە گرت، پێش ئەوەی بێڵن هیچ ئازارێکی خێزانەکەی بدات هەوڵیاندا دەمارگیرییەکەی لێ بڕەوێننەوە، لەگەڵ خۆیان بردیان و دووریان خستەوە. ئەفسەرەکە بلاوەی بەهەموویان کردو وتی:

- ئەنتیفۆلس ئێستا بەندی منە، کەس ناتوانێت دەستی بۆ بەرێت ئەگەر من بەرەڵلام کرد(ئازادم کرد) ئەوا خۆم دەبمە ئەوکەسە قەرزەکەی ئەنگێلۆ بداتەوە. ئەدریانا بەڵێنیدا ئەگەر مێردەکەی قەرزاری زێڕینگرەکەبێت، ئەوا خۆی ئامادەیە قەرزەکەی بۆ بگەڕێنێتەوە. ئەدریانا بەهاوڕێیەتی ئەفسەرەکە چوونە ماڵی ئەنگێلۆ، بۆ زانینی راستی رووداوەکە.

ئەنتیفۆلس و درۆمیۆ سیراکیۆس، لەلایەکی دیکەوە بەخۆو بە شمشێرەکانیانەوە بەدیارکەوتن.

لۆشیانا لە خۆشیانا هاواری کرد: ئۆه گەورەم! ئازادیان کردوون بەخۆیان و شمشێرەکانیانەوە هاتوونەتەوە! ژنەکەو(خاوەن پۆرپێنتین)و ئەفسەرەکە بەدوایاندا هەڵاتن بۆ رزگارکردنی گیانی خۆیان. ئەنتیفۆلس و درۆمیۆ بەجۆرێک سەریان لێشێوابوو، کە خۆشیان نەیاندەزانی ئەوە چی روودەدات. بەرەو بەندەرەکە هەنگاوییان دەنا بۆ ئەوەی لەگەڵ کەشتییە چاوەڕوانکراوەکە بڕۆن. لەرێگایدا چاویان بە ئەنگێلۆ و بازرگانەکە کەوت. راستەوخۆ بەتەنیشتیانەوە تێپەڕین.

ئەنگێلۆ تێبینی کرد کەوا ئەنتیفۆلس ملوانکە زێڕەکەی ئەوی لەملی کردووە. هاوڕێیە بازرگانەکەی خۆی لێ ئاگادارکردەوە- کاتێ بازرگانەکە سەیری ئەنتیفۆکسی کرد شمشێرەکەی لەکاڵان دەرهێناوە- ناچار ئەویش لە لایەن خۆیەوە شمشێرەکەی دەرهێناو خۆی ئامادەکرد بۆ شەڕ.

لەوکاتەدا، ئەدریانا و بۆشیانا و ژنە خاوەندارەکەو ئەوانی تر بەدوایانەوە (ئەنتیفۆلس و درۆمیو «S») دەرکەوتن و هاواریان دەکرد؛ ئازاری مەدەن! بیوەستێنن، شێت بووە!

ئەنتیفۆس (S) و درۆمیو (S) سەیرێکی دواوەی خۆیان کرد و ئەو ژنانەیان بینی، کە کەمێک پێش ئێستا هەردووکیان لەماڵەکەیاندا رایان کردووە، زیاتر ترس دایگرتن بێ ئاگایانە خۆیان کێشا بەنێ و کڵێسەیەکدا و دەرگاکەیان لە ژوورەوە لەسەر خۆیان داخست بۆ ئەوەی لە هەموو زیانێکی دەرەوە بەدووربن. ئەنگیلۆ و بازرگانەکە کە تا ئەوکات هەر بەدوایانەوە بوون لەوکاتەی سەرۆکی پاکیزەکان لە کڵێسەکەدا هاتە دەرەوە، وتی: ئەو قەڵەبالغییە و دەنگە دەنگە چییە، بۆچی لێرە کۆبوونەتەوە؟

ئەدریانا:

- ببورە خانمەکەم، مێردەکەم شێت بووە، لەماڵێ هەڵاتووە، ئێستا خۆی لەم کڵێسەیەدا حەشارداوە.

ئافرەتە پاکیزەکە وتی:

- باشە، لێی بگەڕێن، ئەو ئێستا سەلامەتە، ئەم پیاوە داماوە هاتۆتە راسترین و پاکترین شوێن. ئیماندارە لە خوا ترسەکان دەتوانن مێشکی دووبارە بۆ بگەڕێننەوە زیاتر لەوەی کە دکتۆرەکان دەتوانن.

ئەدریانا پێی لە عەرزی داو، وەک ئەوەی زۆر تووڕەبێت دەیوت: دەبێ هەر چاوم بە مێردەکەم بکەوێت، بەڵام ئەمانە هیچی سوودی نەبوو. ئافرەتە پاکیزەکە سووربوو لەسەر رەتکردنەوەی بەدەستەوەدانی ئەنتیفۆلس بەشوێن کەوتەکانی.

بەرێکەوت دۆقی ئەم شارە (ئەفسوس)، لەگەڵ ئەفسەرە یاساییەکانی و ئاگیۆن (کە بەزنجیر بەسترابۆوە) بە بەردەم کڵێسەکە تێپەڕین ئەوکاتە هاتوە بۆ جێبەجێ کردنی سزای مەرگی ئاگیۆنی بەدبەخت، ئەدریانا ئەوکاتەی بە هەل زانی خۆی هاوێشتە ژێر ئەژنۆی دۆق، بۆ ئەوەی فەرمان لەسەر ئافرەتە پاکیزەکە بکات بۆ گەڕاندنەوەی مێردە شێتەکەی، ئەنتیفولس (S) و خزمەتکارە گەمژەکەی درۆمیۆ(S).

دۆق رۆڵی بێوچانی ئەنتیفۆلس«A»ی هێنایەوە بەرچاو کە یەکێک بوو لە جەنگاوەرە هەرە ئازاکانی دۆق، لەشەڕەکاندا وەک پاڵەوانێکی چاو نەترس بۆ دۆق دەجەنگا، بەدوای ئافرەتە پاکیزەکەیدا نارد بۆ ئەوەی رێگا بەئەدریانا بدات بۆ هێنانە دەرەوەی مێردەکەی.

لەوکاتەش ئەنتیفۆلس(A)و درۆمیو (A) لەلایەکی دیکەوە، بۆ دیارکەوتن بەرەو قەڵەباڵغییەکە هاتن و بەدۆقی وت:

- گەورەم لەبیرتە ئەو خزمەت و هەوڵانەی لە گۆڕەپانەکانی جەنگ وەک ئەرکێکی سەرشان خۆم رایانم دەپەڕاند هەمووی لەبەرخاتری شکۆداری تۆ بوو دەبا بەزەیی و میهرت بەسەرمندا ببارێت! ئیمڕۆ خێزانەکەم لەپێش هەموو خەڵکی شاردا شەرمەزارو ئابڕوی بردووم، بەهۆی داخستنی دەرگای ماڵەکەم قەدەغەی چوونەژوورەوەی لێکردبووم لەدەرەوە بەجێی هێشتبووم و خۆیشی بەجووتە لەگەڵ غەریبان نانیان دەخوارد لە ماڵی مندا!

ئەدریانا سووربوو لەسەر قسەکانی وتی: گەورەی من، خاوەن شکۆ ئەمە راست نییە، من لەگەڵ مێردی خۆم نانم خواردووە. بۆ راستی قسەکانیشم لۆشیانای خوشکم وەک گەواهیدەرێک دەتوانی لێی بپرسی.

ئاگیۆن هاتە نێو گفتوگۆیەکەوە.

- لەوانەیە ئەنتیفۆلس ئەم کارە نامۆیانەی کردبێت، بەڵام لەهەمانکاتیشدا دەرگای لەسەر داخرابێت، لەدەرەوەی ماڵی خۆیدا.

ئەنتیفۆلس(A) بەگلەییەوە وتی:

- من ئەوکەسە نیمە ئەمجۆرە کارانە بکەم، خۆ ئێوە باش دەمناسن. سوێندەخۆم گەورەم، ئەم ژنە منی لەنانخواردنی ئەم ئێوارەیەش بێ بەشکردو ئەم پیاوەش بەڵێنی پێدابووم ملوانکەیەکی زێڕی خۆیم بۆ بێنێتە پۆڕێیننێن. لەدواییدا منی تۆمەتبارکرد بەوەی کە گوایا من ملوانکەیەکم لێ وەرگرتووە، داوای پارەکەیشم لێدەکات. منیش ناچار خزمەتکارەکەم نارد بۆ ماڵەوە بۆ ئەوەی برێک پارەم بۆ بێنێ، بەڵام ئەویش نەیهێناو شتێکی دیکەش ماوە حەزدەکەم بە بەرێزتانی رابگەیەنم ئەویش ئەمەیە، خێزانەکەم پیاوێکی بەناو دکتۆری هێناوە بۆ چارەسەرکردنم، گوایە من شێت بوومە. نازانم ئەم شتانە چین. سەرم لێشێواوە. هەروەها تۆمەتێکی دیکەشیان خستۆتەپاڵم گوایا من و خزمەتکارەکەم چەند خولەکێک پێش ئێستا بەبێ ئاگادارکردنەوەی ئەوانە لەماڵ رامان کردووە

بازرگانەکە وتی:

- ئەی کێبوو تازە لەبەر چاومانەوە هەڵدەهات و خۆی

کـرد بەم کلێســـەدا، ملوانکە زێڕینەکـەت لەملدا شـۆڕ کردبۆوە! منبووم ها!؟

ئەنتیفۆلس(A) وتی:

- من تاوەکـو ئێســـتـا ژوورەوەی ئەم کلێســـەیەم نەبینیـبـوو. گـەورەم ئەوانە دەیانەوێت درۆم پـیـاهەڵدەن، لەبەرچاوی بەڕێزتان سووک وریسـوام بکەن. دۆق ئێسـتا خـۆیشی سـەری لێ شـێـواوە کـامـەیان لەسـەرهەقن و کامەشیان هەڵەن. ناچار بەشوێن ئافرەتە پاکیزەکەیدا نارد بۆ ئەوەی چاوی پێبکەوێت، کە ئەگەر لەتوانای داهەیە ئەم کێشەیە کۆتایی پێبێنێت. کاتێک ئافرەتە پاکیزەکە چووە کلێسـاکە بەمەبەستی ئەوەی بزانێ ئایا ئەم دوو راکردووە لەژووری مـاون یاخـود هەڵاتوون. لەم کـاتەشـدا، ئاگـیـۆن چاوی لەسـەر ئەنتیـفۆلس(A) هەڵنەگرت و بەشـەوقەوە سەیری دەکرد. لێی پرسی: ئایا تۆ ئەنتیفۆلس نیت؟ تۆش درۆمیۆی هاوڕێی نیت؟

هەردووکـیـان وەڵامـیـان دایەوە کـە خـۆیان خـاوەن ئەم ناوانەن.

ئاگیۆن وتی:

- ئایا من ناناسنەوە، باوکـتـــانم؟ هیـچ گـۆڕانێکم بەسەرهاتووە، لەماوەی ئەو حەوت ساڵەی رابردوو؟

ئەنتیفۆلس(A) وەڵامی دایەوە.

- ببـوره، گـەورەم تۆکـێی من هەرگـیـز لەژیانمدا بەبیـرم نایەت کە باوکی خۆمم دیتبێت!

ئاگیۆن.

- چی؟ لەسیـراکیـۆسیش منت نەبینیـبـوو، حەوت سـاڵ بەر لەئێستا؟

ئەنتیفۆلس(A):

- من لەژیانمدا نەچوومەتە سیراکیۆس.

ئاگـیـۆنی بێـئـاگـا! نەیدەزانی دوای کـەمـێکی دیکە گـــەورەتـرین راســـتـی ئاشکرا دەبێت، ناســـینـەوەو شادبوونەوەی هەردوو جمکەکەی!

دۆق لەبەرخۆیەوە دەدوا. واهەستدەکەم ئاگیـۆنیش لەبەر ئەم سزایەی کە چاوەڕوانیەتی واخەریکە شێت دەبێ.

پێش ئەوەی کەسێکی دیکە بتوانێ قسەبکات. ئافرەتە پاکیـزەکە لەناو کلێسـەکەدا بەخۆیی و دوو هەڵاتووەکەوە هاتە دەرەوە. ئەنتیـفـۆلس(S) یەکسـەر بەدیتنی باوکی ناســـیـــەوەو بەرەو باوکی هەنگاوی نا ئەوەی زۆر سەیروسەرسوڕهێنەرترە ئەوەیە، کـاتێک ئافرەتە پاکزەکەش ئاگیۆنی بینی، هاواری کرد.

- ئەگەر تۆ بەڕاستی ئاگیۆن بیت، ئەوا منیش بەڕاستی ئەمیلیای خێزانی تۆم، کەدوو کوڕم لەتۆ هەیە!

ئاگیۆن بەشاگەشکەییەوە وتی:

- ئەگەر ئەمەش یەکێک بێت، ئەی کوا ئەوەی دیکەیان و درۆمیۆی هاوڕێی کە لەگەڵ تۆدابوون لە بەلەمە خێراکەی نێو دەریا؟

ئەمیلیا:

- مـاسی گـرەکان لێـیـان دزیم و تاوەکـو ئێسـتـاش چاوم پێیان نەکەوتۆتەوە، لەوکاتەی لێک جوێ بوونەوە.

دوای بیسـتنی ئەم هەمـوو قـسـانە، دۆقی شـارو ئەدریاناو ئەنگیلۆ و ئەوانی دیکە هەمـوویان بەمـەندە هۆشـیـیـەوە سەیری هەردوو ئەنتیـفـۆلس و هەردوو درۆمیـۆیان دەکرد، بەچاوێکی زەق و وردبوونەوە. دۆق تاکـەکـەس بـوو کـە بەمـەسـەلەکـەی دەزانی، چونکە چیـرۆکـە خـەمـاویەکـەی ئاگیۆن هێشتا لەمێشکیدا دەزرینگایەوە، پێیان وت:

ئاگیۆن ئەمیلیا. ئەمانە هەردووکـیـان کوڕی ئێوەن و ئەم دووبرایەش کوڕی ژنە هەژارو داماوەکەن لەهەمان کاتیشدا هاوڕێی کـوڕەکـانتـانن و. تۆش ئەنتـیـفـۆلس(S) تۆش ئەنتیفۆلس(A)، ئەمانە باوکانی ئێوەن. ئاگیۆن ئێسـتا تۆش ئازادیت. ئێوەش هەردووکـتـان کـامـەتان پارەی ئەم ملوانکەیەی لەلایە؟

ئەنتیفۆلس(S) وەڵامی دایەوە.

- منم گـەورەم من پارەو ملوانکە زێڕەکـەم لەلایەو زۆر خۆشحاڵم بە گەڕانەوەیان بۆ خاوەنە راستەقینەکانیان.

ئەدریانا لێیانی پرسی:

- ئەی کامەتان ئەم ئێوارەیە نانی لەگەڵ مندا خوارد؟

ئەنتیفۆلس(S) بۆ جاری دووەم وەڵامی دایەوە،

- من بووم، خـاتوون خوشکەکەی تۆم خۆشـدەویست، دووبارە دەیڵێمەوە ئەگەر رێگام پێبدەن.

ئافرەتە پاکیزەکە(ئمیلیا) وتی:

ئەم خـۆشـیــانە هەمـووی بانگی ئاهەنگ گـێـڕانمان لێـدەکـەن، من چەندین سـاڵە چاوەڕێی سـاتێکی وابووم. وەرە مێردە خۆشەویستەکەم وەرە کوڕە شیـرینەکـانم، وەرە خـاوەن شکۆ، وەرە هاوڕێیـە دڵسـۆزەکـانم کـوڕەکـانم ئەو جـەمژنە چاوەڕێی ئێـوە دەکـات، بۆ هەمـووتـان! ئەمـە چیرۆکێکی زۆر دووررودرێژە تەنها دەتوانرێت لەسەر مێزی خواردن و خـواردنەوەبگێـڕدرێتەوە. هیـچ خۆشـیـیـەک لە جیهاندا گەورەتر نیە لەو خۆشییەی کە ئێستا من ئەمشەو بەچاوی خۆم دەیبینم!

**سەرچاوە**

**Four Shokespeore Comedies**

# مێژووی موساسیری (برادۆست)و بایەخە ئارکیۆلۆژیەکەی

## بەشی یەکەم

وەرگێر/ یوسف برادۆستی

لە بەهاری ساڵی ١٩٨٤ بەڕێوەبەرایەتی ڕێگەوبانی هەولێر ڕێگایەکی دروست دەکرد لە ناوچەی سیدەکان، کێلێکی دۆزیەوە لە گوندی- تۆپ زاوەی ناوچەی سیدەکان، هەروەها ئەندازیارانی جادەکەش لەژێر خاکدا بناغەی دیوارێکی بەردینیان دۆزیەوە دوایش کەوتە ژێر ئەو جادەی کە لە ناوچەکەدا تێدەپەری کێلی تۆپزاوە- کێلێکی زۆر کۆن و ناوداره، دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە پاشاکانی (نورارتۆر)، دیوارە بەردینەکەی ژێر خاکیش دەگەڕێتەوە بۆ پاشماوەی شاری- (موساسیر)...mususir. یان بۆ پەرستگای خوداوەندی هالسدی- خوداوەندی نەتەوەی ئۆرارتیەکان کە پەرستگای سەرەکیان لە شاری(موساسیر) بووە، کێلی تۆپزاوە لەلایەن (بەڕێوەبەرایەتی- شوێنەوارو کەلتور) لە نزیکەی ٢٠ حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٤ گواسترایەوە بۆ قەڵای هەولێر،

لەناوەراستی حوزەیرانی ساڵی ١٩٨٦ دەستەی ڕێگەوبانی ناوچەی سیدەکان کە سەر بە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگەوبانی هەولێر بوو ڕێگەیەکی دەبرد بۆ سێ گۆشەی سنوری لە ناوچەی سیدەکان لە ئەنجامی پرۆسەی دروست کردنی ڕێگاو- کۆلین لە گردی (شەماشە) کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای گوندی بێرکمە، شوێنەوارێکی یرۆنزیی گرینگ دۆزرایەوە.

(ئەنتیکە)کانی- بریتیبوون لە سەرکەوم و تیرو شیرو خەنجەرو کەرەستەی تری نوحاسی.

لەناو ئەو کەرستانە- کەوگیر ێک دۆزرایەوە کە بۆ دارشتنی کانزاکان بووە.

لەکاتی دەرهێنانی ئەو کەرستانە لەژێر خاک بەهۆی ئامرازی نوێ لەژێر گردی (شەماشە).- ٢٩٢ پارچەی برۆنزی هەمەجۆر بوون، لەوانە ٣ قاپ- جام-ی شکاو سەرەرای هەندێ پارچەی نوحاسی تر، ژمارەیەکی زۆریشیان کەل کرابوون و نەناسراوانەوە لەوانەیە بەهۆی نوکی (شۆفەلەکە) تێک و پێک درابن. لەکاتی






هەڵدانەوەی خۆڵ.

رۆژنامەی جمهوری- بەغدا- لە رۆژی یەک شەممەی ٢٧/ گەلاوێژی ساڵی ١٩٨٦ گوتارێکی بڵاوکردەوە لەژێر ناونیشانی=

دۆزینەوەی- ئەنتیکەی ئارکولۆژی و کەرەستەی جەنگی.

گوتی/ بەم دووایانە/ ئەنتیکەی دانسقەو کەرەستەی جەنگی/ لە گوندی بێرکمە دۆزرایەوە لە ناحیەی برادۆست لە پارێزگای هەولێر/ کە ژمارەیان دەگاتە/ (٣٠٠) سێ سەد پارچە نوحاس، لەنێوانی سەرکەرم و تیرو خەنجەرو- کەوگیری دارشتنی کانزا، هەر لەم بارەیەوە- دکتۆر منیر یوسف طە/ بەرێوەبەری گشتی شوێنەوارو مۆزەکان دەڵێ:-

لەکاتی خۆی ئەم ناوچەیە گوزارشت بوو لەکارگەیەک بۆ چەکدارکردنی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری، کە لە کۆتاییەکانی هەزارەی دووەم و نیوەی هەزارەی یەکەمی پ-ز- هەروەها ئەم چەکانە لەم ناوچەیە دروست دەکران و دوای دەنێردرانە وولاتی ئاشوور، ئەم ناوچەیە هەر لە کۆنەوە بەکەرستە برۆنزیەکانی تەموینی وولاتی ئاشوری دەکرد، دوای توێژینەوە کردنی ئەم چەکانە، توانرا تەمەنیان دەست نیشان بکرێت، کە تەمەنیان دەگەرێتەوە بۆ سنوری ماوەی نێوان ساڵی (١٤٠٠- ١٥٠٠)پ ز- دروست کردنی ئەم چەکانە لەم ناوچەیە بەردەوام بووە تانزیکەی هەزار ساڵ پێش ئەو ناوچەیەی ئەو شوێنەوارەی لێ دۆزرایەوە پێیدەگوترا- موساسیر..، موساسیر بەهەرێمێک دەگوترا لە هەرێمەکانی مەملەکەتی- ئۆرارتۆ- چەقی ئەو مەملەکەتە دەکەوێتە دەوروبەری- گۆلی وان- هەروەها پایتەختی هەرێمەکەش بە (موساسیر) ناو دەبرا، شاری (موساسیر)یش دەکەوێتە باشوری سیدەکان (گوندی- مجیەسەری- ئێستا- کە هێشتا ناوەکە گۆرانێکی وەهای بەسەردا نەهاتووە) وەرگێر، شاری موساسیر- گوزارە لە پایتەختی دواناوەندی یان پایتەختی ئاینی ئۆرارتیەکان دەکات بەشاری خوداوەندی نەتەوەی- هالدی- دادەنرا، پەرستگای سەرەکی یان لەم شارە بووە، سەرجوونی ئاشور (٧٢٢-٧٠٥)پ ز- باسی گرتنی ئەم شارەی کردووەو نەقشێکی ئاشوریش دۆزراوەتەوە کە وێنەو خەسلەتەکانی ئەم شارەی تێدا باس کردووە.

شاری موساسیر- دەکەوێتە گۆشەی باکوری رۆژهەلاتی وولاتی ئاشوور. واتە رۆژئاوای رۆینگەی کێلەشین- موساسیر کۆمەڵە شارێکی دەگرتەخۆ..

لەسەر بۆچوونی هەندێ زانایانی ئارکۆلۆژی، موساسیر «موساسیر» دەکەوێتە نێوانی رۆژئاوای دەریای قەزوین و باشوری «گۆلی وان»(١)

بەگشتی سنوری هەرێمی موساسیر- دەگەیشتە شاری رواندزی ئێستا، بەلام هەندێ جار دورتریش دەرۆیشت تادەگەیشتە هەریرو باتاس، هەروەها لە چاکسازیەکانی- نورارت-دا دیارە کە تەنگەی گەلی عەلی بەگ و خەلیفان و بەرزایەکانی سپیلک بەشێک بوونە لە هەرێمی

موساسیر- دەتوانین بڵێین برادۆستی ئێستا دڵی هەرێمی موساسیر بووە کە پایتەختی موساسیرو پەرستگای خوداوەندی نەتەوەی ئۆرارتیەکان هالدی لێبووە.

گەورەترین شوێنەواری دەستنیشان کراوی وڵاتی موساسیر- کێلی- تۆپزاوەیە- کەلەلایەن- جەنەرال رۆلتسۆنی ئینگلیز لە ساڵی ١٨٤١ز-دا دۆزرایەوە- کێلی- کێلەشین)یش لە ساڵی ١٧٨٠ز- لەلایەن راهیبی ئەلمانی سۆلتس- schulz- دۆزرایەوە هەردوو کێلەکان لەسەر رێگای کاروانەکانی کە بەرەو دەریاچەی ورمێ و گۆلی وان- دەچون بەپێچەوانەش دوای بۆ ووڵاتی ئورارتۆ- یا- هالدی کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای گۆڵی وان.

زۆر لە مێژوونووسان- ئۆرارتیەکان- دەبەنەوە سەر هۆریەکان ئەوانەی کە رۆڵێکی گرنگیان گێرا، لە مێژووی رۆژهەڵاتی کۆندا لە هەزارەی دووەمی پ- ز، کە نیشتەجێ ی بانەکانی باکوربوون لە رۆژهەڵاتی ناوەراست.

ئاشوریەکان زۆر هەوڵیاندا بەتایبەتی دوایی بوژانەوەیان لە ساڵی- ٩١١پ.ز- بە هەموو لایەکدا سنورەکانیان بکێشن تائەوەی لەشکرەکانیان گەیاندە رێچکەکانی چیای زاگرۆس و- تۆرۆس و بەرەو ناوەوەی بانەکانی باکور لە رۆژهەڵاتی ناوەراست رۆیشتن بۆ دەست بەسەر داگرتن و مل کەچ کردنی گەلانی ئەو ناوچەیە وەکو میدیەکان و ئورارتیەکان(هۆریەکان)و(موشکی) و ئەوانی تر یا بۆ تیرۆرو دورخستنەوەی مەترسیان لە رێگە بازرگانیەکانی ئاشوری (-2-)

لێرەوە مل ملانێیەکان زۆر توندبوون لەنێوانی ئاشورو ئوراتۆ تانزیکەی شەش سەدە درێژەی کێشا(٥٦٠ساڵی خەیاند) شاری موساسیر- یەکێک بوو لە شوێنگەکانی ململانێ، هەرێمی پێشەوەی ئۆراریتیەکان بوو لە رووبەرو بوونەوەی لەگەڵ ئاشور، خەسلەتێکی ستراتیژی و ئابوری ئایینی و جوگرافی لەخۆگرتبوو.

مێژووی موساسیر بەشێکە لەمێژووی ئورارتۆ لەبەر ئەوە پێویستە رۆشناییەک بخەینە سەر مێژووی ئورارتۆ بۆ دەرک کردنی مێژووی موساسیر بژێوی ئەو ناوچەیە چۆن بووە بەلایەنی ئورارتیەکان، هەتاوەی کردبوویان بە نزرگەی خوداوەندی نەتەوەیان- هالدی- شاری موساسیر تاکو ئێستاش [دژ بەرێکی] جوگرافی هەیە ئەمەش دەبێتە حەشارگەیەک لە خراپکاری دوژمنایەتی

مێژووی ئۆرارتۆ-uartu

دەوڵەتی ئۆرارتۆ لە ئەرمینیا لە دەوروبەری گۆڵی وان دامەزرا شاری- تشبا-ی- وانی ئێستای کردە پایتەختی خۆی، وای بۆ دەچن کە ساردیوس-ی یەکەم- پادشای هەلدیەکان- یا- ئۆرارتیەکان ئەوشارەی دروست کردبێ. ئورارتیەکان بەرەچەلەک دەچنەوە سەر هەمان ئەو کۆمەلە ئادەمیزادانەی کە لە نەژادی هۆریەکان بوون. ئەو هۆریانەی کە رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە مێژووی عێراقی کۆن لە دەوروبەری هەزارەی دووەمی پ ز، ئەمەش لە دەورانی دەمەزراندنی دەوڵەتی (میتانی) کە لە بەشەکانی باکوری خاکی میسۆپۆتامیا دامەزرا. لە (ناوچەی جەزیرە) نێوانی رووباری دیجلەو فورات کە مەڵبەندی سەرەکی نیشتەجێیان بووە،.



**کیلەشین- کە** ئێستا لە مۆزەخانەی شاری ئۆرمی- یە لە ئێران

وولاتی ئورارتو، دەکەوێتە ناوچەیەکی شاخاوی و زنجیرە چیای بەرز سەرەرای دەشتایی فرەوان و بەپیت و بەرەکەت و ئاوێکی زۆر، ئەمەش بوویتە هۆی ئەوەی ئەو ناوچەیە ببێتە ناوچەیەکی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری، بەشێوەیەکی گشتی بەخێووکردنی ئەسپ جێگای بایەخی ئەوان بووە کە داهاتی سەرەکی ئەو وولاتە بووە، دارستانی زۆرو کانزای جۆراوجۆر لە خاکی ئەو وولاتەدا دەرفەتێکی گەورەی رەخساندووە لەبواری پێشکەوتنی دانیشتوانی ئەم وولاتە. دەوڵەمەندی ئەو وولاتە بە دارستان و کانزاکان و کشتوکاڵ و ئاژەڵداری و نزیکی ئەم وولاتە لە عێراقی کۆن و بازرگانی دۆلی رافدەینی لەگەڵ خۆیدا پەرەی پێداو چالاکی کرد، هەر لە زووەوە. ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دەورانی نیشتەجێ ی بازرگانی (ئەکەدی) لە گۆڵ تەپە(کانیش-ی کۆن-) لە هەرێمی- کیدۆکیا- لە ناوەراستی (ئەنادۆل) لەدەوروبەری سەدەی (٢٣)ی پ ز- لەمەدا کاریگەری شارستانیەتی دۆلی رافیدەین بە تەواوی بەدیار دەکەوێ لەسەر پاشماوەی پاشەرۆکەکانی ئۆرارتۆ-(3)

ئاشوری یەکان لە دەورانی شەلمان سەری یەکەم (١٢٧٤-١٢٤٥پ ز) شەری مەملەکەتی ئۆرارتۆ-یان دەست پێکرد تادورانی سەرجۆنی دووەم (٧٢٢-٧٠٥پ ز) بەشێوەیەکی راستەوخۆ بووە جارجاریش لە رێگەی لاوازکردنی کاریگەری سیاسی بووە لە باکوری سوریا، لەهەمان کاتدا درێژ دەبووەوە تاشاری حەلەب، ئاشوریەکان هێرشە سەربازی یەکانیان دژی ئۆرارتۆ بەرەو (ئەرمینیا) ئاراستەکرد شەلمان سەری یەکەم توانی چیا سەر سەختەکانی- ئۆرارتۆ- تۆراو- دری-یان- ئۆرۆتاری- بخاتە ژێر رکێفی خۆی.(4)

تیگلات پلاسەری یەکەم (١٠١٥-١٠٧٧پ ز) هێرشی کردە سەر وولاتی- نایدی- کە ئەو وولاتە دەکەوێتە باشوری رۆژئاوای گۆڵی وان، هێزەکانی گەیشتن بەقولایی ئەرمینیا- لەشاری (مەلازگرد) پەیکەری بۆ دانرا.

شاری مەلازگرد دەکەوێتە دواوەی گۆڵی وان، یەکێک لە لەشکرەکانی هەستا بەپاک کردنەوەی خاکی موساسیری-و کرمانی لەچیاکانی زاگرۆس دارو دەستەی ناحەزانی

بیل- کاک- ١٠٧٤-١٠٥٧پ ز- پاشای ئاشوری هێرشە سەربازیەکانی کردنە سەر هەر یەکێک لە ئورارتۆ-و- ئارامیەکان. ئارامیەکان لە کۆتای سەدەی شانزەی پێش زاین لە رۆژئاوای وولاتی ئاشور بەدرێژای دۆلی رافیدەین نیشتەجێ بوون.-6-

لە کۆتایی سەدەی دەیەمی پێش زایینی (ئۆرارتۆ)ئەو مەملەکەتە بەهێزو گەورەیە نەبوو، کە ببێتە بەهێزترین بەرهەڵستکاری دەولەتی ئاشور- مەملەکەتی ئورارتۆ/ لەدوای ئەوە لە (ئەرمینیا) دامەزرا.-7-

لەو پانزە ساڵەی کە ماونەتەوە لە تەمەنی فەرمان رەوای ئاشور ناسرپالی دووەم (٨٨٣-٨٥٩پ ز) ئاشور حەسانەوەیەکی گەورەی بەخۆوە بینی لە هەردوو رووی ئاشتی و ئارامی ئیتر لەو ماوەیە هیچ شتێک باس نەکراوە، تەنها باسی یەک هێرش هاتووە لە ساڵی (٨٦٦پ ز) دژی هەڵگەراوەکانی- کاشیاری- طورعابدین- ئەویش هەرێمێکە بەخێرایی دەکەوێتە ژێر گوشاری دەولەتی ئۆرارتۆ/ کە خودان هێزێکی شاراوە بووە، ئۆرارتۆ- لە- دەورانی کۆن بە ئارارات دەناسرا، دوای بە ئەرمینیا

کاتێ شەلمان سەری سێ یەم (٨٥٨-٨٣٤پ ز)و کورەکەی لە باکور تاکو دواوەی دەریاچەی نایری- گرت لەوێوە گەیشتە قولایی شاری ئۆرارتۆ- ئۆرارتۆ/ ئەوکاتە تازە دامەزرابوو لە نێوان چیا بەرزەکانی ئەرمینیا- مێژوونووسان ئاماژەی ئەوە دەکەن کە مەملەکەتی ئۆرارتۆ لە سەرەتاوە یەکێتیەک بوو لە نێوانی سەرۆک هۆزەکان و میرنشینەکان زێتر لەوەی کە دەولەتێک بێ- پروپاگەندەکانی ئاشور وەکو خەسلەتی هەمیشەیان سەرکەوتنی تەواو یەک لاکەرەوەیان بەیان کردووە، واش بۆمان باس دەکەن کە چەندین شاری سەر بە پادشای ئۆرارتۆ- کە پێ ی دەگوترا- ئارامی داگیرکردووە، هەموو سەرچاوەکان دان بەوە دادەنێن دوای ئەوەش بریاری- ئارامی- وەکو دەزانین مەملەکەتی ئۆرارتۆ- بوو بە بەرهەڵستکاری سەرەکی ئیمپراتۆریەتی ئاشوری لە سەدەی (هەشتەمی پ ز)-9-

شەلمان سەر پاشای ئاشور هەواڵی سەرکەوتنەکانی لەسە

دەرگای برونزی نووسی و نەخشاند.

شەلمان سەر لە ساڵی (٨٥٥ پ ز) هێرشێکی ئامادەکرد بۆ سەر ئۆرارتۆ/ بە وولاتی (خابوشکیا) تێپەری بۆ (رۆژئاوای موساسیر هەرێمی بۆتانی ئێستا) شاری سکۆنیای پایتەختی پادشای ئۆرارتۆ-ی داگیرکرد- ئارامی پاشای ئۆرارتۆ هەلات و لە چیاکانی ئەدوری Aduri- پێی گەیشت و شەرێکی خوێناوی لەنێوانیاندا رووی داو سوپای ئارامی شکەستی هێناو سێ هەزارو چوار شەرکەری لێکوژران. دەستی بەسەر برێکی زۆر لە دەسکەوتەکانی جەنگی داگرت لە گالیسکەی جەنگی و ئەسپ و ئێستر.

شەلمان سەر دەڵێ= (ئارام)م تێک و پێک داو کردم بەپاشماوەو کاول بە ناویان کەوتم وەکو گای هار)

شەلمان سەر لە ساڵی دەیەم و یانزەی فەرمان رەوایەکەی. پێنج هێرشی کردە سەر ئارامی لە ئاکامدا دەستی بەسەر سەد شاری وولاتی ئۆرارتۆ داگرت، هەر هێرشێک بۆ کوشتاری ئارامی کرابایە لەلایەن ئاشوریەکان، کە کاتی ئارامی تێدەشکاو شکەستی دەهێنا یەکسەر بۆ چیا دورەکان هەڵ دەهات و دوای دەگەرایەوە، جارێکی تر شەلمان سەر لە ساڵی (پانزەی) فەرمان رەوایدا هێرشێکی کردە سەر وولاتی ئۆرارتۆ، رۆینگەی چیای (طوینبۆ)ی گرت و لەگەڵ هەموو ئەو شارانەی کە دەکەوێتە ئەو دەڤەردو نێوانی سەرچاوەکانی رووباری فورات و دیجلە.

Habuskia- خابوشکیا-

لە ساڵی (٢٧)ی فەرمانرەوایی شەلمان سەر، ئارامی پادشای ئورارتیەکان مرد، کورەکەی (سردوری یان سدوری دووەم بوو بەپادشای ئۆرارتیەکان.

(دیان ئاشور) سەرکردەی گشتی سوپای ئیمپریاتوریەتی ئاشوری لەشکرێکی سازداو هێرشێکی کردە سەر سرودی دووەم پاشای ئۆرارتی- سەرکەوتنی تەواوی بەدەست هێنا Surdueill .

لە ساڵی (٣١) حوکمرانی شەلمانسەری سێ یەم هێرشێکی تری کردە سەر [سدوری] بەسەرکردایەتی [دیان ئاشور] لە رێگای شاری [خابوشکیا و موساسیر- لەم رێگەیەدا بەدواداچوو، پەنجا شاری سوتاندو تالان کرد، ئیتر هێرشەکانی سەلمانسەری سێ یەم وەستان بۆ سەر وولاتی ئۆرارتۆ- تەنها چەند پێک دادانێک نەبێت، هیچ شەرێکی یەک لاکەرەوە روی نەداوە، هەندێ هێرشی تریش کران ئەویش بۆ تەمبێکردنی- هەڵگەراوەکان و ئەو گەلانەی کە سەر بە ئیمپراتۆریەتی ئاشووردوە بوون.

لە دەورانی شمس ئادد-ی پێنجەم (٨٢٣-٨١١پ ز) و کورەکەی سەردەمانی (کیی و مەندی سیاسی و بێ دەنگی یە) بۆ ئاشوریەکان کە نزیکەی سەدەیەکی خایاند.

(شەمس ئادد) هێرشی یەکەمی دەست پێکرد بۆ سەر هەرێمەکانی باکور یان باکوری رۆژهەلات، ئۆرارتۆ هەر وەکو خۆی مایەوەو هەرەشەی زیاتر بوو بۆ سەر ئاشور، زۆربەی چالاکی یەسەربازیەکانی-شمس ئادد- لەو سالانەدا تایبەت بوون بۆ وەرگرتنی پشتگیری و متمانەی سەرکردەکانی وولاتی نایری بۆ وولاتی ئاشور، کە لەمپەرێکی بەهێزی دروست کردبوو لە باشوری رۆژئاوای گۆلی وان.

**سەرچاوەکان نووسەر-**

**١- جورج كڏنتينڎ/ الحياة اليومية في بابل واشور.**
**٢-د- ابراهيم شريف/ الموقع الجغرافي للعراق واثره في تاريخة العام/بغداد/١٦٦/٢-١٦٧.**
**٣- سامي سعيد الاحمد ورضا جواد الهاشمي/ تاريخ الشرق القديم/ ايران والاناضول/ وزارة التعليم العالي والبحث العلمي/ص٨٨.**
**٤-د- جورج روو/ العراق القديم- ترجمة حسين علوان/ بغداد ١٩٨٤ص ٣٥٣.**
**٥- د- جورج روو/ مصدر السابق ص٣٧٥**
**٦- هاري ساكز/ عظمة بابل/ ترجمة د. عامر سليمان/ موصل ١٩٧٩/ص ١٠٠-١٠١-١٠٧**
**٧- د- جورج روو- المصدر السابق/ص٣٨٣**
**٨- هاري ساكز/ عظمة بابل/ص١١٣**
**٩- جورج روو/ المصدر السابعة/ص٣٩٧**
**١٠- هاري ساكز/ عظمة بابل/ص١١٦-١١٧.**
**١١- سترچاوەي وترگير/ جريدة/ خەتبات/ الجمعة ١٩٩٨/٧/١٧ العدد ٨٨٣٠-ص١٢- زبير بلال/القسم الاول.**

# چەند تێبینیێن فۆلكلۆری

خالید صالح

بەرپەرڤەدان و خواندنا هندە پەرتۆک و رۆژنامەو گۆڤارا، ب تایبەت ئەڤێن پەیوەندی ب فولکلوری ڤە هەین بۆ مرۆڤی هندە تشت دیار بن کو گومان تێدا نینە وان تشتان پەیوەندی یا ب کورداو فولکلورێ وان ڤە هەی.

ل ڤێرە ژی دێ چەند تێبینی یا دیار کەین کو پەیوەندی ب کورداڤە هەی و هەمی ئەو تێبینی دچەند هژمارێن گۆڤارا «التراث الشعبي» یاعیراقی دا یێن هاتینە بەلاڤ کرن:

**١- «ئزعرتی»**

سنەت کرنا زارویا رەوشتەکە دناڤ گەلەک مللەتان دا یا هەی، ب تایبەت ئەڤ مللەتێن بسورمان.

دناڤ گەلەک ژوان مللەتاندا ئاهەنگ و شەهیان ب ڤێ هەلکەفتنێ دهێنە گێران، هەرچەند نهو گەلەک ئەو ئاهەنگ و شەهیان یێن کێم ڤە بوین، چونکی سنەت کرن ئەڤرو باراپتر یا بۆیە کارەکێ پزیشکی و شەهیان گێران یا بۆیە بارەکێ ئابوری یێ گران، ب تایبەت بۆ ئەڤ خێزانێن کێم دەرامەت.

ل باژێرێ بەغدا سەرتراش و (ئزعرتی) ب ڤێ چەندێ رادبون، لێ ئەڤ ئزعرتی کی نەوچنە؟

دگۆڤارا (التراث الشعبي)دا دبێژیت:

ئزعرتی مرۆڤێن کوچ بەرن، ژ باژێرێن تورکی دهاتن، وەکی باژێرێن(زعرت)و (بدلیس)و ب کارێ سنەت کرنێ رادبون و ئەڤ مرۆڤە باراپتر ل دەمێ سنەت کرنێ (هاتن کو دکەتە دوماهی یا هاڤینێ و سەرێ پاییزێ دا. ئەڤ ئزعرتی یە هندا ل باژێری کاردکرن وهند دناڤبەرا گوندادا (گەرۆک بون و ئەڤێن ناڤ و دەنگێن خۆ ژی هەین، ل دیڤ داخازا گوندەکێ دەست نیشان کری یان شێخەکی داچینە گوندێ وان و ب کارێ خۆ رابیت.

جلکێن ڤان ئزعرتی یا دەرسۆکەکا پێچای ل سەر کولاڤەکێ رەش و شیتکەک و چانتکەک ددەستا دا و ئەڤ تشتە دوی چانتکی دا بون: دارەک وەکی تەشییێ، پارچەکا ئاسنی وەکی(مەقەسێ)، دەڤک.

هەلبەت(ئزعرتی) هەر(سعرت)ی یان(سێرتی) نە کو ئەو ژی بێ گومان باژێرەکێ کوردستانێیە.

ژێدەر/ گۆڤارا(التراث الشعبي) ژمارە-٤- سالا ١٩٨٨

**٢- «زۆرخانە»**

زۆر خانە یاریەکا ئیرانییە و ژ دوو پەیڤێن فارسی(زۆر+ خانە) واتە(خانی یێ زۆرێ) یانی هێزێ یا پێیک هاتی یەو دکوردی ژی دا هەر ب ڤێ مانێ دهێت، ئەڤ یاریە هەر جۆرە خۆلێکدانکەکە کو ئەو ژی یاریەکا کوردییە.

یاریکەرێ ڤێ یاریێ دڤێت گەلەک رەوشت لێ هەبن ژوانا یێ پاقژو ب دەست نڤێژبیت، باوەری ب سورمانەتێنی هەبیت، رەوشت پاک بیت، جگارە کێشان و ڤەخارن ل نک نەبیت.

تەماشەڤان ژی دڤێت هندە مەرجا ب جه بینت ژوانا: تەناهیێ ب پاریزیت. چ ل مەشقێ و چ ژی ددەمێ خۆ لێکدانکێدا، دەرگەهێ سەرەکی رابچیتە ژوور کو سەرە دەرا وێ یانزمەو تەماشەڤان یێ نەچارە خۆ ب چەمینت و بچیتە ژوور وەکی رێزگرتنەک بۆ ڤێ یاریێ.

مێژوویا ڤێ یاری یێ ل بەغدا دزڤریتە پتر ژ(١٧٠) سالا، دەمێ سێ خورت ژ بەغدا چوونە تەهران و ل وێرێ چوونە باژێرکێ زۆر خاناو(٤٥) رۆژا ل وێرێ ماین شەهرەزایی ڤێ یاری یێ بوین و یاریکەرین وێ نیاسین و

هەر ل ژڤـرینا وان بۆبەغـدا رابۆن سێ زۆرخـانە ل بەغـدا ڤـەكرن و ئـيـدى ئەڤ ياريە رۆژ بۆ رۆژێ هەر گـەشـەكـرو زۆرخـانە هەر مـشـە بۆن و سـەرپەشـێن وان گـەهشـتـە پارێزگـەها و دوو زۆر خانە ل پارێزگـەها كـەركـوك هاتنە ڤەكرن ب رێبەری يا (شێخ محمد علی).

ل دوماهی یێ فەرە بێژین كو چەندین یاریكەر ل بەغدا ب ناڤ و دەنگ بۆن بەری ئەڤ زۆرخـانە ب ئێكجـاری نەمـینن و وەكی هەر ژناڤـان دیار گەلەک ژوان كـورد بۆن، لێ گۆڤارا (التراث الشعبي) ب ج رەنگا دەست نیشان نەكریە وێ چەندێ و ژوان ناڤان و ژبلی وان ژی:

-**(علو الكردی)**: كو دبێـژن وی خەتیرەكا شـەمـالكا ل هەیڤا (محەرەمێ) هلدگرتن كو یا پێک هاتن بۆ ژ(٤٠) شەمالكێن هەل.

-**(مصطفی البهلوان)**: یان **(مصطفی العسكری)**، ئەو ژی (مستەفا كورێ عەبدولرەحمان عەسكەری)یە، بابێ وی (جـەعـفـەر عـەسـكەری) یە، كـو ژبنیـات ژ گـوندێ(عـەسكەر)ل دەڤـەرا(سلێـمـانی یێ) یێن هاتین، (مـسـتـەفـا) ئەفـسـەر بۆ دناڤ لەشكەرێ ئوسـمـانی دا، گـەلەک دڤێ یاری یێـدا یێ زیرەک و شـەهرەزا بۆ، شیاسەركەڤیت ل سەر یاریكەرێ ئیرانی(ئەكبەر بوزورگ) كو ئەو ژی ژنەژاد كورد بۆ.

-**(حـاج حـەسـەن كـورد)**: ل سـالا(١٨٦٥)یێ ل تاخێ(سراج الدين) یێ ژ دایک بۆی و ل سالا(١٨٨٣) یێ دەست ب ڤێ یاریێ كری و چەندین سەركەفتن یێ ب دەست ڤە ئینایین و ل سالا (١٩٦٢)یێ دنیا یا لێ تارێ بۆی.

-**(خەلاوی الكردی)**: ئەڤـە ژی یێ ب ناڤ و دەنگ بۆ گەلەک سەركەفتن ب دەستڤە ئینا بۆن.

- **(صـادق الصندوق)**: ل سـالا(١٩١٣)یێ ل تاخێ كوردا یێ ژدایک بۆی.

- **(عباس الديک)**: ل سالا(١٩٠٢) یێ ل بەغدا یێ ژ دایک بۆی.

- (مـیـرزا جـعـفـر): خـودانێ مـەزنتـرین وب ناڤ و دەنگترین زۆر خانە ل باژێرێ گەرمەنشا.

- **(صادق بلوفروش)**.

هەلبەت ژبلی كەركوک ل كوردستانێ وەكی (سجادی) دبێژیت.

«یەكـەم جـار چاڤێ من یێ ڤ ڤێ یاری یێ كـەتی ل باژێرێ(سنە) بۆ.

زۆرخانا (پالەوان ئەحمەد)

**ژێدەر- گۆڤارا(التراث الشعبي) ٩-١٠/ سالا ١٩٨٤ الزورخـانات فی القطر العـراقی- الحاج ابراهیم حلمی حسن**

**- كـوردەواری- عـلاءالدین سـجـادی- زۆرخـانە- بپ ٢٥٠-**

**- گۆڤارا-گولان) ب زمانێ عەرەبی- ژمارە- ٥١ سالا ٢٠٠٠**

**نوزت الدهوكی- الكرد والمصارعة وبیوتات الزورخانة**

**٢-«قوربەشک»**

ئەڤ گیـانداره هەر دكـەڤن دا ل كـوردسـتـانێ یێ هەی، پیـرتێ ڤی گـیـانداری یێ خـولیكی یان قـەهوایی یەو نیـشـانێن رەش و سـپی یێن لێ هەین ، خـارنا وی یا سەرەكی تشـتـێن چاندنێ و چەند گـیـاندارن وەكی مـارو جـردو كـێـرویشک و كـرم و... ئەڤ گـیـانداره ژ(٣-٥) تێشكان دئینیت و دوو رەنگ ژێ یێن ل عیراقێ هەین ب عـەرەبی دبێـژنێ (غـریریه Badger)و(راتل یان كـعب Ratel) . ڤی گـیـانداری گەلەک ناڤ د عەرەبی دا یێن هەین، ئەو ژی ل دیڤ زاراڤ و دەڤـەرایە وەكی(الزبزب، الغریر، الطبرة، الزرنب، البزیز، الگرطه، حفار القبور، اكل العسل).

دیسان نڤێـسـەرێ بابەتێ دگۆڤارا (التراث الشـعبي)دا دبێژیت:

ل دەڤـەرا سلێـمـانی یێ دبێـژنە ڤی گـیـانداری «قـوربەشک» (هەلبـەت ل دەڤـەرا بەهدینا ژی هەر ئەڤ ناڤـە یێ هەی)و ل كـەركـوک دبێـزنێ «قـورت» و پاشـڤـەمـایێن ڤێ گـیـانداری دگـەلەک شكەفـتـان دایێن هاتینە دیتن و ژوانا شكەفتا **(شانەدەر)** ل كوردستانێ.

دناڤ فولكلورێ بەغدا دا ترسەک ژڤی گیانداری هەبو، ب شـەڤ نۆبەت دگـرتن نەكـەئێكی دخـەودا بخـۆت و تا سپێدێ تەست و ئامانێن سفری ژترسان هەر لێددان و ل

سالا(١٩٠٩)ێ گیاندارەک ژڤان ل رەخ و روییێن بەغدا دیتن یێ کوشتی، خەلک ب مەندە هۆشی دچوون دابیینن.

لێ ئەڤ ترسە دناڤ کوردان دا نەبویە، نڤێسەرێ بابەتێ دبێژیت. ل سالا (١٩٤٨)ێ ئێک ژڤان قوربەشکا هاتبو دناڤ کۆلانکێن بەغداداو ترس و لەرز کەتبو دناڤ خەلکی دا، لێ ل شەڤەکێ **مامۆستا تەوفیق وەهبی** ل دیڤ چوو تاشیای دوماهی یێ ب کوژیت و ئەڤ گیاندارە هینانە مۆزەخانا سرۆشتی دا ب حەبینن

**ژێدەر/- گۆڤارا(التراث الشعبي) ژمارە(٥-٦) سالا ١٩٨٣**

**البزيز في الايام الخوالي- محمد جاسم البهرزي.**

**٤- خارنا«الكرديه»**

بەری پتر ژ(٨٠٠) سالا پەرتۆکەک ب زمانێ عەرەبی دەرکەت بۆ. ئەڤ پەرتۆکە یاتایبەتمەند بۆ ب خارناڤە ناڤێ، وێ(كتاب الطبيخ) بۆ، نڤێسەرێ وێ(محمد بن الحسن ابن محمد بن الكريم الكاتب البغدادي) بۆ، ئەڤ پەرتۆکە ژلایێ(د- داود الچلبي) ڤە ل(جامع أيا صوفيا) ل ستەنبۆل هاتبو دیتن و دانا بتنێیە هاتییە دیتن کو ل سالا (١٩٣٤)ێ ل چاپخانا (ام الربيعين) ل باژێرێ میسل ژلاین(چەلەبی)ڤە هاتییە چاپ کرن.ڤێ پەرتۆکێ ناڤێ پتر ژ(١٧٠)ێ خارنا یێن دناڤ خۆدا گرتین و رێکا درست کرنا وان، ناڤێ وان خارنا دناڤ چ فەرهەنگاژی دا نەهاتییە دیتن و میژوو یاوان خارنا ڤەدگەرێتە چاخێ عەباسی یا.

نڤێسەرێ بابەتی پەرتۆک یاکری یە دەهـ پشک و هەر پشکێ ناڤێ چەندین خارنا یێن تێدا ب رێزکرین.

پشکا سێ یێ ژڤێ پەرتۆکێ ناڤێ چەندین خارنا یێن ب رێزکرین کو ئێک ژوان خارنا ناڤێ وێ(الكرديه)یە،لێ ئەڤ خارنە چیە و چەوا درست دکەن و چ پەیوەندی ب کوردان ڤە هەیە؟ هیڤی دکەین ل داهاتی دیارو ئەشکەرابیت.

**ژێدەر/- گۆڤارا(التراث الشعبي)- ژمارە(٩-١٠) سالا ١٩٨٤**

**كتاب الطبيخ- دراسة: كاظم سعدالدين**

**٥-«دهۆل و زورنا»**

بابەتەکێ فولکلوری ل ژێر ناڤێ(کارتێکرنا موسیقا عەرەبی ل سەر موسیقا ئەوروپی) دا ناڤێ چەندین ئامیرا یێن ب رێز کرین و ژوانا دهۆل و زورنا، کو نڤێسەرێ بابەتێ دبێژیت:

(زورنا) پەیڤەکا تورکی یە(هەلبەت کوردی ژییە) و ل هەمی وەلاتێن عەرەبی بە لاڤ بۆ ل سەدێن ناڤین یا گەهشتییە ئەوروپا.

(دهۆل) ژێ ئامیرەکێ موسیقی یە، ئە،وروپی یا ژ (رۆژ هەلاتێ وەلاتێن عەرەبی) یا وەرگرتی دەمێ شەرێ(خاج پەرێسادا).

هەلبەت نڤێسەری ب چ رەنگا ناڤێ کوردان نەهینایە، لێ بۆچی رۆژهەلاتا وەلاتێن عەرەبی و بۆ نەکوردستان؟ دەمێ خاچ پەرێسا مانە هەر ئەو دەمە یێ کو لەشکەرێ (سەلاحەددینی) گەهشتییە لەشکەرێ ئەوروپی؟

**ژێدەر/- گۆڤارا(التراث الشعبي)- ژمارە(١١-١٢) سالا ١٩٨٠ نماذج من أثر الموسيقي العربية علي الموسيقي الاوربية- عبدالجبار محمود**

**٦- «ناڤ»**

ژبو کورت کرنا ناڤا ب تایبەت ل دەڤەرێن ب کرمانجی یا ژووری د ئاخڤن دێ بینی تیپا(و) ل دوماهی یێ زێدە دکەن، بۆ نموونە:

عەلی دێ بیتە عەلو، ئەحمەد دێ بیتە ئەحمو، محەمەد دێ بیتە محو عەبدولا دێ بیتە عەبو... هتد

ل دەڤەرا موسل ژێ هەر ئەڤ رەنگە کورت کرنە یا هەی ، دهژمارەکا گۆڤارا(التراث الشعبي)دا نڤێسەرێ بابەتێ چەندین ناڤ هەر ب ڤێ رەنگێ یێن ب رێز کرین:

(عبدالله- عەبو)(محمد- حەمو)·عبدالقادر- قەدۆ)(علي - عەلو)(عبدالرحمن- رحو)(عزيز- عەزۆ)(بلال- بلو)(خليل- خەلو)(سليمان يان سليم- سەلو)( فاطمە· فەطو)( خديجە- خەجو)(أمنە- ئامو)... هتد

کورت کرنا ناڤا باور ناکەم دچ زاراڤێن عەرەبی دا ب ڤێ رەنگی هەبن.

ژبلی دەڤەرێن نێزیکی کوردان ب تایبەت موسل ئەو ژێ

هەلبەت ژبەر کارتێکرنا کوردان ل سەر وان ئەگەر هەر ژبنیات ژوان بخو نەدەرکەتبیت و ئەو بخو ژبنیات کورد نەبن.

ژێدەر/- گۆڤارا(التراث الشعبي) ژمارە-٩-سالا ١٩٨٠.

(النحت والتصغير في لهجة الموصل العامة محمد شيت

٧-«نيسانۆک»

ل سەر کولیلکا نیسانێ، ئەوا دبێژنێ(نیسانۆک) (الشقيق يان شقائق النعمان) دناڤ فولکلورێ موسل دا سەرهاتییەک یاهەی:

دبێژن کچکەکا گوندی داچیتە سەر رویبارێ ئاڤێ، چاڤێ وێ ل لایێ دی یێ رویباری ڤ نیسانوکەکێ کەت و کەتە دناڤ هزرادا:

ئەز دێ شوی کەم و دێ من بچویکەک بیت، ئەو بچویک دێ مەزن بیت و دێ هێتە سەر رویباری و چاڤێ وی دێ ڤ کولیلکا هە کەڤیت (نیسانوک)، دێ جلکا ژ بەر خۆکەت و چیتە وێ کولیلکێ، دێ چیت کەت و دێ زڤریتە ڤە، تا دزڤریت ل نیڤا ئاڤێ دێ واستیێت و دێ دئاڤێ دا خندقیت... ژناڤ ڤان هزرا دەرکەت و کرە گری و بخو دادا... هەوارە کورێ من... خویشکا وێ دەنکی را هات گۆتێ: تەخێرە؟ گۆت: حال و مەسەلێت من ئەڤەنە ... وێ ژی لخو داداو کرە گری... هەوارە ئەز بۆ خارزایێ خۆ نەمینم.

دەیک دیڤ راهات، وێ ژی چیرۆک زانی... وێ ژی بخۆ دادا... هەوارە ئەز بۆ نەڤییێ خۆ نەمبینم.

وەسا... باب و هەمی مال لدیڤ راهاتن و بۆ نیهاری ل ویرێ، تا ئاقلدارەک ل وان پەیدا بوی و هەدارا وان هینای و هەمی جارەکادی زڤراندی نە مال ڤە.

ئەڤ چیرۆکە دناڤ فۆلکلۆرێ کوردی ژی دا یێ هەی و هەر وەکی وێ دناڤ گۆتنێن مەزنان دا(پەندا) دێ بێژن(بی کولیلکا دەرێ کانێ یێ) یان(بۆ کولیلکا تێلی یا) کو دیسا کچکک جەرکەک راکر داچیتە ئاڤێ، چاڤێ وێ ل دەرێ کانی یێ ڤ کولیلکەکێ دکەڤیت ل دەرێ کانی یێ و دکەڤتە دهزرادا:

ئەز دێ شوی کەم و دێ من کورەک هەبیت، دێ هێتە سەر کانی یێ و چاڤێ وی دێ ڤ کولیلکێ کەڤیت، دێ چیت دابکەت، بەلێ دێ دئاڤێ دا خندقیت و ... وەسا دکەتە گری و خویشک دیڤدار ادهێت و ئەو ژی دگریت، تا بابێ وان دهێت و هەردووان بێ دەنگ دکەت.

ل ڤیرە دیار دبیت فۆلکلۆر ل دەڤەرێن نێزیک چەند کارتێکرنێ لێک دکەن و ب بۆرینا سالا فۆلکلۆر بۆ یێ ب هێزتر دمینت ، ئەڤە ئەگەر موسل دریژاهی یا جوگرافی یا کوردستانێ نەبیت.

ژێدەر/- گۆڤارا(التراث الشعبي) ژمارە(٣-٤) سالا ١٩٨٤

الازهار ومدلولاتها عند العامه- بتول سليمان داود

- مشتاخا چیا ژ گۆتننێن پێشیا- مەلا محمود دیرشەوی

- خەرمان- حەمە صالح فەرهادی- ١٩٩٧

شیانۆکێ گەلەک ناڤ یێن هەین:

گولە مێلاقە- باتینۆک- گولا سۆر

٨-«مقام بێژ»

هەر بازێرەکی کەلەپۆرێ خۆ یێ تایبەت ب خوڤە یێ هەی. بەغدا ژی ئێکە ژوان بازێرا کو کەلەپۆرێ خۆ هەی و ئێک ژوان کەلەپۆرا(چایخانە) نە، چایخانە هەلبەت ددەمێ خۆدا بنگەهەکێ گرنگێ کۆم ڤە بینابییە و گەلەک کارل ویرێ دهاتنە ئەنجام دان، ئەڤ چایخانە ژی هەر ئێک باراپتر یا تایبەت بییە ب کارەکێ تایبەت ڤە بۆ نموونە: هندەک ژێ جهێ کرین و فرۆتن و کۆم ڤەبۆنا بازرگانا بۆیە، هندەک ژێ جهێ فرۆتنا کایێ بۆینەو هندەک جهێ کۆترو شەرێن دیکلا بۆینەو هندەک جهێ رەوشەنبیرو مامۆستاو خانەنشین و ... بۆینەو... وەسا.

ژبلی ڤان هەمی یا چایخانە جهێ کۆم ڤە بۆنا مقام بێژا بۆینە (مقامێن عیراقی)و مقام لێ گوتن نەو هەر مقام بێژەکی چایخانا خۆ یا تایبەت هەبۆیە. ئێک ژوان مقام بێژا ب ناڤێ(حسين الكردي) بۆیە، کو ڤی مقام بێژی ل چایخانا (التبانه) ل الفضل) مقام دگۆتن... هەر چەند ژبلی ڤێ چایخانێ ئەڤ مقام بێژە ل گەلەک چایخانێن دی تر ژی دگەری یا...

ل دوماهی ییّ فەرە بێژین کو ناسناڤێ (الكردی) ل بەغدا هەر بتنێ بۆ کوردا دهێتە ب کار هینان و گومان دوێ چەندێ دانینە کو ئەڤە ژی ئێکە ژ گەلەک مقام بێژا کو ژ نەژاد کوردو مقامێن عیراقی گۆتین و دەنگێن وان ل چایخانێن بەغدا بلند بوین.

**ژێدەر.- گۆڤارا (التراث الشعبي) ژمارە(٥-٦) / ١٩٨٣**

**المقاهي ووظائفها الاجتماعية- د. نوری حمودی القيسی**

**٩-« خودانا دوو بهارا»**

ل( ١٠ نیسانا ) سالا( ١٩٦٩)ێ یەکەم ڤیستەڤالا(ام الربیعین) ل باژێرێ موسل هاتە کرن و هێشتا یا بەردەوامە، ئەڤ ڤیستەڤالە هاتبو کرن چونکی دوو بهار یێن لێ هەین. پاییزو بهار): ل بهارێ ئەڤ دەڤەرە مینا هەمی کوردستانێ دهێتە خەملاندن و ب سەدا رەنگ و جورێن گیا و گول و کولیلکا.. ئادارۆک، ونیسانۆک و سیسن و بەیبین و نێرگزو شلێرو...

نڤێسەرا بابەتی گەلەک جهو دەڤەر یێن دەست نیشان کرین (وەکی نڤێسەر دبێژیت)موسل) کو ئەو گیاو گول و کولیلک لێشین دبن، لێ ئەگەر تو لێ بچی دێ بینی پتری یاوان دەڤەران هەر کوردستانن و خەڵکی وێ هەمی کوردن و ژوان جهێن نڤێسەرێ دەست نیشان کرین و ئەو کیاییێن لێ شین دبن

- نێرگز: دناڤبەرا میسل و ئاکرێ شین دبن.
- (الحجکپی): ل هەولێرێ دبێژنێ(چوغان)
- کەنگر(الكعوب): کورد خارنەکێ ژێ درست دکەن دبێژنێ(کنرماسی)

واتە دگەل ماسی یا ، دبیت هەر(کەنگر ماست)بیت کو دگەل ماستی چێ دکەن

تۆلک. الخباز: کورد دگەل ساڤارێ دلێنن و دبێژنێ. تۆلک ساوەر)

- (زهر الترمس): ل دەڤەرا سلێمانیێ یا بەلاڤە.
- (الاقحوان): ل چیایێ پیرمام، دناڤبەرا صلاح الدین و سەرەردش یابەلاڤە.
- (قرنفل هندی): ژنکێن سلێمانیێ رستکا پێ چێ دکەن.
- هنار: هنارێن ب ناڤ و دەنگ یێن هەین وەکی هنارێن شەهرەبان و هنارێن(شوشێ) ل نێزیکی ئاکرێ و هنارێن( مسابق) ئەوێن تیڤل تەنک ل پارێزگەها دهۆکێ (واتە هنارێن مسافک).
- جلنار(زهره الرمان): ئەڤ ناڤە گەلەکێ بەلاڤە ل ناڤ عەرەبێن عیراقێ وناڤێ وێ(گول هنارە) کو کوردو فارس ب کار دهینن.

ل دوماهی ییّ فەرە بێژین کو هەر کوردستانە خودانا دوو بهاراو چار وەرزێن سالێ.

ژێدەر/- گۆڤارا(التراث الشعبي). ژمارە(٣-٤/ سالا ١٩٨٤)

الازهار ومدلولاتها عند العامه- بتول سليمان داود

- خەرمان- حەمە سالح فەرهادی / ١٩٩٧

*(الاقحوان): ب سۆرانی دبێژنێ هەمیشە بەهار

(چوغان): گیایەکێ وەکی کەرەفسی یە، ب کار دهینن بۆ درست کرنا سابینێ.

**١٠-«نێرگز»**

نێرگز گولەکا بێهن خۆشەو ل کوردستانێ گەلەکا بەلاڤە... لێ ل نک کوردان نێرگز نەبهارەو بێهن و جوانی یا وێ نەیا بهاریێیە، لەوما ستری دبێژیتێ(هەر چەند ستری)یە ژی:

**نێرگزێ...**

**حەیا سزێ ...**

**تەنەهێلا بهار بزێ...**

عەردب ژی خۆ ژڤێ گولێ ددەنە پاش وەکی دیاری.

دبێژن ژنکەکێ دخەونێ دا دیت مێرێ وێ یێ دەستکەکێ نێرگزا دکەتە دیاری بۆ وێ، چوو پرسیارا خەونا خۆ کر گوتنێ:

زەلامێ تە دێ تە بەردەت!!

ئەڤ ئاخفتنە گوتێ ل دیڤ گۆتنا هۆزانڤانەکی:

ليس للنرجس عهد- انما العهد لآسن

ژێدەر. گۆڤارا (التراث الشعبي) هەر ژمارا (٣-٤) سالا ١٩٨٤

الازهار ومدلولاتها عند العامة- بتول سليمان داود.

# ((پەیوەندی مێشک بە زیرەکییەوە))

و/ بەهرە فەیسەل

زۆرجار بەهەڵە قەبارەی مێشک بەزیرەکییەوە دەبەستینەوە، هەروەها گەلێ جاریش بەهەڵە ئەو قسە باوە دەڵێینەوە، کە مرۆڤی زیرەک بیرکردنەوەی بەهێزە، لەڕاستیدا ئەم سێیانە بەیەکەوە بەند نین. ئەم وتارە رووناکی دەخاتە سەر زۆربەی ئەو گوتەباوانەی لەم بوارەدا دەکرێن:-

مێشک- کە سەرچاوەی زیرەکی و ئەو شوێنەیە کە بیرەوەری تێدا دەپارێزرێ بەگرنگترین و ئاڵۆزترین سیستەمی لەش دادەنرێت. بریتییە لە شانەیەکی زۆر نەرم و خاو و وەکو شانەکانی دیکەی لەش بەشی زۆری پێکهاتەکەی ئاوە. ئێسکە بەهێزەکانی کەللەی سەر مێشک لە کارتێکەرە دەرەکییەکان دەپارێزن. لەنێوان مێشکی نەرم و هەستیارو ئێسکی کەللەی ردق و بەهێزدا چینێک لەشانە هەیە پێی دەوترێ مێشک کە ئەویش نەرم و شلەو بە مێشکەوە نووساوە، بۆیە هیچ زیانێک بەمێشک ناگەیەنێ. لەگەڵ ئەم دەوروبەری مێشک و مۆخەیەت بەشلەیەک دەورە دراوە کە لە کاریگەری هێزی کێشکردنی زەوی دەیپارێزێ و هەروەها ئەم شلەیە دەبێتە هۆی هێورکردنەوەو مژینی هێزی بەرکەوتنێک کە بە کەللە سەر دەکەوێ و نایەڵێ کار لە مێشک بکات مەگەر زۆر بەهێز بێت.

بارستایی مێشکی نەهەنگ لەوانەیە بگاتە [٩] کیلۆگرام و بەمەش مێشکی نەهەنگ گەورەترین مێشکە لەناو هەموو گیاندارانداا، دەشزانین کە نەهەنگ لە هەموو گیانداران زیرەکتر نین، بۆیە دەتوانین بڵێین کە گەورەیی مێشک مانای زیرەکی نییە. بۆ ئەوەی جۆرە پەیوەندیەک لەنێوان بارستایی مێشک و قەبارەکەی و زیرەکی بدۆزینەوە دەبینین دوو جۆرە فەرمان هەن، کە مێشک بەجێیان دەگەیەنێ:-

١- کۆنترۆڵ کردنی کاری هەموو سیستەمەکانی لەش و رێکخستنی نێوانیان.

٢- بیرکردنەوەو بیرهاتنەوەو توانای شیکردنەوەو گەلێ لەو کارانەی کە ئاستی زیرەکی نیشان دەدەن کە هەندێ جار پێیان دەوترێ تێگەیشتن یان هۆش.

ئەگەر لەشی گیاندارەکە گەورەبێ- هەروەکو لە نەهەنگ و فیلدا- ئەوا مێشک هەموو وزەی خۆی بەکاردێنێ بۆ راپەڕاندنی کارەکانی ئەم لاشە گەورەیەو کەمێک بۆ زانین و بیرکردنەوە دەمێنێتەوە لێی، بەمەش ئاستی زیرەکی کەم دەبێتەوە، بۆیە لێرەدا دەردەکەوێ کە بەکارهێنانی رێژەی نێوان بارستایی مێشک و بارستایی لەشی گیانەوەرە زیندووەکە وەکو پێوەرێک یان بەڵگەیەک بۆ زیرەکی باشترە لەوەی تەنیا بارستایی مێشک بەتەنیا بەکاربهێنرێ. بۆ کورت کردنەوەی بەو رێژەیە دەڵێین [رێژەی دوو بارستاییەکە].

[گاری جۆنسن] لە زانکۆی کالیفۆرنیا رێژەی دوو بارستاییەکی بۆ گەلێ گیانەوەرانی زیندوو لێکداوەتەوەو بۆی دەرکەوت کە بەم پێیەی خوارەوە پتر دەبێ:- ماسی، خشۆکەکان، باڵندەکان، مەمکدارەکان. واتە، رێژەی دوو بارستاییەکە لە مەمکدارەکان لە هەموویان گەورەترە- ئەمەش لەگەڵ پەرەسەندن و ئاڵۆزتر بوونی سیستەمی بایۆلۆجیەکانی ئەم بوونەوەرانە رێک دەکەوێ. ئەگەر بۆ نموونە، بارستایی مەمکدارێک لەگەڵ بارستایی خشۆکێک وەکو یەک بوو، ئەوا مێشکی یەکەم بەلای کەم بە [١٠] جار لە هی دووەم گەورەتر دەبێ، لەوانەشە بگاتە [١٠٠] جار. دەربارەی مەمکدارەکان، ڕدوەی قیتەکان [ئەوانەن کە لە هەموو مەمکدارەکان پتر پەرەیان سەندووەو مرۆڤ و مەیموونیش دەگرێتەوە] گەورەترین رێژەی دووبارستاییان هەیە. ئەم رێژەیەش بە [٢تا ٢٠] جار گەورەترە لە رێژەی دووبارستایی مەمکدارەکانی دیکە. گومانیشی تێدا نییە، کە رێژەی دووبارستایی بۆ مرۆڤ گەورەترین رێژەیە لەناو هەمووانداو دەگاتە [٢/٥] واتە هەر [٥٠] گرامێک لە لەش بەرامبەر یەک گرامە لە مێشک. ئەم خشتەیەی خوارەوە ناوەندی بارستایی

میشک و ڕێژەی دووبارستاییەکە لە هەندێ گیانداری زیندوو نیشان دەدات:-

دوای مرۆڤ لە گەورەیی ڕێژەکە هەردوو دۆلفین و شامپانزی دێن [خشتەکە] باوەڕیش وایە کە هەردووکیان بەرادەیەک زیرەکن.

دەزانن کە دۆلفین شەپۆلەکانی دەنگ بەکاردێنێ وەکو زمانێک بۆ قسەکردن و تێک گەیشتن لەناوخۆیاندا ئەو زمانەی دۆلفین تارادەیەک بەئامێری سۆنار دەچێ، کە بۆ دۆزینەوەی تەنەکانی ناو ئاو بەکاردەهێنرێ. ئەم ڕێگەیەش تائێستا بەتەواوی نەزانراوە، بەڵام هەندێ لە زانایان باوەڕیان وایە کە دۆلفین ئەو شەپۆلە دەنگیانە دەنێرێ کە بەو شەپۆلانە دەچن کە بە تەنەکان دەکەون و دەگەڕێنەوە، کاتێک کە دۆلفینێکی دیکە ئەو دەنگە وەردەگرێ، ئەوا ئەو شەپۆلانە بۆ ئەو دۆلفینە وەکو ئەوە وایە کە وێنەیەکی دەنگی بۆ ئەو تەنەی بداتێ کە ئەو ویستویە بۆی وەسف بکا. بەمەش دەتوانین بڵێین کە دۆلفین بە ڕێگەی وێنەی بیستراو [ئەگەر دەربڕینەکە ڕاست بێ] لەگەڵ یەک قسە دەکەن.

هەرچی سەبارەت بە شامپانزیە ئەوا هەوڵدان زۆرە بۆ ئەوەی فێری زمانێکی بکەن، هەندێکیان بە بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و هەندێ لە زانایانیش گەش بینن، چونکە پێیان وایە دەکرێ دوای چەند کۆزێکی دیکە نەوەیەکی نوێ لە شامپانزی پەیدا ببێ کە توانای قسەکردنی هەبێ.

پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە هەندێ لادان لەو پەیوەندیەی نێوان ڕێژەی دووبارستاییەکە لەگەڵ زیرەکیدان هەن. بۆ نموونە: ڕێژەی دووبارستاییەکە بۆ هەندێ مێشوولەی بچوک لەوانەیە بگاتە ڕێژەی دووبارستاییەکەی مرۆڤ یان پتریش، باوەڕوایە کە سنوورێکی ئەو پەڕی کەمی هەیە بۆ قەبارە یان بارستایی مێشک و ئەگەر لەو سنوورە کەمتر بوو ئەوا زۆربەی یان هەر هەموو توانای زانین و بیرکردنەوەی نامێنێ، بۆیە لەو حاڵەتەدا ڕێژەی دووبارستاییەکە گوزارشت لە زیرەکی ناکات.

بابێینە سەر مرۆڤ، لەوانەیە هەندێک بپرسن ئایا دەتوانین زیرەکی یەکێک دیاری بکەین بەپێوانی ڕێژەی دووبارستاییەکەی؟. پێش وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە تێبینی ئەمانە دەکەین:

یەکەم: بارستایی مێشکی ئافرەت بەنزیکەی [ ١٥٠ ] گرام لە بارستایی مێشکی پیاو بچووکترە. لەبەر ئەوە بەگشتی بارستایی لەشی ئافرەت لە بارستایی لەشی پیاو کەمترە، ئەوا مانای وایە کە ڕێژەی دووبارستاییەکە لە مرۆڤدا پەیوەست نییە بە جنس.

دووەم: منداڵ کە لە دایک دەبێ مێشکێکی گەورەی هەیە و بەگشتی مێشکی منداڵ لەکاتی لە دایکبووندا دەگاتە [ ٣٥٠ ] گرام- ئەمەش وا دەکا کە ڕێژەی دوو بارستاییەکە لە منداڵدا ببێتە نزیکەی [ ١٢٪ ] واتە شەش ئەوەندەی ڕێژەی گەوران، مێشکی منداڵیش بەخێراییەکی گەورە گەشە دەکا بەتایبەتی لە سێ ساڵی یەکەمی تەمەنیدا کە بەساڵانی فێرە قسەبوون و فێربوونی خێرا دادەنرێ کە دەست نیشانی ئاستی زیرەکی دوا ڕۆژی دەکات.

فێربوونی منداڵ لە دەوروبەرەکەی دەبێتە هۆی پتربوونی تێکەڵی مێشکی و بارستاییەکەی و بەمەش خانەکانی مێشکی زۆر دەبن و ئەوانەش کە هەن چوست و چالاکتر دەبن کە یارمەتی خێرابوونی فێربوونی دەدەن لە دوا ڕۆژدا، کە منداڵ ساڵی یەکەمی تەواو دەکا ڕێژەی دووبارستاییەکەی بۆ نیوەی کاتی لە دایکبوونی کەم دەبێتەوە [نزیکەی ٦٪ ] لە ساڵی چوونە بەر خوێندندا [ ٦،٥ساڵ] مێشکی منداڵ دەگاتە [ ٩٠٪ ]ی مێشکی گەوران، بەڵام بارستایی لەشی نزیکەی [ ٢٠٪ ]ی بارستایی گەورانە، لەمەوە گرنگی ساڵانی یەکەمی منداڵ دەردەکەوێ نەک هەر بۆ گەشەکردنی لەشی، بەڵکو بۆ کاریگەریشی لەسەر زیرەکی لە دوا ڕۆژدا.

سێیەم:- بەپێی زانیاری نووسەر- ئامارێکی وردو گشتی لەسەر بارستایی مێشکی مرۆڤە بەناوبانگەکان نییە تا بەراوردی ڕێژەی دووبارستاییەکەیان لەگەڵ زیرەکییان بکەین، بەڵام هەندێ حاڵەتی زانراو هەن: مێشکی [لۆردبایرۆن]- بەناوبانگترین ئەدیبەکانی ئینگلیزە لە سەدەی نۆزدەدا- زۆ گەورەبوو [نزیکەی ٢٢٠٠ گرام] بەمەش ڕێژەی دووبارستاییەکەی زۆر گەورە بوو، بەڵام ئەوە لە [ئەنشتاین]دا وانە بوو کە بەڕاستی بەمەزنترین زانا دەژمێردرێ، ڕێژەی دووبارستاییەکەی ئەوەندە گەورە نەبوو سەرنج ڕابکێشێ و هاوڕێک نەبوو لەگەڵ ئەوەی پێشکەشی زانستی کرد لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا. هەندێ کەسیش هەن بەخاوەن مێشکی بچووک ناوبراون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر لەوانە زیرەکتر بوون کە مێشکیان گەورە بووە. بەناوبانگترینیان :ئەناتۆلی فرانس] بوو کە نووسەرێکی پێتۆڵ بوو، کەچی بارستایی مێشکی تەنیا [ ١١٠٠گرام] بوو، واتە بارستایی مێشکی نیوەی بارستایی مێشکی (بایرۆن) بوو.

چوارەم:- ئەگەر هەموو بەشەکانی مێشک هاوتای یەک بان یان لە گرنگی و کاریگەری وەکو یەک بان- هەروەک هەندێ بیردۆز وای بۆ دەچێ- ئەوا قەبارە یان

بارستـایی مـێشک کـاریگەریەکی باشی دەبوو لەسـەر ئاستی زیرەکی، بەڵام ئەوەی نەگۆڕە ئەوەیە کە بەشەکانی مێشک وەکو یەک نین بە واتای ئەوەی کە بەشـەکـانی مـێـشک لە گـرنگیـاندا وەکـو یەک نین، بۆ نموونە، بارستـایی مێشکی مرۆڤی کۆن [ناسراو بە نیاندرتال] کـە لە نزیک دوسلدۆرف لە ئەڵمـانیـا دۆزراوەتەوە [١٥٠٠] گـرام بووە واتە گـەورەتر بووە لە ناوەندی بارستـایی مێشکی مرۆڤی ئەمرۆ. ناشبێ ئەو مرۆڤە سەرەتاییەی کە (١٠) هەزار ساڵ پێش ئێستا ژیاوە لە مرۆڤی ئێستا زیرەکتر بووبێ.

جیاوازیەکی گرنگی نێوان پێکهاتەی مێشکی مرۆڤی کـۆن ومـێـشکی ئێـمـە ئەو گـڵـمـتـەی [مض lobe] پێشـەوەی توێکڵی مـێشکە لە مـرۆڤی نوێ کە گـەشەی کردو بەرین بوو لەسەر حیسـابی گـڵمتی دواوە. نابێ جیـاوازی ژینگە کـۆمـەڵایەتیـەکەش لەو دووبارەدا لەبیر بکەین، کە کاریگەری لەسەر زیرەکی هەیە. ئەگەر ئەوانە هەمـوو لەبەرچاو بگرین دەتوانین بڵێین گەورەیی مێشک یان گەورەیی رێژەی دوو بارستـاییـەکە بەشێـوەیەکی زۆر دەبێـتە هۆی دەرخستنی زیرەکی، بەڵام ئەمە تاکە هۆکار یان هۆکـارێکی کـاریگەر نیـیـە لە زیرەکـیـدا، بەڵکو هۆکاری دیکەش هەن.

لەڕاستیـشدا بەم دواییە دەرکەوت کە مێشک بازنەی کـارەبایی زۆر وردی [مـایکرۆسکۆبی] تێـدایە کـە ڕەهەندەکـانی لە یەک مـایکرۆن [مـایکرۆن= یەک لە ملیۆن بەشی مەترە] پتر نین. ئەو بازنانەش لە مێشکدا لە کۆتایی قۆناغی ناوزگدا دروست دەبن.

کـرداری داکردنی زانیـاری لەناو مـێـشکدا و پاشـان هێنانەوەی لەکـاتی پێویسـتدا کـردارێکی ئاڵۆزەو- لە بنەڕەتدا- لە توێکڵی مـێـشکدا دەبێ. هەندێ ناوچە لە مێشکدا هەن بۆ داکردنی زانیاری بۆ ماوەیەکی کورت و هەندێ ناوچەی دیکە تایبـەتن بەداکـردنی زانیـاری بۆ ماوەیەکی درێژ.

مێـشک- جگە لە مێشکۆڵە کە هیچ پەیوەندیەکی بە بیرهاتنەوە نیـیـە- نزیکەی سەد بلیۆن خانەی دەمـاری تێـدایە، هەریەک لەو خـانە دەمـارانەش بە دە خـانەی پاڵپشت دەورە دراون بۆ راگرتنی شێوەو هەڵکەوتەکەی. سێ جۆرە خانەی دەمار هەن:-

دەمـارە خـانەی هەسـتکردن بۆ گـواسـتـنەوەی زانیـاری لەسـەرباری ژینگە. دەمـارە خـانەی جـوولە کـە تەزووی دەمـار دەگـەیەننە مـاسـوولکەو گـلاندەکـان و پاشـان دەمـارەخـانە هاوکـارەکـان کـە پەیوەندیان بەو فـەرمـانە ئاڵۆزانەوە هەیە، کـە تایبـەتە بەبوونەوەرە پەرەسـەندووە زیرەکـەکان وەک: تێگەیشتن و فێربوون.

ژمـــارەشـــیـــان لە بوونەوەرە زیندووەکـــاندا بەپێی پەرەسەندنیان دەگۆڕێ.

پێکهاتەی دەمارەخانە زۆر لەخانەکانی دیکە جیاواز نیـیـە، بەڵام برێکی زۆرتریان لە پرۆتین و ترشی ناوەکی تێدایە کە پێی دەوترێ ترشی [رایبۆنە کلەیەک].

هەر خـانە دەمـارێک لە نێـوان هەزار تا دە هەزار لقی لێ دەبێـتـەوە- وەکـو لقـەکـانی دار وایە- کـە خـانەکـە بەخـانە دەمـاری دیکەوە دەگـەیەنن بۆ گـواسـتـنەوەی تەزووی دەمارەخانە- هەروەها لە هەر خانەیەکدا لقێک کە ئەستوورایی لە نێوان نیو تا [٢٠] مایکۆن دەبێ و پێی دەوترێ تەوەرە جیـا دەبێـتـەوەو بە لقی بچـووکـتر کۆتایی دێت کە لە کۆتایی هەر یەکێکیاندا ئاوسانێک هەیە پێی دەوترێ ئاوسـانی یەکـتـرگرتن بۆ ئەوەی خانە دەمارەکە بەخانە دەمارێکی دیکەیان خانەی ماسوولکە بگەیەنێ بۆ ناردنی تەزووی خـانە دەمـــارەکـە بەیەک ئاڕاستەدا بۆ ئەندامەکانی لەش.

ئەگـــەر ئەو باوەڕەی زانایان راست بێ، کــە دەڵێن مــێــشکی مــرۆڤ هەمـــان رێگە بەکـــاردێنێ کــە لە کۆمـپـیـوتەردا بەکاردێ، واتە رێگەی دوو ژمـارەیی بۆ داکردنی زانیاری، ئەوا دەتوانێ زانیـاریەکی سادە دابکا لە هەر یەکێک لە لق یان ئاوسـانە یەکـترگرەکانی خانە دەمارەکان. زانایان ئەو برە زانیاریەی کە دەکرێ دابکرێ لەناو مـێشکدا بە [١٠-١٥] زانیـاری [یەک کە ١٥ سـفـری لە پێش بێ] دادەنێن. لەوانەیە ئەو ژمـارەیە سەرسوڕهێنەرو زێدەڕۆیی بێ، بەڵام ئەگەر بیـر لەو برە زانیاریانە بکەینەوە کە کەسێکی ئاسایی دەتوانێ وەبیر خۆیانی بێنێتەوە، هەر لە ژمارەو کرداری ژماردن و پیت و وشەی زمانەوانی و مێژوو و کەس و زانیاری گشتی و بیرەوەری و... تر. ئەوا دەبینین ئەو ژمارەیە زۆر نابوێتە بەرامبەر گەورەیی مێشکی مرۆڤ.

**١- مـەبەست لە زانیـاری سـادە وەک وەڵامـدانەوەی پرسیـارێک بە: بەڵێ یان نا کە لە مێـشکدا دادەکرێ. ئەم رێگەی دووانەییـــە بۆ داکـــردنی زانیـــاری لە کۆمپیوتەردا بەکاردێت.**

**٢- زانیـــاری بۆ مـــاوەیەکی دوورودرێژ لە توێکڵی مـێـشکدا هەڵدەگـیـرێ، بەڵام بۆ مـاوەی کـورت وەک رۆژێک یان کـەمـتـر ئەوا پێوا وایە لە پێکهـاتەیەکی بچووک لەژێر توێکڵی مێشکدا هەڵدەگیرێ پێی دەوترێ [پارائامۆن].**

سـەرچاوە : گۆڤـاری العربي/ ژمـارە ٣٤٦/ ئەیلول/ ١٩٨٧. د. فخري اسماعیل حسن.

# ئەنشتاین
# ئەو فڕ گروازەیەی چارەنووسی مرۆڤایەتی گۆڕی

ئا:هاوژین عومەر

کاتێک ئەنشتایین لە(١٥)ی نیسانی ساڵی (١٩٥٥)کۆچی دوایی کرد هۆکاری راگەیاندنەکانی رۆژئاوا دەستیان کرد بەهەڵمەتێکی فراوانی پرسەو خەفەتباوی بۆ کۆچکردنی ئەو کەڵەپیاوە کرد، کە ئەدگار و بۆچونی پێشکەوتنی هەسارەی زەوی گۆڕی ، لەنێو ئەم پرسە گەرموگوڕەدا نافرەتێکی سەر بە یەکێک لەرێخراوەکانی دژایەتیکردنی جەنگ رایگەیاند: لەدایک بوونی ئەنشتایین بەڵا بوو بۆ مرۆڤایەتی، چارەنووس وایکرد ئەنشتایین وێنەی سەرەتا و کۆتایی زەوی و مرۆڤ بکێشێت.

دوای بڵاو بونەوەی ئەم راگەیاندنە ، چەند بیرو بۆچونێکی دیکەی هاوشێوە لەسەر کەسایەتی ئەنشتایین لەرۆژنامەکانی ئەوروپا بڵاو بۆوەو هەموویان پشتگیرییان لە راگەیاندنەکەی ئەم نافرەتە ناشتیخوازە دەکرد ، تا کار گەیشتە ئەوەی هەرکاتێک باس لەزانایی وبلیمەتی ئەنشتایین کرابا ئەوا راستەوخۆ ئەو دژە بۆچوونانە دووبارە دەبوونەوە، کە دەرهەق ئەنشتاین گوترابون هەروەها ئەم بیرو راو بۆچونانە پێگەو وکاری گەریان لەسەر خودی ئەنشتاینیش هەبوو بەجۆرێک ئەنشتایین لەدوا رۆژەکانی ژیانیدا دەربارەی ئەم بابەتە گوتی:((گەر لەسەرەتادا بمزانیبوایە ئەمە رودەدات ئەوتا سەعات چاکردنەوەم لەلا باش بوو)) .

ئەنشتایین بەیەکێک لەلایەنگرەکانی ئاشتی ناسرابوو لە گەرمەی جەنگی جیهانی یەکەمدابەشداری لەنووسینی گرنگترین پاداشتی تایبەت بە(لایەنگری ئاشتی ) کرد کەئەم کارە ئەوکات هەمو کەسێک ئەی دەتوانی خۆی لێ بدات .

دۆزینەوەکانی ئەنشتاین یاریدەر بوون بۆ گەیشتنی مرۆڤ بۆ سەر مانگ و بەکار هێنانی لێزەر وبەرهەم هێنانی خورگەی کەهرۆ موگناتیسی ، کەچەند ساڵێک دوای مردنی تواندرا ترافستەرو کۆمپیوتەری لێ دروستبکرێت . بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەنشتایین چەند هاوکێشەیەکی بیرکاری دۆزیەوە کەبوەو بەردی بناغەی دروستکردنی و چەکی ناوەکی )و( بۆمبی ئەتومی ) . سەرباری جیاوازی لەدۆزینەوەکانی ئەنشتایین و ئەو خزمەتانەی پێشکەشی بەهەردوو لایەنی جەنگ و ئاشتی جیهانی کردوە کەچی کەس ناتوانێ نکوڵی لە دژایەتی ئەنشتاین بۆ جەنگ بکات.

*** ئەنشتاین و...غاندی**

ئەنشتـــاین یەکـێک بوو لەلایەنگرو مـــوریدانی سەرکردەی هیندی کۆچ کردوو«غاندی»و فەلسەفە بەناوبانگەکەی (اللاعنف)و بیروڕای ئاشتیخوازەکانی غاندی. ئەنشتاین بەبۆنەی مردنی غاندی لە وتەیەکی پرسە ئامێزدا گوتی: «رۆژێک دادێت ئێمەو نەوەکانی دوای ئێمە باوەڕناکەن مرۆڤێکی وەک غاندی لەسەر رووی زەوی هامـــوشـــۆیی کـــردبێت». لەگەڵ ئەوەی

خۆشەویستی ئەنشتاین بۆ غاندی و بیروبۆچوونەکانی گەیشتبووە رادەی شکۆدارکردن کەچی ئەنشتاین سڵینەکرد لەهاندان و نووسینی نامە بۆ(رۆزفلت)ی سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ دەست پێشخەریکردن لەدروستکردنی«بۆمبی وێرانکەر) لەپێش (هیتلەر). ئەم هاندان و نامەنووسینە بوون بە هەڵوێستێکی زانستی لەسەر ئەنشتاین و بەشداربوون لەسەر دامەزراندنی پرۆژەی (مانهاتن) بۆ دروست کردنی بۆمبی ئەتۆمی، لە کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم ئاراستەی ولاتی یابان کراو بەهۆیەوە ناچارکرا خۆ بەدەستەوە بدات کۆتایی بەجەنگی دووەمی جیهانی بهێندرێت.

لێرەدا خوێنەر هەقی خۆیەتی بپرسێت چۆن دەبێ بلیمەتێکی وەک ئەنشتاین لە پاڵ ئەم هەموو کارە وێرانکاریە دابێت؟ لەوانەیە وەلامەکان لەسەر ئەوە کۆکبن کە ئەنشتاین باوەڕی وابوو تاکە ڕێگا بۆ پەرەپێدانەوەی هیتلەرو رێگەگرتن لە وێران کردنی زەوی بەدروستکردنی چەکی ئەتۆمی دەبێت، بەلام خۆ بەشداربوونی ئەنشتاین لە دروستکردنی قیبلەنوومای تایبەت بەغەواسەی جەنگی پێش سەرهەڵدانی هیتلەرو هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی بوو، ئاخۆ ئەم کردارە بەنەزعەیەکی جەنگی جیهانی بوو، ئاخۆ ئەم کردارە بەنەزعەیەکی شەڕانگێزی داناندرێت کە هەر لە منداڵییەوە لە خودی ئەنشتاین هەبوو بێت؟ ئەمە پرسیارێکەو خوێنەر سەریشکە لە وەلامدانەوەی.

*** دوور لە بلیمەتیی**

کەسایەتی ئەنشتاین رەنگدانەوەی پێکهاتەی کەسایەتییەکی ئاڵۆزە، بۆیە تێگەیشتن لە خودی ئەنشتاین زۆر گرانترە لە تێگەیشتنی تیۆرە رێژەییەکەی (تیۆری نسبی)، ئێمە لە بەرامبەر مرۆڤێکدا ین کە بەئەڵمانی لە دایک بووە، بەلام دواتر چەندەها جار رەگەزنامەی خۆی گۆڕیوەو چەند جارێک دەستبەسەر کراوەو دوور خراوەتەوە ئەمە سەرەڕای ئەوەی چەند بۆ ئاشتی تێکۆشاوە ئەوەندەش بۆ کاری جەنگی هەوڵی داوە. چەند تەجروبەیەکی عاتیفی بەسەر بردووەو بەلایەنی کەم کچێکی ناشەرعی هەبووە، لەسەردەمی خوێندن و لاویەتیدا بارودۆخی ئابووری زۆر نالەبار بووە، هەژاری هاوڕێی هەمیشەیی بووە، لەگەڵ جوانی و شۆخ و شەنگی ئەنشتاین و کۆبوونەوەی ژمارەیەکی زۆر لە ئافرەت لە دەوروبەری کەچی کچێکی (شەلەی) خۆشویستووە تەمەنی (٣) ساڵ لە تەمەنی ئەنشتاین گەورەتر بووە، ئەم ئافرەتە (میلفاماریک)ی هاوڕێ خوێندنی بوو لە ساڵی ١٩٣٠ بەرەسمی بوو بەهاوسەری کچێکی ناشەرعیان هەبووە هەردووکیان وازیان لێهێناوەو بەرەو چارەنووسێکی نادیاریان بردووە، سەبارەت بە چارەنووسی کچە (٣) ساڵانەکەی ئەنشتاین چەند گوتەیەکی جیاواز هەن، هەندێکیان دەڵێن بەهۆی نەخۆشییەوە مردووە، ئەوانی دیکە باوەڕیان وایە کە بەناوی یەکێکی دیکەیان کردبێ، خۆشەویستی ئەنشتاین بۆ زانست هەر لە منداڵییەوە سەری هەڵداوە ئەمەش زیاتر بەدیارکەوتووە کاتێک لە تەمەنی (٦) ساڵیدا باوکی قیبلەنومایەکی پێبەخشیووە، ئەم قیبلەنومایە ئەو پرسیارەی لە خەیاڵی زانستی ئەنشتاین وروژاندووە کە بۆچی دەرزی قیبلەنومایەکە هەمووکات روو لە باکوورە؟

ئەنشتاین دایکی زۆر لەلا گەورەو خۆشەویست بووە، ئەمەش وای کردووە چەند

**تێگەیشتن لە خودی ئەنشتاین زۆر گرانترە لە تێگەیشتنی تیۆرە رێژەییەکەی تیۆری نسبی**

## دۆزینەوەکانی ئەنشتاین یاریدەر بوون بۆ گەیشتنی مرۆڤ بۆ سەر مانگ و بەکار هێنانی لێزەر وبەرهەم هێنانی خورگەی کەهرۆ موگناتیسی

خەسڵەتێکی دایکی لەلای ئەم چەکەرە بکەن لەوانە سەربەخۆیی لەکەسایەتیدا، خۆشەویستی مۆسیقاو ژەنینی ئامێری کەمانجەو حەزیشی لە سەمفۆنیاکانی (مۆزارت و بیهتەو باخ و برامز) دەکرد.

سەبارەت بەباوەڕهێنان بەخودا، ئەنشتاین باوەڕی پتەوی بە بوونی خودای تاک و تەنها هەبوو، بەڕادەیەک چەند تیۆرێکی زانستی راست و دروستی رەتکردەوە بەبیانووی ئەوەی ناوەرۆکی ئەم تیۆرانە لەگەڵ خەسڵەت وهۆکاری خودا ناگونجێن!!

*** ئەنشتاین و... چەند خەسڵەتێکی**

ژیانی ئەنشتاین ژیانێکی ئاسایی نەبوو بەڵکو تارادەیەک لە ژیانی خەڵکانی دیکە جیاواز بوو، هاورێکانی دەڵێن: ئەنشتاین وەک هەر بلیمەتێکی خاوەنی چەندین خەسڵەتی سەیرو سەمەرە بووە کە زۆر بەکەمی لە مرۆڤی دیکە بەدی دەکران بۆ نموونە:

ئەنشتاین زۆر قیزی لە (گۆرەوی) دەکرد دەڵێن بەدرێژایی تەمەنی لە پێی نەکردووە، هەروەها حەزی لە برینی نینۆکی پەنجەکانی قاچی نەدەکرد، بیانوووشی بۆ لە پێ نەکردنی گۆرەوی ئەوە بوو کە زوو دەدرێت و کونی تێدەبێت، بەڵام ئەنشتاینی زاناو بلیمەت نەیدەزانی نهێنی درانی گۆرەویەکانی نینۆکە درێژەکانیەتی!!

* هەروەها ئەنشتاین تا ئەو رۆژەی کۆچیی دوایی کرد ئۆتۆمبێلی لێنەخوڕیبوو لە ژیانیدا هەوڵی خۆفێرکردنی هونەری ئۆتۆمبیل لێخوڕینی نەداوە، بەڵام بەپێچەوانەوە عاشقی لەبەلەم لێخورین بوو زۆر حەزی لە بەخێرایی لێخورینی بەلەم دەکرد، بۆیە کاتێک بەلەمێکی لەناو ئاو دەدیت ئەوا بەبەلەمەکەی خۆی و بەخێراییەکی زۆر بەهێز بەرەو رووی دەچوو بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی تووشی ترس بکات لەدوا چرکەدا بەلێزانی خۆی دەرباز دەکرد!

* ئەنشتاین بەشی هەرە زۆری ژیانی منداڵی بەنەخۆشی خراپی قسە دەربڕین بەسەربرد، تا تەمەنی نەبوو بە (٩) ساڵ نەیتوانی بەڕوون و رەوانی قسە بکات، بۆیە دایک و باوکی زۆر خەمیان لێدەخوارد ئەم زمان گیرانەیان بەنیشانەیەکی دیار بۆ کەم عەقڵی ئەنشتاین لە قەڵەم دەدا.

* زۆربەی زۆری جەماوەری ئەنشتاین ئافرەت بوون، زۆر خۆشەویست بوو لەلایەن، دەڵێن داواکاری شووکردنی بەئەنشتاین وەک باران بەسەریدا دەباری، ژمارەیەک لە ئافرەتی شۆخ و شەنگ کەوتبوونە داوی خۆشەویستی ئەم پیاوە قژ گڕوازەیە زیاتر لە منداڵێکی ناشەرعی هەبوو.

* جوانی و... تیۆری رێژەیی

سەبارەت بەتیۆرە بەناوبانگەکەی ئەنشتاین (تیۆری رێژەیی) دوو چیرۆک هەیە، یەکێکیان باس لەوە دەکات کە ئەنشتاین شەوێکی تەواوی لە یەکێک لە میوانخانەکان بەبیانووی تێگەیاندن و شیکردنەوەی (تیۆری رێژەیی) بۆ خانمە ئەکتەری سینەمایی شۆخ و شەنگ (مارلین مۆنرۆ رێژەیی) بەسەربردووە.

چیرۆکی دووەمیان پەیوەستە بە کیژۆڵە جوانەی گرەو لەگەڵ هاورێکانی دەکات کە دەتوانی بۆ ماوەی نیو کاتژمێر وا لە ئەنشتاین

بکات قسەی لەگەڵ بکات، بۆیە روو لە ماڵی ئەنشتاین
دەکات و بەسکرتێرەکەی دەڵێت بەئەنشتاین بڵێ کچێکی
(٢٠) ساڵان دەیەوێت دەربارەی کارێکی یەکجار گرنگ
قسەت لەگەڵ بکات، ئەنشتاینیش دەڵێ با بفەرموێ،
کچە کاتێک چاوی بەئەنشتاین دەکەوێت دەڵێ: دەمەوێ
نیوکاتژمێر لەگەڵ جەنابت دابنیشم، ئەنشتاین پێدەکەنێ
و داوای لێ دەکات لەم ماوەیەدا باس لە بابەتێک بکەن:
کچەش دەڵێ: هەوڵ بدە بەسادەترین شێوە تیۆری رێژەییم
تێگەیەنی، ئەنشتاین سەرکەوتوو نابێ لە تێگەیاندنی
کچە، هەڵدەستێت وەک ئەوەی بیەوێ کرۆکی تیۆرەکەی
تێبگەیەنێت دەڵێت (لە راستیدا تێگەیشتنی تیۆری
رێژەیی زیرەکی گەرەک نییە) بەڵگەش بۆ ئەمە چیرۆکی
ئەو دوو جولەکەیە کە باس لە من دەکەن، یەکەمیان
بەدووەمیان دەڵێت (من شانازی بەئەنشتاین دەکەم
چونکە سەر بەئاینی ئێمەیە، دووەمیان دەڵێت:
ئەنشتاین کێیە؟ ئەوی دیکەیان دەڵێت: چۆن ئەنشتاین
ناناسێت؟ زیرەکترین زانای ئەم سەدەیەیە، دووەمیان:
باشە چی بۆ مرۆڤایەتی کردووە؟، یەکەمیان: تیۆری
رێژەیی داهێناوە، دووەمیان دەپرسێ تیۆری رێژەیی چییە؟
هاورێکەی دەڵێ: تیۆری رێژەیی ئەوەیە گەر هاتوو
بارودۆخ وا رەخسا بۆ ماوەی کاتژمێرێک لەگەڵ
ئافرەتێکی ناشیرین دانیشتی ئەوا ئەم کاتژمێرە بەدرێژایی
رۆژێک درێژ دەبێتەوە، بەڵام گەر هاتوو لەگەڵ ئافرەتێکی
شۆخ و شەنگ دانیشتیت ئەوا ئەم کاتژمێرە کورت
دەبێتەوەو بەیەک دەقیقە کۆتایی دێت، ئەمە بە(تیۆری
رێژەیی) ئا لەم کاتەدا ئەنشتاین سەری هەڵدەبرێت و
تەماشای کاتژمێر دەکات دەبینێ نیو کاتژمێر بەسەر
قسەکانیان تێپەڕ بووە، کچە جوانەکەش دەڵێت ئەمە
یەکەم جارە لە ژیانم بتوانم تیۆرێکی زانستی ئاڵۆز
بەخێرایی تێبگەم، ئەنشتاینیش دەڵێ: منیش ئەمە یەکەم
(جارە بتوانم لە نیو دەقیقەدا ئەم تیۆرە شیبکەمەوە.

ئەنشتاینیش کۆچکردنی بەهەفتەیەک رازی بوو لەسەر
ئەوەی ناوی لەسەر ئەو یاداشتە بێت کە پێشکەش
بەدەوڵەتانی جیهان دەکرێت و هانیان دەدات و از لە
چەکی وێرانکەرو بۆمبی ئەتۆمی بهێنن، هەروەها
پەشیمانی خۆی دەربارەی ناوەڕۆکی ئەو نامەیە دەربڕی کە
لە ساڵی ١٩٣٩ بۆ سەرۆک رۆزفۆڵتی ناردبوو، هەروەها
لە دوارۆژەکانی ژیاندا دەستی کرد بەرەشکردنەوەو
نووسینەوەی چەند برگەیەک لە تیۆرەکانی، دوا داواکار
بیستی ئەوە بوو کە کاغەزێکی زۆری بۆ بهێنن بۆ ئەوەی
بتوانێ کۆتایی بە (تیۆری یەک کێلکەی). بهێنێت، بەڵام
پێش گەیشتنی کاغەزەکان دڵی لەلێدان کەوت. کۆچی
دوایی ئەنشتاین هەرایەکی نایەوە هیچی لەو هەرایانە
کەمتر نەبوو کە بەهۆی کۆچی دوایی هەریەکە لە شازادە
دایاناو سەرۆک جەمال عەبدولناسرو سەرۆک کینیدی
دروست بوو. بەڵام سەیر لەوەدایە کە خەڵکی بەگشتی
شتێکی زۆر دەربارەی دۆزینەوەکانی ئەنشتاین نازانن
تەنها داهێنانی (چەکی ناوکی) نەبێت. بۆیە ئەو
پرسیارەی خۆی قوت دەکاتەوەو ئەوەیە بۆچی ئەم هەموو
بایەخ دانە میللییە بە پیاوێک کە تەنها کۆمەڵێکی ئەم
لە داهێنانەکانی دەگەن؟ بۆچی ئێوەو سیمای ئەنشتاین
کرا بەنموونەیەکی باو بۆ زاناو بلیمەتان لەکارە سینەمایی
و تەلەفزیۆنیەکاندا؟ ئاخۆ دەبێ قژ گروازەیی ئەنشتاین و
نارێکی جلوبەرگ و لەشی نهێنی سەرنج راکێشانی
خەڵکی بن بۆی؟ بەڵام راکێشان (الجاذبیە) لە داهێنانی
نیوتنە! باشە ئەنشتاین مافی بەسەرەوە چییە؟ ئا خۆ دەبێ
ئەنشتاین زانایەکی ئاشتی خوازبووبێ یاخود بلیمەتێکی
شەڕانگێز ئەم پرسیارانە خوێنەر دەتوانێ وەڵامیان
بداتەوە؟

**سەرچاوە**

**گۆڤاری (زهرة الخليج) ژ ١١٠٩.**

هونەرمەند: سەڵاح کۆیی

# بۆشاییەکی زۆر لەبواری هونەری گۆرانی منداڵانی کورد هەیە

کەم کەس هەیە گوێی لە دەنگە خۆشەکەی هونەرمەندی گۆرانی بێژی ناسراوی شاری کۆیێ ، کاک سەڵاح محەمەد کۆیی نەبووبێ و هەست و نەستی بەدەنگە بەسۆزەکەی نەخرۆشابێ، سەڵاح محەمەد کۆیی لە سەرەتای هەشتاکان زێتر بەگۆرانی (کچە خەجێ) ناسراوە. بەڵام بەم دواییە خەریکی تۆمارکردنی کۆمەڵێک گۆرانی و مەندلۆجە بۆ منداڵانی کوردستان، لێرەدا بەهەڵمان زانی سەبارەت بەم وەرچەرخانە هونەرییە کاک سەڵاح کۆیی هونەرمەند بدوێنین:

* چۆن بوو ئەو وەرچەرخانە لەمێژووی هونەریتان روویدا، کاتێ لەگۆرانی گوتن لە گەورانەوە بۆ منداڵان خۆتان یەکلاکردەوە؟

- پێش ئەوەی بێمە سەرباسی هونەرو گۆرانی و مۆسیقای منداڵان. دەمەوێ بڵێم کەمن تاکو ئەمرۆش بریاری کۆتاییم نەداوە کە واز لەگوتنی گۆرانی گەوران بهێنم... «بەڵام بەنیازم».

ئەو وەرچەرخانەشم لەهونەردا هەستم کرد بۆشاییەکی زۆر هەیە لەبواری هونەری منداڵاندا کەسیش خۆی لێ ناکاتە خاوەن، هەوڵەکانی منیش زیندووکردنەوەی ئەو گۆرانی و یارییانەی کە لەکۆمەڵگای کوردەواریماندا ئەنجامدراون بەشێوازێکی تازەو جوانتر دەماودەم بۆ منداڵانی کوردی نوێ بکەمەوە .

* چ چێژو جوانی و خۆشییەک لەگۆرانی منداڵانەوە دەبینی؟

- منداڵ ئەو پەپولە رۆح سوکەیە کە هەموو گەورە ئادەمیزادێک خۆشی دەوێ. منیش زۆر هەست بە ئارامی و بەختەوەری دەکەم کاتێ منداڵێک دەبینم گۆرانیەکانی من دەڵێتەوە چ لەبەر دەرگا بێ چ لەکۆڵانان بێ و چ لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنەکان بێ، هەست بە خۆشییەکی بێ سنوور دەکەم چونکە دەزانم کارێکم کردووە کە منداڵان لێم رازین.



* ئایاگۆرانیبێژی منداڵان ئەرکێکی قورستری دەکەوێتە ئەستۆ کاتێ دەیەوێ گۆرانی بۆ منداڵان بڵێ؟
- لەراستیدا ئەرکێکی قورسە دەبێ هونەرمەند بزانێ چۆن هەڵس و کەوت لەگەڵ منداڵدا بکات و فێری بکات حەزو گوێگرتن لەگۆرانی و مۆسیقای نەتەوەکەی بکاو مێشک و هەستیان جۆشبدا بە سرودو بیری کوردانە. لەهەمووی گرنگتر ئەو کەسانەی هەڵس و کەوت لەگەڵ منداڵان دەکەن و بەتایبەتیش لەبواری هونەرەوە دەبێ مرۆڤی زۆر راست و دڵسۆزو رەوشت بەرزبن. نەبادا توشی لادان بێن.
* ئەی ئاوازدانەری منداڵان دەبێ چۆن بێ و تا چەند توانیویانە خزمەت بە گۆرانی منداڵان بکەن؟
- ئاوازدانان بۆ گۆرانی منداڵان جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئاوازی گەوراندا، چونکە دەبێ میلۆدیەکەی سادەو ساکارو بێگرێ بێ. تاکو منداڵ زوو وەریبگرێ و بەسانایی بیڵێتەوە. ئاوازدانەری باشیشمان هەیە لەبواری هونەری منداڵاندا.
* لەو بوارەدا تا ئێستا چەند گۆرانیت بۆ منداڵان تۆمار کردووە؟
- گۆرانی منداڵانم زۆرە بەداخەوە تاکو ئێستا نەمتوانیوە تەنها گۆرانیەکیش تۆمار بکەم. ئەوانەی تۆمارم کردوون لەشێوەی کلیپن کە ژمارەیان چوارە. ئەوانیش (دێوەرە، شەموولە، هەلوربەلور، مامۆستا)ن وا ئێستاش خۆم ئامادەکردووە بۆ تۆمارکردنی کلیپی (یاریکە، راکە، پێکەنە) کە گوزارشت لەیاری تۆپێن دەکات بۆ منداڵان.
* شێوەی تایبەتی بە گۆرانی منداڵان دەبێ چۆن بێ و مەرجەکانی چین؟
- ئاوازەکەو شیعرەکەش پێویستە لە ئاستی هەستی منداڵان بێت و لەهەمان کاتدا سووک و سادەبن منداڵ زوو وەریبگرێ و لەبەری بکات. ئاوازەکانیش بەرای من لەمەقامەکانی راست و، عەجەم و نەهاوەند... هتد. بێ باشترە بۆ قورگ و دەنگی منداڵان.
* بۆچی ئێستاکە لەهەولێر تیپی گۆرانی و مۆسیقای تایبەت بەمنداڵان نابینرێ؟
- بەشانازییەوە دەڵێم دوو تیپی مۆسیقای منداڵان ئێستا لەشاری هەولێر هەیەو بەردەوامن کە زۆر بەتوانان و ئومێدی دوارۆژی مۆسیقای کوردین لەو شارەدا.
یەکەمیان: تیپی مۆسیقای منداڵان سەر بەچالاکی قوتابخانەکان لە پەروەردەی هەولێر.
دووەمیان: تیپی مۆسیقای منداڵانی سەنتەری پەپوولەکانی کوردستان سەر بەکەناڵی ئاسمانی کوردستانن. هیوادارم پشت گوێ نەخرێن.
* بەرای تۆ چاکترین شاعیرو گۆرانیبێژی منداڵانی کورد لەو سەردەمەدا کێیە؟
- لەو چەند ساڵەی دواییدا شیعری منداڵانمان زۆربووە، دیارە شاعیرە خۆشەویستەکانمان هەستیان بەو بۆشاییە کردووە. بۆیە جارجارە دەبینین نامیلکە شیعری تایبەت بەمنداڵان دەکەوێتە بازاڕاوە دەستخۆشی لەهەموویان دەکەم، هیوادارم بەردەوام بن لەسەر ئەو کارە پیرۆزەیان.
* ئەی تا چەند دامو دەزگا هونەرییەکان (وەک رادیۆ، تەلەفزیۆن) یان بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیری و هونەری منداڵان هاوکاری ئەو پرۆژەیە دەکەن کە خزمەت بەهونەری گۆرانی و مۆسیقای منداڵانی کورد بگەیەنێ؟
- بەداخەوە هاوکاری لەبواری هونەرییەوە زۆر کەمەو تا ئێستا هیچ دەزگایەکی هونەری تایبەت بەمنداڵان کارێکی هونەری باشی وای بۆ منداڵان نەکردووە کە شایانی باس بێ. ئەوەی هەیە تەنها کەناڵی ئاسمانی کوردستان و چالاکی قوتابخانەکانەو لەبواری هونەریدا کەمن دیومە. بەڵام لەبواری دیکەدا وەک هاوکاری و یارمەتی لەوانەیە کاری باش کرابێ.
چونکە هەر دەزگایەو کارێکی تایبەتی لەسەرشانە.

**ئا: دەریا عەبدوڵڵا**

## عادل هەورامی:

# ئەوەی ڕیتمێکی هەورامی تێدانەبێ، ناتوانێ گۆرانی هەورامی بڵێ

**هونەرمەندێکی لاوی دەڤەری هەورامانەو ئێستا لە شاری سلێمانی دادەنیشێ، لەماوەیەکی کەمدا توانی بە دەنگە خۆشەکەی هەستی گوێگران و سەرنجی بینەران بۆ خۆی ڕابکێشێ. لە سەردانی ئەم دواییەی بۆ شاری هەولێر. بە هەلمان زانی ڕووبەڕووی چەند پرسیارێکی بکەینەوە:**



*** لە بیۆگرافیای هونەریت بدوێ؟**

- لە ساڵی (١٩٧٢) هاتومەتە دنیاوە، لە سەرەتای منداڵییەوە هەوڵم داوە ببم بە هونەرمەندێک، لەوەش کاریگەری عەبدولڕەحمان بەڵخەیی باوکم بەسەرمەوە هەبوو، کە دەنگێکی خۆشی هەبوو، بەڵام بەداخەوە خۆی دەرنەخستووە، یەکەم گۆرانیم لە ساڵی (١٩٩٣) تۆمارکرد و لە ساڵی (٢٠٠٠) سیدییەکی (٨) گۆرانیم تۆمارو بڵاوکردەوە، لە ساڵی (٢٠٠١) سیدییەکی دیکەم بەناوی ئولفەتەوە لە ئاوازی نیازی سەنتور بڵاوکردەوەو پێشکەشی بیسەرانم کرد.

*** گۆرانی و ئاوازی ناوچەی هەورامان تایبەتمەندێتی خۆی هەیە، تا چەند ئێوەی گۆرانیبێژانی هەورامان توانیوتانە مامەڵەیەکی هاوچەرخانە لەگەڵ ئەو کەلەپوورەی ناوچەی هەورامان بکەن؟**

- پێم وایە ئەو کەسەی ڕیتمێکی هەورامی تێدا نەبێ، ناتوانێ گۆرانی هەورامی بڵێ، فۆلکلۆری هەورامی و ڕیتم و شێوازی گوتنی کاریگەرییان بەسەرمەوە هەبوود، بەتایبەتی کە باوکم دادەنیشت و گۆرانی بۆ دەگوتم، پێم وایە هێشتاکەهیچم بۆ هەورامان نەکردووە، بۆیە لەمانگی داهاتووە چاوەڕێین لەو سیدییەی کە پێشکەشتانی ددکەم، چی بۆ هەورامان ددکەم و ئەوکات ئەو پرسیارە ئاراستە بکەن.

*** فۆلکلۆری ئاوازو شیعری گۆرانی ناوچەی هەورامان، تا چەند لەلایەن ئاواز دانەران و هونەرمەندانی بواری گۆرانی و مۆسیقاوە بەنۆتە کراون؟**

- ئەوەی بیستبێتیم و بینیبێتم زۆر کراوە، وەک مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی و سەلاح رەئوف هەر بەرهەمێکیان ئامادەکردبێ بەنۆتەیان کردووە، بۆ خۆشم گۆرانی (قەڵای سنگ)م، بەنۆتە کرد، کە ژەنینی ئاکۆ عەزیز، مامۆستا سەلاح رەئوف مۆسیقاکەی ئامادەکردووە.

*** ئەو گۆرانیبێژ و هونەرمەندانەی کە لەناوچە جیاوازەکانی کوردستانی عێراق و ئێران دان، کامیان**

**زێتر وەک قوتابخانەیەکی گۆرانی ناوچەکەتان دەخوێنرێنەوە؟**

- گۆرانیبێژمان زۆرن، بەڵام بەداخەوە کەسیان نەیانتوانیوە وەک عەباسی کەمەندی کاربکەن، کە بەلای من هونەرمەندی یەکەمە.

*** هەر لەناوچەکەی ئێوە، ئەو هونەرمەندانەی کە کاریگەرییان بەسەر دەنگ و بەهرەو داهێنانی هونەری هونەرمەندانی ئێستاوە هەیە کێن؟**

-.لەمەوپێش عوسمان کێنمیەی هەبووە، عەلی و جەمیل هەبوونە، کاک شەفیق لە کوردستانی ئێرانە، ئەمانە هەمووی کاریگەرییان هەبووە بەسەر گەنجانی ئەمڕۆکە، کە بتوانن لەسەر فۆلکلۆری هەورامان کاربکەن.

*** هەندێک لەرەخنەگرانی بواری مۆسیقا پێیان وایە بەزەحمەت ئاوازە هەورامییەکان بەنۆتە بکرێت، چونکە ئەو ریتمەی هەیە زۆر جیاوازە لەگەڵ ناوچەکانی دیکە، ئەوە تا چەند راستە؟**

- زۆر راستە، چونکە ئێمە لە هەورامان بەسێ قۆناغ دەڕۆین لەگۆرانیدا، بەستەو خاڵ و بەزمی چەپڵەشمان هەیە، بەستە ئەوەیە کە ئاوازی بەیات و حیجازو تۆزێ خاوترە لە هەڵپەڕکێ ئەوە بەکاردێت، سیاچەمانەش کە چەند ساڵە کاری لەسەر دەکەن بەنۆتە ناکرێ، بەڵام وەکو شێوەی هەڵپەڕکێ و گۆرانی دەکرێ بەنۆتە بکرێت، بەڵام سیاچەمانە بە نۆتە ناکرێت.

*** ئێستا خەریکی پرۆژەیەکی هونەریت و کارێکی تازەت بەدەستەوەیە لەم رۆژانەش هاتیە شاری هەولێرو لە هوتێلی چوارچرا ئاهەنگێکی گۆرانی و مۆسیقات پێشکەش کرد، با بزانین ئەم پرۆژەیە چییە؟**

- وەک کارە تازەکەم مژدە دەدەم بە جەماوەرە خۆشەویستەکەم چ لە دەرەوەی هەرێم یاخود لە ناوەوەی هەرێم، کە سیدییەکی تازەم بەدەستەوەیە بریتییە لە (دە) گۆرانی و گۆرانیەکی دیکەم هەیە بەسەر شاری هەڵەبجەی شەهیدە، مۆسیقاکەی لەلایەن توانا فەرەج ئامادەکراوەو کاک زاناش بە کەمانی بۆ ژەنیوە بەم زووانە دەکەوێتە بازارەوە.

*** تائێستا هەر بە شێوەزاری هەورامی گۆرانی دەچڕی یان بەشێوەزارەکانی دیکەش، با بڵێین گۆرانی کرمانجی یان دەشتی هەولێر کە تایبەتمەندی هەیە لە حەیران، ئایا لەو ئەزموونەدا خۆتان تاقی کردۆتەوە؟**

- دەتوانم بڵێم بەشێوەزاری سۆرانی و فەیلی گۆرانیم گوتووە، لە هەوڵی ئەوەشدام گۆرانی بە بادینی و حەیران و سیاچەمانەش بەکاربێنم لەمەو دوا خۆم تاقی بکەمەوە.

*** لە بواری شیعرداناندا، کێ شیعرت بۆ دادەنێ، جا چ بە شێوەزارەکانی هەورامی یا شێوەزاری دیکە؟**

- وەکو شیعری هەورامی کە بەکارم هێنابێ، شیعری مەولەویم بەکارهێناوە، بەڵام سەبکی خۆم دیارە لەو شێوەزارانەی کە بە کاریان دێنم، هەستاوم میلۆدێکی هەورامیم هێناوە بە شیعرێکی تازەی کاک ئەمین هەورامی و گۆرانیم تێدا ئامادەکردووە، ئەوشتانەش کە لەگەڵ نۆتەی من ناگونجێت دەتوانم دوای پرس کردن بە شاعیران، دەستکارییان بکەم، بەڵام شیعرەکانی وەک مەولەوی و نالی و پیرەمێرد ناتوانم دەستکاریان بکەم، بۆیە کە زۆرجار سوودیان لێ وەرناگرم.

*** جگە لە ئاوازی فۆلکلۆر، کێ ئاوازت بۆ دادەنێ و سوود لەسەرچاوەی ئاوازی کام هونەرمەند وەردەگرێ؟**

- من خۆم سێ چوار ئاوازم داناوە، لەم دواییەشدا کاک نیازی سەنتوور بە ئاوازێکی سۆرانی یارمەتی داوم لە سیدییەکەی (٢٠٠٢)، وێڕای دڵسۆز عوسمان کێمنەیی و مامۆستای خۆشەویستم عەباس کەمەندی کە هەوڵی زۆری لەگەڵداوم.

*** ئەو گۆرانیبێژو ئاواز دانەرو مۆسیقا ژەنانەی کە مامەڵە لەگەڵ ئامێری رۆژئاوایی دەکەن ئایا گونجانێک دروست دەکات یان کارێکی نەشاز دەکەن؟**

- من خۆم یەکێکم لەوانە بە شێوازو میلۆدێکی رۆژئاوایی جوان کاردەکەم، ئەگەر بێت و مۆسیقا و ئاوازو هۆنراوەکە بگونجێت کارێکی جوانە، لەو بوارەشدا پسپۆڕیشمان کەمە، ئەوەی هەشە دەچێتە دەرەوە، بۆیە داواکارین گۆرانیبێژان لەگەڵ سەبکی ئاوازو شیعرەکاندا، بەرهەمەکانیان ئامادە بکەن.

**ئا: هەورامان قادر**

زاگرۆس قادر خانزادە

# ژینگە کاریگەری لەسەر زمان و هزرو ئیستاتیکای مرۆڤ هەیە..

**هونەرمەندی شێوەکاری کوردستانی رۆژهەلات زاگرۆس قادر خانزادە، لە دایک بووی شاری بانەیە لە سالّی (١٩٧٥)، لە رۆژانی (٢٧ و ٢٠٠٢/١١/٢٨)، پیشانگای هاوبەشی بەهاوکاری هونەرمەند رەزا محەمەدی لە گەلەری کوردستان لەشاری هەولێر کردەوە، بە دەرفەتمان زانی راستەوخۆ رووبەرووی چەند پرسیارێکی بکەینەوە:**

*** رووی فەزای تابلۆکانت، لە بوونی بابەتی هەلبژێردراو هاتوون یان دەرەنجامی چەند حالەتێکی دەروونین؟**

- هەر میتۆدێکم هێنابێتە ناو تابلۆکانم، پێویستیەکی بابەتی و ناوەرۆک بووە، سەرەرای ئەوەش لەو یەک ئاوازو مۆسیقیەم هێناوەتە دەرەوە و کردوودمە بە چەند ئاوازێک، وەک فەلسەفە و سایکۆلۆژیا و مێژوو و سیاسەت و کێشە کۆمەلایەتیەکان، بۆیە رەنگە جۆرێک ئالۆزی لە تابلۆکانمدا ببینرێ.

*** ئەو گۆرانکاریانەی لە تابلۆکانتدا بەدی دەکرێن، ئایا ئەوە لە سروشتدا بووە، یان لەنێوان دوو قۆناغی جیاوازی ئەزموونی تۆدا بووە؟**

- دیارە گۆران لە زاتی مرۆڤدا هەروایە و هەمیشە هەیە، ئەمانەش ئەزموونی دیکەیان لەپێش بووە، کە بەپێی زەمەن تێروانینەکان دەگۆردرێن و کاری تازە دەبینرێ و دەبیسترێ بۆیە گۆرانکاریەکانیش سروشتی و ئاساین، ئێمە لە هەر کۆمەلگایەک بژین دیارە کاریگەری لەسەر بۆچوون و زمان و ئیستاتیکای مرۆڤ هەیە بەتایبەتی سەردەمی مۆدێرن.

*** بینەر ئەگەر سەرنجی تابلۆکانت بدات، هەست دەکات لە دوو سەردەمی جیاوازدا ژیاوی،ئەزموونی دوو سەردەمی جیاوازت بەکارهێناوە و کارت بۆ کردووە، چۆن توانیوتە لەنێوان ئەزموونی دوو سەردەمی کۆن و ئێستادا هاوسەنگیەک دروست بکەیت؟**

- ئەو حالەتە زۆر بە ئاسانی لە کارەکانمدا دەبینرێ، چونکە من هاتووم دوێنێم بەئەمرۆوە بەستۆتەوە، وەک بابەت و هێنانی هەندێک مەتن کە لە کۆنەوە وەرمگرتوون و بە دنیای ئەمرۆکەم بەستۆتەوە بە تەکنیکی دنیای مۆدێرن و دەستکەوتەکانی و ئەو کاریگەریانەی کە تەکنەلۆجیا لەسەر عەقلی مرۆڤایەتی و ئاوێتەی یەکتری کردووە، بابەتەکانی خۆشەویستی و



ئافرەت و شەرو ئاشتی تەوەری بەرهەمەکانی منن و هێناومەتە ئاراوە، دیارە تازەگەری شتی تر هەلناگرێ، چونکە ژیانی مرۆڤ بریتین لەم شتانە.

*** لەنێوان تەکنیک و ستایلدا، ئایا ماددەی ئاوی ئەو ئازادیەی بەکارەکانی تۆ داوە کە جوانکاری و بابەت فەرامۆش نەکەی، ئەو تەوزیف کردنە چۆن دەسەلمێنی؟**

- ئەوەی ئێستا دەیبینی ددرەنجامی تاقی کردنەوەیەکی

دوورو درێژی قۆناغی کاری هونەریە بۆ زانینی کام ماتریال یارمەتیم دەدات بۆ دەربڕینی ویستەکانی من، دوای تاقی کردنەوەیەکی زۆر گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە بۆیە ئاوییەکان زیاتر لەمنەوە نزیکن، چونکە زەمەنێکی زۆر لەدەست نادەم و لەکاتێکی دیاریکراودا کارەکان تەواو دەکەم.

*** زۆر لەو هونەرمەندە شێوەکارانەی کە باس لە مۆدێرنێتە و نوێخوازی دەکەن لەکارێکی هونەریدا، ئەم چەمکی نوێخوازییە بۆ کارکردن لە کەلەپوور دەگەڕێننەوە، بەبۆچوونی تۆ کارکردن لە کارێکی هونەریدا دابڕانە لە ڕابردوو یان مێژوو، کەلەپوور یان بەهاوچەرخێتی کردنە لەکارێکی کۆندا؟**

- لەکارە بەراییەکاندا دیارە هونەرمەند ئاگاداری لە کاری دوێنێ هەیە، ئەگەر کارێکی مۆدێرنێتەی کردبێت، ئەو تازەگەریی و پێشڤەچوونەش ڕەوتی ئێستای جیهانە، کە ناخی مرۆڤ حەزی لە گۆڕان و پێشکەوتنە، هونەرمەندیش ئەگەر کوڕی سەردەمی خۆی نەبێت دیارە مردووە، ڕەنگە هەڵگری دوێنێش بێت، چونکە ئەو هونەرمەندە لەناو کۆمەڵگادا دەژیت و کارتێکردنی کۆمەڵگای بەسەرەوە دەبێت، هونەرمەند بۆ ئەوەی بیرمەندو داهێنەربێ دەبێ لەگەڵ هەڵگری پەیامی دوێنێ، بۆچوون و زمانی تازەشی هەبێت.

*** دەکرێ کەمێک لە بزاڤ و چالاکی و ڕیشەی مێژینەی هونەری شێوەکاری لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بزانین بەتایبەت لە شارێکی وەک بانە، کە ناوچەیەکی سەر سنوورییە، چۆن باسی هونەری شێوەکاری بکەین؟**

- ئەو بزاڤە هونەرییە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بە گشتی مێژینەیەکی زۆری نییە، من خۆم هەست دەکەم کە نەسلی دووەمم لە هونەری شێوەکاری لە کوردستانی ڕۆژهەڵات، چونکە نەسلی یەکەم بریتین لە هونەرمەندان کاک مەهدی وهادی زیادینی و فەردین سادقی ئەیوبی، تاکە مێژوویەک کە هەبێت ئەوانە کە ئێستا هەن، بۆیە مێژوویەکی دەوڵەمەندمان لەو بوارەدا نییە.

*** ئەی بە بۆچوونی تۆ ئەو نەقش و نیگارانەی کە لەداوێنی کێوی بێستوون و پاشماوەی شوێنەوارە دێرینەکانی زێویە و هەروەها نەقشی سەربەرەوکلیم و مافوری کوردی هەن، ناچنە خانەی مێژووی هونەری شێوەکاری میللی کوردییەوە؟**

- هەرچەندە ئەوانە دەچنە خانەی هونەری نەقاشی و پەیکەرتاشییەوە، هەرچەندە بۆ خۆشم کەڵکم لێ وەرگرتوون، بەلام لەبارەی هونەری شێوەکاری لە کوردستانی ئێراندا مێژینەیەکمان نییە.



*** دیارە تۆ زۆر ئاگاداری ئەم مێژووە نیت؟**

- بەڵێ ڕاستە کەلەپووری میللی هونەری شێوەکاری لە کۆندا هەیە کە ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێ، ئەگەر بە وردیی سەرنجی دەقی فۆلکلۆری کوردی بدەین، دەبینین ئەو بەیت و لاوکانە ئەگەر وەک ڕەخنەگرێک بە دواداچوونی بۆ بکەین، جۆرەها وێنەو تابلۆ دەبینرێ، وێنە هەیە بۆ هونەرمەندانی کورد نەیانتوانیوە کەڵک لەو کەلەپوورە هونەرییە دەوڵەمەندە وەرگرن.

من بۆ خۆم سوودێکی زۆرم لە کەلەپووری هونەری میللی وەرگرتووە و بەشێکی کارەکانم هەر ئەوەیە، بەلام وەک کاری شێوەکاری بەمانای ئەمڕۆیی ئێمە هیچ مێژوویەکمان نییە کە کۆمەڵێک کاری شێوەکاری داهێنەرانەی تێدا بێت، بەلام تا چەند ئەو کەلەپوورە دەوڵەمەندە دەچێتە ناوخانەی هونەری شێوەکاری ئەوە چیرۆکێکی دیکەیە.

*** دەکرێ لە کوردستانی ئێراندا باس لە هونەرمەندانی پێشەنگی کوردی بکەن،بەتایبەت ئەوانەی لە بواری هونەری شێوەکاریدا کاریان کردووە؟**

- لە بۆکان کە سەرچاوەی ئەو بزاڤ و جموجۆڵەیە، چەند کەسێک لەو بوارەدا کاریان کردووە وەک محەممەدی ڕۆستەم زادە کە دوای ئەزموون و هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر داویانە، ئەو هونەرە لەو شوێنەدا ڕۆڵێکی بەرچاوی بینیوە.

**ئا: مژدە سەلیم**

ئیبراهیم خەلیل ئەحمەد

# وێنەی فۆتۆگراف دەتوانێ پەیامی خۆی بە خوێنەران بگەیەنێ



قۆناغی دواناوەندی لە ئێران تەواوکردووەو ئێستا قوتابی قۆناغی پێنجەمی کۆلێژی دەرمانسازییە، ئەندامی کارای سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستانە.

بەشداری لە چەندین پیشانگادا کردووە:

- سالی ٢٠٠٠ کردنەوەی پیشانگای تایبەتی لە رۆژی زانکۆ لە کۆلێژی دەرمانسازی لە هەولێر.
- سالی ٢٠٠٠ بەشداری لە پیشانگای هاوبەش لە ژێر ناوی گوتاری خۆشەویستی کردووە.
- سالی ٢٠٠١ لە (١١)ەمین فیستیڤالی نێو دەوڵەتی بەغدا بۆ وێنەی فۆتۆگرافی لە ژێر ناوی (وێنەی فۆتۆگرافی پەیامی خۆشەویستی و ئاشتییە)(الصوره الفوتوغرافیه رساله محبه والسلام) کە نزیکەی ٢٠ ولات بەشداریان تێدا کردوو خەلاتی برۆنزی لە تەوەری مندالان وەرگرتووە.
- لە سالی ٢٠٠١ دووەمین پیشانگای تایبەتی لە ژێر ناونیشانی (خەونە وەنەوشەییەکان) لە هۆلی میدیا کردەوە.
- لە سالی ٢٠٠٢ بەشداری پیشانگای هاوبەش لە یەکەمین فیستیڤالی کورتە فیلمی کوردی کردووە.
- سالی ٢٠٠٢ سێیەمین پیشانگای تایبەتی خۆی لە پیرمەم کردوەتەوە.
- سالی ٢٠٠٢ خەلاتی یەکەمی فیستیڤالی (مونتی ئەمیاتا) کە لە شاری (گەوستیۆ)ی ئیتالیا سازدرابوو بە هاوبەشی لە وێنەی فۆتۆگرافی وەرگرتووە.

زۆر لە وێنەکانی لە رۆژنامەو گۆڤارەکانی ناوەوەو دەرەوەی ولات بلاوبۆتەوە.

* بۆچی فۆتۆگراف لە رۆژنامەڤانی کوردیدا بایەخ و رۆڵی بەرچاوی نەبووە؟

- ئەگەر بڵێین رۆڵی نەبووە، ئەمە هەق نییە، بەلام بە پێی پێویست نەبووە، لەبەر ئەوە کە زۆرینەی گۆڤارو رۆژنامەکان یان خوێنەری رۆژنامەکانیش بە گشتی هۆشیاریەکی تەواویان نییە، دەربارەی رەگەزو پەیامی ئەکادیمی ئەستاتییەکانی هونەری فۆتۆگراف.

* ئەو گرفتانە چین لەبەردەم هونەری فۆتۆگراف و هونەرمەندی فۆتۆگراف لەکاتی ئەنجامدانی کارێکی رۆژنامەڤانیدا؟

-جگە لەوەی کە گرفتی تەکنیکی هەیە لەبەردەم فۆتۆگرافەرانی کورد، ئەوەش لەبەر نەبوونی پێداویستی سەردتاییەکانی ئامێرو کەرەستە پێشکەوتووەکان کە لەم سەردەمەدا رۆڵی بەرچاو دەبینێن لە بەخشینی رووی

جوانی فۆتۆگراف، لەلایەکی دیکەوە هەندێک گرفتی کۆمەڵایەتی تایبەت هەیە کە رووبەرووی هونەرمەندانی فۆتۆگراف دەبێتەوە، ئەمەش بەهۆی نەبوونی هۆشیاریکی کەم لە لایەن خەڵکەوە سەبارەت بە هونەری فۆتۆگراف بۆ نموونە هەندێک جار هونەرمەندی فۆتۆگراف کە دەیهەوێت گرتەی ئافرەتێک لە کاتی کارکردن یان هەر جۆرێکی تر بگرێت ئەوە بێ شک دووچاری ئاستەنگ دەبێتەوە بەهۆی کە ئافرەتەکە یان خەڵکی نزیک رێگە نادەن کە وێنەی گرتەکە بگرێت.

ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێک داب و نەریتی کۆنەپەرەستانەی کۆمەڵایەتیی و ئاینی، کە بێگومان ئەمە یەکێکە لە گرنگترین لەو کێشانە کە دووچاری ئێمەی فۆتۆگرافەوە دەبێتەوە، ئەمەی باسی دەکەین رەنگە بەنسبت کێشەکانمانەوە دەڵوپ دەگریت و هەروەها کێشەکانی تر......



*** لە وڵاتان رۆژنامەی وێنەدار هەیەو بایەخی زۆری پێدراوە لای ئێمە ئەم دیاردەیە بەدی ناکرێ، چ بکرێت باشە بۆ برەودان بە رۆژنامەیەکی وێنەدار؟**

- ئەوەی راستی بێت وێنەی فۆتۆگراف یاخود ئەو شتەی دەبینرێت رۆڵێکی کاریگەری هەیە لە دونیای ئەمرۆدا. چونکە وێنەی فۆتۆگراف زۆر بە ئاسانی دەتوانێ پەیامی خۆی بە بەرامبەر بگەیەنێ، ئەویش وای کردووە کە لە دەرەوە زۆر بایەخی پێ بدرێت، لە هەموو بواری ژیاندا دەوری وێنەی فۆتۆگراف دەبینین، لە بواری ریکلام، بازرگانی، سیاسی کە بایەخی زۆر بە فۆتۆ دەدرێت، رۆژنامە یاخود گۆڤاری وێنەدار زۆر پەرەی سەندووە.

هەر کاتێک کە فۆتۆگراف و وێنەی فۆتۆگراف لە کۆمەڵگای ئێمەدا بایەخی پێدرا ئەو کات بێگومان رۆژنامەی وێنەدار دەوری دەبێتەوە.



*** زۆرجار بڵاوکراوەیەک، تەنانەت هەندێ جار دەزگایەک بێ رەزامەندی و پرسی خاوەنەکەی وێنەی ئەرشیفی وێنەگرێک چاپدەکات و بڵاو دەکاتەوە، لە رووی یاساییەوە چۆن چارسەری ئەم دیاردەیە دەکرێ؟**

- دەبێت یاسایەک هەبێت کە پارێزگاری لە مافی وێنەگری فۆتۆگراف بکات «یاسای کوپارانێت» پەیرەو بکرێت، کە هەرکەسی نەتوانێ بە ئارەزووی خۆی وێنەیەک کە مافی بەسەردا نییە بڵاوبکاتەوە، بۆ ئەم مەبەستەش ئەگەر یاسای کۆپارانێت هەبێت، ئەگەر هەرکەسی و لایەنێک وێنەی بە بێ ئاگاداری خاوەنی وێنە بڵاو بکاتەوە سزا بدرێت و مافی خاوەن وێنەی بۆ بکەرێتەوە، ئەمە دەتوانێ سنورێک بۆ ئەم کارە دابنێت.

*** پێشنیارتان چییە بۆ گەشەپێدانی بەرهەم و توانای وێنەگرانی فۆتۆگراف لە رۆژنامەڤانی کوردیدا؟**

- بایەخدان بە وێنەگری فۆتۆگراف و وێنەی فۆتۆگراف و هەروەها کردنەوەی خولی فێرکردن و هۆشیارکردنەوە بۆ وێنەگرانی فۆتۆگراف و کردنەوەی پیشانگا.

پێشبرکێی وێنەی فۆتۆگراف و هاوکاری کردنی وێنەگری فۆتۆگراف بۆ کردنەوە پیشانگا.

**ئا: محەمەد سەلیم**

# هۆشیاریی دوای مردن؟

**مارلین شلیتز**
**لە ئینگلیزیەوە: گۆران صباح**

پار ساڵ ڕووبەڕووی بەردنگاریەکی سەخت بوومەوە. مردن نەبووە میوانی تەنها یەک لە هاوڕێکانم بەڵکو بووە میوانی زۆربەی هاوڕێ و هاوپۆلەکانم. پاشی ئەم بارە ناهەموارە لەگەڵ خۆم دانیشتوومەو بەکاتژمێر بیرم کردۆتەوە، هەوڵمداوە مانایەک بۆ هێرشەکانی مردن و لە دەستدانی هاورێیەکانم بدۆزمەوە، دوای مەرگی زۆربەی هاوڕێکانم نەمتوانیوە هیچی تر تەلەفۆن بۆ هاورێیانم بکەم و ئیمەیلیکی خێرایان بۆ ڕەوانە بکەم چونکە لە ژیان گەشتێکی تاهەتاییان ئەنجامداوە. مردن لە هەموو ئەو کەسانەی کردم کە ڕۆڵێکی کاریگەریان لە ژیانی مندا هەبوو. لەگەڵ مردنی هاوڕێکانم پەیوەندییە گەرم و گوڕو گفتوگۆ بەپەرۆشەکانیشمان بەجارێ ساردو سڕبوون و وەستان. ئایا ئەمە ڕاستە؟

ئەزموون و تێبینی کردن وەڵامی تەواومان بێ نابەخشن سەبارەت بە پرسیارەکانی بوونی ژیان لە پاش مەرگ بەڵام بیروباوەڕ سەرچاوەی وەڵامی ئەو پرسیارانەن. لەم سەردەمەدا دەتوانرێ نهێنی ژیان بەهۆی هەردوو ڕەهەندی ڕەخنەیی و والابوونی دەرگای ڕاستی و زانیاری ئاشکرا بکرێت. پرسیارێک هەڵدەقوڵێتەوە ئەویش: بە هۆی چییەوە نەریتە ڕۆحی و ئاینییەکان قسەیان لەسەر بوونی ژیانی ڕاستەقینەی پاش مەرگی کردووە؟

لەڕاستیدا بەپشت بەستن بە بیروباوەڕێکی بەخێر دەڵێن:

دوای مردن هۆشیاری مرۆڤ بەردەوام دەبێت هەرچەندە جەستەی مرۆڤ بوونی نەبێت. هەندێ لە بیرمەندانی تۆیست (taoist) دەڵێن: دوای مردن تەنها ئەو ڕۆحانە دەژین کە کامل و تەواو پێ گەیشتوون. بەڵام هیندو (hindu) یۆگاکانی تیبیتان بووزی دەڵێن: هەموو زیندەوەرێک دوای مردن ڕۆحی دێتەوە بەر. ئێمە ڕێزی ئەم بیروبۆچوون و باوەڕە جیاجیانە دەگرین، بەڵام شتێکی زۆر ئاساییە گەر بەگومان بین لە ڕاستی ژیانی دوای مردن.

لەم ڕۆژگارەدا هەندێ لەو بیروبۆچوونانە دەربارەی هۆشیاری دوای مردن بەهۆی چەند ئەزمونێکی ڕاستەوخۆی هەندێ خەڵکەوە سەلمێنراون. بۆ نموونە: هەندێ کەس لەسەردەم و کەلتووری جیاوازدا لە ڕێگای خەونەوە دیمەنی کەسی مردوویان بەزیندوویی بینیوە سۆفیەکی مەسیحی بەناوی مێستر ئێکهارت [meister Eck-hart) نووسیویەتی [هەندێ کەس پێیانوایە کە ئەوان دەبوایە خوا ببینن بەجۆرێک خوا لە شوێنی خۆی و ئەوانیش لە شوێنی خۆیان، چونکە دەیانووت «ئێمە و خوا یەکین لە زانیاری!»]

مەشق و ڕاهێنانەکانی شامنەکانی چاخی بەردین ڕەنگ دانەوەی هەیە لەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان بەشامنیزم هەیە. **شامنیەکان باوەڕیان وایە کە هەقیقەت چەند ئاستێکی هەمە جۆرە یاخود فرە ئاستە. هەروەها پێیان وایە کە فرە ڕەهەندیش بەهۆی جموجوڵ لەنێوان بواری جیاجیاو دیاریکراودا بوونی هەیە.**

شامنیەکان دەڵێن: دەتوانین گەشت بۆ ڕۆح بکەین، پەیوەندی بەرۆحەکانی سروشت و باوباپیرانمان بکەین و خۆمانیان پێ بناسێنین.

هەروەها دەڵێن سنووری نێوان زیندوو و مردوو سنورێکی هەمەڕەکییەو گشتییە نەک شوورەیەکی پۆلایین.

گەلێ بواری جیاجیای زانست لە بوونی ژیانی پاش مەرگ دەکۆڵنەوە دەروونناس «گاری شۆرتز» [Garg shortiz] گەلێ پێناوی ڕۆحی تاقی کردۆتەوە.

بۆ ئەوەی بزانێت پەیوەندی هەیە لەنێوان مردووێک و پێناوێکی ڕۆحی. لە یەکێک لە تاقی کردنەوەکان بۆی دەرکەوت کە پەیوەندی وشەیی و جەستەیی نییە بەڵکو پەیوەندیەکی ڕۆحی لەنێوانیان هەیە. بەم جۆرەش، شۆرتز، پێی وایە دەتوانین زانیاری زیاترمان دەست بکەوێت لەسەر مردووان.

ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە بتوانین پەیوەندی بەمردووەکان بکەین؟ نەخێر، بەڵام دڵنیاشنین کە ناتوانین. هەروەها پێناوە ڕۆحییەکان بەکاردەهێنرێن لە لێکۆڵینەوەکانی وەک گەڕانەوەی ڕۆح بۆ جەستە دوای مردن ئەزموونەکانی لەش و سەرد مەرگ. زاناکان مردن بەم جۆرە وەسف دەکەن: مردن دەڕاسەیەکی مەنگ و مۆنە لە پڕێکا خۆشەویستەکانمان دەبڕێتەوە. هەروەها دەروونناسی عەقلی «ڕێ ی مۆند موودی» مردن بە «ڕووناکی لەنکاو» وەسف دەکات.

بۆیە مردن وەک حاڵەتێک سەیر دەکرێ کە کاتی دوای مردن و پێش مردن وەک یەک نییە. بەهۆی سنووری مردنەوە ڕەنگە گەشەو گۆڕانی تایبەتی کەسی لە ئاستێکی سنووردار دایە بەم چەشنەش مردن ناسکی و کورتی و کەم تەمەنی ڕاستی و ژیان دەسەلمێنێت.

**لێکۆڵینەوە لەسەر ژیان و هۆشیاری دوای مردن دڵنەوایی جەرگ سووتاوەکان دەداتەوەو خەم و پەژارەو ترس و گومانیان بن بڕ دەکات.** وامان لێ دەکات دوورکەوینەوە لە جودابوونەوەو بەرەو هەستێکی فراوانتری خودو پەیوەندیەکی گشتیمان دەبات.

**شامنیەکان:** ئەو کەسانەی کە لە هەندێ کۆمەڵگاو ئایینی جیاوازدا باوەڕیان پێ کراوە کە دەتوانن پەیوەندی بەرۆحە باش و خراپەکان بکەن و خەڵکی نەخۆش چاک بکەنەوە.

**سەرچاوە**

**گۆڤاری: ڕۆحانیەت و تەندروستی.. spiritualitg and health**
**ئەم گۆڤارە لە ویلایەتی نیۆرکی ئەمریکی دەردەچێت**

**هەڵکەوت عەبدوڵڵا**
٢٠٠٤/١/١٧

# ریفراندۆم و رۆشنبیر

ماوەیەکە چەمکی ریفراندۆم (راپرسی)، وەک هەموو چەمکە بیانیە- مرۆڤایەتیەکان بۆتە میوانی کۆمەڵگەی **کوردستان و** هاوشێوەی هەر چەمکێکی دیکەی هاوردو یاخود هاتوو کەوتۆتە سەر هەموو زارێک و بەراست و چەوت، چاک **و خراپ بەکاردەبرێ و** لەسەر سەکۆ جۆربەجۆرەکان گفتوگۆی لەسەر دەکرێت.

ئەوانەی ترسی داهاتوویان لی نیشتوەو بەدگومانن بەرامبەر بە چارەنووسی رووناک بۆ خەڵکی کوردستان. **بەدەرمانی دەردەکان** دادەنێت. ئەوانەی موحافەزەکارانە یاخود بەرژەوەند خوازانە مامەڵە لەگەڵ رووداوەکاندا دەکەن. بەکارێکی هەرزەکارانەی **دادەنێن و** پێیانوایە دەبێتە هۆی لە دەستدانی ئەوەی تاکو ئێستا بەدەست نەهاتوە. ئەوانەش کە هۆشمەندانەو نیگەران ئاسا سەیری قۆناغەکە دەکەن و بروایان بەکردنەوەی پەنجەرەیەک لە دیواری بەشوراتەنراوی مێژووی گەلەکەمان هەیە. **وەک ئامرازێک** تێیدەروانن کە دەشێ بۆ دەستەبەرکردنی ئامانجەکانی داهاتوو و پاراستنی ئیمرۆی ئەوەکانمان بەکارببرێت.

لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە توێژینەوەیەکی هەمەلایەن و تۆکمە دەربارەی ئەو چەمکە میوانە بخەمەروو. بەڵکو گەرەکمە **هێما بۆ** ئەوە بکەم. داخۆ پەیوەندییەک یاخود سەکۆیەک ریفراندۆم و رۆشنبیر پێکەوە کۆدەکاتەوەو دەشێ شتی هاوبەشیان **هەبێ و** کار لەیەکتر بکەن؟

ریفراندۆم وەک یەکێک لە ئامرازەکانی بەرجەستەکردنی ویست (ئیرادە)ی مرۆڤەکان و کارپێکردنی ئازادیی تاکە کەس. رۆڵێکی کاریگەری هەیە لە کۆمەڵگە مرۆڤایەتیەکاندا، چونکە پەیوەندی نێوان فەرمانرەواو فەرمانرەواییکراو. واتە دەسەڵاتداران و هاوولاتیان. لە ژینگەیەکی سروشتیدا دەپارێزێ. بەوپێیەی فەرمانرەوایی دەربری ویستی بە کۆمەڵی تاکەکان دەبێت لە رێگەی هەڵبژاردن و دەنگدانەوەو تاکەکانیش پاراستنی فەرمانرەوایی بەئەرکی خۆیان دەزانن و لەپێناو ئەوەشدا دەستبەرداری هەندێک لە مافەکانی خۆیان دەبن. هەروەها وادەکات بەشداریکردنی هاولاتیان لە بریارە چارەنووسسازەکاندا چالاک بێت و خەمساردی و بێموبالاتی برەوێنەوەو زەمینەش خۆشدەکات بۆ لە دایکبوون و بەهێزبوونی رای گشتی کە رۆڵی گەورەی دەبێت لە فشارخستنە سەر دەسەڵاتی سیاسی بۆ بەوەفابوون بۆ بەڵێن و دیمانەکانی خۆی و رێگە گرتن لە گرتبوونەوەی دەسەلات و سەرهەڵدانی ئیستیبداری سیاسی. پەیامی رۆشنبیر بیناتنانەوەی کۆمەڵگەیە لەسەر بنچینەی  رێزگرتنی بەها تاکە کەسیەکان و دامەزراندنی ژینگەیەک کە تیایدا مرۆڤ لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانی و دادپەروەری ژیان بەرێتەسەر. هەروەها رۆشنبیر ئامانجیەتی کۆمەڵگەی خۆی بەپێی گۆرانکارییە هاوچەرخ و سەردەمییەکان نوێ بکاتەوەو بکەرێکی کاراو بەشدارکارێکی چالاک بێت لە پرۆسەی پەرەسەندنی کۆمەلایەتیدا.

لێرەوە ریفراندۆم ئامرازێکی چاک و کاریگەرە بەدەست رۆشنبیرەوە بۆ دەستەبەرکردنی ژینگەیەکی دیموکراسی سروشتی بۆ کۆمەڵگەکەی و ئینجا خۆی. تاکو بتوانێ چاکتر رۆڵی خۆی ببینێ لە ژیانی رۆشنبیری و سیاسی و کۆمەلایەتیدا. ریفراندۆمیش سوودێکی زۆر لە مەعریفەو تێروانینی رۆشنبیر وەردەگرێ و دەتوانێ لە رێگەی ئەویشەوە بە ئەزموون و تاقیکردنەوەکانی گەلان شادبێت لەبواری بریاردان لەسەر چارەنووسی خۆیاندا. واتە ریفرانۆم یەکێکە لەو میکانیزمانەی رۆشنبیر دەتوانێ لە رێگەیەوە زەمینەی کاری چالاکانەو بەشداریکردنی گونجاو خۆشبکات و رۆشنبیریش ئەو ئەقڵەیە کە دەتوانێ ریفراندۆم خۆماڵی بکات و خەسڵەتە ناوخۆییەکانی پێ ببەخشێ و لەرەوتی کۆپیکردن و دۆگماییەت رزگاریبکات. ریفراندۆم یەکێکە لەو پردانەی رۆشنبیر بەهۆیەوە هاوولاتیانی خۆی لەسەردەمی فەرامۆشکردنەوە دەگوێزنەوە بۆ قۆناغی ئامادەبوونی بەرجەستەکارانەو رۆشنبیریش ئەو بکەرە هۆشیارەیە کە ریفراندۆم لە ئەندێشەوە دەگوێزێتەوە بۆ کاری بەرجەستەو لە خەونەوە دەیکاتە واقیع.

دەبێ ئەوەش بڵێم کە ریفراندۆم ئامانج نییە و دارێکی تەلیسماوی نییە بۆ چارەسەرکردنی هەموو گرفتەکان. بەڵکو تەنیا یەکێکە لە ئامرازە گرنگەکان بۆ ئەم قۆناغە هەستیارەی گەلەکەمان پیایدا تێدەپەرێ. رۆشنبیریش تاقە بکەر نییە کە بتوانێ گۆرانکاری ریشەیی بهێنێتە ئاراوە. بەڵکو یەکێکە لە بکەرەکان کە پێویستە هاوشانی بکەرەکانی دیکە کاربکات.

بەهەرحاڵ، رۆشنبیرانی ئێمە تاکو ئیمرۆ زۆر چەمک و میتۆدی هەمەرەنگیان بەکاربردوە کە کەمێکیان سەرکەوتووبوون و زۆرێکیان تێکشکابوون. بەلام نازانین داخۆ ریفراندۆم دەکەنە یەکێکە لە چەمکە هێزبەخشەکان یاخود چەمکە سەرسمدەرو زیان بەخشەکان؟!

داخۆ ریفراندۆم دەبێتە ئەو بەلەمەی رۆشنبیران لە کەناری پەککەوتەیی بەوە بگوێزێتەوە بۆ قەراغی ئامادەیی و کاریگەریخستنەوە یاخود ریفراندۆمیش وەک هەر چەمکێکی دی دەخەسێن و لە خزمەتی بەرژەوەندییە تایبەتیەکانی خۆیان یاخود سیاسەتمەداراندا دەخەنەگەر؟!